پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی ٥٠

# فیقهی ئاسان

## الفقه الميسر

نووسینی

احمد عیسی عاشور

وەرگێڕان: نوری فارس حەمەخان

پێداچوونەوەو پەراوێزی لەچاپدانی کردووە

محمود احمد محمد

بەرگی یەکەم

عاشور، احمد عیسی.
الفقه‌المیسر. کردی.
فیقهی ئاسان: (فقه المیسر) / نووسه‌ر احمد عیسی عاشور؛ وه‌رگیرانی نوری فارس حه‌مه‌خان؛ مصحح محمود احمد محمد.-- تهران: نشر احسان، ۲۰۰۷.
۲ ج.
ISBN: 964-356-565-3 (دوره)
ISBN: 964-356-563-7 (ج. ۱)
ISBN: 964-356-564-5 (ج. ۲)

فیپا.
کردی.
۱. فقه شافعی. الف. فارس، نوری، مترجم. ب. محمد، محمود احمد، مصحح. Muhammad, Mahmud Ahmad
BP ۱۷۷/ع۲ف۷۰۴۷ ۲۹۷/۳۳۳
کتابخانه ملی ایران ۸۵-۳۵۴۰۴م

## فیقهی ئاسان (به‌رگی یه‌که‌م)

✦نووسه‌ر: احمد عیسی عاشور
✦وه‌رگێرانی: نوری فارس حمه خان
✦بلاْوکاْر: نه‌شری ئیحسان - تاران
✦چاپی: یه‌که‌م ـ ۲۰۰۷
✦چاپخانه: مه‌هارت ـ تاران
✦تیراژ: ۳۰۰۰ دانه
✦ژماره‌ی سپاردنی: (۸۳۱)ی ساڵی (۲۰۰٦)ی وه‌زاره‌تی رۆشنبیری پێدراوه

➢ فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ٤٠٦ ـ تلفن: ٦٦٩٥٤٤٠٤
➢ فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۳۳ ـ تلفن: ۳۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱٤۹۵

ژماره‌ی نیونه ته وایه‌تی (ج ۱):۷-۵۶۳-۳۵۶-۹۶۴ ISBN: 964-356-563-7
ژماره‌ی نیونه ته وایه‌تی دەوره:۳-۵۶۵-۳۵۶-۹۶۴ ISBN: 964-356-565-3



بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی: بە پێنووسی وەرگێڕ:-**

**الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين.**

**لە پاش سوپاسی خودای مەزنو، ناردنی دروود بۆ سەر گیانی پیرۆزی پێغەمبەرو یارانو هاوڕێیانو پەیڕەوانی، عەرزم ئەمەیە لە خزمەتتاندا: ئەم نامە پیرۆزەیە کە واین لە خزمەتیدا، ئەصڵەکەی پێشەوای گەورەو خواناس (الامام تقی الدین أبو بکر محمد الحسینی الحصنی الدمشقی) دایناوەو ناوی ناوە (کفایة الاخیار في حل غایة الاختصار).**

**مامۆستای گەورەو مەزنیش: ئەحمەد عیسا عاشوور سەر لەنوێ بە شێوازێکی زۆر جوانی ئاسانی رەوانی نوێ ئەم کتێبەی دارشتۆتەوە، ئەگەر لە شوێنێ خواریو خێچیو ئاڵۆزییەك لە عیبارەتی عەصڵەکەدا بووبێ راستی کردۆتەوە، هەتا مەردوم زۆر بەئاسانی لە بابەتو مەبەستەکان حاڵی ببن، لە شوێنێ پێویست بە زیادەیێ هەبێ زیادی کردووە، جاروباریش شتێ کە سوودی کەم بێت لەبەر کورتەکاری کرتاندویەتی، بەلام جەوهەری ئەصڵەکە ئەوەی سوودمەندبێ وەك خۆی ماوە، چەند**

مەسەلەو بابەتێ کە لەئەصڵەکەدا نەبووە مامۆستا ئەحمەد زیادی کردووە، وەك مەسەلەی تەشریحی لەشی مردوو، مەسەلەی تەئمین لەسەر حەیات، چونکە ئەصڵەکە لە سەدەی نۆیەمی کۆچیدا دانراوە، ئەو سەردەمەیش ئەم جۆرەشتانە وەك ئێستا باویان نەبووە، جا لەبەر ئەم گۆڕانکارییە ڕەوایە کە مامۆستای عاشوور ناوی کتێبەکەی گۆڕیوەو ناوی ناوە (الفقه الميسر) بە کوردی واتە: شەرعی ڕەوانو ئاسان[1] ئەم کتێبە بۆ ناو کوردەواری خۆمانو بۆ سوننی عێراق زۆر لەبارە، چونکە زۆربەی ئەم دوولایەنە شافیعی مەزهەبن.

بەلاّم خوا هەقە دیاری ترین دیاردەی نایابی ئەم کتێبە ئەمەیە: کە حوکمو بڕیارەکان، یا بەئایەتێ، یا بە حەدیسێ تەوجیە دەکات، یاخود بە ئیجماعو یەکگرتنی ئوممەت!

---

[1] ئیمامی نەوەویش موحەڕەری ئیمامی رافیعی کورت کردۆتەوەو هەنێ بابەتی لێ پتر کردووەو ناوی ناوە مینهاج، شێخی قاضی زەکەریایش میهناجی کورت کردۆتەوەو برێ مەسەلەی لەسەر زیادکردووەو ناوی ناوە مەنهەج {ڕەزای خوای گەورە لە هەموویان بێ}.

مەبەستم ئەوەیە ئەم جۆرە گۆڕانە لە کۆنو نوێدا بووە. ئەمە پێی ناگوترێ دزی، لەبەر ئەوە بەر شیعرەکەی مەولەوی ناکەوێ، کە دەفەرموێ:

گێسکێ بدزێو کلکی هەڵپاچی

لەدەس خاوەن ماڵ هەرگیز دەرناچی

له راستیدا نرخی هەموو شتێ بەپێی سوودەکەیەتی، هیچ شتێکیش وەکوو خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەسوودنییە، بە تایبەتی لە بواری تەفسیرو حەدیثو شەریعەتدا، جا لەبەر ئەمە هەمیشە ئاواتمە کە خزمەتی بەرنامەکەی خوا بکەم، هاوکات لەگەڵ خزمەتی گەلی کوردی خۆما، بە راستی ئەمە کتێبەیش ئەو دوو ئاواتەم دەهێنێتە دی، لەبەر ئەوە لەسەر داخوازی بڕی لە دۆستو برادەران، کە یەکێ لەو بەڕێزە ئازیزانە جەنابی مامۆستا مەحمود ئەحمەد موحەمەد بوو، هاتم ئەم پەڕاوە پەسەندەم وەرگێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی، هۆی ئەم پێشنیارە فەرداره‌ی ئەم زاتانەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە بەبیرو بۆچوونی ئەوان بەندەی هەژار ئەهلییەتی هەڵسان بەم ئەرکە پیرۆزەم هەیە، گەرچی من ئەمە بە حوسنی ڤەن دەزانمو لە مەیدانی واتە: بەرینو گوشاددا خۆم بە فەقێو شاگرد دەزانم، لەگەڵ ئەوەیشدا ئومێدم قەوییە بە رەحمەتی خوا کە لەم کارە پیرۆزەدا یارمەتیم بداو سەرکەوتووم بفەرموێو خۆی مامۆستاییم بکاو، جێگە گرانەکانیم بۆ ئاسانو حەل بکاو گومانە جوانەکەی ئەوان بەراست بگێڕێ. لە راستیدا حاڵی بوون لەم جۆرە پەڕاوە، شارەزاییەکی تەواوی لە زانستە شەرعییەکان دەوێ.

**لێرەدا پێم خۆشە ئاماژە بۆ ئەم چەند خاڵە بکەم:**

١) مامۆستا ئەحمەد عاشوور لە پێشەکییەکەی خۆیدا وەسپێکی جوانی زۆری ئیمامی شافیعی دەکا. بەندەیش دەڵێم: خەطیبی شەربێنی لە سەرەتای بەرگی یەکەمی (مغنى المحتاج)دا دەفەرموێ:

(ئەو فەرموودەیەی کە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: زانایەکی قورەیشی لەناو ئۆمەتی مندا هەڵ دەکەوێ جیهان پڕ دەکا لە زانست) مەبەست لە ئاماژەی ئەم فەرموودەیە ئیمامی شافیعییە، {ڕەزای خوای لێبێ}.

جا ئازیزان! کەسێ پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} ئەنا خوانی بێ و مەدحی بکا، ئیتر من هەرچی بڵێم بەهەزاریەکی ئەوە نابێ، سوپاس و ستایش بۆ خوا کە لە پەیڕەوانی مەزهەبی ئەم پێشەوا مەزنەین. لێرەدا ئەمەتان عەرز دەکەم: لە ڕاستیدا هەردوو مامۆستای دانەری ئەم کتێبەداناو زاناو شەریعەتزان و مەلان، خوابکا کارەکەی بەندە جۆرە تەواو کەرێ بێت بۆ کارە پیرۆزەکەی ئەوان، ئافەرین بۆ خۆیان کەم کەسم دیوە وەك ئەوان کە حوکم و بڕیارەکان بە دەقی ڕۆشنی کیتاب و سوننەت و بە ئیجماعی ئوممەت ڕۆشن بکەنەوە. ئەمە یەکێکە لە هۆی برەوپەیداکردنی ئەم کتێبە.

٢) (لە ڕاستیدا ئەم کتێبە کورتەیەکی پوختی شەرعە، لەسەر ڕێڕەوی ئیمامی شافیعی، وە بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی لەم چەرخەی ئێمەدا مامۆستایەکی دڵسۆزی نەرمو نیانی زمان شیرینی هاوڕێ خۆشی مەشرەب خۆشە، خۆی لە باتی مامۆستا فێری شەریعەتمان دەکا، بە تایبەتی بە شێوازێکی جوان و ئاسان و ڕەوان فێری بەشی عیبادەت و

موعامەلاتمان دەکا، کە ئەم دوو بەشەیش بۆ ئەم رۆژگارەی ئێمە، بۆ ئەهلی دین، زۆر زۆر پێویستن، هەر لەبەر ئەمەیشە کە ئەمڕۆ ئەم کتێبە لە ناولاوو رۆشنبیرە ئیسلامییەکاندا فرۆختو برەوێکی چاکی بێ مانەندی هەیە، لە خواداوا دەکەم کە بە بەخششی خۆی لە تەرجەمەکەیدا سەر کەتوومان بفەرموێ، وە بۆ شایەکی گەورەی لە نامەخانەی کوردی پێپڕ بکاتەوە) ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانم کە عەرزی نووسەرە کوردە ئازیزەکانمان بکەم: (ئازیزان! دەتوانین لە رێگەی وەگێڕانەوە گەورەترین خزمەت بە ئایین، بە ژیان، بەزمان، بەنیشتمان، بەنەتەوە، بەمرۆڤایەتی بکەین، ئەم هەموو کوێرەوەرییەی کە ئەمڕۆ گەلی کوردی تیایە، لەگەڵ ئەو هەمکە تاڵاوەی کە ئەمڕۆ دەیچێژێ ماکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەردی نەخوێندەواری. کەواتە: مەرد ئەو مەردەیە کە بە نووکی خامە پەردەی نەزانی لە سەردڵو چاوو گوێی کوردی هاوڵاتی ستەمدیدەی خۆی بدڕێو بە سورمەی زانستی بەسوود بە تیشکی ئایینی راستو دروست چاوەکانی برێژێو پڕیان بکا لە نووری رۆشنبیری!).

ئازیزان! تەکلیفی مالایوطاق لە کورد مەکەن، کەواتە داوای یەکێتیو یەکگرتنو برایی‌و تەبایی‌و کوردایەتی‌و مەردایەتی‌و خۆ ئازادکردنو نیشتمانپەروەری‌و خزمەتی کوردو کوردستانو ئایینو نیشتمانیان لێمەکەن، هەتا لە پێش ئەوەدا رۆشنبیریان نەکەن، چونکە ئەم جۆرە ئەرکانە بە مرۆڤی داناو زانای دڵسۆزی ئەم خاکو نشتمانە ئەنجام دەدرێ، پیشەی نەزانو مرۆی دوور لە بیری خواناسی هەر دزی‌و جەردەیی‌و خۆخۆرییە!.

٣) بــۆ ســاخکردنەوەی ئــەم پــەڕاوە بــەهرەم لــەم سەرچــاوە متمانەپێکراوەنە وەرگرتووە: شەریعەتی ئیسلام، مامۆستای مامۆستایان جەنابی گەورەو سەروەرمان مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، موغنی موحتاج هی خەطیبی شەربێنی. فەتحولموعین. الفقه علی المذاهب الاربعه. شرح المحلی علی المنهاج. جلال الدین المحلی. هەروا بەهرەم لە سەرچاوەکانی ساخکردنەوەی تاجول ئوصوول و ریاض صالحین و تەجریدی بوخاری وەرگرتووە کە سوپاس بۆ خودای گەورەو میهرەبان ئەم سێ کتێبە پیرۆزانەیشم بە تەواوی کردووە بە کوردی.

خودایە! بە بەخشش و میهرەبانی خۆت لە خۆمان و کەسوکارو دۆست و برادەرمان و لە مامۆستاو فەقێمان و، لە مردوو زیندومان خۆش بە، خوایە! خۆمان و کەسوکارمان و منالمان و منالی منالمان لە هەردوو جیهاندا لە پەنای خۆتا پەنابدە، خوایە! رەحمێ بە حاڵی ئەم گەلی کوردی ستەمدیدەیە بکە، خوایە! ئەوەی موتالای ئەم کتێبە دەکا بیکە بە نوور بۆ چاوی و بەتوێشوو بۆ دڵی.

خوایە! رەحمێ بە حاڵی باوکم و دایکم و کاوەی کوڕم بفەرموو. خوایە! یاریدەم بفەرموو هەتا ئەم کتێبە بە تەواوی دەکەم بە کوردی. ئامین.

سلێمانی گەرەکی مامۆستایان
نوری فارس حەمەخان حەسەن

بسم الله الرحمن الرحیم

## ١) پاکی (الطهارة):

**پێناسەی پاکی:** پاکی لە زماندا واتە: خاوێنی، دەڵێن: جلکەکەم پاك کردەوە، واتە: خاوێنم کردەوە، لە شەرعیشدا واتە: نەهێشتنی ناپاکی (حەدەث)و لابردنی پیسی.

بە پێی شەرع لەسەر رێبازی ئیمامی شافیعی {رەزای خوای لێبێ} ئەم چوار شتە پاکەوەکەرنو شتی ناپاك پاك دەکەنەوە: ئاو، گڵ، خۆشەکردن (کەوڵ خۆشکردن)، بوون بەسرکە.

ئاو هەموو ناپاکیو چەپەڵییەك پاك دەکاتەوە، گڵ – یاخۆڵ - تەیەممومی پێدەکرێ، گلاوی سەگو بەرزایشی پێ دەردەکرێ، ئەو شتەیش کە شتی پێخۆشە دەکرێ کەوڵی مردارەوە بوو پاك دەکاتەوە، مەیو ئارەقیش هەرکاتێ کە لە خۆیانەوە بەبێ دەسکاریی کەسێ بوون بە سرکە ئیتر پاك دەبنەوەو حەڵاڵ دەبن.

### دروستە بەم حەوت ئاوە شت پاك بکرێتەوە:

١) **ئاوی باران،** چونکە یەزدانی مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ – سورة الأنفال – ١١/٨} . خودا لە ئاسمانەوە بارانی باراندو لافاو هەڵسا، هەتا بەو ئاوە پاکتان بکاتەوە).

٢ ) **ئـاوی دەریـا**، چـونکە لـە بـارەی ئـاوی دەریـاوە لـە پێغەمبـەری خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} پرسـیارکرا: ئایـا بـە ئـاوی دەریـا دەسـنوێژ بگـرین؟ فـەرمووی: (ئـاوی دەریـا هـەم پاکـەو هـەم پاکەوەکەریـشە، مردارەوەبووشی حەلاڵـەو گیانلەبـەری ئـاوی کاتـێ دەمـرێ هـەتا نەگـەنێ خـواردنی دروستە) بوخـاریو موسلیمو تیرمیـزیو ئیبنـو حـەببان ئـەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە.

٣ ) **ئاوی بیر**، بەپێی ئەم فەرموودەیە کە سەهل گێڕاویەتەوە: یاران عـەرزی پێغەمبـەریان کـرد: قوربـان! ئـەو ئـاوەی کـە تـۆ دەسـنوێژی پـێ ئەگری ئەوە لە بیری بوضاعە دەیهێـنن، ئـەو بیـرەش پیـسایی ئـادەمیزادو پـەڕۆی بێنوێـژی ژنـانو شـتی وای تێدەکـەوێو لـە شپیـسیش خـۆی لێدەشۆری، جا لە پاش ئەم روونکردنەوەیە بۆمـان بـەیان بەفـەرموو کـە حوکمی ئەم ئاوە چییە؟ ئـەویش فـەرمووی: (ئـەو ئـاوە هـەم پاکـەو هـەم پاکەوەکەرەیـشە، چـونکە گەیـشتۆتە رادەی قوللـەتێنو بـەپێی شـەرع کـە بناغەی لەسەر ئاسانکارییە، بە هیچ شتێ پیس نابێ، مەگەر بە شتێ کە تـامی، یـا بـۆنی، یـا رەنگـی بگـۆڕێ!). ئەمـە پوختەیریوایەتـەکانی ئـەم فەرموودەیەیە کە لـەم شوێنەدا دانـەر کردوویـەتی بـە بەڵگـە. ئەمـەیش دەقەکەیـەتی لێـرەدا: (المـاء طهـور لا ینجـسه شـیء) تیرمیـذیو ئەحمەد گێڕاویانەتەوە، ئەحمەد بە صەحیحی داناوە.

٤ ) **ئاوی زێو جۆگەو چەم**.

٥ ) **ئاوی بەفر**.

٦ ) **ئاوی تەرزە**.

٧) **ئاوی كانیو كاریز**، ئاوی بەفرو تەرزەیش هەر بە ئاوی پەتی حلێبن، بە پێی ئەم فەرموودەیە، كە ئەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} دەستووری وابوو لە دوای ئەللاهو ئەكبەری نوێژدا بەستن، لە پێش خوێندنی فاتیحادا ئێستێكی بچكۆلانەی دەكرد، گوتم: قوربان! لەم ئیستەدا چی دەخوێنی؟ فەرمووی: (دەڵێم: **اللهمَّ باعد بيني وبين خطاياى كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقني من خطاياى كما ينقى الثوب الابيض من الدنس، اللهم اغسلني من خطاياى بالماء والثلج والبرد**: خودایە! لە گوناه دوورم بخەرەوە وەك دووری خۆرهەڵات لە خۆرئاوا، خودایە! وەك پارچەیێ بلووری سپیی پاكی بێ گەرد لە گوناه پاكم بكەرەوە، خودایە! گوناهەكانم بە ئاوو بە بەفرو بە تەرزە پاك بشۆرەرەوە!) شەیخان - واتە: بوخاریو موسلیم - {رەزاو رەحمەتی خوایان لێبێ} گێڕاویانەتەوە.

## ٢) بەشەكانی ئاو:

**ئاوە شەرعییەكان دەبن بەم پێنج بەشەوە:**

١) **ئاوی رووت**: كە خۆی لە خۆیدا پاكەو لە هەمانكاتدا پاكەوەكەریشەو شتی تری ناپاك پاك دەكاتەوە، بێدەسنوێژیو لەشپیسی لادەبات، شتی پیسبوو پاك دەكاتەوە، بەكارهێنانی هیچ ناپەسەندییەكی تیادا نییە، بۆیە ناونراوە ئاوی رووت، چونكە كە گوترا ئاو، وەقەیدێكی تری لەگەڵ نەبوو، مەبەست ئاوی پەتییەو بەس!.

٢) **ئـاوی خۆرانگـاز:** ئـەمیش خـۆی لـە خویـدا هـەم پاکـەو هـەم پاکەوەکـەرە، دەسـتنوێژی پێـدەگیرێو، لەشپیـسی پـێ دەردەکـرێو، شـتی پیـسبوو پـاك دەکاتـەوە، بـەڵام بـەکار هێنـانی ناپەسـەندە، گوایـە دەڵـێن: دەبێ بە هۆی بەڵەکی، چونکە بیستراوە (ئـەثەر)ێ لـە حـەزرەتی عومـەر {خوای لێ رازی بێ} دەگێڕنـەوە، فەرموویـەتی: (لا تغتـسلوا بالمـاء المـشمس فانه یورث البرص: بە ئاوی خۆرزەدە خۆتان مەشۆرن، چونکە دەبـێ بـە ماکی بەڵەکی!) و ئەم قسەی ئیمامی عومەرە، دارە قوطنی {رەزای خوای لێبێ} بە رشتەیەکی ساخ، واتە : بەسەندێکی صەحیح، گێڕاویەتەوە، شافیعیش {رەزای خـوای لێبـێ} لـەم بارەیـەوە فەرموودەیـەکی بێهێـزی گێڕاوەتـەوە، دارەقوطنی {خوای لێ رازی بێ} ئەو فەرموودەیە ئاوا دەگێڕێتەوە: عائیـشە {رەزای خوای لێبێ} فـەرمووی: جـارێ لەبـەر خـۆر ئـاوم دانـابوو تـا گـەرم ببـێ، لـەو کاتەدا حـەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} هاتەماڵەوە، کـە لـە حاڵەکـە حاڵی بـوو فـەرمووی: (لا تفعلـی یـا حمـیراء فانـە یـورث الـبرص: عائیـشە! شـتی وامەکە، چونکە ئەوە دەبێ بە ماکی بەڵەکی!). بۆیە شـافیعی دەفـەرموێ: (ئـاوی خۆرەنگـازم بـەلاوە ناپەسـەند نییـە، مەگـەر کاتـێ کـە پزیـشك پەسەندی نەکا) (ئەمە: پوختەی گێڕانـەوەکانی ئـەم فەرموودەیەیـە لـەم شوێنەدا کە بە درێژی لە پەراوێزدا باسی لێ کراوە — وەرگێڕ).

**ئەمەیش بەم دوو مەرجە ناپەسەندە:**

**یەکـەم:** گەرمکردنەکـە لـە بـەرخۆر، لـە دفرێکـی وادابـێ کـە ژەنـگ هەڵبهێنـێ، وەك مسو ئاسنو قورقوشم، چونکە ئەمانـە کـە خـۆر کاریـان

تێدەکا بۆ درنیێ دەردەدەن وەك رۆناو سەر ئاوەکە دەکەوێ، دەڵێن: ئەو بەڵخە بۆ دڕناوییە دەبێ بەهۆی بەڵەکی.

**دووەم:** دەبێ خۆرە تاودانەکە لە وڵاتی گەرمیان بی، کە هەتاو زۆر گەرمە.

٣) **ئاوی بەکارهێنراو:** مەبەست ئەو ئاوەیە کە بۆ دەسنوێژ یا بۆ شۆردنی شتیپیس بەکار هێنرابێ، وەلێ رەنگو تامو بۆی نەگۆڕابێ سەنگیشی پتر نەبووبێ. لەبەر ئەم فەرموودەیەی دواوە ئەم جۆرە ئاوە پاکە، خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (**خَلَقَ اللهُ الماءَ طَهُوراً لا يُنَجّسُه شيءٌ الا ماغيّر طعمَهُ أو ريحَهُ**) لە گێڕانەوەیەکی ئیبنو ماجەدا: (أو لونه). ئەم فەرموودەیە بێهێزە، واتاکەی لە پێشەوە رابورد، بەڵام حوکمی ئەم مەسئەلەیە بەیەکگرتنو ئیجماعی زاناکان دامەزراوە. وەك گوتمان ئەم جۆرە ئاوە پاکە بەڵام راجیایی (خیلاف) لەوەدا هەیە: کەئایا پاکەوەکەریشە یانا، مەزهەب (واتە: فەتواپێ دراو) ئەوەیە کە پاکەوەکەر نییە، چونکە هاوڕێیانی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەگەڵ ئەو هەموو بەتەنگەوەبوونەیاندا بۆ کارو باری ئایین، نەدەچوون کۆی بکەنەوەو سەرلەنوێ، دەستنوێژی پێ بگرنەوە، ئەگەر شتی وا رەوا بوایە ئەوان دەیانکرد. گەرچی هەندێ زانایان فەرموویانە: راستیەکەی ئەم جۆرە ئاوە هەم پاکەو هەم پاکەوەکەریشە، مەگەر بەهۆی بەکارهێنانەوە رەنگی یا بۆنی یا تامی بگۆڕێ، بەڵگەشیان ئەمەیە: کە یاران لە ناو خۆیاندا لەسەر قۆزینەوەی ئاوەچۆڕی دەستنوێژی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خەریك بوون بچن بە گژی یەکتردا، ئەو ئاوە

چۆرەیان دەبرد خۆیان پیمووفەرك دەكرد. دیارە خۆپیمووفەرككردن بە شۆردنی ئەندامەكانی دەسنوێژیش دەبێ، هەروەك بەجۆری تریش خۆی پیمووفەرك دەكری، كەواتە ئەم جۆرە ئاوە هەم پاكەو هەم پاكەوەكەریشە، چونكە لە بنەرەتدا وا بووە، بەلگەی زۆریش هەیە لەسەر ئەوە كە هەموو جۆرە ئاوێ پاكەو شت پاك دەكاتەوە، كاریش بە ئەصڵو بنەرەتو بەلگە دەكرێ، تا بەرهەڵستێ سەرهەڵدەدا!.

٤ ) **ئاوی گۆڕاو**: بەهۆی تێكەڵبوونی شتی پاكەوە: ئەگەر گۆڕانەكەی بەهۆی شتێكەوە بێ كە پێویستیی ئاوەكە نەبێ، وە بەهۆی ئەوشتەوە لە ئاوی دەردەچوو، وەپێی نەدەگوترا ئاو، ئەوە خۆی پاكە بەلاّم شت پاك ناكاتەوە.

بەلاّم گۆڕانی ئاو بەهۆی زۆر وەستانەوە، یا بەهۆی شتێكەوە كە پێویستیی ئاوەكەبێ، وەك گڵو قەوزەو قسلو زەرنیقو شتی تری وا، كە لە شوێنی راوەستانی ئاوەكەدا بن، یا لە رێرەوو گوزەرگاكەیدابن، ئەوە گۆڕانی وا زیانی نییە، چونكە لەم دوو حاڵەدا ناوی ئاو هەر ماوە، ئیتر لەبەر ناچاریو بارسووكی بە پاكو پاكەوەكەر دادەنرێ. گۆڕانی لە بەرچاوو گۆڕانی بڕیاردراو (مەعنەوی) هەردوو چونیەكن، كەواتە: ئەگەر گولاوێكی بێبۆن، كە لە ئاوی گوڵ گیرابێ، كە نیشانەكانی تری، جگە لە بۆنەكەی، دەق لە نیشانەكانی ئاو بكات، ئەگەر گولاوێكی ئاوا تێكەڵی ئاوێ بوو، وە بەدیمەن نەیگۆڕی، ئەوا ئێمە وای دادەنێین كە ئەو گولاوەتێكەڵ كراوە ئەگەر بۆنەكەی بمایە هیگۆڕی یا نا، وە بەپێی ئەوە بڕیار دەدەین. ئەوەندە هەیە ئەگەر ئاوێ بەهۆی خوێ كێویلەوە گۆڕا،

پاکەوەکەر نییە، ئەگەر بەهۆی خوێی تەرەوە بوو زیانی نییە، چونکە گشت خوێیەك، جگە لە خوێ کێویلە، لە بنەڕەتدا ئاوە.

٥ ) **ئاوێ پیسی تێکەوتبێ:** ئەمە دەبێ بەم دوو بەشەوە: کەم یا زۆر، مەبەست لە ئاوی کەم ئەوەیە کە لە قوللەتین کەمتربێ، ئەوە بەلێکەوتنی شتی پیسی کارتێکەر پیس دەبێ، بەڵام بە تێکەوتنی پیسییەك کە چاو نەیبینێ‌و بە تێکەوتنی مێش‌و زەردەواڵەو شتی وا کە خوێنی ڕەوانیان نییە پیس نابێ، ئەم بڕیار (حوکم)ەیش لە چەمك‌و مەفهوومی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وەرگێراوە: (اذا بلغ الماء قلتين لم يحمل الخبث: کاتێ ئاو گەیشتە رادەی قوللەتەین ئیتر پیسی هەڵناگرێ). (ئینو حەببان لە صەحییحی خۆیداگێڕاویەتەوە، هەروا ئەحمەدو دارەقوطنی‌و بەیهەقی‌و حاکمیش گێڕاویانەتەوە). چونکە چەمك‌و مەفهوومەکەی ئەوە دەگەیەنی: ئاوی کەمتر لە قوللەتێن پیسی هەڵدەگرێ. ئاوی زۆریش، کە ئەوەیە گەیشتبێ بە قوللەتێن، یا لە قوللەتێن پتر بێ، بەلێکەوتن‌و تێکەوتنی شتی پیس، پیس نابێ، مەگەر بیگۆڕێ، لەبەر ئەم فەرمایشتەی {دروودی خوای لەسەربێ} (خلق الله الماء طهورا...) تا کۆتایی فەرموودەکە، کە کەمێ لەمەوپێش رابورد. قوللەتین واتە: دوو جەررەی گەورە، مەبەست جەڕەی وڵاتی هەجەرە، لەبەر ئەم فەرمایشتەی {دروودی خوای لەسەربێ}: (هەر ئاوێ پڕ دوو جەڕڕەی گەورەبێ لە جەڕەکانی وڵاتی هەجەر ئیتر بە هیچ شتێ پیس نابێ) شافیعی {خوای لێ ڕازی بێ} وای داناوە: کە دوو جەڕە نزیکەی پێنج کوندە ئاو دەگرن، بە ئەندازەو رووبەریش (واتە: بە پێوانەیش) لە شوێنی چوارگۆشەدا، دەبێ کە گەزێك‌و چارەکێ درێژو پان‌و قووڵ بێ،

بە گەزی مرۆی مامناوەندی، لەسەر پەنجەی بەرزەلووتەی دەستیەوە هەتا بنی ئانیشکی (تەماشای کتێبی رەوضە ١٩/١بکە). کۆمەڵێکیش کە یەکێکیان ئیمامی رەویانییە ئەوەیان لەلا پەسەندە: (ئاوی کەمیش وەك ئاوی زۆر وایە: تا نەگۆڕێ پیس نابێ!) ئەم رایە بەپێی بەڵگەو لێوردبوونەوە بەێزە، چونکە مەنطووقی (خلق الله الماء طهورا) ئەوە دەگەیەنێ، وەك زانراویشە دەلالەتی مەنطوق لە دەلالەتی مەفهووم لەپێشترە. گۆڕان بە لێکەوتنی شتی پیس، کەم‌و زۆری چونیەکە، هەروا تامی بگۆڕێ، یا رەنگی، یا بۆنی، یەکسانە، هەروا پیساییەکە تێکەڵی ئاوەکە بێ، یا لە نزیکەوەبێ چونیەکە، یا پێویستی ئاوەکە بێ، یا پێویستی نەبێ فەرقی نیە وەڵێ گۆڕان بەشتی پاك بەپێچەوانەوە بوو، چونکە کارو باری پیسایی زەحمەتە، دەبێ دووربینی‌و (احتیاط) بکرێ، دەی ئەگەر شتێ پیس کەوتە ناو ئاوێ، کە لە نیشانەکانیدا وەك خۆی وابوو، وەك میزێکی بێبۆن‌و رەنگ، ئەوە رێك وەك مەسەلەی گولاوە بێبۆنەکەو ئاوەکە وایە، کە لە پێشەوە رابورد، شتی شل (جگە لە ئاو) زۆربێ یا کەمبێ بە لێکەوتنی پیسی پیس دەبێ، با نەیشگۆڕێ، چونکە ئاگاداریکردنی ئەم وەك ئاو زەحمەت نیە.

## ٣) حوکمی ئاوی بەرماوە:

بەرماوە ئەو ئاوەیە کە لە دەفرەکەدا دەمێنی، لەدوا ئەوە کە گیانلەبەرێ یا ئادەمیزادێ لێی دەخواتەوە، ئەمە چەند جۆرێکی هەیە، وەك:

١) (**بەرماوە**) **پاشماوەی مرۆڤ**، ئەمەیان پاکە، لەبەر فەرمایشتی زاتی مەزن، {وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ – سورة الإسراء – ١٧/٧٠}. واتە: یەزدانی مەزن ڕێزو قەدرێکی زۆری بە نەوەی ئادەم بەخشیوە) جا بەهۆی ئەم حورمەت لێگرتنەوەیە کە مرۆڤ چ موسڵمان بێ، چ ناموسڵمان بێ، لە حاڵی ژیانو مردنیدا بەپاك دادەنرێ. ئەگەر کەسێ ڕەخنە لەم حوکمە بگرێو ئەم ئایەتەی تربکا بەبیانوو کە دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ – سورة التوبه – ٩/٢٨}. واتە: لە ڕاستیدا هاوبەشەپەیداکەرەکان پیسن. ئەوە ئێمە وەڵامی ڕەخنەکەی ئاوا دەدەینەوە دەڵێین: مەبەست پیسیی بیرو باوەڕە، نەوەك پیسی ئەندامو جەستە، چونکە دڵو دەروونیان چەپەڵە، وەلێ جەستەو ئەندامیان پاکە، چونکە لەسەردەمی خۆشەویستدا {درودی خوای لەسەربێ} وەفدەکانیان دەچوونە خزمەتیو تێکەڵی کۆمەڵی موسوڵمانان دەبوونو تەنانەت هامشۆی مزگەوتەکەی پێغەمبەریشیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} فەرمانی نەدەکرد بە شۆردنی شتێ کە لە جەستەی ئەوان بکەوێ.

٢) **پاشماوەی** (**بەرماوە**) **گیاندار**، ئەمەیش هەرپاکە، چونکە گشت گیانداری (سەگو بەرزای لێدەرچێ) لە حاڵی ژیانیدا پاکە، ئیتر گۆشتی بخورێ یا نا، بەپێی ئەم فەرموودەیە کە جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} دەیگێڕێتەوە: (لە پێغەمبەریان پرسی: ئایا بەو ئاوەی کە لەبەر گوێدرێژ دەمێنێتەوە، دەسنوێژ بگرین؟ فەرمووی: بەڵی هەروا بە بەرماوەی هەموو، ئاژەڵو دڕندەیێ دەسنوێژ گرتن دورستە). (شافیعیو دارەقطنیو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە). لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە

دەگێڕنەوە: عومەر لە ناو دەستەیێ سواردا مردەچێ، عەمری کوڕی عاصیان تیادەبێ، لە رێ دەگەنە سەر حەوزێ، عەمر بە خاوەنی حەوزەکە دەفەرموێ: ئەی خاوەنی حەوز! ئایا دڕندەیش دێنە سەر حەوزەکەت بۆ ئاوخواردنەوە؟ عومەر {رەزای خوای لێبێ} گورج دەفەرموێ: (باسی ئەوەمان بۆ مەکە، ئەوەی راست بێ هەم ئێمەو هەم دڕندەو گیانەوەر بە سەرەو بەرو دوا لەم جۆرە ئاوانە لە چۆڵ دەخۆینەوە!). (مالیك گێڕاویەتەوە) لەبە ئەم فەرموودەیەیش: کە بشەی کچی کەعب فەرمووی: ئەبو قەتادەی خەزوورم هاتەوە، ئاوی دەسنوێژم بۆ داکرد، پشیلەیەك هات لێی خواردەوە، ئەبو قەتادەیش دەمی قاپەکەی بۆ لارکردەوە تا پشیلەکە تێر ئاوی خواردەوە، کە دی من سرنجی دەدەم، فەرمووی:برازا! ئەوە بەلاتەوە سەیرە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: (پشیلە پیس نیە، پشیلەیش لەرِیزی کارەکەرو نۆکەرو ئەمانەیە کە بۆ خزمەت بەسەرتانا دەخولێنەوە!). (هەرپێنجیان گێڕاویانەتەوە. بوخاریو موسلمو ئەبو داوودو تیرمیذی نەسائی) بەلام پاشماوەی سەگو بەراز پیسە، دەبێ پارێزیان لێبکرێ، بە پێی ئەم فەرمایشتەی {درودی خوای لەسەربێ}: (کە سەگ دەمی نایە ناو حەجەتتان، حەوت جار بە ئاو گلاوی دەرکەنو پاك بیشۆن، یەکەم جاریان بە خۆڵاو بێ) (ئەحمەدو موسلیم گێڕاویانەتەوە) فەرموودەکە هەرباسی-گلاوی سەگ دەکا، گلاوی بەراز بە قیاس لەسەر ئەو، چونکە بەراز لە شەرعدا حاڵی لە حاڵی سەگ خراپترە، ماوەردی ئەم ئایەتەیش دەکات بە بەڵگە لەسەر گلاویو پیسی بەراز: {أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ – سورة الأنعام – ١٤٥/٦} . واتە: یا گۆشتی بەراز بێ، بەراستی گۆشتی بەراز چەپەڵە) دیارە کەپیسیو چەپەڵی، یەك شتن.

## ٤) پێستی مردار:

پێستو کەوڵی مردارەوەبوو بە دەباخ پاك دەبێتەوە، گیاندارەکە گۆشتی بخورێ یانا، کەوڵەکەی بە خۆشەکردن خاوێن دەبێتەوە. حەدیثەکەی مەیموونە بەڵگەی ئەمەیە، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەلاکی مەڕەکەی دی فڕە درابوو، فەرمووی: (ئەی ئەوە بۆچی کەڵکتان لە کەوڵەکەی وەرنەگرتووە؟) گوتیان: ئاخر مردارەوە بووە، فەرمووی: (با مردارەوە بوویش بێ، کەوڵەکەی بە ئاوو بە گەڵای دڵق (قەرەظ) پاك دەبێتەوە) (ئەبو داوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە، ڕشتەی نەسائی جوانە) لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: (هەموو کەوڵو پێستەیێ بە خۆشەکردن پاك دبێتەوە) (شەیخان گێڕاویانەتەوە).

پێستە خۆشەکردن بەم جۆرە شتانە دەبێ: بەزاخو بە گەڵا (قەرەظ)و بە توێکڵە هەنارو بە مازوو بەخوێو بەشتی تری لەم بابەتە، پێستەی مردار بەم جۆرە دەرمانە دەرو ناوەوەی پاك دەبێتەوە، بەڵام دەبێ خۆشەکردنەکە بە دەرمانێکی وا بێ هەموو گۆشتە زیادەی ئەو پێستەیە بڕزێنێو هەڵی بکەنێو لای بباتو وەهای خۆشە بکا ئەگەر لە ئاوا بخووسێ تێك نەچێو بۆگەن نەکاتەوە، لە پاش خۆشەکردنەکە پێویستە کەوڵەکە پاك بشۆردرێ، ئەگەر بەشتی پیس خۆشە کرابوو، بەڵام قسەی ساختر ئەوەیە: هەر دەبێ بشۆردرێ بابە دەرمانی پاکیش خۆشە کرابێ، وەك جەوتو تاڵ هەنارو مازوو و خوێ.

ئەوەنـدە هەیـە کـە پێـستی سـەگو بـەرازو بەچـکەیانو بەچـکەی دوورەگیـان لـە دەبـاخ نایـێ، چـونکە ئـەم دووە لـە کـاتی ژیانـدا پیـسن، خۆشـەکرن پێـستێ پـاك دەکاتـەوە کـە بـەهۆی مردنـەوە چـەپەڵ بووبـێ، شتێ کە لە ژیانـدا پاکی هـەڵ نـەگرێ دیـارە لـە پـاش مـردن زیـاتر پـاکی هەڵناگرێ.

## ٥) ئێسكو مووی مردار:

مــردار: گیانداریێکــە لــە ژینــدا نــەمابیو بــەپێی شــەرعی خــوا سـەرنەبڕابێ، کەواتـە: گیانـداری گۆشـتی نـەخورێ باسـەریش بـبڕێ هـەر مـرداره، هـەروا گیانــداری کــە چــەقۆی لــە سـەربێو سـەبڕابێ، بــەلام سـەربڕینەکەی لەسـەر دەسـتوورو یاسـای شـەریعەت نـەبێ هـەر مـرداره. مـردار هـەموو بەشـەکانی لەشـی پیـسە، وەك گۆشـتو پێـستو خـوریو مـووی بـەپێی ئایـەتی: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ – سورة المائدة – ٣/٥} . واتە: ئەی موسڵمانینە! مردارەوەبوو لەسەر ئێوە حەرام کـراوە) چونکە حەرامکردنی شتێ کە لەزاتی خۆیدا حـەرام نـەبێو خواردنیـشی زیانی نەبێ نیشانەی ئەوەیـە کـە پیسە، بۆیـە دەڵێن: خـواردنی گۆشـتی مردار زیانی نیە، چونکە ئەگەر زیانی ببوایە بۆ ناچار ڕەوا نـەدەبوو. وە بەپێی ئایـەتی: {إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ – سـورة الأنعـام – ١٤٥/٦} . واتــە: مەگــەر ئــەو قەدەغـەکراوە مـردارەوە بووبـێ، یـاخوێنی ڕژاوبـێ، یـا گۆشـتی بـەرازبێ، چـونکە بەراسـتی ئـەوە چـەپەڵە. چـەپەڵو پیـسیش یـەکن، ڕانـاو لـە

(فانــه)دا دەگەڕێتــەوە بــۆ کۆمەڵــەی ناوبراوەکــان، کــە یــەکێکیان مردارەوەبـووە، وەکـی تـریش ئێـسكو مـوو خـوریو کوڵـكو پـەڕ بـەبێ گومـان دادەنـرێن بـە پارچـەی مردارەوەبـوو، لەبـەر ئـەوە هـەموویان حەرامن. هەیشە دەفەرموێ: موو بە مردنی پیس نابێ چونکە ژیانی تیادا نیە، بە نیشانەی ئەوە کاتێ دەیتاشن گیاندار هەست بە هیچ ناکاو ئێشی پێ ناگا، هەروا ئەم فەرموودەیەیش دەکا بە بەڵگە: •پێستی مردار ئەگەر خۆشەکرا دەستی لێ بدەی قەی ناکا، هەروا دەستدان لە خوریو مووەکەی لە پاش مردنی قەیدی نیە) (دارە قوطنی گێڕاویەتەوە).

هەر پارچەیێ لە زیندوو جیابێتەوە رێك وەك مردووەکەی وایە، ئەگەر مردووی ئەو گیاندارە پاکبێ ئەو پارچەیەش پاکە، وەك پارچەی مرۆڤو ماسیو کوللە، ئەگەر مردووەکەی پیس بێ ئەو پارچەیشە پیسە، وەك پارچە دووگێ لە مەڕێکی زیندوو جیابووبێتەوە، یا وەك ئارەقو مووی ئەو گیاندارانە کە گۆشتیان ناخورێ، بەڵام هەرشتێ کە گۆشتی بخورێ موو خوریو کوڵكو پەڕەکەی پاکە، بەپێی یەکگرتنو ئیجماعی زانایانی ئایین، یەزدان دەفەرموێ: {وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ - سورة النحل - ١٦/٨٠}.

واتە: هەروا خودا بە سروشت خستوویەتە ناو دڵتانەوە کە بۆ سوودو خۆش گوزەرانی خۆتان، لە خوری مەڕو لە کورکی وشترو لە مووی بزن، رایەخو پێخەفو شمەکی ناو ماڵو بەرگو پۆشاك دروست بکەن، کە تا کاتی دیاری کراوی خۆیان دەبن بە مایەی رابواردنی ژیانی جیهان بۆتان). مەبەست لەم قسەیە ئەو تووكو مووەیە کە لەپاش سەربڕین کۆی دەکەنەوە، یا لەکاتی ژیانی ئاژەڵدا وەری دەگرن، وەك واتە: باوە کە

بەزیندوویی هەموو جارێ لەکاتی خۆیدا خوریو مووی ئاژەڵ دەبڕنەوە. وەڵێ ئەگەر لەشتێ لە مانە بە گومان بووین، کە پارچەی ئاژەڵی پاکە یا هی پیسە؟ ئەوە بڕیار دەدەین کە پاکە، چونکە شت لە بەنەڕەتدا پاکە، گومان کردن لە پیسی، شتێکی تازەیەو پەیدابووە، بەپێی بناغە (ئەصڵ) بێ پیسی نەبووە، پاکی هەبووە!.

بەڵام بەهەر حاڵ مووی ئادەمیو پارچەی ئادەمی لە حاڵی ژیانو مردنیدا پاکە، چونکە خوا دەفەرموێ: {وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ} .

## ٦) بەکارهێنانو ڕاگرتنی قاپو قاچاخ:

بەکارهێنانی دەفری زێڕو زیو، لە خواردنو خواردنەوەدا، بۆ پیاوو ژن یاساخە، لەبەر ئەم فەرمایشتەی {دروودی خوای لەسەربێ}: (هەر کەسێ لە حاجەتی زێڕو زیودا شت بخوا پاشت بخواتەوە، ئەوە خۆش خۆش هڵپو هوڕ ئاگری دۆزەخ هەڵ دەڕێژیتە ناو ورگی خۆیەوە!) خودا لە شتی واو لە هەر شتێ کە دەبی بەهۆی شتی وا پەنامان بدا.

هەموو بەکارهێنانێکی تریشیان نادروستەو یاساخە، وەك ئیمامی نەوەوی {ڕەحمەتی خوای لێبێ} لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: (هاوڕێیانی ئێمە، لە زانایانی ڕێبازی ئیمامی شافیعی {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموون: یەکگرتنو ئیجماع هەیە لەسەر قەدەغەکردنی خواردنو خواردنەوەو گشت بەکارهێنانێکی تری حاجەتی زێڕو زیو.. تا ئەوێ کە دەفەرموێ:- بۆ ئەمەیش پیاوو ژن چون یەکن، بەبێ ڕاجیاوییو خیلاف، بەڵام تەنیا بۆژن دروستە کە، هی زێڕ یا هی زیو لە خۆی بدا، بە

مەبەستی خۆرازا ندنەوە بۆ مێردەکەی، یا بۆ ئاغاکەی، ئەگەر کەنیزەك و گورجی بوو). قسەی ئەوەوی لەگەل کەمێ گۆڕانیدا لێرەدا تەواو.

هەروا دروست نیە کە بەم حاجەتانە دووکان و هۆدەو ناومال و دیوەخان و شتی تری وا برازێنرێتەوە. بگرە فەرمایشتی ساخ ئەوەیە کە راگرتنی ئەم دوو جۆرە حاجەتە بەبێ بەکارهێنانیش نادروستە، چونکە شتێ کە بەکارهێنانی دروست نەبێ راگرتنیشی نادروستە، وەك ئامێری گاڵتەو گەپ و کەرەستەی یاری و گەمەی نارەوا، سەرەڕای ئەمەیشە هەرشتێ لە بناخەدا حەرامبێ تەماشاکردنیشی حەرامە. بۆیە دروست نیە بۆ وەستاکە ئەم جۆرە حاجەتانە دروست بکا، وە لەسەر دروستکردنەکەی کرێی ناکەوێ، چونکە کردنی شتی وا تاوانە. هەرکەسێکیش ئەم جۆرە حاجەتە بشکێنی تۆڵەی شکستەکەو فەرقی نرخی ساخ لە چاوشکاودای لەسەر نیە، کە پێی دەگوترێ (ئەرش: بژاردنی شکستیی: زەدە بژێویی) بۆ کەسیش دروست نیە کە داوای بژاردنی ئەوەی لێبکا، یا بچێ لای ستەمکارێ داوای لەسەر تۆمار بکا. حاجەتی تریش ئەگەر بە نیازی جوانی بەزیو پینە کرابوو، بەکارهێنانی و راگرتنی نارەوایە، خوا پینەکە بچووکبێ یا گەورەبێ، بەلام ئەگەر پینەکە بچووکبوو وە بەقەد پێویستبوو ئەوە لەبەر بچووکی نادروست نیەو لەبەر ناچاری ناپەسەندیش نیە، لەم بارەیەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە کە بوخاری لە عاصیمی ئەحوەلەوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: (جامە ئاوە پێخۆرەکەی پێغەمبەرم دی، لەلای ئەنەسی کوڕی مالیك بوو (رەزای خوای لێبێ) قلیشێکی تێبوو بوو، ئەنەس تالێ

سیمی زیوی تێگرتبوو، ئەنەس {ڕەزای خوای لێبێت} دەیفەرموو: بارەها جار بە دەستی خۆم لەم جامەدا خواردنەوەم دەرخواردی پێغەمبەر داوە) وەڵێ بە هیچ ڕەنگێ بەکارهێنانی حاجەتی بە زێڕ پینەکراو دروست نیە!

## ٧) سیواك:

موسڵمان سوننەتە بە پەلکەدار سیواکێ، یا بەهەر شتێکی زبری پاکی تر، جگە لە پەنجەی خۆی، سیواك بکا، دەمو ددانی بە فورچە بشۆرێ، بیهێنێ بە باری پانی ددانەکانیدا، لە دەرو ناوەوە، وە بەباری درێژی زمانیدا، بۆ لابردنی بەڵخ و گۆڕانی تامی دەم، سیواك گشت کاتێ سوننەتە، مەگەر بۆ ڕۆژووەوان، بۆ ئەو لەپاش نیوەڕۆ باش نیەو ناباشە، سەروەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (سیواكو فرچەکردنی دەمو ددان هەم هۆی پاکی دەمو ددانەو هەم هۆی ڕەزامەندیی پەروەردگارە) (ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حەببانو بەیهەقیو نەسائی بە ڕشتەیەکی ساخ - ئیسنادێکی صەحیح - گێڕاویانەتەوە) سیواكو دەم فرچەکردن لەم کاتانەدا گەڵێ پەسەندە:

١) **لەکاتی گۆڕانی تامو بۆنی دەمدا**، وەك بەهۆی بۆنی ناخۆشی سیرو پیازو شتی واوە پەیدا بووبێ.

٢) **لەکاتی هەڵسان لە خەوا**، لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمدا، کە ناودارن بە صەحیحەین، دەفەرموێ: (یاسای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو کە بەشەو هەڵدەسا لەخەو بۆ شەونوێژ سیواکی لە دەمی رادەدا) لە گێڕانەوەیەکدا: (حەزرەت کاتێ لەخەو هەڵدەستا سیواکی دەکرد).

٣) **لەکاتی هەڵسان بۆ نوێژ دابەستن**. چونکە دەفەرموێ {درودی خوای لەسەربێ}: (نەبادا ئازارو زەحمەتی ئۆمەتم بدەم، دەنا فەرمانم پێدەکردن کە بۆ هەموو نوێژێ سیواك بکەن!) (شێخی بوخاریو شێخی موسلیم گێڕاویانەتەوە) عائیشەیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (دوو رکات نوێژ لەگەڵ سیواك کردندا لە حەفتا رکات گەورەترن کە بەبێ سیواککردن بکرێن؟) (ئەبو نەعیم گێڕاویەتیەوە، پیاوانی رشتەکەی جێگەی متمانەن، دارە قوطنیش گێراویەتیەوە، دەیلەمیش لە موسنەدی فیردەوسدا).

٤) **لەکاتی گرتنی دەسنوێژدا**، لەبەر فەرموودەکەی حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ}: کە دەفەرموێ: (نەبادا ئۆمەتم تووشی سەخڵەتیو زەحمەت بکەم، ئەگینا بۆ گرتنی هەموو دەسنوێژێ فەرمانم پێدەکردن بە سیواك کردن) (نەسائیو ئیبنو مەجە گێراویانەتەوە).

٥) **لەکاتی دەسپێکدرنی خوێندنی قورئاندا**. چونکە لە شوێنی سیواك بۆ نوێژ خوێندن سوننەت بێ کە برێتییە لە خوێندنی هەندێ قورئانو خوێندنی ذیکری تر، دیارە کە بۆ قورئانخوێندنی پەتی سوننەت تربێ، گەرچی سیواککردن بە هەموو شتێکی زبری لابەری پاك دەبێ، بەلام بە داری سیواك خێرترە، سیواك سوودی زۆرە: پوك توند دەکاتەوەو ددان ساخلەم دەکاو دەسگای هەرسو هەزم بەهێز دەکاو، گمیزکردن خیرا دەکاو، دەمو ددان پاكو خاوێن دەکاتەوە، دەبێ بەمایەی رەزای خوداو، پیری وا دەخاو چارەی مرۆڤ گەشو نوورانی دەکاو، گەشەو پەرە بەهۆشیاری دەداو، پاداشتی باش دوو چەندان دەکاو، لەکاتی

گیانەڵاندا گیانکێشان ئاسان ەکاو، لەکاتی سەرەمەرگا شایەتمان یادی موسڵمان دەخاتەوە!).

**سوننەتە دامەزراوەکانی سیواك:** ئەمانەن، شۆردنی سیواك‌و فرچەکەیە لە پێش‌و پاشی سیواککردنەکەدا، بەدەستی راستی بیگرێ، بەلای راستی دەمی دەست پێبکا، سیواکەکە بهێنێ بە ئاسمانەی مەلاشویداو بەسەر تەوقە کاکیلەکانیدا، وەدرێژییەکەی یەك بستبێ، هەر کەسێ ددانی نەمابێ بۆی هەیە بە پەنجەی خۆی سیواك بکا، بە پێی فەرموودەکەی عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: (گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! مرۆڤی وا هەیە ددانی نەماوە، ئایا سوننەتە سیواك بکا؟ فەرمووی: بەڵێ، عەرزیمکرد چۆن چۆنی بیکا؟ فەرمووی: پەنجەی خۆی بهێنی بە ناوی دەمیدا) (تەبەرانی گێراویەتەوە).

## ٨) دەسنوێژ:

دەسنوێژ مەرجگەل‌و فەرزگەل‌و سوننەتگەل‌و بەتاڵکەرەوە گەلێ هەی. مەرجەکانی ئەمانەن‌و بەبێ ئەمانە دانامەزرێ: ئیسلامەتی‌و فامین(تەمیز)و پاکێتیی ئاوەکەو، نەبوونی نێوانی لەبەرچاو، وەك پەردە چڵکێکی وا کە نەهێڵێ ئاوەکە بگاتە سەر پێست، هەروەها نەبوونی بەرهەڵستی شەرعی، وەك بێنوێژی‌و زەیستانی، هەروەها داهاتنی کات بۆ کەسی ناچار، وەك ژنی هەمیشە بێنوێژو کەسێ میزو شتی وا رانەگرێ، چونکە خۆپاککردنەوەی ئەم جۆرە کەسانە پێی دەگوترێ: خۆپاککردنەوەی ناچاری، دیارە ناچاریش تا کاتەکەی نەیەت پەیدا نابێ.

فەرزو پێویستییەکانیشی ئەم شەش شتەن: یەکەمیان نیەتهێنانە، بەپێی ئەم فەرمایشتەی سەرەوەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: (هەموو کردەوەیێ بە پێی نیازو نیەتەکەیەتیو هیچ کارێ بەبێ نیازو خواستی دڵ دانامەزرێ) (هەردوو شێخ – واتە: بوخاریو موسلیم – گێڕاویانەتەوە). کاتی نیەتهێنان لەگەڵ دەسپێکردنی شۆرینی یەکەم بەشی روخساردایە، نێتو نیاز ئەوەیە لە دڵیدا نیازی دەسنوێژگرتن بێنێ، بۆ نموونە بە دەمو دڵ بڵێ، یا هەر لە دڵدا بڵێ: نیازم هەیە بێدەسنوێژیی لەسەر خۆم لادەبەم، یا نیەتم هەیە نوێژ لە خۆم حەڵاڵ دەکەم، یا نیەتمە فەرزی دەسنوێژ بەجێ دەهێنم!.

**دووهەمیان:** شۆرینی روخسارە، وەك زاتی مەزن دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ – سورة المائدة – ٦/٥}. واتە: ئەی موسڵمانینە! کاتێ ویستتان راست ببنەوە بۆ بەجێ هێنانی نوێژەکانتان روخسارتان بشۆرن، ئەوجا هەردوو دەستتان لەگەڵ هەر دوو ئانیشکتاندا بشۆرن، وە بەئاوێکی تازە دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتانداو سەتان تەڕکەن، ئەوجا پێکانتان هەتا دەگاتە هەردوو قولاپەکانتان بشۆرن). رووبەری روخسار بە باری درێژیدا، لە جێگەی سەوزبوونی مووی سەرەوە دەست پێدەکا هەتا ئاخری چەناگە، لە باری پانیش ناوەندی هەردوو گوێچکەیە. پێویستە لە کاتێ شۆرینی روخساریدا شۆرینی هەموو بەشەکانی بروٚو برژانگو گێسوو ومێڵو هەموو موویەکی تر، بەڵام مووی روو (عارض)و مووی ریش ئەگەر تەنك بوون پێویستە دەرەوەو ناوەوەیان لەگەڵ پێستەکەدا

بشۆردرێ، ئەگەر پڕ بوون هەر رووی دەرەوەیان پێویستە بشۆردرێ.
مووی تەنك ئەوەیە پێستەکە لە ژێریەوە دیاربێ.

**سێهەمیان:** شۆرینی هەردوو دەستە هەتا سەر هەردوو سەر ئانیشك، بەپێی ئایەتەکەی پێشوو، بەڵگەیەکی تریش هەیە: جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: بە چاوی خۆم پێغەمبەرم دی ئاوی دەسنوێژەکەی دەکرد بەسەر سەر ئانیشکەکانیدا، ئەوجا فەرمووی: (ئەو دەسنوێژەی کە مەرجی دروستبوونی نوێژە لەلای خوا ئەمەیە) (دارە قوطنی و بەیهەقی). ئانیشك ئەو سەرجمگەیەیە کە دەکەوێتە نێوانی قۆڵ و باسکەوە، پێویستە ئاوەکە بگا بە هەموو مووەکەو بە هەموو پێستەکە، تەنانەت ئەگەر لە ژێر نینۆکا چڵك کۆبووبۆوە، نەیدەهێشت ئاوەکە ژێرەکەی تەربکا ئەوە نە دەسنوێژیکەی دادەمەزرێ و نە نوێژەکەی دروستە.

**چوارەمیان:** تەڕکردنی سەر، بە کەم و زۆر دێتەجێ، بەپێی فەرموودەکەی موغیرە {ڕەزای خوای لێبێ}: جارێ پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەسنوێژی گرت دەستی تەڕی هێنا بەسەر مووی پێشەسەریداو بەسەر مێزەرەکەیداو بەسەر هەردوو خوففەکەیدا). (موسلیم) چونکە ئەگەر تەڕکردنی هەموو سەر مەرج بوایە، سەرورمر {درودی خوای لەسەربێ} بە تەڕکردنی مووی پێشەسەری قنیاتی نەدەکرد، وەکی تریش ئەگەر کەسێ بۆ دڵدانەوە دەستی هێنا بەسەر تەوقەسەری هەتیودا بەوەیش دەگوترێ کە دەستی هێناوە بەسەریدا.

**پێنجەمیان:** شۆرینی هەر دوو پێیە، لەگەڵ هەردوو قاپە رەقەڵەکاندا، بەپێی ئایەتی: (وأرجكم الى الكعبين) قاپ یا قاپە رەقەڵە، یا قولەپێ، ئێسقانێکی رەقەڵەی بەرزە بەم دیوو بەو دیوی قاچەوە، لە نێوانی لاقو پێدایە، هەر قاچەی دوو قولەپێی هەیە، لە فەرموودەی ساخدا دەفەرموێ: (ئینجا قاچی راستی هەتا هەردوو قاپەرەقەڵەی شۆرد، ئەوجا بەو چەشنە پێی چەپیشی شۆرد) نوعمانی کوڕی بەشیریش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: (ریزەکانتان راست بکەنەوە) ئیتر ئێمەیش شانمان دەنووسان بە شانی یەکترییەوەو قولەپێشمان دەلکان بە قولەپێی یەکترییەوە) (بوخاری).

دەی ئەم فەرموودەیەی نوعمان بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەموو پێیەك دوو قاپە رەقەڵەی هەیە.

**شەشەمیان:** ریزلێگرتنە (تەرتیب) واتە: بەجێهێنانی شۆردنی ئەندامەکان لەسەر ئەم ریزەی باسکرا: روخسار، دەست، سەر، قاچ. پێویستبوونی رێزلێگرتن یا لە ئایەتەکەوە وەردەگیرێ، لەسەر رای ئەو زانایانەی کە دەفەرموون: واوی عەطف بۆ رێزلێگرتنە، یا لە کردارو گفتاری حەزرەت خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} چونکە شتی وا لە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەگێردراوەتەوە کە ئەم ریزەی پێش‌و پاش کردبێ، بەڵکوو جارێ حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لەسەر ئەم شێوەیە ریزی لە شۆردنی ئەندامەکانی دەسنوێژ گرت‌و فەرمووی: (ئەو دەسنوێژەی کە مەرجی دروستبوونی نوێژە لای خوا ئەمەیە) (بوخاری). لە

فەرموودەیەکی تریشدا دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: (ئەوە پێش بخەن کە خوا پێشی خستووە) (نەسائی بە رشتەیەکی ساخ گێڕاویەتەوە) دیسان لەبەر ئەوەیش کە خودای گەورە - سەر کە ئەندامێکە لە دەسنوێژدا تەڕ دەکرێ نەك دەشۆردرێ – داینـاوە لـە نێـوانی ئـەو ئەندامانـەی کـە دەشۆرێن، وە بـەم کـارە ریـزی ئەندامـە هاوچەشـنەکانی پـچڕاندووە، عـەرەبیش کـە قورئانەکـە بـە زمـانی ئەوانـە، ئیـشی وا ناکـەن ئەگـەر قازانجێکی نەبێ،

ئـەو قازانجـەش لێـرەدا پێویـستبوونی ریزلێگرتنـە، هـەروا لەبـەر ئەوەیش کـە مەبەسـت لـەم ئایەتـە روونکردنـەوەی چۆنێتی دەسـنوێژی پێویستە.

## ٩) سوننەتەکانی دسنوێژ:

**١) سوننەتە بـۆ دەسـنوێژ گـر لـە سـەرەتاوە نـاوی خـودا بهێنـێ،** بەیهـەقی بەرشـتەیەکی چـاك (اسـناد جیـد) گێڕاویەتـەوە: کـە حـەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەستی نایە ناو حاجەتەکەوە (ئەوجا پەیتا پەیتا ئاو لە نێوانی پەنجەکانیاوە هەڵدەقوڵا) ئینجا بە هاوڕێیانی خۆی فـەرموو: (بـە پیرۆزیی ناوی خودا دەست بکەن بە دەسنوێژ گرتن لێـی) لـە فـەرموودەی ساخدا دەفەرموێ: (هەر کارێکی بایەخدار بیسمیلای لێنـەکرێ گولەکەو بێفەڕە!) واتـە: ناتەواوو بێپیتـە.

**٢) سـوننەتە بەروپـشتی هـەردوو دەسـتی،** بـەر لـە کردنیـان بـەناو ئاوەکەدا بشۆرێ، چونکە چۆنێتیی دەسنوێژی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}

ئاوا باس کراوە، لەبەر ئەم فەرموودەی ئەوسی کوڕی ئەوسیش کە دەفەرمویٚ: (سەرنجم داوە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەسنوێژی دەگرت لە پێشدا سێجار هەر دوو دەستی خۆی تامووچەکانی دەشۆرد) (ئەحمەد) لە صەحیحەینیشدا هەب: (حومرانی نۆکەری عوسمان فەرمووی: عوسمان داوای ئاوی کردو لەسەر ئەم شێوەیە دەسنوێژی گرت: لە پێشا سێ جار هەردوو لەپی شۆرد) وێنەی ئەم شێوەیە لە کۆمەڵێ لەیارانەوە چەسپاوە.

**٣ ) ئاو لەدەم رادان.**

**٤ ) ئاو لە لووت رادان و هەنگکردن**، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} وای دەکرد، دەیش فەرمویٚ: (ئەم دەشتە لە سوننەتن) (موسلیم) جا لەناو ریزی ئەو دەیەدا ئەم دووەی ژمارد: ئاو لە دەم رادان و ئاو لە لووت رادان. مەرجە بۆ هاتنەدی ئەم دوو سوننەتە ئاو لەدەم رادان پێش بخریٚ، هەروەك سوونەتە زیادەڕەوی کرن لەم دوو سوننەتەدا، مەگەر بۆ کەسیٚ کە بەرۆژووبیٚ، بۆ ئەو ناپەسەندە.

**٥ ) دەستهێنان بە هەموو سەردا**، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وایکردووە، لەبەر ئەوەیش هەتا لە مەترسی راجیایی (خروج لە خیلاف) دەرباز ببین، چونکە هەندیٚ زانا دەڵێن: دەستهێنان بەسەر هەموو سەردا فەرزە، ئەمەیش مەترسی ئەوەی هەیە ئەگەر ئەم رایە راست بیٚ دەسنوێژی سەرپێچیکەر (مخالف) بەتاڵ بیٚ.

**٦ ) دەستی تەڕ هێنان بە هەردوو گوێچکەدا**، بە ئاوێکی تازە، لەپاش مەسحی سەری، بە دیوی دەرەوەو ناوەوەیاندا، عەبدوڵڵای کوڕی

زەید دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینی دەسنوێژی دەگرت، بە ئاوێکی تازە لە پاش تەڕکردنی سەری، دەستی تەڕی هێنا بە هەردوو گوێی خۆیدا) (حاکم، بەیهەقی) بەیهەقی بە ڕەشتەیەکی ساخ گێڕاویەتەوە، چۆنێتیی ئەم تەڕکردنە ئاوایە: هەردوو پەنجەی شایەتمانی بخاتە هەردوو کونە گوێی و بەناو چرچ و لۆچەکاندا سووڕیان پێ بدا، هەردوو پەنجە کەڵەیشی لە هەمانکاتدا بەسەر دەرەوەی گوێکانیدا بهێنێ.

٧) **ئاژنینەوەی ریشی پڕ**، سوننەتە پەنجە بخاتە نێوانی مووی ریشەوە، ریشی پڕ ئەوەیە لە ژێریەوە پێستەکە دیار نەبێ، ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەستووری وابوو کاتێ دەسنوێژی دەگرت بە پەنجەکانی دەستی دەخستە ریشی) (ئیبنو ماجە) هەروا دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە دەسنوێژدا دەستی دەخستە ریشی، بوخاری دەفەرموێ: ئەمە ساخترین بەڵگەی ئەم مەسەلەیە. فەرموودەیەکی تری ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} کاتێ دەسنوێژی دەگرت لەژێر ریشیەوە بە پەنجەکانی دەستی دەخستە مووی ریشی!) (ئیبنو ماجە).

٨) **ئاژنینەوەی نێوانی پەنجاکانی هەردوو دەست و هەردوو پێ**، بەپێی ئەم فەرموودەیەی ئیبنو عەبباس: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: (کە دەسنوێژ دەگری دەست بخەرە ناو پەنجەی دەست و پێت) (ئیبنو ماجە، تیرمیذی) دەس خستنە ناو چەنجەی پێ ئاوا باشە: بەپەنجە تووتەی دەستی چەپی لە ژێرپێیەوە، لە پەنجە تووتەی قاچی راستییەوە دەست پێبکاو بەریز پیایاندا بڕوا هەتا لە پەنجە تووتەی

قاچی چییەوە دەردەچێ، ئاژنینەوەی پەنجەکانی دەستیش بەوە دەبێ کە بەناویەکا تێکیان پەڕێنێو بییانجوڵێنێ.

٩) **پێخشتنی لای ڕاست لە سەر لای چەپ**، لە هەموو شۆردنو کردەوەی دەسنوێژدا لای ڕاست بخاتە پێشی لای چەپەوە، بەپێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ} (کاتێ دەسنوێژ دەگرن بە ئەندامە ڕاستەکانتان دەست پێ بکەن) (ئەبو داوود، ئیبنو ماجە، ئیبنو خوزەیمە، ئیبنو حەببان) ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حەبان بە فەرموودەیەکی ساخیان داناوە. عائیشەیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە کردنی ئەم شتانەدا حەزی لەوە بوو کە لای ڕاستی پێش بخات: لە پێڵاو لەپێکردنو لە قژ شانەکردنو لە دەسنوێژ گرتنداو لە هەموو کارێکی گرنگیدا) (پەسەندی هەردوو لایە - بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە).

١٠) **سوننەتە سێ جار کرنەوەی شۆردنو تەڕکردنی ئەندامەکانی دەسنوێژ**، بەپێی فەرموودەکەی عوسمان {ڕەزای خوای لێبێ}: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەسنوێژی گرتو هەموو ئەندامەکانی دەسنوێژی سێ جار سی جار شۆرد) (موسلم) لە گێڕانەوەیەکی ئەبو داوود لە عوسمانەوە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سێ جار دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، لە گێڕانەوەیەکی ئیبنو ماجەدا: دەڵێ: عەلی {ڕەزای خوای لێبێ} دەسنوێژی گرت، سێ جار سێ جار، ئەندامەکانی دەسنوێژی شۆرد، وە فەرمووی: دەسنوێژی پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} ئاوابوو.

١١) **سوننەتە شۆردنەکە بەرو دوابێ**، پێش ئەوەی ئەندامی پێشوو وشك ببێتەوە دەست بکا بەئەندامی دوا ئەو، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای

لەسەربێ} وایکردووە، هەتا لە مەترسی راجیاییش دەربازبین. سوننەتە لەپاش لێبوونەوە دەستەکانی رانەوەشێنێ، بە پێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ}: (کاتێ لە دەسنوێژبوونەوە دەستتان رامەوەشێنن، چونکە شتی وا دەبێ بە باوەشێنی شەیتان) (ئیبنو ئەبی حاتەمو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە) لەبەر ئەوەیش کاری وا بۆنی بێزابوونی لە خواپەرستی لێ دێ، سوننەتە لە پاش بیسمیلاکردن ئەمەیش پتربکا: (اللهم اغفر لی ذنبی ووسع لی في داري وبارك لی في رزقی: خودایە! لە گوناهم خۆشبەو گوشادی بخەرە ماڵمو پیتو فەڕ بخەرە رۆزیم) (تیرمیذی لە ئەبو هورەیرەوە). سوننەتە کە ئەنگوستیلەیش لە شوێنی خۆی بلەقێنێ، ئەگەر ژێرەکەی تەڕ دەبوو، دەنا دەبێ دایکەنێو لەقاندن بەسنیە سوننەتە بە شۆردنی لای سەرووی دەست پێبکا، و لە پێشە سەریەوە دەست بکا بە تەڕکردنی سەری، وە بەنووکی پەنجەی دەستو پێی، دەست پێ بکات، ئەگەر خۆی ئاوی دادەکرد بۆ خۆی، بەلام ئەگەر کەسێکی تر ئاوی دەکرد بە دەستیدا لە ئانیشکەکانیەوە دەست پێبکا، وە ئاوی دەسنوێژەکەی لەو (مودد)ێ کەمتر نەبێ، وە لە ئاو بەکارهێناندا دەسبلاوی نەکا، وە لە سێ جا رتێ نەپەڕێ، وە لەکاتی دەسنوێژگرتندا قسە نەکا، وە ئاوەکە شڵپ نەکێشێ بە روویدا، بەڵکوو بەشێنەیی، لەپاش تەواو بوونی کردارەکانی دەسنوێژەکە روو بکاتە قیبلەو هەردوو دەستی بەرزەوە بکاو بڵێ، (اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله، اللهم اجعلنی من التوابين واجعلنی من المتطهرين، سبحانك اللهم وبحمدك، اشهد أن لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك) وە هەر لەحاڵی بەرەو

قیبلـەدا سـوورەتی (انـا أنزلنـا) بخوێنـێ بـەڵام لـەم کاتـەدا دەسـتی بەرزنەکاتـەوە. موسـلیم {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتـەوە: هـەر کەسـێ لـەپاش دەسـنوێژگرتن بڵـێ: (أشـهد أن لا الـه الا الله وحـده لا شـريك لـه، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله) هەر هەشت دەرگاکـانی بەهەشـتی بـۆ دەکرێتـەوە، بـە کـەیفی خـۆی لـە کامیانـەوە حـەزبکا دەچێتە ژوورەوە) تیرمیذی لەم نزایـە ئەمـەی پـتر کـردووە: (اللـهم اجعلنـی مـن التـوابين واجعلنـي مـن المتطهـرين) حـاکمیش {رەزای خوای لێبێ} ئەمـەی لـێ پـتر کـردووە: (سـبحانك اللـهم وبحمـدك اشـهد أن لا الـه انـت أسـتغفرك وأتوب اليك).

سـوننەتە بـەبێ بەهانـەی رەوا یارمـەتی لـە کـەس وەرنـەگری لـە دەسنوێژگرتندا، وە بەبێ بەهانە خۆی وشـك نەکاتـەوە. واتـە: بـە خـاولی ئەندامـەکانی دەسـنوێژ نەسـڕێ بـا لەسـەر خـۆ وشـك ببنـەوە سـوونەتە لەپاش کاتی دەسنوێژی تازەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی دیاری دسـنوێژ بکا، پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (هەر موسڵمانێ دەسنوێژێ بە جوانی بگرێ، وە دوو رکات سـوننەتی پێوە بکا، بـە باشـی دڵیـان بـداتێو بـیری لـە لایـان بـێ، مـسۆگەر کـە بەهەشـت بـۆ خـۆی مـسۆگەر دەکـا) (موسلیم). بزانن: ئەگەر لەناو دسنوێژەکەیدا گومـانی بـۆ پەیـدا بـوو کـە فەرزێ لە فەرزەکانی دەسـنوێژی فـەرامۆش کـردووە، ئـەوە پێویـستە ئـەو فەرزە بکاتەوە، وەهەر چیش فەرز نەکراوەوە دووبارەی بکاتـەوە، چـونکە بناغەی کار لە شەریعەتدا لـە سـەر نـەبوونی شـتە، عـەدەم ئەصـڵە، کـارو فیعل عاریضە، بەڵام هـەر گومـانێ لـە پـاش تـەواکردنی دەسـنوێژەکە کـە بـوو، لەبـەر فەرمایشتی بایەخـدار کـاری پـێ نـاکرێ، چـونکە گومـانی وا

زۆره، کارپێکردنی دیزواره، له رواڵەتیشدا وا دەردەکەوێ کە دەسنوێژ به تەواوی گیرابێ! بەڵام گومان له نێتدا له پاش تەواو بوونی دەسنوێژیش گەرەکە بۆی بگەڕێتەوە، سەر لەنوێ دەسنوێژەکەی بگرێتەوە.

## ١٠) تاراتگرتن: استنجاء: خۆ پاككردنەوە:

پێناسەکەی له شەرعا: (لابردنی پیسی سەر هەردوو رایە، کە پیشیان دەگوترێ: پاش‌و پێش، بە ئاو، یا بە بەرد، یا بە هەردوکیان) حوکمەکەی فەرزە، بەپێی فەرمایشتەکەی {درودی خوای لەسەربێ}: (کاتێ یەکێکتان دەچێ بۆ سەراو باسێ بەرد لەگەڵ خۆی ببا، خۆی پێیان پاك بکاتەوە، ئیتر ئەوە برێتی تاراتگرتن دەکەوێ) (ئەبو داوودو دارە قوطنی‌و ئیبنو ماجە بە رشتەیەکی جوانی ساخ گێڕاویانەتەوە) ئەنەسیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: (منو کورێکی له سێرەی مندا کە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەچوو بۆ سەراو جەوەندەیێ ئاومان بۆی دەبرد، بەو ئاوە تاراتی دەگرت، وەنەقیزەیەکیشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دایدەچەقاندو دەیکرد بە بەردەم (بەربەست - سوترە) له کاتی نوێژدا). وا باشترە کە خۆی بە بەردو بەئاو پاك بکاتەوە، چونکە خەڵکی قوبابە هەردووکیان تاراتیان دەگرت، خودا لەبەر ئەوە ستایشیکردن‌و فەرمووی: {فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ - سورة التوبة - ١٠٨/٩}. واتە: ئەم مزگەوتەی قوبا کۆمەڵێ پیاوی موسڵمانی ساغی پاك‌و تەمیزی تیایە، حەز بەپاکی دڵ‌و دەروون‌و لەش‌و جل‌و شوێن دەکەن، لەبێ دەسنوێژی‌و

لەشپیسی دوورن، بەسە بۆ سەربەرزی ئەوان کە خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە حزیان لە پاکیو خاوێنییەو خۆیان پاكو خاوێن رادەگرن) چونکە ئەوە بوو کاتێ ئەم ئایەتە هات پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە هۆی ئەم ستایشەی، لێیانی پرسی، عەرزیان کرد: لە پێشدا خۆمان بە بەرد پاك دەکەینەوە ئەوجا بە ئاویش تاراتدەگرین) بەززار بە رشتەیەکی بێهێز (ضعیف) گێڕاویەتەوە، بەڵام نەوەوی بە راستی نازانێو دەفەرموێ: زانایانی شەرع ئاوا دەیگێڕنەوە، کەچی لە کتێبەکانی حەدیسدا شتی وانییە، بەڵکوو ئەمەیان تیایدایە: (بەئاو خۆمان پاك دەکردەوە) (ئەحمەد، ئیبنو خوزەیمە) وا باشە لە پاساودانی باشترینیدا بگوترێ: (زاتی پیساییەکە بە بەردەکە لا دەچێ، ئەسەرەکەشی بە ئاوەکە لادەچی، ئیتر دەست چەپەڵاوی نابێ). ئەگەر تاراتگر ویستی هەر بە یەکێکیان پاك بکاتەوە، باخۆی بەئاو پاك بکاتەوە باشترە، چونکە ئەو هەم پیساییەکە لادەبا، هەم خۆی ئەسەرەکەی لادەبا، بەڵام بەردەکە هەر خودی پیساییەکە لادەبا، ئەگەر تاراتگرتن بە بەردبوو پێویستە بەسێ بەردبێ، ئەگەر بەسی بەرد پاك نەبۆوە پێویستە بەزیاتر خۆی پاك بکاتەوە، مەرج بوونی سێبەرد بەپێی فەرموودەکەی پێشووە: (کاتێ یەکێکتان دەچی بۆ سەراو با سێ بەرد لەگەڵ خۆی ببا) خۆپاککردنەوە هەر مەرج نیە بە بەرد بی، بەڵکوو بە هەرشتێ کە پاكو وشك بێو پیسی هەڵبکەنێو رێزی نەبێ دەبێ بەڵام بە بەردی تەڕو شتی پیسو شتی ساف (وەك قامیشو شووشە) نابێ. ئیبنو مەسعود {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمێ: جارێ حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} رۆیشت بۆ سەراو، بەمنی فەرموو کە سێ بەردی بۆ ببەم، منیش دوو بەردم دەست کەوت، هەر

چەند گەڕام بۆ بەردی سێهەم دەستم نەکەوت، لەبەر ئەوە دوو بەردو تەپاڵەیەکم بۆی برد، دوو تەپاڵەکەی فڕێداو فەرمووی: (تەپاڵە چەپەڵە!) (بوخاری) بۆیە بەشتی ڕێزداریش نابێ، وەکوو کولێرەو هەموو خواردەمەنییەکی تری ئادەمیزاد، یا خواردەمەنی جنۆکە وەك ئیسقان، لەبەر ئەم فەرموودەی مسلیم: (حەزروت {دروودی خوای لەسەربێ} ڕێگەی نەدەدا تارات بە ئێسك بگیرێ، دەیفەرموو: چونکە ئێسك خۆراکی برا جنۆکەکانی ئێوەیە!).

مەرجی بە کارهێنانی بەردو وێنەی بەرد ئەمەیە: شوێنەپیسەکە وشك نەبوبێتەوەو پیسییەکەیش لە جێگەی ئاسایی خۆی لای نەدابێ‌و شتی بێگانەی تری نەهاتبێتە سەر، دەنا دەبێ تاراتەکە بەس بە ئاوبێ، یا بە بەردو بە ئاوبێ، بەردی تەنیا بەس نیە).

## ١١) دەستووری سەراوکردن:

**١) نادروستە بۆ سەراوکەر لە چۆڵەوانی، ئەگەر پەنایێ نەبوو،** ڕووکردن‌و پشتکردن لە ڕووگە، بەپێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ} (کە دەچنە سەر پێشاو، بۆ پیسایی یان بۆ گمێز، نە ڕووبکەنە ڕووگە (قیبلە)و نە پشتی تێبکەن، بەڵام ڕووبکەنە ئەم لاو لا) (شەیخان) هۆی ئەم نادروستیە ئەمەیە: بەری ڕووگە شکۆمەندە، دەبێ شکۆمەندییەکەی بپارێزرێ، بەپێی فەرموودەکەی سوراقەی کوڕی مالیك {ڕەزای خوای لێبێ} دەیگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: بە گوێچکەی خۆم لە زاری پیرۆزی سەروەرم ژنەوت دەیفەرموو {دروودی خوای لەسەربێ}: (کاتێ کەسێکتان دەچێ بۆ سەراو

بارێزی قیبلەی خوای گەورەو مەزن بگریٚ، با روونەکاتە رووگە. بەلاّم ئەوەوی دەفەرمویٚ: ئەگەر لەبەر دەمیەوە داپۆشەریٚ (ساتریٚ) هەبوو، دوو سێیەکی گەزیٚ بەرز بوو، خۆشی بەقەد سیٚ گەز یا کەمتر لێیەوە نزیك بوو، ئەوە رووکردن تێی دروستە، ئیتر چ لەناو سارادا بیٚ، چ لەناو خانوودا بیٚ، رووکردنو پشت کردنە رووگە لەناومالّدا بۆیە حەرام نیە لەبەر ئەم فەرموودەیەی ئیبنو عومەر: فەرمووی: ئیشم هەبوو چوومە سەر سەربانەکەی حەفصەی خوشکم کە ژنی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بوو، پێغەمبەرم دی خەریك بوو روو بە شام دەستی بە ئاو دەگەیاندو پشتی کردبووە رووگە. (کۆمەڵەکە گێڕاویانەتەوە – بوخاری، موسلیم، ئەبو داودد، تیرمیذی، نەسائی) شافعیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمویٚ: رووکردنو پشتکردن لە رووگە لەدەشت نادروسە نەك لەناو مالّدا. مەروانول ئەصفەریش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمویٚ: ئیبنو عومەرم بینی حوشترەکەی لە بەردەمیەوە لە رووی قیبلەوە یەخ دابوو، ئەوجا بەرەو وشترەکە گمیزی دەکرد، عەرزیم کرد: ئەی باوکی ئەورەحمان! خۆشتی وا نەیی لێکراوە؟ چۆن تۆ دەیکەی؟ فەرمووی: شتی وا لە بۆشاییدا، لە شوێنی بەربەرەلاّدا نەیی لێکراوە، بەلاّم ئەگەر لە نێوانی تۆو نێوانی رووگەدا شتیٚ هەبیٚ کە پەردەت بۆ بکا ئەوا قەیناکا) ئەبو داوودو حاکم گێڕاویانەتەوە.

٢ ) **پارێز بکا لە گمێزکردن لە ناو ئاوی راوەستاودا.** پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: (کەستان قەت گمیز مەکەنە ئاوی راوەستاوەوە) جابیریش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمویٚ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی دەکرد کە لەناو ئاوی راوەستاودا گمێز بکریٚ) (موسلیم،

نەسائی) ئەم نەیی لێکردنەیش ئاوی کەمو زۆری دەگرێتەوە، چونکە شتی وا مایەی چەپەڵییە، بەلام بەرگیرییەکە چونکە بەرگری = دفاع بەلام (بەرگیری = منع) لە کەما توندترە، وە لە شەویشدا توندترە لە رۆژ، چونکە دەڵێن: ئاو لە شەودا ئارامگای جنۆکەیە، جا دوور نیە کە بەهۆی ئەوەوە جنۆکە تووشی زیانێکی بکەن، ئاوی رەوانیش ئەگەر کەم بێ میزتێکردنی نادروستە، چونکە لەکاری دەخا، نە بەکەڵکی خۆی دەمێنێ، نە بەکەڵکی کەسێکی ار دەیّ، ئەگەر زۆریش بێ ئەوە ناپەسەندە، واتە: مەکرووهە، ئاوی راوەستاویش کەمو زۆری ئەم دووبڕیارەی بۆ هەیە، کەم بێ نادروستە زۆر بێ (واتە: قوڵلەتێن بێ) ناپەسەنە. بەهەر حاڵ سەراوکردن لە ئاوی راوەستاودا زۆر خراپە.

٣) **سەراونەکا لە ژێرداری بەریدا**، لە کاتی بەردا، یا لەهەر کاتێکی.تردا، پیساییکردن ناپەسەندترە، چونکە بەرەکەی پیس دەکاو قێزەوون دەبێ.

٤) **سەراو نەکا لەسەر ریگایێ کە هاتوو چۆی تیابکرێ**، سەراوی گەورە خراپترە، جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خۆتان بپارێزن لەو دوو شتە ناشرینە کە دەبن بە هۆی ئەوە خەڵکی نەفرەتتان لێبکەنو لەعنەتتان بۆ بنێرن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو دوو شتەیە چین؟ فەرمووی: سەراوکردن لەسەرەرێدا، یا لە سێبەری جێگەدانیشتندا.

٥) **سەراو نەکاتە ناو کونی زەوییەوە**، مەبەست کونی دەم خڕوپانە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە فەرموودەیێکا، کە

نەسائیو ئەبو داوود گێڕاویانەتەوەو حاکم فەرموویەتی: فەرموودەیەکی ساخە چونکە بەپێی مەرجەکانی صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمە، پێشگیریی کردووە لەوە کە: (میز بکرێتە کونەوە). لەبەر ئەوە کە جێگەو شوێنی جنۆکەیە.

٦ ) **لە سێبەری دانیشتنی مەردوومدا**، وەك سێبەری درەختو شتی وا سەراو نەکا. سەراوی گەورە خراپترە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرموویەتی: خۆتان لەم سێ ئیشە بپارێزن کە دەبن بەهۆی نەفرین لێکردنتان: سەراوکردن لە گۆڕگاکاندا یا لەسەر چەقی ڕێگەوباندا، یا لە سێبەری حەوانەوەدا، وەك سێبەری درەختو شتی وا. (ئەبو داوود) جێگەی گۆڵو کانیکردنو ڕێگەی کانیو بوارو دەوروبەرو قەراخی ئاوی لێخواردنەوەو بەربەڕۆچکەی زستانیش لەم بڕیارەدا وەك سێبەر وایە. میزکردن لەسەر گۆڕ نادروستە، هەروا لەناو ماڵی مزگەوتدا، با بیکاتە دەفەرموێ: فریشتەوەو دوایی لە دەرەوەی مزگەوت بیرێژێ هەر حەرامە!.

٧ ) **لە کاتی دەست بەئاو گەیاندنا قسەنەکا**، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (نابێ دوو کەس بەیەکەوە بچن بۆ سەراوو شەرمیان هەڵماڵن دەست بکەن بە قسەکردن، چونکە خودای گەورەو مەزن زۆر ڕقی لە شتی وا دەبێتەوە) (ئەبو داوود) بۆیە خوا زۆر ڕقی لە شتی وایە لەبەر هەڵماڵینی شەرمگا، دەنا قسەکردن لەم کاتەدا دروستە بەڵام ناپەسەندە، دەق وەك ژن تەڵاقدان خۆی ڕەوایە کەچی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە بارەیەوە دەفەرموێ: (دزێوترین حەڵاڵ لەلای خودای گەورەو سەروەر ژن تەڵاقدانە) ئەمانەیش حوکمی قسەکردنیان هەیە:

وەڵامدانەوەی سڵاوو نزاکردن بۆ پژمیوو سوپاسکردنی پژمیو، ئەگەر لەسەر پێشاو پژمی با لە دڵەوە سوپاسی خوا بکا، موحیبی طه بەری دەفەرموێ: (گەرەکە لەوکاتەدا نەبخواو نەبخواتەوەو نە تەماشای دەردراوەکە بکاو نە سەیری شەرمگای خۆی بکاو نە سەیری ئاسمان بکاو نە بەدەستی یاری بکاو نە زۆریش لە ئاودەستا بمێنێتەوە، ناپەسەندە هەڵگرتنی شتێ کە ناوی خوای لێنووسرابێ،وەك ئەنگوستیلەو پارەو درەم، هەروا شتێ قورئانی لێنووسرابێ، لە بۆ شکۆمەندیی، ناوی پێغەمبەریش لەم مەسەلەیەدا وەك ناوی خوا وایە)، لە حەدیسا دەفەرموێ: (پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەرۆیشتە ناو ئاو دستەوە ئەنگوستیلەکەی دادەکەندو لە شوێنێکا دایدەنا، ئەوجا دەرۆیشتە ناوی، چونکە مۆری (محمد رسول الله)ی لێهەڵکەندرابوو) (تیرمیذی) گێڕویەتەوەو فەرموویەتی: فەرموودەیەکی جوانی ساخە (حدیث حسن صحیح) حەرامە سیپارە (موصحەف) ببرێتە ناو ئاودەستەوە، مەگەر بترسێ کە بیدزن، یا بکەوێتە دەستی بێبڕوا، لەکاتی وادا ناچارییە دروستە، بە هەرحاڵ پێویستە بەپێی توانا پاك رابگیرێو لە بێرێزی بپارێزرێ.

**بزانن:** کە هەموو ناوێکی شکۆمەند لەم حکومەدا وەك ناوی خواو پێغەمبەر وایە، کەواتە ئەمە ناوی گشت پێغەمبەرەکان دەگرێتەوە {دروودی خوایان لەسەربێ}.

٨) **نابێ رووبکاتە خۆرو مانگ،** یا پشتیان تێبکا، چونکە ئەم دووشتە دوو نیشانەی گەورەی ئاشکران لەسەر گەورەیی خوای مەزن.

٩) بەرەو رووی بـا، بامیزنـەکا، لەوکاتـەدا قورسـایی لەشـی بخاتـە سەر قاچی چەپی، کە دەچێتە ناو ئاودەستەوە قاچـی چـەپی پـێش بخـاو بڵێ: (باسم الله اللهم انی أعوذ بك من الخبث والخبائث: بـە پـیرۆزی ناوی خوا خۆم دەپارێزم لە شەیتان، ئـەی خودایـە! پـەنا دەگـرم بـەتۆ لـە گۆڵو دێڵـی شـەیتان) کـاتێکیش دەردەچێ قاچـی چـەپی پێـشبخاو بڵـێ: (غفرانك الحمد لله الذی أذهب عنـی الاذی وعافـاني: خودایـە! داوای لێبوردنت لێدەکەم کە ئەم ماوەیە لە یادی تۆ دوورکەوتمەوە، سوپاس بـۆ ئەو خودایـەی کـە ئـەم ئازارەی لـە کـۆڵ جـستمەوەو ساخڵەمی کـردووم) چونکە حە دیث دەفـەرموێ پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} کـە لـە ئـاودەس دەردەچـوو دەیفـەرموو: (غفرانـك) (هـەر پێـنج فەرموودەزانەکـە گێڕاویانەتـەوە) لەچـەند رێگـەی بێهێزیـشەوە دەگێڕنـەوە کـە پێغەمبـەر فەرموویـەتی: (الحمـد لله الـذی أذهـب عنـی الاذی وعافـانی). شـتی واش با بێهێزیش بێت بەڵام لـە عیبادەتـدا کـاری پێـدەکرێ. وا پەسـەندە کـە لەخـەڵك دووربکەوێتـەوەو شـوێنێکی فـشەڵی لـەبار بـۆ مێزکـردن هەڵبـژێرێ، نـەبادا پرۆژەکـەی بگەڕێتـەوە بـۆ خـۆی، بـەپێی ئـەم فەرموودەیـەی ئـەبو مووسـا {رەزای خوای لێبێ}: (جـارێ پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} چـووە پـەنا دیوارێکـەوە لـە نەرمایـیەکی فشەڵدا گمێـزی کـردو فەرمووی: کاتێ دەتانـەوێ گمێزبکـەن جێگەیـەکی لـەبار کـە دەستبدا بـۆ میزلێکـردن بدۆزنـەوە!) (ئەحمـەد ، ئـەبو داوود) وا باشـە کـە لـەپاش سەراوەکە ئاو بپرژێنی لە شەرمو شەرواڵەکەی، هەتا دڵە راوکێ لـە خـۆی دووربخاتەوە.

## ١٢) هۆکانی بێدەسنوێژیی:

**دەسنوێژ بەمانە دەشكێت:-**

دەرچـوونی شـتێ لـە پـێش یـان لـە پـاش، قـەبارە داربـێ یـان بێقەبارەبێ وەك با، ئاساییبێ یان نائاسایی وەك خوێنو زیخ، خودپیس (نجس العين)بێ یان پاكبێ، وەكو كرم، سەر بەلگەیش لەم مەسەلەیەدا ئـەم ئایەتەیـە: {او جَاء اَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ - سورة النساء - ٤٣/٤}. واتـە: وە یـاخود یـەكێ لـە ئێـوە لەسـەر ئـاو هاتـەوەو بێدەسنوێژبوو. غائیط لە بنەڕەتدا ئەو شوێنەیە كە دەستی تیادا بە ئاو دەگەیەنرێ، دەردراوەكە بەهۆی هاوسایەتیوە بەو ناوە نـاونراوە، بە پێی ئایەتەكـە میـزو پیسایی بەردەكـەون، بـاو تـڕو تـسیش بـەپێی ئـەم فەرموودەیـە بەردەكـەون. ئـەبو هـورەیرە {خـوای لێ ڕازی بـێ} فـەرمووی: پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} فـەرمۆوی: (هـەر كەسـێ دەسـنوێژی شـكا تـا دەسنوێژ نەگرێتەوە نوێژكردنی بۆ دروست نیە. پیاوێكیش گوتی: ئـەی ئەبو هورەیرە! دەسنوێژ بەچی دەشكێ؟ فەرمووی: بە بالێبوونـەوەو تـڕو تـسو شـتی وا) (پەسـەندی هەردوولایـە. واتـە: بوخـاریو موسـلیم گێڕاویانەتـەوە) مـەزیش بـەر دەسـنوێژ شـكێن دەكـەوێ بـەپێی ئـەم فەرموودەیە: عەلی {ڕەزای خوای لێبێ} فـەرمووی: مـەزیم زۆر بـوو، شەرمیـشم دەكرد بۆ خۆم لە پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} بپرسـم، چونكە كچەكەی خێزانم بوو، جا میقدادی كوڕی ئەسوەدم ڕاسپارد، بـۆ ئەمـە لێـی پرسـی، فەرمووبووی: چۆكی بشۆرێو دەسنوێژ بگـرێ) (شـەیخەین). بـەپێی ئـەم فەرمایشتەی ئیبنو مەسعودو ئیبنـو عەبباسـیش {ڕەزای خوای لێبێ} وە دیـش

بەردەکـەی: (بـەهۆی دەرچـوونی وەدییـەوە دەسـنوێژ پێویـست دەبـێ) بەیهەقی لـە (السنن)دا گێڕاویەتـەوە. ئایـەتو فـەرموودەکان دەکـرێن بـە پێوەر بۆ هەموو دەدراوێکـی تـریش تەنانـەت بـا سروشـتی لەشـیش دەری نەپەڕاندبێ!.

بەڵام دەردراوێ لە دوو راگە (سـبیلین)ەوە دەرنـەچوو بـێ، دەسـنوێژ ناشکێنێ، وەك خوێندبەردانو کەلەشاخ گـرتنو رشـانەوەو ئـارەقو شـتی تری لەم بابەتە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کەڵەشاخی لـە خـۆی دەگرتو شوێنە کەڵەشاخلێگراوەکەی دەشۆردو ئیتر بەبێ ئـەوە دەسـنوێژ بگـرێ، نوێـژی دەکـرد، جارێکیش لـە غـەزای زاتولریقاعـا دوو پیـاو لـە یـارانی پێغەمبـەر {دروودی خوا لەسـەر خـۆی و رەزای خـوا لـە یـارانیبێ} ئێـشکی لەشـکری موسوڵمانانان دەگرت، پیاوێکیان هەڵسا دەستی کرد بە نوێـژکردن، پیـاوێ لـە بێبڕواکـان تیرێکـی تێگـرت، ئـەویش تیرەکـەی دەرکێـشاو نوێژەکـەی تـەواوکرد، هـەر خوێنیـشی لێـدەهات، کاتـێ پێغەمبـەر {دروودی خـوای لەسـەربێ} بـەوەی زانـی رەخنـەی لێنـەگرت. (ئـەبو داوود بـە رشـتەیەکی سـاخ گێڕاویەتـەوە) لەبـەر ئـەوەیش دەردراوی دووڕا واتـە: (پـاشو پـێش) تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە لە غەیری ئەواندانییە.

### یەکێ لە دەسنوێژ شکێن (نَوَاقِضْ)ەکان :-

خەوتنـە، بـەپێی فەرمایـشتەکەی پێغەبـەر {دروودی خـوای لەسەربێ}: چـاو دەمبێنی کۆمە، هەر چاو کاتێ چووە خەو دەمبێنەکە خاو دەبێتەوە، جا لەبـەر ئـەوە ئەگـەر کەسـێ خـەوت کاتـێ هەڵدەسـتێ بـا دەسنوێژ بگـرێ) (ئـەبو داوودو ئیبنوماجـە). بـەڵام کەسـێ نوسـتبێو پاشـی خـۆی لــە

زەوییەکە قایم کردبێ، ئەوە دەسنوێژی ناشکێ، بەپێی فەرمایشتی ئەنەس کە دەفەرموێ: یارانی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} جاران دەیشخەوتن، کە هەڵدەستان بەبێ ئەوەی دەسنوێژ تازەبکەنەوە نوێژیان دەکرد) (موسلیم گێڕاویەتەوە)، ئەبو داوود ئەم رستەیەشی لەم فەرموودەیە پتر کردووە: وا خەویان لێدەکەوت سەریان شۆڕدەبۆوەو چەناگەیان دەیدا لەسەر سینگیان، ئەمەیش بە سەرینیی پێغەمبەر بوو.

**یەکێ تریان:** نەمانی هۆشە بەسەر خۆشی یا بە نەخۆشی وەك بوورانەوەو شێتی، چونکە لە شوێنێ بەخەو دەسنوێژ بشکێ کە لەچاو نەمانی هۆشدا شتێ وا مرۆڤ بێئاگا ناکا، دەبێ بەم باشتر بشکێ.

**یەکی تریان:** بەیەك گەیشتنی پێستی نێرو مێی نامەحرەمە، بەبێ پەردە، مەگەر هی منالێ کە تەمەنی لەوادەی ئارەزووی ئادەمیزادی ئاسایی کەمتربێ، بەپێی ئایەتی: {أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء – ٤٣/٤} . واتە: یا پێستتان لە پێستی ژنان کەوت) ئەوەتا لەم ئایەتەدا (لمس) عەطف کراوەتەوە سەر (مجئ) وەفەرمان کراوە ئەگەر ئاو نەبوو لە دوا روودانی یەکێ لەم کارانە، تەیەمموم بکرێ، ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە کە دەستلێدانی تەنیا هۆی بێ دەسنوێژییە، رێك وەك سەراوکردن، بەوەدا دەزانین کە مەبەست لە (لەمس) جووتبوونو دروستبوون لەگەڵ ژندا نیە، چونکە ئەم واتایە دژی رواڵەتی دەرەوەی وشەکەیە، چونکە (لەمس) بەغەیری جووتبوونیش دەگوترێ، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: {فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ – سورة الأنعام – ٧/٦} . واتە: ئەگەر کتێبێکیشت بۆ بنێرین کە لە کاغەزدا نوسرابێ، وە بەدەستی خۆیان

دەست لە پەرەکانی بدەن، هەر بڕوا ناهێننو دەڵێن: ئای لەم جادووە گەورەو ئاشکرایە) پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} لەمسی بە واتایەکی تر جگە لە جووتبوون بەکار هێناوە، وەك ئەوە بە ماعیزی فەرموو: (لعلك لامست: رەنگبێ هەر دەستبازیت لە گەڵیدا کردبێ) هەر بەلگەیەکیش کە بۆچوونی تری هەڵدەگرت لە بەلگەیی دەکەوێ، کە واتە: لەمس لە زمانی عەرەبدا بریتییە لە کەوتنی پێست لە پێست، ئیتر بە قەستی بی یان نا، بە ئارەزووبێ یان نا، لە نێرینەیشا جیاوازی لە نێوانی پیرێ کە لە پیاوەتی کەوتبێو نێرینەی تردانیە، پیرو لاوو خەساوو شلەیەتەو مێرد منالٚ جیاوازیان نیە، لە مێینەیشا فەرقی ژنی گەنجو پیرێژنێ ئارەزووی لێنەکرێ نیە، چونکە هەر چۆنێبێ جێگەی گومان لێکردنی ئارەزوو لێکردنە! بۆیەیش لە یەککەوتنی پێستی خۆیی (مەحرەم) دەسنوێژ ناشکێنێ لەسەر فەرمایشتی دامەزراو، چونکە جێگەی گومانی ئارەزوولێکردن نیە، پەردەیش کە لە بەینا بوو ئەوە بەیەك گەیشتن نیە بۆیە دەسنوێژ ناشکێ، هەروا دەست دانو لە نینۆكو مووو ددان دەسنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە هەروا لەیەککەوتنی ئەم شتانە لەناو خۆیانا.

**یەکێ تریان:** گەیشتنی بەری دەستی کەسێکە بە پێستی پاشو پێشی خۆی یا هی ئادەمیزادێکی تر، ئیتر نێربن یان مێ، گەورە بن یان بچووك جیاوازیان نیە، ، بەپێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ} کەسێ دەستیدا لە پاشوپێش (فەرج)ی خۆی با دەسنوێژ بگرێتەوە) (ئەحمەدو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە، حاکمیش فەرموویەتی: ئەمە بەپێی مەرجی هەردوو شێخە) واتە: (بوخاریو موسلیم، کە لە زانستی فەرموودەدا ناسراون بە شەیخەین، واتە: هەردوو شێخ) وە بەپێی ئەم

فەرمایشتەیشی {دروودی خوای لەسەربێ}: هەرکامێکتان بەبێ پەردە یا بەبێ دەستپێچ دەستیدا لە شەرم واتە: پاش‌و پێشی خۆی بدات با دەسنوێژبگرێتەوە.

ئیبنو حەببان گێڕاویەتەوە، (افضاء) کە لە دەقی عەرەبی فەرموودەکەدا هەیە برێتییە لە دەست لێدان بە بەری دەست، دەی ئەوا بەپێی دەقی فەرموودەکان بەدەست لێدان لە شەرمی خۆی دەسنوێژی دەشکێ، دیارە بەهی کەسێکی تر باشتر دەشکێ، چونکە ئەوە پتر پەردەی ڕێز لە نێوانا دەدرێنێ، بەڵکوو بەبێ ئەم پێوەر (قیاس)ەیش ئەم دەقە لەم بارەیەوە چەسپاوە: کەسێ دەستبدا لە چووک (زەکەر)ی خۆی با دەسنوێژ بگرێتەوە) فەرموودەکەی خاتوو بوسرەیش دەفەرموێ: بۆ خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ دەستیدا لە چووک دەبێ دەسنوێژ تازە بکاتەوە (ئەحمەدو نەسائی) ئەمەیش دامەنی خۆی‌و دامەنی خەڵکی تریش دەگێڕیتەوە، هەروەك پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر پیاوێ دەستی کەوت لە چووکی خۆی با دەسنوێژ تازە بکاتەوە، هەر ژنێکیش دەستی دا لە شەرمگای خۆی با دەسنوێژ تازە بکاتەوە) (ئەحمەد) ئەو فەرموودەیەی کە ئەوە دەگەیەنێ کە بەشتی وا دەسنوێژ ناشکێ، ئیبنو حەببان‌و کەسانی تر دەفەرموون: ئەوە هەڵوەشاوەتەوە، پاشیش (کە مەبەست لێی پزووی کۆمی ئادەمیزادە) بەر وشەی شەرم‌و دامەن دەکەوێ لەم فەرموودانەدا، کە بە واتای فەرجن، هەروەك بە قیاس لەسەر پێشیش هەمان بڕیاری بۆ دەسەپێ، بە وشەی (بەری دەست) ئەوەی بەری دەست نەبێ بەر بڕیارە ناکەوێ، واتە: دەسنوێژ بە سەری پەنجەو بە نێوانی‌و بە لاتەنیشتی‌و

بەلالەپ ناشکێ، بە (شەرمگای ئادەمیزادیش) هی گیانلەبەرو مەلو مۆر دەردەچێ، بەدەس دان لەبەرو دوای گیانلەبەر دەسنوێژ ناشکێ.

**یەکی تریان:** چاکبوونەوەی هەمیشە بێ دەسنوێژە وەك کەسێ هەمیشە میزەچورکێی بێ، یا پێی رانەگرێ، یا وەك ژنی هەمیشە بێنوێژ، چونکە پاکێتیی ئەمانە لەبەر ناچارییەو هی ناچارییەکەیانە، هەر کاتێ ناچارییەکەیان نەما حوکمەکەیشی نامێنێ، کە ئەوەیە چاوپۆشی دەکرێ لە دەدراوەکەیان.

## ١٣) یاسایەکی سەرعزانی (قاعیدة فقهیة):

یەکێ لە یاسا بریاردراوەکان، کە بڕیاری (حکم)ی زۆری شەرعی بەپێی ئەو دروست دەبێ ئەمەیە: (إستِصحابُ الاصل) واتە: مانەوەی شت لەسەر حاڵی پێشووی خۆی، لەسەر ئەم شێوەیە: بڕیارێ بۆ شتێ لەکاتی دوەمیدا دەچەسپێ، لەسەر بنیاتی چەسپ بوونی ئەو بڕیارە بۆی لەکاتی یەکەمیدا، جا بەپێی ئەم یاسایە مەردوم تێکڕا بەیەك دەنگ دەڵێن: ئەگەر کەسێ گومانی بۆ پەیدابوو کە ئایا ژنەکەی تەلاق داوە یا نا؟ ئەوە دروستە لە گەڵی دروست بێ، چونکە بنەڕەت (ئەصڵ) نەبوونی تەلاق، بەڵام ئەگەر گومانی کرد: کە ئەو ژنەی مارە کردووە یا نا؟ ئەوە دروست نیە بڕواتە لای، چونکە بنەڕەت نەبوونی مارەکردنە، لەسەر هەمان یاسا ئەگەر کەسێ سوور دەیزانی کە دەسنوێژی هەبوو، لە فیسارە کات، بەڵام گومانی لە نەمانیا لەوەودوا پەیدا کرد، ئەوە چوونکە بنەڕەت هەبوونی پاکییەو نەبوونی بێ دەسنوێژییە دەسنوێژەکەی هەر ماوەو نەشکاوە! بە

پێچەوانەیشەوە هەروەها ئەگەر کەسێکیش سوور دەیزانی کە لەپاش کاتێکی زانراوەوە وەك پاش خۆر کەوتن، دەسنوێژی گرتووەو دەسنوێژی شکاوە بەڵام نەیدەزانی کە کامیان لە پێشدا بوون، ئەوە تەماشا دەکەین ئەگەر لە پێش خۆرکەوتندا دەسنوێژی نەبووە ئەوە ئێستا دەسنوێژدارە، چونکە بێ دەسنوێژییەکە لە پێش خۆرکەوتندا هەڵ دەگرێ کە لەپێش پاکییەکەوە بووبێ، هەڵیش دەگرێ کە لە پاشیەوە بووبێ، جا بەم رەچاوکردن (اعتبار)ە پاکێتی دەبێ بە بنەڕەت، بەڵام ئەگەر لە پێش خۆرکەوتندا دەسنوێژی هەبوو ئەوا ئێستا بێ دەسنوێژە چونکە سوور زانینی پاکێتی لە پێش خۆرکەوتندا بەوەلا دەچێ کە سووریش دەزانێ کە لە پاش خۆرکەوتن دەسنوێژی شکاوە، لەشپیسیش لەم بڕیارەدا وەك بێ دەسنوێژی وایە.

## ١٤) خۆشۆردن (غوسڵ):

شۆردن لە زماندا: کردنی ئاوە بەسەرشتدا بە رەهایی (مطلقا). لە شەرعدا: کردنیەتی بەسەر هەموو جەستەدا بە مەبەستی شتن. (هۆیەکانی): ئەو شتانەی کە دەبن بە هۆی پێویستبوونی خۆشتن شەش شتن سیانیان پیاوو ژن تیایانا هاوبەشن.

**یەکەم:** بەیەکاچوونی سوننەتگای نێرو مێیە، لەسەر ئەم شێوەیە بەلایەنی کەمەوە تێچوونی گۆمکەی چووك، یا بە ئەندازەی ئەوە، بۆ ناو پێش یا پاشی گیانداری، بکەرو بدەر مرۆڤ بن یا گیانلەبەر جیایی نیە، هەروا ئاوی بێتەوە یا نا جیاوازی نیە، سەربەڵگە لەم مەسەلەیەدا

فەرموودەکەی خاتوو عائیشەیە {ڕەزای خوای لێبێ} کە دەفەرمویَ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} و سەرو ماڵو منالْ بە قوربانیبیَ، فەرمووی: کاتیَ دوو سوننەتگاکە بەیەکا چوون خۆشۆردن پێویست دەبیَ، من خۆمو پێغەمبەری خوا ئاوامان دەکردو لە پاشا هەدوکمان خۆمان دەشۆرد (موسلیم) (بەیەکاچوونی سوننەتگای نێرو میَ: واتە: التقاء الختانین – وەرگێر).

دووەم: دەرچوونی تۆماوە، بەپێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ} ئاو لە ئاوەوەیە. واتە: خۆشۆردن بە ئاوهاتنەوە پێویست ەبیَ (موسلیم) ئیتر دەرچوونەکە لە خەوا بیَ یا لە حالْی بەخەبەریدا بیَ، خۆشی پێبگا یا نا، چونکە فەرموودەکەی بەرەهایی فەرموویەتی، تۆماو ئەم سیَ نیشانەی هەیە:

١) لەکاتی تەڕیدا بۆنی هەویر یا بۆنی کیفی هێشووی خورمای لێدیَ، لە کاتی وشکیدا بۆنی سپێنەی هێلکەی لیَ دیَ.

٢) بە چەند بلْقیَ هەلْدەقولْیَ. خوای گەورە دەفەرمویَ: {مِن مَّاء دَافِقٍ سورة الطارق – ٦/٨٦} واتە: لە ئاوێکی هەلْقولْیو دروست کراوە، بە دەرچوونی تۆماو خۆشی دەگا بە خاوەنەکەیو دوا بە دوای ئەوە چووك سیس دەبێتەوەو کولْوکۆی دلْ دادەمریَ. جیایی ژن لەگەلْ پیاوا ئەوەیە ئاوی ژن وەك هی پیاو هەلْناقولْیَ، ئەو بەجۆریَ تر ئاوی دێتەوە. ئەگەر کەسیَ لە خەو هەلْساو روانی لینجاوە خەستە سپییەکە وا بەگیانیەوە، هیچ کام لەم نیشانانەی تری تیانەبوو ئەوە خۆشۆردنی لەسەر نیە، چونکە وەدیش لەم دوو نیشانەیەدا وەك تۆماو

وایە، بڕیار بە دەستی خۆیەتی دایدەنیٚ بەوەدی خۆشۆردنی لەسەر نیە، بەڵام دەبیٚ چووکی بشۆریٚ، دایدەنیٚ بە تۆماو ئەوە دەبیٚ خۆی بشۆریٚ، لە حاڵی دووەما ئەگەر باقی مەندەکەی لە دوا خۆشۆردن هاتە مرەوە پێویستە دووبارە خۆی بشۆرێتەوە.

**سێیەم:** مردنە، بەپێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ} لە بارەی ئەو پیاوەوە کاتی حەجی ماڵاواییدا لە ئیحرامدا لە وشترەکەی بەربۆوەو ئەستۆی شکا، کە فەرمووی: بە ئاوو بە مۆرد بیشۆرن (شەیخەین).

## سیانیشیان تایبەتن بە ژنانەوە، ئەمانەن لە دواوە:

**یەکەمیان:** بێنوێژییە، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ – سورة البقرة – ٢٢٢/٢}. واتە: لەکاتی بێنوێژ حەڵاڵەکانتان بە نیازی چوونەلا نزیکیان مەکەون، هەتا لە بێنوێژییەکەیان پاك دەبنەوە، جا ئەو کاتە بچنە لایان لەوشوێنەوە کە خودا ڕێی پیٚ داونو ڕەوای دیوە بۆتان، وە بەپێی فەرموودەکەی عائیشە {خوای لێ ڕازی بێ}: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: کاتیٚ سەرەتای بێنوێژییەکەی جارانت دەستی پێکرد ئیتر نوێژمەکە هەتا بە قەد ئەو ڕۆژانە دەڕوا، ئنجا با خوێنەکەیش نەوەستیٚ بەڵام تۆ بە نیازی خۆشۆردنی بێنوێژی خۆت بشۆرەو نوێژی خۆتی لێبکە (شەیخەین).

**دووەمیان:** زەیستانییە، ئەمەیش بۆ ئەمە وەك بێنوێژی وایە، چونکە برێتییە لە خوێنی بێنوێژی کۆوەبوو، وە لەبەر ئەوەیش

هاوڕێیـان {رەزای خوای لێبێ} یـەکیان گرتـووە لەسـەر ئـەوەو بـەکۆی دەنـگ دەڵێن: کە ئەویش وەك بێنوێژی وایە،

**سێیەمیان:** منداڵبوونە، با بـڕێتیش بـێ لـە خوێنپارەیـێ یـا گۆشـت پارەیێ، هۆی فەرزبوونی خۆشۆردن دووشتە:

**یەکەمیان:** لە کاتی منداڵبوونـدا گومانی دەرچوونی خـوێن هەیـە، بڕیـاری شـەرعیش پەیوەنـدی بـە پەیـدابوونی گومانـەوە هەیـە، وەك خـەوتن، دەسـنوێژ دەشـکێنێ، چـونکە کـاتی خـەوتن جێگـەی گومـانی دەسنوێژشکاندنە.

**دووەمیان:** ئەوەیـە کـە منـداڵ لـە تۆمـاو دروسـت بـووە، دەرچـوونی تۆماویش خۆشۆردن پێویست دەکا.

## ١٥) فەرزەکانی خۆشۆردن:

**خۆشۆردن دوو فەرزی هەیە:**

**یەکـەمیان:** نیەتهێنانـە، بـەپێی فەرموودەکـەی {دروودی خوای لەسەربێ}: هەموو کردەوەیـێ بـەپێی نیـازو نیەتەکەیـەتی، دڵ جێگـەی نیەتـە، نێـت دەبـێ لەگـەڵ یەکـەم شـوێنی شـۆراو لـە لەشـبێ، واتـە: نیەتەکـە لەگـەڵ شـۆرینی هـەر شـوێنێکی لەشـدا هـەبوو ئـەوە بـە یەکـەم شـێنی شـۆراو دادەنـرێ، نێتهێنـان ئاوایـە: لەشـپیس نێـی لابردنـی لەشپیسی بهێنـێ، یـا لابردنـی بێدەسـنوێژی گـەورە لـە هـەموو لەشـی، ژنـی بێنوێـژ نیـەتی لابردنی بێنوێژی بهێنێ، ژنی زەیستان نیەتی لابردنـی زەیـستانی بهێنـێ!

بۆ دروستبوونی خۆشۆردن مەرجەكە لە پێشا پیسی سەر لەش لابرێ، بەپێی فەرموودەكەی {دروودی خوای لەسەربێ}: خوێنەكە لە خۆت بشۆرەو ئینجا نوێژی خۆتی لێبكە، لەلای برێ لە زاناكان لابردنی پیسی لە فەرزەكانی خۆشۆردنن، بەڵام قسەی دروست ئەوەیە كە مەرجە نەك فەرز.

**دووەمیان:** گەیاندنی ئاوەكە بە هەمووپێستو بنكی مووەكان، بەپێی فەرموودەكەی {درووی خوای لەسەربێ}: لەبن هەموو موویەكا لەشپیسی هەیە، كەواتە مووەكان باش تەڕ بكەنو پێست تەواو خاوێن بكەنەوە لەكاتی لەشپیسی دەركردندا). (ئەبو داوودو تیرمیذی) پێغەمبەر {درووی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر كەسێ شوێنی تاقە یەك موو بهێڵێتەوەو لەكاتی خۆشۆردنی لەشپیسیدا نەیشۆرێ ئەوە بە ئاگری دۆزەخ واوای لێدەكرێ). ئیمامی عەلیش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: دەسا من لەترسی ئەم هەڕەشەیەیە كە لەم فەرموودەیەدا هەیە شەڕم بەستۆتە سەری خۆم). عەلی دەستووری وابوو مووی خۆی هەڵ دەپاچی، (ئەحمەد، ئەبو داوود، ئیبنوماجە) پێویستە پەلكە (ئەگەر ناوەكەی تەڕنەدەبوو بەبێ كردنەوە) فەرزە بیكاتەوە، بەپێی فەرمایشتەكەی {درووی خوای لەسەربێ}: مووەكان باش تەڕبكەن، وە بەپێی فەرمایشتەكەی تری {درووی خوای لەسەربێ}: هەر كەسێ شوێنی تاقە یەك موو... تا كۆتایی فەرموودەكە. بەڵام ئەو فەرموودەیەی كە ئوممو سەلەمە {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من ئافرەتمو پەلكەكانم توند شەتەك دەدەم ئایا بۆ خۆشۆردنی لەشپیسی هەڵیان بوەشێنم یا نا؟ فەرمووی: نەء، تەنیا ئەوەندەت بەسە سێ مشت ئاو بكە بەسەر سەرتاو، باش باش قژو كەزییەكانت هەڵگلۆفەو ئەوجا سەراپا ئاوبكە بەسەر خۆتا ئیتر پاك

دەبیتەوە). (موسلیم لە صحیحی خۆیا گێڕاویەتەوە) ئەمە بەم بارەدا دەخرێ:کە مووەکە تەنك بووەو بەستنەکە رێی لە ئاوەکە نەگرتووە کە بگاتە بنی مووەکانو بگاتە هەموو پێستەکە، ئەم تەئویلەیش بۆیە دەکەین تاکار بە کۆی بەلگەکان بکرێ.

لە هەمانکاتدا پێویستە دیوی دەرەوەی پێست گشتی بشۆردرێ، هەتا ئەوەی بەدەرەوەیە لە کڕاکەی گوێ بشۆردرێ، هەروا چرچو لۆچی لەش، هەروا ژێرپێستی کەوا بە گومکەی چووکەوە بۆ خەتەنە نەکراو، هەروا ئەوەی لە بەرودوای ژن واتە: لە پێشو پاشی کە لە کاتی دانشتندا دەردەکەوێ. بزانن بۆیەی سەر نینۆك کە ناهێلێ ئاو بگاتە ژێری، یا هەر دەرمانێ تری وا کە نەهێلێ ئاو بگاتە سەر پێست، بزانن شتی وا دەبێ لابرێ، بەلام خەنەو وسمە وانین، چونکە تەنیا رەنگی پێستو مووەکە دەگۆڕنو بەس.

## ١٦) سوننەتەکانی خۆشۆردن:

سوننەتەکانی خۆشۆردن چەند شتێکن: یەکێکیان: ناوی خواهێنانە، یەکێکی تریان: شۆردنی هەردوو دەستە هەتا هەردوو مووچ لە پێش ئەوەدا کە بکرێ بەناو ئاوی خۆشۆردنەکەدا. بەلگەی ئەمەیش لە دەسنوێژدا رابورد، یەکێ تریان: لە پێشدا دەسنوێژێکی تەواو بگرێ، لەبەر فەرموودەکەی عایشە {رەزای خوای لێبێ}: جاران یاسای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو: کاتێ غوسلی لەشپیسی دەدەکرد لە پێشدا دەسنوێژێکی تەواوی دەفەرموێ: دەکرد دەق وەك دەسوێژی نوێژ، (شەیخەن).

بوخاریش {ڕەزای خوای لێبێ} لە ئوممو سەلەمەوە {ڕەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} شۆردنی هەردوو قازی خستە داواوە، قاچی حوسەین دەفەرموێ: لەبەر ئەوەی ئەم دوو گێڕانەوەیە هەردووکیان ڕاستو دروستن کار بە هەردووکیان دەکرێ، جا ئەوەی لەشپیسی خۆی دەردەکا سەپشکە لە نێوانی ئەم دوو شتەدا، یا دەسنوێژەکەی بە تەواوی بگرێ، بەپێی گێڕانەوەکەی عائیشە، یا شۆردنی قاچەکانی بخاتە دوا خۆشۆردن بەپێی گێڕانەوەکەی ئوممو سەلەمە. یەکێکی تریان: دەست بخاتە هەموو جەستەی، بە تایبەتی چرچو لۆچەکانی، ئەمەیش لەبەر دووربینی، وە هەتا لە مەترسی ڕاجیاییش دەرباز ببین، چونکە هەندێ ئەمەیان بە پێویست داناوە، گرنگی بدا بە دەست خستنە چرچو لۆچی لەشی، وەك بنباخەڵو لۆچی سكو ناو ناوكو پێچو پەنای هەردوو گوێ، چونکە ئەمە دەبێ بە هۆی دڵ ئاوخواردنەوەو دڵنیا دەبێ لەوە کە ئاوەکە گەیشتۆتە هەموو بەشو پاژەکانی لەشی، بە تایبەتی بۆ گوێکانی لالوێی ئاو هەڵبگرێو گوێچکەی دابنێ لەسەری، لە سەرخۆ، هەتا ئاوەکە بگاتە هەموو گۆشەو پێچو پەناکانی.

**یەکێکی تریان:** مووالاتە: واتە: ڕێزپێوەگرتن، کە ئەوەیە پێش ئەوەی ئەندامی پێشوو وشك ببێتەوە دەست بکا بە شۆردنی ئەندامی دوا ئەو.

**یەکێکی تریان:** پێش خستنی شۆردنی لای ڕاستە لەسەر لای چەپ، دیوی دەرەوەو دیوی ناوەوەی، بەم ڕەنگە لە پێشدا ئاو دەکا بەسەر

سەریدا، ئەوجا بەلای راستیدا ئەوجا بەلای چەپیدا، چونکە ئەو (درودی خوای لەسەربێ) حەزی لەوە بوو کە لە دەسنوێژو خۆشۆردندا لای راستی پێش بخا (پەسەندی هەردوولایە: متفق علیه).

**یەکێ تریان:** سێ جار کردنەوەی شۆردن، سێ جار سەری بشواتو سێ جار دەستی تێبخات، باقی مەندەی لەشیشی هەروا، لە مەیشدا حەزرەت دەکا بە سەرمەشق، وا پەسەندە ئاوی خۆشۆردن لە مەنێ کەمتر نەبێو ئاوی دەسنوێژ لە (مودد)ێ کەمتر نەبێ، بەپێی ئەم فەرموودەیەی موسلیم: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مەنێ ئاو بەشی خۆشۆردنی دەکردو (مودد)ێ ئاویش بەشی دەسنوێژی دەکرد). تازەکردنەوەی خۆشۆردن سوننەت نیە، چونکە شتی وا لە سوننەتدا نیە، سەرەڕای ئەوەیشە زەحمەتە، بەلام دەسنوێژ ئەو زەحمەتەی تیا نیە لەبەر ئەوە سوننەتە تازە بکرێتەوە، هەر کاتێ ویستی نوێژی پێوە بکا، هەروا بەپێی ئەم فەرموودەیەش کە ئەبو داوودو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە: دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ) هەر کەسێ لەسەرپاکی دەسنوێژ تازە بکاتەوە خوا دە چاکەی بۆ دەنووسێ. لەبەر ئەوەیش کە لە سەرەتای ئیسلامەتییەوە بۆ هەموو نوێژێ دەسنوێژیان دەگرت، تا پێویستبوونی ئەوە هەلوەشایەوەو زاتی داخوازییەکە (ئەصلی طەلەبەکە)مایەوە. وا پەسەندە کە بە لەشی پیسەوە نەموو بتاشێو نە نینۆك بکا، هەتا هەموو پاژێکی لەشی پاکبێ، سوننەتە لە پاش خۆشۆردن بلێ: (اشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله) لەمەدا چاو لە پێغەمبەری خوا بکا، چونکە ئەو وای دەکرد.

## ١٧) هەڵماڵینی شەرمگا لەكاتی خۆشۆردندا:

دروست نیە بۆ كەس كە لە بەرچاوی كەسێكی تر، بەشەرمگای رووتەوە خۆی بشۆرێ، لەسەر ئەوە تەمبێیەك (تەعزیر)ێكی وا دەكرێ كە بگونجێ لەگەڵ حاڵیدا، دروست نیە بۆ ئامادەبوان كە ئەوەی لێ قبوڵكەن، پێویستە لە سەریان بەرهەڵستی بكەنو بێزاری دەربڕن، خۆ ئەگەر خۆیانی لێبێدەنگ كەن تاوانبار دەبنو ئەوانیش تەمبێ دەكرێن بە پێی فەرمایشتەكەی {دروودی خوای لەسەربێ} نەفرەتو لەعنەتی خوا لەو كەسەی كە تەماشای شەرمگای نامەحرەم دەكاو، لەو كەسەیش كە نامەحرەم تەماشای شەرمگای دەكا. بەڵام ئەگەر بە تەنیا خۆی بوو دروستە، لە حاڵی وایشدا خۆداپۆشین باشترە، چونكە شەمكردن لە خوا شایانترە، هەتا لە هەموو كەسێكی تر.

پیاو لەناو گەرماوا دەبێ چاوی خۆی لە روانینی ناڕەوا بگرێ، شەرمگای رووت نەكا لە بەرچاوی كەسێ كە بۆی دروست نەبێ تەماشای بكا: ئیمامی قورطوبی {رەحمەتی خوای لێبێ} لە تەفسیرەكەیدا، لە راڤەی ئایەتی: (كراما كاتبین، یعلمون ما تفعلون)دا ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە: هەر پیاوێ بە لەش رووتی لەناو گەرماودا بێ دوو فریشتەكەی كەوان لە گەڵیا نەفرەتی لێدەكەن. حاكمیش لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرموویەتی: نادروستە بۆ پیاو بچێتە ناو گەرماو مەگەر بە پەشتەماڵەوە.

## ١٨) خۆشۆردنە سوننەتەکان:

بەهۆی ئەم چەند شتەوە خۆ شۆردن سوننەتە: خۆشۆردنی هەینی، حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەوەی لە ڕۆژی هەینیدا بۆ نوێژی هەینی تەنیا دەسنوێژ دەگرێ ئەوە بەپێی سوننەتی پێغەمبەر ڕەفتار دەکا، دیارە کە ئەوەیش کارێکی گەڵێ شیرینە، ئەوەیشی کە خۆی دەشوا دیارە کە خۆشۆردنەکە زۆر خێرترە، (ترمیذی گێڕاویەتەوە) ئەوەویش {ڕەزای خوای لێبێ} فەرموویەتی فەرموودەیەکی ساغە. هەندێ وا بۆی چوون: کە فەرز بێ نەك سوننەت، ئەمەیشیان لەم فەرمایشتە وەرگرتووە کە دەفەرموێ {درودی خوای لەسەربێ}: کاتێ دەچن بۆ نوێژی هەینی خۆتان بشۆرن). موسلیم گێڕاویەتەوە، چونکە ڕووکاری فەرمان (ظاهیری ئەمر) بۆپێویست بوونە، ئەم فەرموودەیەش ڕای ئەم لایەنە دووپات دەکاتەوە: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو پیاوێکی ڕەسیدە) مەبەست لە ڕەسیدە پیاوێکە جێگەی تەکلیف بێ (شەیخەین). بەڵام ئەم قسەیە بەوە بەرپەرچ دراوەتەوە کە فەرمان (ئەمر) لەم فەرموودەیەدا، بۆ پەسەندکردنە نەك بۆ پێویست بوون، چونکە چەند فەرموودەیەکی ساخ لەم مەسەلەیەدا هەیە، کە دەبن بە بەڵگە لەسەری، واتە: لەسەر پەسەندکردنی (تخییر) بەم جۆرەیش کار بە کۆی بەڵگەکان دەکرێ، ئەوەیش باشترە لەوە کە کار بە هەندێکیان بکرێو کار بە هەندێکیان نەکرێ، بەمە دەگوترێ: (الجمع بين الادلة). هەروا بەم شێوەیەش بەرپەرچ دراوەتەوە: کە وشەی (پێویست) لەم شوێنەدا بۆیە بەکار هێنراوە بۆ دووپاتکردنەوەی پەسەنکردن، وەك چۆن کەسێ بە کەسێ

دەڵێ: مافی تۆ لەسەر من هەیە. واتە: ڕەوایەکی تەواوە، نەك فەرزە لەسەر من (تەماشای نەیلولئەوطار – ٣٥٢/١ بفەرموون) دەگێڕنەوە: ئیمامی عومەر {ڕەزای خوای لێبێ} سەرگەرمی وتاری ڕۆژی هەینی بوو، لەو کاتەدا عوسمان خۆی کرد بە ژووردا، عومەر گازی کردو پێی فەرموو: کەی ئەمە وەختە؟ عوسمان فەرمووی: سەرم جەنجاڵ بوو نەمپەرژا بگەڕێمەوە بۆ ماڵ، تا کاتێکم زانی گوێم لە بانگ بوو، ئیتر هەر ئەوەندەم بۆ کرا دەسنوێژم گرتو هاتم، عومەر فەرمانی پێ نەکردم بچێ خۆی بشۆرێ، ئەگەر خۆشۆردن پێویست بوایە عوسمان چۆن فەراموشی دەکرد؟ ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سوننەتەو پێویست نیە، کاتەکەی لە شەبەقەوە دەست پێ دەکا، واتە: لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینییەوە، بەڵام هەتا نزیکتری بخاتەوە لە ڕۆیشتنی بۆ نوێژەکەی ئەوە خێری زۆرترە، چونکە مەبەست لێی پاكو خاوێنییە لابردنی ئەوبۆنە ناخۆشەیە کە بەهۆی قەرەباڵغییەوە پەیدا دەبێ، لە ئەنجامی ئارەق دەردانو شتی وادا. ئەگەر لە خۆشۆردنو زوو چوون هەریەکێکیانی بۆ دەکرا، ئەوە ڕەچاوکردنی (موراعات)ی خۆشۆردن باشترە، چونکە ڕاجیایی هەیە لەسەری کە پێویستە یا سوننەتە.

**یەکێ تریان:** خۆشۆردنە لە پێش نوێژی هەردوو جەژنەوە، ئیبنو عەببا {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو لە ڕۆژی جەژنی قورباندا خۆی دەشۆرد. جاران عومەرو ئیبنو عومەرو علی ئەمەیان دەکر، لەبەر ئەوەیش کە مەردوم بۆ ئەمیش کۆدەبنەوە، لەپاش بەرەبەیانەوە کاتی ئەم خۆشۆردنانە

دهست پێدهکا بهبێ ترس، لهسهر فهرموودهی پهسهند، له پێش بهره بهیانیشهوه له نیوهشهوهوه دهست پێدهکا.

**یهکێ تریان:** خۆشۆردنه بۆ نوێژی نوێژهبارانهو خۆرگیرانو مانگ گیران، چونکه بۆ ئهم نوێژانهش وهك نوێژی ههینی خهڵك کۆ دهبنهوهو قهرهباڵغی دروست دهبێو بۆنی ناخۆش پهیدا دهبێ، کهوابێ بۆ ئهمانهیش خۆشۆردن سوننهت دهبێ! له ئایندهدا ئهم باسانه به دوورو درێژی دێن.

**یهکێ تریان:** خۆشۆردنه بۆ کهسێ که مردووی شۆردبێ. پێغهمبهر {دروودی خوای لهسهربێ} دهفهرموێ: ههر کهسێ مردوویهکی شۆرد با له دواییدا خۆی بشۆرێ، ئهوهیشی که مردوو ههڵ دهگرێ با دهسنوێژ بشۆرێ. (ترمیذی دهفهرموێ: فهرموودهیهکی جوانه، فهرمان لهم فهرموودهیهدا بۆیه بۆ پێویستبوون نیه، به نیشانهی ئهم فهرموودهیهی تر که دهفهرموێ: مردووتان که دهمرێ پاکه، به مردن موسڵمان پیس نابێ، کهواته: ئهوهندهتان بهسه که له پاش شۆردنی تهنیا دهستهکهنتان بشۆرن). بهیههقی گێڕاویهتیهوهو به جوانی داناوه. ههروا به بهڵگهی ئهم فهرموودهیهی تریش: جاران که مردوومان دهشۆرد، به ئارهزووی خۆمان بوو ههمان بوو لهپاشدا خۆی دهشۆرد، ههیشمان بوو خۆی نه دهشۆرد. خهطیب گێڕاویهتهوه، ههروا به بهڵگهی ئهم فهرموودهیهی تریش: له پاش شۆردنی مردووهکانتان خۆشۆردنتان لهسهر نیه (حاکم).

**یهکێ تریان:** بێ بڕوا کاتێ موسڵمان دهبێ سوننهته خۆی بشۆرێ، دهگێڕنهوه: قهیسی کوڕی عاصیمو ثومامهی کوڕی ئوثال، کاتێ موسڵمان

بوون، پێغەمبەر {درووده‌ی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێکردن کە خۆیان بشۆرن، بەڵام پێویستی نەکرد لە سەریان، چونکە کۆمەڵێ تر موسوڵمان بوونو پێغەمبەر {درووده‌و سەڵاوی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێکردن: کە خۆیان بشۆرن، لەبەر ئەوەیش چونکە ئیسلامبوون تەوبەکردنە لە نافەرمانییەکانی خوا، تەوبەش لە گوناه بەبێ خۆشۆردنیش دروستە، بەڵام ئەمە بۆ کەسێ وایە کە لە حاڵی بێبڕوایەکەیدا لەشی پیس نەبووبێ دەنا پێویستە لەسەری کە لەپاش ئیسلامبوون خۆشۆری (غوسڵ) بکا، بۆیە دەبێ لەپاش ئیسلامبوون خۆی بشۆرێ، چونکە خۆشۆردنی شەرعی پێویستی بە نیەتە، نیەتیش لە حاڵی کوفردا دانامەزرێ!

**یەکێ تریان :** شێت کە چاك بۆوە سوننەتە خۆی بشۆرێ، هەروا کەسێکیش کە لە هۆش خۆی چووبێ، کاتێ هۆشی هاتەوە سوننەتە خۆشۆری بکا، چونکە رێگەی تێدەچێ کە تۆماویان لێ دابەزیبێ. شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: هەر مرۆڤێ شێت ببێ ئاوی دێتەوە.

**یەکێ تریان :** خۆشۆردنە بۆ ئیحرام دابەستن، زەیدی کوڕی ثابیت {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەرم دی {درووده‌ی خوای لەسەربێ} بۆ ئیحرام بەستن خۆی رووت کردەوەو خۆی شۆرد (ترمیذی) لەم خۆشۆرییەدا پیاوو منداڵو ژن چۆن یەکن، ژنەکە ئەگەر بێنوێژیش بێ، یا زەیستان بێ هەر سوننەتە بۆ خۆی بشۆرێ، چونکە ئەسمای کچی عومەریش کە هاوسەری ئەبو بەکری صدسق بوو {رەزای خوایان لێبێ} لە ذولحولەیفە منداڵی بوو، پێغەمبەر {درووده‌ی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێکرد کە بۆ ئیحرام دابەستن خۆی بشۆرێ، (موسلیم) بەغەویو مەحامیلی دەفەرموون: بۆ ئەمە جیاوازی

نیـه لـه نێـوانی ژیـرو شـێتو لـه نێـوانی منـاڵی فامیـدەو کەسـانی تـردا. ئەگەر ئیحرامدار ئاوی دەست نەکەوت سوننەتە تەیەمووم بکا. ئەگەر ئەوەندەی ئـاو دەست کـەوت کـه بەشـی دەسـنوێژی دەکـر، بـا دەسـنوێژی پێبگرێ. چونکە ئاسان بە هۆی گرانەوە لە کۆڵ ناکەوێ.

**یـەکێ تریـان:** خۆشـۆردنە بـۆ رۆیـشتنە نـاو مەککـە. نـافیع (رەزای خوای لێبێ) فـەرمووی: گـشت جـارێ ئیبنـو عومـەر (رەزای خوای لێبێ) کـە دەهـات بـۆ مەککـە شـەو لـە ذی طـەوا دەمایـەوە، بـەیانی لـەوێ خـۆی دەشۆرد، ئەوجا لە رۆژدا دەهاتە ناو مەککەوە، دەیفەرموو: پێغەمبـەریش (درودی خوای لەسەربێ) ئاوەهـای دەکـرد (شـەیخەین). هـەر کەسـێ بـچێتە نـاو مەککە سوننەتە بۆی کە خۆی بشوا، ئیتر لـە ئیحرامـی حـەجو عـەمرەدا بـێ یـا لـە ئیحرامـدا نـەبێ. شـافیعی لـە پـەڕاوی (الام)دا دەفـەرموێ: ئەوەیشی کە بەبێ ئیحرام دەچێتە نـاو مەککە هەر سوننەتە کـە خـۆی بشۆرێ. بەڵگەیشی ئەوەیە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ساڵی رزگـارکردنی مەککە کە تەشریفی چووە ناو مەککە خۆی بۆ ئەوە شۆرد، ئـەو کاتـە لـە ئیحرامدا نەبوو، بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا.

**یـەکێ تریـان:** خۆشـۆردنە بـۆ وەسـتانی عەرەفـە، چـونکە ئیبنـو عومەر ئەمەی دەکرد مالیك گێڕاویەتەوە، بەڵکوو ئیبنولخـەل هەقایـەتی وا لـە پێغەمبەریـشەوە بـاس دەکـا، گوایـە پێغەمبـەریش ئـەوەی کردبـێ، سـەرەڕای ئـەوەیش ئـەو شـوێنە کۆمـەڵگای مەردومـە، لەبـەر ئـەوە وەك کۆبوونەوەی هەینی خۆشۆردن بۆی سوننەتە.

**یەکێ تریان:** خۆشۆردنە بۆ بەرد فڕەدان بۆ کۆگابەردەکان لە سێ رۆژی پاش جەژندا، بەڵام بۆ بەرد فڕەدان بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە لە رۆژی جەژندا سوننەت نیە، چونکە کاتی ئەم بەردفڕەدانە لەکاتی خۆشۆردن بۆ وەستان لە موزدەلیفە نزیکە، کە ئەویش هەر لە رۆژی جەژندایە، بە پێچەوانەی بەرد فڕەدانی سێ رۆژەی پاش جەژن، چونکە ئەمانەیان دوور کەوتوونەتەوەو لەبەرقەرەباڵغیش خۆشۆردن بۆیان لەم سێ رۆژەدا سوننەتە. سەرەڕای ئەم هۆیەیش ئەم بەردفڕەدانانە دەکەونە پاش نیوەڕۆ، کە قرچەی گەرمایە، لە کاتی وایشدا خۆشۆردن سوننەتە.

**یەکێ تریان:** خۆشۆردنە لە پێش تەوافی بەیتا، کە ئەم سێ تەوافە دەگرێتەوە، تەوافولقودوم، تەوافولئیفاضە، تەوافولوەداع، چونکە مەردوم بۆ ئەمانە کۆ دەبنەوە، لەبەر ئەوە خۆشۆردن بۆیان سوننەتە سافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: خۆشۆردن بۆ ئەم سێ تەوافە سوننەتە.

**یەکێ تریان:** خۆشۆردنە بۆ خەڵوە کێشان لە مزگەوتا، دەقی فەرموودەی شافیعی لەسەری هەیە، هەروا بۆ چوونە ناو مەدینەی پیرۆز کە شاری پێغەمبەری خوایە. نەوەوی لە (مەناسیك)دا ئاوا دەفەرموێ، هەروا بۆ هەموو شەوێکی رەمەزان، ئەم قسەیە عەببادی نەقڵی دەکا لە حەلیمییەوە، هەروا بۆ بەرتاشین، خەففاف لە (الخصال)دا فەرموویەتی، خاوەنی (جمع الجمواع) لە (المنصات) شافیعیەوە رادەگوێزێتەوە: کە فەرموویەتی: خۆشۆردنم بۆ ئەمانە پێخۆشە: بۆ کەڵە شاخ گرتنو بۆ چوونە ناو گەرماوو بۆ هەموو کارێ کە سروشتی جەستە بگۆڕێو لاوازی بکا، چونکە شۆردن توندوتۆڵی دەکاتەوەو دەیبوژێنێتەوە.

## ١٩) دەستی تەڕهێنان بەسەر خوف (سۆل)دا لە باتی شۆرینی پێ:

دروستە دەستی تەڕهێنان بەسەر خوفدا لە باتیی شۆردنی پێ، بەپێی فەرموودەکەی موسلیم کە لە جابیرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەرم بینی، گمێزی کرد، لەپاشا دەسنوێژی گرت، جووتێ سوولی لە پێدابوو، لە باتی شۆرینی پێی دەستێ تەڕی هێنا بەسەر سۆڵەکانیدا (پەسەندی هەردوولایە = شەیخەین). یارانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خوا لەسەر یارانی) ئەم فەرموودەیان زۆر بەلاوە پەسەندبوو، چونکە جەریر لە پاش هاتنی ئایەتی دەسنوێژ، کەوا لە سوورەتی مائیدەدا، موسڵمان بووە، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە ئایەتەکە هەر چەند بەلگەیە لەسەر شۆرینی پێ، بەلام نابێ بە هەڵوەشێنەوەی مەسەلەی تەڕکردنی خوفا بۆ کەسێ خوفی لە پێدا بێ. نەوەوی‌و کەسانی تریش فەرموویانە: ئەو زانایانەی کە لە یەککگرتن (اجماع)دا رایان بایەخی هەیە لەسەر ئەوە یەکیان گرتووە: کە دروستە دەستی تەڕهێنان بەسەر سۆڵدا، چ لە ماڵەوە بێ چ لە سەفەرو رێبواریدابێ، لەبەر پێویستی بێ یانا، تەنانەت بۆ ئافرەتێکیش کە ئالوودەی ماڵەوەبێ، یا بۆ نەخۆشێ کە دەردەکەی درێژخایەن بێ‌و نەتوانێ لەسەر پێ بڕوا هەر دروستە کە دەستی تەڕ بهێنێ بەسەر سۆڵەکانیدا، لەباتی شۆردنی پێیەکانی بە مەرجێ سوولەکان لەپێیدابن. والله أعلم. حەسەنی بەصریش دەفەرموێ: حەفتاکەس لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) قسەیان بۆ کردووم کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) دەستی تەڕی بەسەر خوفدا دەهێنا. خەڵکێکی بێ شوماریش لە هاوڕێیان مەسحی خوفیان لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە.

## ٢٠) مەرجەکانی دەستپیاهێنانی سۆڵ:

**دەستهێنان بە سۆڵدا دوو مەرجی هەیە:**

**مەرجی یەکەم:** دەستنوێژی تەواوی گرتبێ ئەوجا دوو سۆڵەکە لە سەرپاکی لە پێبکا، بەلاّم ئەگەر دەسنوێژی گرتو قاچێکی شۆردو خوفەکەی تێکرد، ئەوجا قاچەکەی تری شۆردو خوفەکەی تری تێکرد، هەقی ئەوەی نیە کە لە دەسنوێژی ئاییندەدا دەستی تەڕ بەسەر سۆڵەکانیدا بهێنێ، بەپێی فەرموودەکەی موغیرە، فەرمووی: لە سەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا بووم، دەسنوێژی گرت، ئاوم کرد بەدەستیدا، فەرمووی: وازیان لێبێنە بە دەسنوێژەوە لە پێم کردوون، ئیتر قاچی نەشۆردو لە جیاتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆلەکانیدا (شەیخەین) شافیعی {رەزای خوای لێبێ} لە موغیرەوە {رەزای خوای لێبێ} دەگێرێتەوە: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! دەستی تەڕ بهێنم بەسەر سۆڵەکانما، لەباتی شۆرینی پێم؟ فەرمووی: بەڵی بەمەرجێ لەسەر دەسنوێژ لە پێیان بکەی.

**مەرجی دووەم:** سۆلەکە دەستبدا بۆ دەسپیاهێنان، ئەم شتانە دەبن بەهۆی دەستدانی:

**یەکەم:** داپۆشەر بێ بۆ هەر شوێنێکی هەر دووپێی کە شۆرینی فەرزبێ، ئەگەر بەشی داپۆشیی شوێن فەرزەکەی نەدەکرد، دەسپیاهێنانی دروست نیە، چونکە لە حاڵی وادا چەندەی بە دەرەوە بێ دەبێ بشۆرێ، وە ئەوەی داپۆشراوە بە سۆڵەکە دەبێ مەسح بکرێ، هیچ زانایەکیش شتی وای نەگوتووە کە مەسحو شۆردن لەیەك دەسنوێژدا کۆبکرێنەوە، لەبەرئەوە شۆردن سەردەکەوێ، چونکە ئەو بناغ (أصل)ەیە.

**دووەم:** سۆلەکان ئەوەندە قایم بن کە بەرگەی ئەوە بگرن کە یەك لە شوێنی یەك هاتوچۆی پێبکرێ بۆ ئەو ئیشانە کە پێویستی رێبواران، لە کاتی بارخستن و بارکرندا، لای کەمی ئەم هاتوچۆیە، وەك غەزالی دەفەرموێ، سێ میلە، بەڵام شێخ ئەبو موحەمەد داینا وە بە مەسافەی قەصر، ئەم فەرمایشتەیش متمانە پێکراوە[1] سۆڵێ کە ئەم هاموشۆیە پێ نەکرێ ئەوە مەسحی دروست نیە، وەك سۆڵێ لە پەرۆی تەنك دروست کرابێ، یا لە شتی وا، وەك گۆرەوی، کە ئاو دادەدا، یا لە شتی وا دروست کرابێ کە زۆر رەق بێ وەك سۆڵی ئاسن!

**سێیەم:** ئاودانەدا، لەسەر فەرمایشتی متمانەدار، چونکە زۆربەی خوف ئەم مەرجەی تیایە، کەواتە: دەقەکان دەبرێن بەسەر ئەو جۆرەدا.

**چوارەم:** دەبێ سۆلەکە خۆشی پاك بێ، چونکە دروست نیە، بە بەرگی پیسەوە نوێژ بکرێ.

## ٢١) ماوەی دەسپیاهێنان (مُدَّةُ المَسح):

---

(١) لێرەدا لە عیبارەتی ئەصڵەکەدا هەست بە ئاڵۆزی دەکرێ، لەگەڵ موغنیو شەریعەتی ئیسلامو (الفقة علی المذاهب الاربعة) رێناکەوێ. لە موغنیدا دەفەرموێ:

مەحامیلی ئەو ماوەیەی دیاری کردووە بەسێ شەو یا زیاتر، ئەسنەوی لە (التنقیح)دا رای لەسەر رای ئەمە، لە (المهمات)یشدا دەفەرموێ: متمانە پێکراو ئەوەیە کە شێخ ئەبو حامید دیاری کردووە بە نزیکەی مەسافەی قەصر. مەبەست ئەوەیە کە ئەو سۆلە لە ماوەی سێ شەودا رێبوار چەند جار لادەدات بۆوچانو، بار بار دەکاتەوە هاموشۆی ئەم وردە ئیشانەی پێبکرێ.

- وەرگێڕ -

دروستە بۆ نیشتەجێ (مقیم) لە دەسنوێژا، لە باتیی شۆرینی پێ، دەستی تەڕ بهێنێ بەسەر خوفەکانیدا، لە ماوەی شەوو رۆژێکا، وە بۆ رێبوار (موسافیر) لە ماوەی سێ شەوو سێ رۆژدا، بەپێی فەرموودەکەی ئەبوبەکر {رەزای خوای لێبێ}: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} رێگەی بە رێبوار داوە، لە دەسنوێژدا تا ماوەی سێ شەوو سێ رۆژ دەس بهێنێ بەسۆلا، بە نیشتەجیش تا ماوەی شەوو رۆژێ (ئیبنو خوزیمەو ئیبنو حەببان، هەرکەسیان لە صەحیحی خۆیدا گێڕاوەتەوە) صەفوانی کوڕی عەسسالیش {رەزای خوای لێبێ} گێڕاویەتەوە: جاران کە لە سەفەردا دەبووین پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێمانی دەگوت کە تاماوەی سێ شەوو سێ رۆژ سۆلەکانمان تەڕ کەین و لەو سێ رۆژانەدا دایان نەکەنین، نەبۆ پیسیو نەبۆ گمیزو نە بۆ خەو، مەگەر بۆ لەشپیسی (نەسائی: تیرمیذی) ترمیذی دەفەموێ: فەرموویەکی ساغی جوانە، مەجی سەفەر ئەوەیە: بۆ گوناه نەبێ، دەنا دەبێ بە قەدنیشتەجێ مەسح بکا.

## ٢٢) سەرەتای ماوەی دەسپیاهێنان:

سەرەتای ماوەی دەسپیاهێنان لەو بێدە سنوێژییەوە دەس پێدەکا کە لە پاش پۆشینی سۆلەکە پەیدا دەبێ، نەك لە سەرەتای پۆشینی سۆلەکەوە، چونکە دەسپیاهێنان پەرستنێکی کات دیاری کراوە ئەویش وەکو نوێژ هەتا کاتەکەی نەیێ دروست نیە بکرێ، داوودی ظاهیری دەفەرموێ: سەرەتای ماوە لە پۆشینەوەیە. ئەووویش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەمە ڕای پەسەندکراوە، چونکە ئەمە خوازە (موقتەضا)ی

فەرموودە ساخەکانی ئەم باسەیە، ئەگەر لە سەفەرا دەستی کرد بە دوسپیاهێنان، لە پاش بوو بە نیشتەجێ، یا نیشتەجێ بوو دەستی پێی کردو بوو بە رێبوار دەسپیاهێنانی نیشتەجێ ئەواو دەکا، چونکە دەسپیاهێنان پەرستنە (عیبادتە)، لەم حاڵەدا نیشتەجێو رێبواری تیا کۆبۆتەوە لەبەر ئەوە بڕیار (حوکم)ی نیشتەجێی هەیە، رێك وەك چۆن ئەگەر لە نیشتەجێیدا دەستی کرد بە نوێژ لە دواییدا بوو بە رێبوار هەقی نیە ئەو نوێژە کورت بکاتەوە، چونکە لە کاتی وادا نیشتەجێی زاڵ دەکرێ. ئەگەر رێبوار گومانی کرد: کە دەسپیاهێنانی لە نیشتەجێیدا دەست پێکردووە، یا لە سەفەردا ئەوە گار بە نیشتەجێی دەکات، چونکە ئەو بنەڕەتە.

## ٢٣) چۆنێتی دەسپیاهێنان:

لای کەمی دەسپیاهێنان ئەوەندەیە کە ناوی دەسپیاهێنان (مەسح) بێ بەسەر پشتی سۆڵەکەدا، لەبەرئەم فەرموودەیە، کە موغیرە {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرم بینی دەستی تەڕی هێنا بەسەر پشتی سۆڵەکانیدا (ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرمیذی). بەڵام هەرە تەواوەکەی ئەوەیە: دەستی تەڕ بهێنێ بەسەر پشتو بەری سۆڵەکاندا بە چەند کێڕێ* بەپێی فەرموودەکەی موغیرەی کوڕی شوعبە {رەزای خوای لێبێ}:

---

* دەگوترێ: کێڕ کێڕ، واتە: خەت خەت

- وەرگێڕ -

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستی هێنا بەسەر پشتو بە بەری سۆڵەکەیدا. چۆنێتیەکەیشی ئاوایە: دەستی چەپی لە ژێرفنگە پاژنەیدا دانێ‌و دەستی راستی لەسەر پشتی سەرپەنجەکانی دابنێ‌و پەنجەکانی هەردوو دەستی بڵاوبکاتەوە، ئەوجا دەستی راستی رابکێشێ بەسەریدا هەتا دەگاتە لاقی‌و دەستی چەپیشی بەکێش بکا بەسەر بەری پێیدا هەتا دەگاتە نووکی پەنجەکانی.

## ٢٤) چی دەسپیاهێنان پووچ دەکاتەوە:

### دەستهێنان بەسەر سۆلدا بەم سێشتە پووچ دەبێتەوە:

**یەکەم:** داکەندنی هەردوکیان یا یەکێکیان، یا کاتێ سۆڵەکە لەکار بکەوێ بەمجۆرە بدڕێ، یا بێهێزبێ، لەم کاتانەدا ئەگەر دەسنوێژداربوو بەس هەردوو قاچی بشۆرێ بەسە، دەنا دەبێ سەر لەنوێ دەسنوێژی تەواو بگرێتەوە.

**دووەم:** کاتێ ماوەکەی تەواو بوو، کە شەوو رۆژێ بۆ نیشتەجێ‌و سێ شەوو سێ رۆژ بۆ رێبوار، بەسەر مەسحەکەیاندا تێپەڕی ئیتر دەستپیاهێنان پووچ دەبێتەوەو دەگەری نامێنێ، دەبێ سەرلەنوێ دەسنوێژی تەواو بشۆرێ‌و قاچی بشۆرێ‌و سۆڵەکان لە پێبکاتەوەو ئەوسا دەست بکاتەوە بە دەسپیاهێنانی نوێ، ئیتر هەروا، ئەمەیش دەیسان بەپێی فەرموودەکەی صەفوان کە لە پێشەوە رابووورد.

**سێیەم:** کاتێ دەستپیاهێنی قاچی خۆی شۆرد، دیسان بەپێی فەرموودەکەی صەفوان.

ئەگەر قاچی لەناو سۆڵەکەدا پیس بوو، وە نەدەکرا کە لەناویدا قاچی بشۆری پێویستە دایبکەنیو قاچی بشۆری، بەلام دەستپیاهێنان پووچ دەبێتەوە، ئەگەر دەکرا لە ناویدا قاچی بشوات ئەوا با بیشواتو دەسپیاهێنانیش پووچ نابێتەوە!.

## ٢٥) تەیەممووم:

**پێناسەکەی:** تەیەمموم لە زمانی عەرەباندا واتە: چوون بۆ لای شتێ، لە شەرعا: ئەوەیە مرۆڤ لەباتی ئاوی دەسنوێژ بە تۆزێکی پاك دەست بهێنێ بەدەمو چاوو هەردوو دەستیا لەگەڵ ئانیشکەکانیا، بەپێی چەند مەرجێکی تایبەت. سەر بەڵگەی دروسبوونی، قورئانو سوننەتو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلامە. خوای گەورە دەفەرموێ: {فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ - سورة النساء - ٤٣/٤}. واتە: ئەگەر لە هەموو ئەم صوورەتانەدا ئاو نەبوو ئەوا قەستی هەڵگرتنی گڵێکی پاك بکەنو لە تۆزی ئەو گڵە پاکە دەست بهێنن بە روخسارو بەدەستتاندا). ئیبنو عەببا {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: واتە: ئەگەر نەخۆش بوون تەیەمموم بکەن، هەروا ئەگەر رێبواریش بوونو ئاوتان دەست نەکەوت تەیەمموم بکەن. پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: رووی زەوی هەموو بۆ خۆمو ئوممەتم وەك

مزگـەوت وایـەو خۆڵەکـەی پـاك‌و پاکەوەکـەرەو لـە کـاتی پێویـستدا تەیەممومی پێدەکەین (موسلیم).

## ٢٦) یاسای دروستبوونی تەیەمموم:

بـزانن ئـەوەی دەبـێ بـە هـۆی دروسـتبوونی تەیـەمموم نـەتوانینی بەکارهێنانی ئاوە بەراستی، یا بەپێی شەرع، نەتوانینیش چەند هۆیـەکی هەیە:

**یەکێکیان سەفەرە، رێبواریش ئەم چوار حاڵەی هەیە:**

**یەکەم:** ئەوەیە سوور بزانی کە ئاو لەو شوێنەدا نیە ئەوە پێویستە تەیـەمموم بکا بـەبێ ئـەوە بگـەڕێ بـە شـوێنی ئـاوا، چونکە لـەکاتی وادا گەڕان بۆ ئاو بێهوودەیە.

**دووەم:** ئەوەیـە گومـانی وابـێ کـە لەوانەیـە لـەو دەووروو بـەرەدا ئـاو هـەبێ، ئـەوە دەبـێ بگـەڕێ بـە دوایـا، چـونکە تەیـەمموم پاکییـەکی ناچارییە، دەی هەتا رێی تێبچی کە بە ئاو دەسنوێژ بگرێ یا لەشپیسی خۆی دەربکا ئەو ناچارییە نایەتەدی‌و رێگەی تەیەمومی بێ نادرێ.

**سێیەم:** ئەوەیـە سـوور بزانـێ کـە ئـاو لـە دەوروبـەری هەیـە، ئـەم حاڵەیان دوو لقی لێدەبێتەوە، ئەگـەر ئاوەکـە لێیـەوە ئەوەنـدە دوور بـوو کە شوان‌و داربڕ بۆ لەوەڕو داربڕین ئەوەندە دوور دەکەوتنـەوە پێویـستە بـڕوا بـۆی‌و تەیـەمموم دروسـت نیـە، ئەگـەر ئاوەکـە ئەوەنـدە دوور بـوو

ئەگەر بڕوا بۆی نوێژەکەی دەچێ ئەوە تەیەمموم دەکا، چونکە ئەوە لە ئێستادا بێئاوە، خۆ گریمان ئەگەر چاوەڕوانیکردنی ئاو هەتا کاتەکە بەسەر دەچی پێویست بێ، ئەوە لە بنەڕەتدا تەیەمموم بڕیار نەدەدراو نەدەکرا بە یاسای دامەزراو.

**چوارەم:** ئەوەیە ئاو هەبێ، بەڵام لەبەر قەرەباڵغیی ڕێبوارەکان بەر ئەو نەدەکەوت و دەستی نەیدەگەیشتێ، ئەوە لەسەر فەرمایشتی دامەزراو تەیەمموم دەکات، لەبەر نەتوانینی لەبەرچاو، گێڕانەوەیشی لەسەر نیە.

**یەکێ تریان:** نەخۆشییە، نەخۆشیش ئەم سێ بار (حاڵ)ەی هەیە:

**باری یەکەم:** ئەوەیە کە مەترسی گیانی، یا نەمانی ئەندامێ، یا نەمانی سوودو قازانجی ئەندامێ، یا پارچەیێ لە ئەندامەکانی هەبێ، ئەوە تەیەمموم دەکا.

**باری دووەم:** ئەوەیە کە مەترسی ئەوەی هەبێ نەخۆشییەکەی زیاد بکا، واتە: ئێش و ئازارەکەی پتر بکا، یا درەنگ چاك بێتەوە، یا مەترسی ئەوەی هەبێ کە لەکەیەکی ناشیرین لە ئەندامێکی بەدەرەوەبوویدا، پەیدابێ، وەك ئەوە پەڵەیەکی ناهەموار لە روخساریدا یا لە جێیەکی تریدا کەوا بەدەرەوە دەرکەوێ، لەم مەترسی پێویستە تەیەمموم بکا، لەسەر رای دامەزراو.

**باری سێیەم:** مەترسی لەکەیەکی کەمی هەبێ وەك کونجری ئاوڵە، یا پەڵەیێ رەشی کەم، یاخود مەترسی ئەوەی هەبێ کە لەکەیەکی ناهەموار لە ئەندامە شاراوەکانیدا ببێ، لەم کاتانەدا دروست نیە تەیمموم بکا!

بــۆ نەخۆشــەکە هەیــە بتمانــە بــە زانیــاری خــۆی لــە بابــەت نەخۆشییەکەیەوە بکا، بە مەرجێ لێی بزانێ یا خاوەن ئەزموون بێ، کە ئایا مەترسیدارە یانـا؟ هـەروەها باوەڕبکـا بـە قـسەی پزیـشکی شـارەزای موسـوڵمانی بـاڵقبووی بـەداد، چـونکە خـودای گـەورە خـۆی دەسـنوێژی پێویـست کـردووە، لەبـەر ئـەوە نـاگۆڕدرێ بەشـێکی تـر مەگـەر لەسـەر شایەتی کەسێ کە خوا خۆی شایەتیەکەی قەبوڵ بفـەرموێ، وەلحـاڵ خـوا خۆی قسەی بێبڕواو مرۆڤی بەدکاری پووچ کردۆتەوە، لە سەر رای نـاودار شایەتییەك کەسیش پەسەند دەکرێ، با تاقە ژنێکیش بێ.

## ٢٧) مەرجەکانی دامەزرانی تەیەمموم:

**بۆ دامەزراندنی تەیەمموم چەند شتێ مەرجە:**

**یەکـەمیان:** هـاتنی کـاتی نوێـژە، بـەپێی ئایـەتی {إِذَا قُمْتُمْ إِلَـى الـصَّلاَةِ فاغْـسِلُواْ وُجُـوهَكُمْ وَأَيْـدِيَكُمْ إِلَـى الْمَرَافِـقِ وَامْـسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَـى أَوْ عَلَـى سَـفَرٍ أَوْ جَـاء أَحَـدٌ مَّـنكُم مِّـنَ الْغَـائِطِ أَوْ لاَمَـسْتُمُ النِّـسَاء فَلَـمْ تَجِـدُواْ مَـاء فَتَيَمَّمُـواْ صَـعِيدًا طَيِّبًـا سـورة المائـدة ٦/٥} . وشەی (قیام) لە ئایەتەکەدا، کەواتای وایە: کاتێ هەڵسان بۆ نوێژ ئەوسا تەیەمموم بکەن، ئەم کـارە نایاتـەدی هـەتا کـاتی نوێژەکـە دانـەیێ، دەسنوێژ بۆیە دادەمەزرێ لە پـێش هـاتی کاتـدا چـونکە پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) کردوویەتی، بەڵام تەیەمموم لەسەر رووکار (ظاهر)ی ئایەتەکە مایــەوە، دیــسان بــەپێی فەرموودەکــەی (درووودی خـوای لەسـەربێ) رووی زەوی

هەمووی بۆ خۆم‌و ئوممەتم وەك مزگەوت وایەو خۆڵەكەی پاك‌و پاكەوەكەرەو لەكاتی پێویستدا تەیەمومی پێدەكرێ، لەهەر شوێنی نوێژم لێبوو، تەیەمموم دەكەم‌و نوێژی خۆمی لێدەكەم (موسلیم) ئەوەی كە دەفەرموێ: لەهەر شوێنێ نوێژم لێبوو تەیەمموم دەكەم. بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە هەتا كاتی نوێژەكە نەیێ نابێ تەیەمموم بكا، دیسان لەبەر ئەوەیش كە تەیەمموم پاكییەكی ناچارییە، ناچاری پێویست نابێ لە پێش هاتنی كاتی نوێژەكەدا.

**دووەمیان:** گەڕانە بە شوێن ئاوا، بەپێی ئایەتی: {فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ – سورة المائدة – ٦/٥} یەزدانی پاك فەرمانمان پێدەكا كە لەكاتی دەست نەكەوتنی ئاودا تەیەمموم بكەین، ئەوەیش نایەتە دی‌و نازانرێ كە ئاو لەو شوێنە هەیە یا نییە هەتا بۆی نەگەڕێ، كەواتە ئەو كەسەی كە دەیەوێ تەیەمموم بكا لە سەریەتی لە پێشدا بگەڕێ بۆ ئاو، ئەگەر دەستی نەكەوت ئەوسا تەیەمموم بكا، گریمان كەسێكی تر لە باتی ئەوبگەڕێ دەبێ، بە مەرجی ئەوە خۆی ڕێگەی ئەوەی پێبداو كابرایش جێگەی باوەڕ بێ، چۆنێتی بۆ گەڕانیش ئاوایە: نابارو بنەی خۆی بگەڕێ، چونكە ڕێی تێدەچێ كە ئاوی تیابێ‌و ئەو هەستی پێنەكا، جا ئەگەر دەستی نەكەوت‌و ئەو شوێنە سارایەكی تەخت بوو بڕوانێ بەهەر چوار لای خۆیدا، بە تایبەتی تەماشای سەوزەڵان‌و جێگەی كۆبوونەوەی مەل‌و مۆربكا، ئەگەر شوێنەكە بەرزو نزم بوو، بە ڕوانینی چاو شتەكە تاقی نەدەكرایەوە، پێویستە بگەڕێ بۆ ئاو بەو دەوروبەرەدا هەتا ماوەیێ (مەسافەیێ) كە ئاو دەبرێ بە ماوەی بانگكردن‌و بە هاوارەوە هاتن، كە برێتییە لەو ماوەیە ئەگەر هاوار لە هاوڕێكانی بكا لەكاتی

خەریکبوونیاندا بگەن بە فریایدا، ئەمەیش بەم مەرجە ئەو کەسە مەترسی زیانی گیانو سامانی نەبێ، بەڵام ئەگەر مەترسی ئەوەی هەبوو پێویست بە گەڕان ناکا، ڕەوایە بۆی کە تەیەمموم بکا، چونکە ترسی وا لەکاتی هەبوونی ئاویشدا بەقینی دەبێ بەهۆی ڕەوابوونی تەیەمموم، کە واتە لە کاتێکا کە هەبوونی ئاوەکە شتێکی خەیاڵیبێ باشتر دەبێ بەهۆی ڕەوا بوون!

جا ئەگەر هاوڕێی لەگەڵ بوو دەبێ بپرسێ: کێ ئاوی هەیە؟ پێویستە لەسەری کە ئاوی دەسنوێژو خۆشۆردن بکڕێ، مەگەر ئیشی بە بەهاکەی بێ بۆ مەسرەفی هاتوچۆی ڕۆیشتنو هاتنەوەی سەفەرەکەی، ئەگەر بە نرخی ئاسایی ئاوی بەکڕین دەست نەدەکەت، پێویست ناکا بە گران بیکڕێ بازیادەکە کەمیش بێ ئەمەیش بە گوێرەی فەرمایشتی دامەزراوە!

**سێیەمیان:** دەست نەدانی بەکارهێنانی ئاوە، وەك کەسێ ئاوی دەست دەکەوێ بەڵام لە ترسی نەخۆشیو جێمان لە کاروانی ناوێرێ بە کاری بهێنێ، یا ئاوەکە کە پێویست بێ بۆ خواردنەوەی خۆی یاهی هاوڕێی، یا هی گیاندارێکی بەقەدر، لە ئێستادا یا لە ئاییندەدا، لەم کاتانەدا دەبێ تەیەمموم بکا.

ئەگەر کەسێ مرد، بەشی شۆردنەکەی ئاوی پێبوو بەڵام هاوڕێکانی توونییان بوو، ئەوە ئاوەکەی دەخۆنەوەو تەیەمموومی بۆ دەکەنو، بەهای ئاوەکە دەخەنە سەر کەلەپوور (میرات)ەکەی، کەسانی تینوو دەتوانن بە زۆر ئاو بە بەهای خۆی لە خاوەنەکەی بستێنن، بە مەرجێ خۆی

پێویستیی پێی نەبێ، بەڵام ئەگەر خۆی پێویستیی پێی هەبوو نابی لێی بستێنن چونکە خاوەنی شت خۆی لە پێشترە پێی.

**چوارەمیان:** گڵێکی پاکە، تۆزێکی وای هەبێ بنووسێ بە روخسارو هەردوو دەستەوە، بەپێی ئایەتی: {فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا – سورة المائدة – ٦/٥} واتە: مەبەست لە (صەعیدی طییب) خۆڵی پاکە، وشەی (صەعید) موجمەلە، خۆڵو هەرچی وا لەسەر رووی زەوی بەرێگەوبانیشەوە بەر (صەعید) دەکەوێ، بەڵام پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} لەم فەرموودەیەدا واتای مەبەستی لەم وشە گشتییە دیاری کردووە کە دەفەرموێ: بۆ تەیەمموم خۆڵت بەسە، هەروا لەم فەرمایشتەیشدا: رووی زەوی هەمووی بۆخۆم و ئۆمەتم بۆ نوێژ لێکردن وەك مزگەوت وایە، خۆڵکەیشی پاکەو پاکەوەکەرەو لە کاتی پێویستدا تەیەممومی پێدەکەین (موسلیم). ئەوەتا پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} لە دواگوتنی زوییەوە، ناوی خۆڵیشی هێناوە، هەتا ئاماژە بکا بۆ ئەوە کە خۆڵ بۆ تەیەمموم پێویستە، ئەگەر پاکێتیو پاکەوەکەریی، تایبەت نەبوونایە بە خۆڵەوە، لەباتی ئەمە ئاوای دەفەرموو: رووی زەوی هەمووی بۆ خۆم و ئومەتم هەم وەك مزگەوت وایە، هەم پاکەو پاکەوەکەرەو لەکاتی پێویستدا تەیەممومی پێدەکەین! بۆیە دەبوو وای بگوتبایە چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} روونکەرەوەی مەبەست لە ئایەتە رەهاکانە. ئیبنو عەبباسیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: صەعید برێتییە لە گڵی وەرد! ئیبنو مەسعوودیش {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: صەعید برێتییە لە گڵێ کە تۆزی هەبێ! شافیعی {رەزای خوای لێبێ}

دەفەرموێ: صەعید برێتییە لە هەموو گڵێ کە تۆزی هەبێ، فەرمایشتی شافیعیش لە زماندا دادەنرێ بە بەڵگە، چونکە زمانەوانێکی عەرەبیزانە.

وەك گوترا بەپێی (صعیدا طیبا) مەرجی گڵەکە ئەوەیە کە پاك بێ، چونکە وشەی (طیب) لە زماندا ئەم سێ واتایەی هەیە: ئەوەی دڵ خۆشی لێوەربگیرێ، حەڵاڵ، پاك. لەم سێ واتایەیش پاك بۆ خۆڵ دەگونجێ، لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەریشدا {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: خۆڵکەیشی پاکەو پاکەوەکەرە بەڵگە هەیە لەسەر ئەم قسەیە کە (طیب) بە مەعنا طاهرو پاکە![1] وەکی تریش ئاوی پیس دەسنوێژی دروست نیە، کەواتە وەجەڵی ئاویش کە خۆڵە لە تەیەمومدا کە تەیەمموم وەجەڵ (بەدەل)ی دەسنوێژە، دەبێ وەك ئەو وابێ، نابێ پیسبێ، دەنا تەیەممومی پێ دروست نابێ.

---

(١) لە موغنی موحتاجدا دەفەرموێ: حەدیسی: (رووی زەوی هەمووی بۆ خۆمو ئۆمەتم وەك مزگەوت وایەو، خۆڵەکەیشی پاکەو پاکەوەکەرە) ئەم گێڕانەوەیە روونکەرەوەو موبەیینە بۆ ئەو گێڕانەوە رەها (موطلق)ەی کە ئەمەی تیایە: (رووی زەوی هەمووی بۆ خۆمو ئۆمەتم هەم وەك مزگەوت وایە، هەم پاکەو پاکەوەکەرە). کەواتە لە عیبارەتی کتێبەکەی بەردەستماندا ئاڵۆزیو شێواوی هەیە. لە زۆر شوێنی تریش شتی وا هەیە.

## ٢٨) فەرزەکانی تەیەممووم:

**تەیەممووم چوار فەرزی هەیە:**

**فەرزی یەکەم:** نیەتە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: گشت کارێ بەپێی نیەتەکەیەتی چۆنێتێکەشی ئەوەیە نیەتی حەلاڵکردنی نوێژ بهێنێ، نەك هی لابردنی بێدەسنوێژی، چونکە تەیەممووم پاکیی ناچارییە، بێدەسنوێژی لا نابات، بەپێی فەرمایشتەکەی {درودی خوای لەسەربێ}. بە عەمری کوڕی عاص: چۆن بەرنوێژیت بۆ هاورێکانت بە لەشی پیسەوە کردووە!). ئەگەر تەیەممووم بێ دەسنوێژی لاببردایە پێی نەدەفەرموو:بە لەشی پیسەوە، کەواتە: برێتییە لە حەلاڵکردنی نوێژو لە حەلاڵکردنی ئەو شتانەی بەبێ پاکی ناکرێن. کاتێکیش نیەتی ڕەوادیتنی هێنا ئەم چوار بارەی هەیە:

**باری یەکەم:** نیەتی ڕەوادیتنی فەرزو سوننەت بەیەکەوە بهێنێ، ئەوە هەردوولایانی بۆ ڕەوا دەبێ، بۆی هەیە سوننەتە کە لەپێش فەرزەکەدا بکا، یا بە پێچەوانەوە، هەروا بۆی هەیە لەکاتی خۆیاندا بیانکا، یا لە دەرەوەی کاتیاندا.

**باری دووەم:** نیەتی فەرز بهێنێ، فەرزەکەی بۆ دروست دەبێ، هەروا سوننەتی پێش‌و پاشی بۆ ڕەوا دەبێ.

**باری سێیەم:** نیەتی سوننەت بهێنێ بەتەنها، لەم بارەدا لەسەر فەرمایشتی دامەزراو فەرزی بۆ دروست نییە چونکە سوننەت پاشکۆ (تابیع)ی فەرزە.

**باری چوارەم:** نیەتی نوێژی رووت بێنیٚو بەس، ئەم بارەیش وەك باری سێیەم وایە، لەسەر فەرمایشتی دامەزراو بەس مافی سوننەتی هەیە.

**فەرزی دووەمو سێیەمی تەیەمموم:** دەسهێنانە بە روخسارو بە هەردوو دەستدا، لەسەر پەنجەکانەوە هەتا لای ژووری هەر دووئانیشك. بەپێی ئایەتی {فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم - سورة المائدة - ٦/٥} . گەرچی لە ئایەتی تەیەممومدا باسی ئانیشك نەکراوە، بەڵام چونکە تەیەمموم وەجەڵی دەسنوێژە لە دیاریکردنی ئەندازەی دەسهێنان بە ئەندامەکانیدا حوکمو بڕیاری دەسنوێژی پێدەدریٚ، لە دەسنوێژیشدا ئەندازەی دەست هەتا سەر ئانیشکە، کەواتە لە تەیەممومیشدا هەروا، وە بەپێی کردنی پێغەمبەریش {درووودی خوای لەسەربێ} کە دەستی دەهێنا بە هەردوو دەستتدا هەتا هەردوو سەر ئانیشك، بەپێی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر: پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: تەیەمموم برێتییە لە دوو پیاکێشان، یەکێکیان بۆ دەموچاو، ئەوی تریان بۆ هەردوو دەست هەتا هەردوو ئانیشك! حاکم ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو وەسفی جوانیشی کردووە، هەروەك بە قیاس لەسەر دەسنوێژ دەسهێنان بە ئانیشکدا پێویست دەبیٚ، چونکە وەك گوترا: تەیەمموم وەجەڵی ئەوە. لەسەر فەرمایشتیٚ، یەك پیاکێشان بەس دەکا، کە مەسحی روخسارو هەردوو لەپی پیٚ بکریٚ، بەپێی فەرموودەکەی عەممار: پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} پێی فەرمووم: تەنها ئاوەهات بەس بوو، ئەوجا پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} هەردوو لەپی خۆیی ماڵی بەسەر رووی زەوییەکەداو فووی لێکردن تا تۆزەکەیان تۆزیٚ سووك بیٚ، ئەوسا بە هەردوو ناولەپی

مەسحی دەمووچاوو هەردوو دەستی خۆیی تا هەردوو مووچی کرد (شەیخان) شافیعی دەفەرموێ: هەرکاتێ دەرکەوت کە فەرموودەیەکی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەسەر مەسەلەیێ هەیە، وە فەرموودەکەیش ساخ بوو، لاوازو بێهێزنەبوو، ئیتر پەیرەوی ئەوە بکەن، وەبزانن کە ئەوە رێبازو مەزهەبی منە. دیارە کە حەدیسەکەش ساخو صەحیحە. نەوەوی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەلگەیەکی زۆر بەهێزە، لە دیمەنی سوننەتیشەوە زۆر نزیکە.

**چوارەم فەرزی تەیەممومـ:** ریزلێکرتنە، کەواتە: پێویستە روخسار لە پێش دەستدا تەیەمموم بکرێ، چونکە ئەندامی پاکێتی تەیەمموم دوانن، کەواتە لە دەسنوێژ دەچێو وەك ئەو ریزلێگرتنی فەرزە، پێویستە ئەنگوستیلە دابکەنرێ، چونکە خۆڵ ناچێتە ژێری، بە پێچەوانەی ئاوی دەسنوێژەوە، چونکە لەودا داکەندنی ئەنگوستیلە فەرز نیە ئەگەر ئاو ژێری تەڕ دەکرد.

## ٢٩) سوننەتەکانی تەیەمموم:

سوننەتەکانی تەیەمموم سێ شتە: ناوی خوا هێنانو پێش خستنی لای راست لەسەر لای چەپو بەین نەکەوتن (مووالات). بەپێی ئەو بەلگانەی لە دەسنوێژا لە پێشەوە رابوردن، بە قیاسیش لەسەر دەسنوێژ، سوننەتە تۆزەکە لە هەردوو لەپی سووك بکاو، لەلای ژوورووی روخسارەوە بهێنێتە خوارەوە، وە لە سەرەتای هەردوو جارەکەوە کە دەست دەدا بە زەویدا پەنجەکانی بلاوبکاتەوە، وە لەپاش دەسهێنان بە هەردوو دەستا نێوانی پەنجەکانی بئاژنێتەوە، کە دەستیش دەهێنێ بە

ئەندامەكانیدا هەتا دەسپیاهێنانەكەی تەواو نەكا دەست هەڵنەبڕێ، تا لە ڕاجیایی كەسانێ كە ئەمە بە پێویست دادەنێن دەربازبین.

## ٣٠) بەچی تەیەمموم پووچ دەبێتەوە:

**تەیەمموم بەم سێ شتە پووچ دەبێتەوە:**

**یەكـەم:** ئـەوەی دەسـنوێژ بـەتاڵ بكاتـەوە تەیـەممومیش بـەتاڵ دەكاتەوە، چونكە ئەویش وەك دەسنوێژ پاكییەكە نوێـژی پێـرەوا دەبـێ، كەواتە ئەویش بەتاڵ دەبێتەوە بە هەموو جۆرە بێدەسنوێییەك.

**دووەم:** دەسكەوتنی ئاوە لە غـەیری كاتی نوێژەكـەدا، ئەگـەر كەسـێ تەیەممومی كرد لە بەرنـەبوونی ئـاو، بـەڵام پـێش ئـەوەی دەسـت بكا بـە نوێژ ئاوی دەسـكەوت ئـەوە تەیەممومەكـەی پووچـە، بـەپێی فەرمایـشتی (دروودی خوای لەسەربێ): خـۆڵی پـاك ئـاوی دەسـنوێژی موسوڵمانە بـا دەسـاڵیش لەسەر یەك ئاوی دەست نەكەوێ، بـەڵام هـەركاتێ ئـاوی دەسـت كـەوت بـا دەسنوێژی پێگرێ (ئەحمەد ، تیرمیذی ، تیرمیذی بە ساغی داناوە).

ئەگەر ئاوی دەستكەوت بەڵام بەرگرێ هـەبوو لـە بـەكارهێنانی، وەك ئەوە پێویستی بوو بـۆ خواردنـەوە، یـا ڕێگرێكـی لەسـەربوو وەك دڕنـدەو دوژمـن و شـتی تـری وا، ئـەوە تەیەممومەكـەی پـووچ نابێتـەوە، چـونكە ئەمانە لە سەرەتاوە هـۆی دروسـت بـوونی تەیـەممومن، ئـیتر چـۆن دەبـن بەهۆی پووچ بوونەوەی. وەلێ ئەگەر لەپاش دەستكردن بە نوێژەكە ئـاوی دەسـت كـەوت، ئـەوا نـە تەیەممومەكـەی پـووچ دەبێتـەوە نـە نوێژەكـەی، چونكە ئەوە دەبـێ بـەهۆی پووچكردنەوەی پەرسـتنێكی لـە كۆڵخـەرەوە،

هاوکات لەگەڵ ئەوەدا بە دەستپێکردنی نوێژەکە دەچێتە ناو مەبەستەوە، کەواتە وەك چۆن کەفارەتدەر پاش دەستکردن بە رۆژووی کەفارەت بەندەیشی دەستبکەوێ، پێویست نیە لەسەری ئازادی بکا، ئەمیش هەروا.

**سێیەم:** وەرگەڕان لە ئیسلام، چونکە ئەوە هەموو کردەوەیەك پووچ دەکاتەوەو گشت پاداشتێ دەفەوتێنی، تەیەمومیش کردەوەی باشە، چونکە عیبادەتە.

## ٣١) دەسهێنان بەسەر تەتەو موشەممادا:

تەتە (شەپك: جەبیرە): تەتەڵەدارو موشەممای گەچو شتی وا کەئێسکی شکستی پێهەڵ دەبەسترێتەوە، مەبەست لە موشەممایش ئەو پەڕۆو دەستە سرو شتانەیە کە برینی پێدەپێچرێ. جا ئەم جۆرەکەسانە ئەگەر تەتەو موشەمماکەیان پێویست بوو، وە بەبێ زیان قابیلی لابردن بوو لەکاتی وەرگتنی پاکیدا، ئەوە پێویستە داپۆشەرەکە لاببا، ئەوجا ئەوەی ساغە بیشوا ئەگەر دەیشگونجا جێگەی نەخۆشینەکەیش بشوا، دەنا لەباتی ئەوە تەیەمموم بکا، ئەگەر شوێنەکەی لە ئەندامی دەسنوێژبوو بەڵام ئەگەر قابیلی لابردن نەبوو، ئەگەر لایبردایە تووشی زیان دەبوو، ئەوە داوای لێناکرێ کە لای ببا، بەڵام پێویستە ئەوەی ساغە بیشوا، هەتا دەبێ ژێر قەراخی تەتەکەیش بشوا، ئەگەر دەستی دەدا ئەوجا دەستی تەڕ بهێنێ بەسەر تەتەکەدا، لەپاش ئەوە یەکسەر تەیەمومیش بکا، بەپێی فەرموودەکەی جابیر {رەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: لە سەفەرێکا بەردێ دای لە پیاوێکمان سەری شکان، لەپاشا

شـەیتانی بـوو، لـە هاوڕێکـانی پرسـی گـوتی: ئایـا رێگـەی تەیـەممومم پێدەدەن؟ دەڵێت: نەء، رێگەت پـێ نـادەین، چونکه تـۆ دەتوانیـت ئـاو بـە کاربێنی، ئەویش خۆی شۆردو مرد، جا کـە هاتینـەوه بـۆلای پێغەمبـەرو ئـەم باسـەیان بۆیگێڕایـەوه فـەرمووی: کوشـتوویانە خـودا بیـانکوژێ، کـە خۆیـان نـەیانزانیوه، بـۆ نەیانپرسـیوه لـە زانایـێ، چونکە چاری نـادانی تـەنها پرسـینەو فێربـوون). ئـەم پیـاوە تـەنیا ئەوەنـدەی بەسـبوو کـە لـە جیـاتی شـۆردنی شـوێنە زامارەکـەی بـە خـۆڵ تەیـەممومی بکردایـەو بـە پـەڕۆیێ برینەکـەیی بپێـچایەو ئینجـا لـەجیاتی شـۆردنی ژێرپەڕۆکـە دەسـتی تـەڕی بەسـەر ئـەو پەڕۆیـەدا بهێنایـە، وە بـاقی مەنـدەی لەشـی بشۆردایە (ئەبو داوود، ئیبنو ماجه، داره قوطنی). لێرەدا سەرنج دەدەین ئەگەر خاوەن تەتەکە لەشی پیسبوو ئـەوە خـۆی سەرپشکە دەتوانـێ لـە پێشدا خۆی بشۆرێو لـە پاشـدا تەیـەمموم بکـا یـا بـە پێـچەوانەوە، بەڵام ئەگەر بێ دەسنوێژ بوو، نابێ لە ئەندامێکەوە بگوێزێتەوە بۆ ئەندامێکی تـر هـەتا بـە تـەواوی دەسـنوێژی ئـەو ئەندامـە تـەواو دەکـا، چـونکە بـە دەسنوێژدا رێزلێگرتن پێویستە. جا ئەگەر شکستو برین هەرچوار پـەلی داگرتبوو ئەوە یەك تەیەممومی بەسە، چونکە لە لە کۆڵکەوتنی شۆردن ریزلێگرتنیش لە کۆڵ دەکەوێ!

ئەوەندە هەیە ئەگەر تەتەو موشەمماکە لە سەرپاکی دانەنرا بـوونو ژێرەکـەیان پـیس بـوو ئـەوە دەبـێ لـە پـاش خۆشـەوەبوون نوێژەکـە بگێڕێتـەوە، چونکە لـە دەسـنوێژو خۆشـۆردندا لابردنـی پیسـی مەرجـە. مایەوە سەر ئـەوە ئەگـەر زامەکـە پێویسـتی بـە تەتـەو موشـەمما نـەبوو، بـەڵام دەترسـا کـە ئـاودز بکـا، ئـەوە بـەپێی توانـا سـاغەکە دەشـواو لـە

سەریەتی تەیەمموم بکا بەڵام پێویست بە دەستی تەرهێنان بەسەر شوێنی دەردەکەدا ناکا.

## ٣٢) پێویستە بۆ هەموو فەرزێ تەیەمومێ بکا:

لە پێشەوە باسی نیەتو گەلێ شتی تری تەیەمومان کرد، لێرەدا روونی دەکەینەوە کە بەیەك تەیەمموم یەك فەرز دەکرێ، بۆ ئەمەیش جوانترین بەڵگە فەرموودەکەی خوای گەورەبە: {إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ – سورة المائدة – ٦/٥} . هەتا ئەوێ کە دەفەرموێ: {فَتَيَمَّمُواْ – سورة المائدة – ٦/٥} . بەپێی ئەم ئایەتە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە، دەسنوێژ یا تەیەمموم بۆ هەموو نوێژێ فەرز بوو، هەتا لە دوایيدا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بە کردەوە چەسپاندی کە دەسنوێژێ بۆ چەند فەرزێ دەبێ، ئەوە بوو: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە رۆژی فەتحی مەککەدا بەیەك دەسنوێژ هەرپێنج نوێژە فەرزەکانی کرد (فەرموودەیەکی ساغە، ئیبنو عومەر گێراویەتەوە) بەڵام تەیەمموم بەپێی خوازە (موقتەضا)ی ئایەتەکە مایەوە کە یەك تەیەمموم بۆ یەك فەرزە. ئیبنو عەبباسیش {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: رێبازی سوننەت وایە: کەیەك نوێژی فەرز بەیەك تەیەمموم بکرێ. وشەی سوننەت لە فەرمایشتی سەحابیدا دەبرێ بەسەر رێبازو سوننەتی پێغەمبەردا {دروودی خوای لەسەربێ} کە برێتییە لەو بەرنامەیەی کە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لەسری بەردەوام بووە، کەواتە: حەزرەت بەکردەوە خوازەی ئایەتەکەی لە تەیەمموما چەسپاندووە!.

بەیهەقیش لە ئیبنو عومەرەوە {رەزای خوایان لێبێ} دەگێڕێتەوە: فەرموویەتی: با دەسنوێژیشی نەشکێ مرۆڤ دەبێ بۆ هەموو نوێژێکی فەرز تەیەمومێ بکا. ئەوەندە هەیە بە یەك تەیەموم دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی چەندەی دەوێ نوێژی سوننەت بکا، چونکە نوێژی سوننەت با زۆریش بن لە حوکمی یەك نوێژدان، بە بەلگەی ئەوە: ئەگەر نوێژکەرێ نیەتی یەك رکات سوننەتی هێنا بۆی هەیە سەد رکات بکا بەسەر یەکەوە بەو نیەتە، بە پێچەوانەشەوە هەروا، وەکی تریش بۆ هەموو سوننەتێ تەیەمومێ بکرێ ئەرکێکی زەحمەتە، رەنگە شتی وا گەلێ جار ببێ بەهۆی ئەوە سوننەتەکە تەرك بکرێ، لەبەر ئەوە شەرع لە سوننەتدا کارەکەی سووکەڵە کردووە، ئەوەتا نوێژی سوننەت، لەگەڵ توانای راوەستاندا بەدانیشتنەوە دروستە، بەسوراییی ولاخیش دروستە، لە سەفەردا لەکاتی رۆیشتندا بەرەو قیبلەیش نەبێ هەر دروستە، بۆ ئەوەی مەودای کردنی زۆربێ و موسوڵمان لێی دانەبڕێ. گریمان لەشپیس یا بێ دەسنوێژ ئاوەکەی کە هەبوو بەشی نەدەکرد، پێویستە لەسەری ئەوە بکار بهێنێ و بۆ باقی مەندەکەی تەیەمموم بکا، چونکە چەندەی کارێ کە لە توانادا هەیە بەهۆی باقی مەندەکەیەوە کە لە توانادا نیە لەکۆڵ ناکەوێ، لە شارعا بەمە دەگوترێ: توانراو بەهۆی نەتوانراوەوە لەکۆڵ ناکەوێ یائاسان بەهۆی گرانەوە لەکۆڵ ناکەوێ! هەروا ئەگەر پیسی بەسەر لەشیەوە هەبوو، وە ئەوەندەی ئاو دەست کەوت کە بەشی شۆردنی بڕێکی دەکرد، لە سەریەتی ئەو ئەندازەیە بشۆرێ. ئەگەر دەسنوێژی نەبوو، یا لەشی پیسبوون پیسییەکیش بە جەستەیەوە هەبوو، ئەوەندەیشی ئاو هەبوو کە بەشی لایەکیانی دەکرد، ئەوە پیسییە

کە دەشۆرێ‌و تەیەمموم دەکا، چونکە لابردنی پیسییەکە پێویستەو وەجەلێ تری نیە، بە پێچەوانەی دەسنوێژو خۆشۆردنەوە، چونکە وەجەڵیان هەیە کە تەیەممومە، ئەگەر کابرا نە ئاوی دەستکەوت‌و نەگڵ، نوێژی خۆی هەر دەکا، لەبەر رێزی کاتەکە، بەڵام لەوەدوا دەیگێرێتەوە.

## ٣٣) باسی پیسی (النجاسه):

پێناسەکەی: پیسی لە زماندا بەهەموو قیزەونێ دەگوترێ، لە شەرعیشا: هەموو شتێکە کە لە حاڵی سەرپشکیدا بەرەهایی بەبێ سنوور خواردن‌و خواردنەوەی نا دروست بێ، لە هەمانکاتدا بگونجێ بۆ خواردن‌و خواردنەوە، نادروستییەکەیشی لەبەر رێزی نەبێ، یا لەبەر ئەوە نەبێ کە قێزەونە، یا لەبەر ئەوە نەبێ کە زیانی هەبێ بۆ لەش یا بۆ هۆش. جا بەهەریەکێ لەم قەیدانە شتێ بەر پێناسەی پیسی دەکەوێ یا لێی دەردەچێ، بەگوتەی: لە حاڵی سەرپشکیدا، شتێ کە لەحاڵی سەرپشکیدا حەرام بێ‌و لەحاڵی ناچاریدا حەلاڵ بێ، وەك مردارەوەبوو، بەردەکەوێ، چونکە مردارەوەبوو لە حاڵی ئاساییدا. پیسەو حەرامە، بەڵام لە حاڵی ناچاریدا پاکەو بۆ ناچار حەلاڵ! بە گوتەی: بەرەهایی بەبێ سنوور رووەکە ژەهراوییەکان بەرناکەون، چونکە ئەوانە پاکن کەمیان رەوایە، زریان نارەوایە، بە گوتەی: بگونجێ بۆ خواردن‌و خواردنەوە بەردو شتی رەقی سەخت، کە پاك بن بەر ئەم پێناسەیە ناکەون، چونکە بە کەڵکی خواردن‌و خواردنەوە نایەن، بە گوتەی: نادروستییەکەیشی لەبەر رێزی نەبێ، شتی رێزدار وەك ئادەمیزاد

دەردەچێ‌و بەری ناکەوێ، بەگوتەی: یا لەبەر ئەوە نەبێ کە قێزەونە چڵم‌و شتی وا بەرناکەوێ، چونکە نادروستی چڵم لەبەر ئەوە نیە کە پیسە، بەڵام لەبەر ئەوەیە کە قیزەونە، بە گوتەی: یا لەبەر ئەوەنەبێ کە زیانی هەبێ بۆ لەش یا بۆ هۆش خۆڵ لە پێناسەکە دەردەچێ، چونکە زیان دەگەیەنێ بە لەش‌و هۆش.

هەندێکیش ئاوا پێناسەی دەکا: قیزەونێکە رێگەی دروستبوونی نوێژ ناد، مەگەر مەهانە هەبێ، برێ دەڵێن: برێتییە لە هەموو شتێ کە خاوەن سروشتی دروست قێزی لێبکاتەوەو خۆیی لێبپارێزێ، ئەگەر بەرجل‌و بەرگیش بکەوێ دەیشۆرن.

## ٣٤) حوکمی ئەو پارچەیەی کە لەناو لەشی گیاندارەوە جیادەبێتەوە:

**بزانن هەرشتێ لە ناوەوەی گیاندار جیابێتەوە دوو جۆری هەیە :**

**یەکەمیان :** گەدە نایگۆڕێ وەك لیك‌و ئارەق‌و شتی وا، حوکمی ئەم جۆرە وەك حوکمی ئەو گیاندارە وایە کە لێی جیابۆتەوە، ئەگەر ئەو لە حاڵی لێجیابوونەوەکەدا پاکبوو ئەویش پاکە ئەگەر ئەو لەوکاتەدا پیس بوو ئەمیش پیسە.

**دووەمیان :** گەدە هەرزی دەکاو دەیگۆڕێ، وەك گمیزو پیسایی‌و شیاکەو پشقل‌و خوێن‌و رشانەوە، هەموو ئەمانە هی هەرگیانداری بن پیسن، هی ئەوانەی گوشتیان ناخورێ بە یەکگرتنی رای زاناکان، بەگوێ

دەنگ دەڵێن: شتی واتە: قیسە. هی ئەوانەیشی گۆشتیان دەخورێ بە قیاس لەسەر هی ئەوانەی کە گوشتیان ناخورێ، چونکە ئەمیش گۆڕاوەو حەل بووەو قێزەون بووە. بە فەرموودەکەی ناسراوە بە حەدیثی عەرەبە سارانشینەکە پیسێتیی گێمز پاساو دەدرێ، ئەوەبوو کە گمێزی لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا کرد، پێغەمبەر فەرمانی کرد کە (سەتڵێ ئاو بکەن بەسەر جێ میزەکەیدا). هەروا فەرموودەی باسی دوو گۆڕەکە: یەکێکیان لەسەر ئەو ئازار دەدرێ چونکە لە حاڵی ژیانیدا خۆی لە گمێزی خۆی نەدەپاراست (موسلیم) بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} فەرمانی کردووە بە خواردنەوەی میزی حوشتر، ئەوە بۆ دەرمان بووە، دەرمانکردنیش بەپیس دروستە، بە مەرجێ دەرمانێکی پاك نەبێ جێگەی بگرێتەوە، ئەوەیش کە خۆشەویست {درووده خوای گەورەی لەسەربێ} فەرموویەتی: خودای گەورە هەرگیز خۆشەوەبوون‌و شیفای گەلی منی نەبەستووە بەشتی واوە کە خۆی حەرامی کردبێ لێیان. ئەمە دەبڕدرێ بەسەر مەی‌و بادەدا، سەرەڕای یەکگرتن بەڵگەی پیسێتیی پیسایی ئەم فەرموودەی {درووده خوای لەسەربێ}: لەبەر میزو پیسایی‌و مەزی‌و رشانەوە جلەکەت بشۆرە (ئەحمەد، دارە قوطنی ، بەززار) هەر لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی پیسێتیی مەزی‌و رشانەوەیشی تیادایە. مەزی ئاوێکی مەیلەو سپی تەڕاوی لینجە، بەبێ لەزەت پێگەیشتن، لە کاتی هێرشی ئارەزوودا بەهۆی دەسبازی‌و تەماشاکردن‌و شتیواوە پەیدا دەبێ. تەرس‌و تەپاڵەیش پیسە، بەپێی ئەم فەرموودەیە:... جا پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} هەر دوو بەردەکەی وەرگرت‌و تەرسەقولەکەی تووڕداو، فەرمووی: ئەمە پیسە، بەکاری خۆپاککردنەوە نایێ. وەدیش پیسە بەپێی فەرموودەکەی عائیشە

{رەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: وەدیش لەپاش میزکردنەوە پەیدا دەبێ، حوکمەکەی ئەوەیە: چووكو گەڵو گونی دەشواو دەسنوێژ دەگرێ وەخۆشۆردنی لەسەر نیە (ئیبنو لمونزیر).

وەدی ئاوێکی مەیلەو سپی خەستی لێلی لیقنە لە دوامیزو لەکاتی هەلگرتنی شتی قورسدا پەیدا دەبێ، خوێنیش پیسە بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {حَرَّمَن عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالْدَّمَ - سورة مائیدة - ٣/٥} هەتا کۆتایی ئایەتەکە، بەپێی ئەم فەروودەیەش: کە دەفەرموێ: - خوێنەکە لە خۆت بشۆرەو نوێژی خۆت بکە) زاناکان لەسەر پیسێتیی تۆماو رایان جیاجیایە، هەیە دەڵێ: پیسە، ئەم رایەیان لەو گێڕانەوەیە وەرگرتووە کە فەرمان دەکا بە شۆردنی، کە ئەمە گفت (لەفظ)ە کەیەتێ عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرد دەفەرموێ: جاران ئەسەری لەشپیسیم بە جلەکانی پێغەمبەرەوە دەشۆرد، کە دەچوو بۆ نوێژ هێشتا جێگەشۆراوەکە هەر تەڕ بوو. رێبازی شافیعیو هاوڕێیانی فەرمووده (ئەصحابول حەدیث)و خەڵکێکی زۆری تر، کە عەلیو سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصو ئیبنو عومەرو عائیشە {رەزای خوادای کەورە لە هەموویان بێ} لە ناویاندایە، رێبازی ئەم زاتانە ئەمەیە: کە تۆماو پاکە، دوو گێڕانەوەیش لە ئەحمەدەوە ریوایەت کراوە، کە ئەمە دروستترینەکەیانە! داوودیش هەروا دەفەرموێ: بەلگەیان بە فەرمایشتی عائشە هێناوەتەوە کە دەفەرموێ: خۆم بە دەستی خۆم تۆماوی وشکەوەبووم بە جلەکانی پێغەمبەرەوە دەووڵیو لە پاشا دەمدەکاند، ئیتر لەدوا ئەوە بەبێ شۆردن پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژی پێوە دەکردن، لە گێڕانەوەیەکی تریدا کە پەسەندی هەردوولایە متفق علە): فەرمووی: بە جلی پێغەمبەرەوە

تۆماوی وشکەوەبوو هەبوو دەیم کرانید، ئیتر دوا ئەوە نوێژی پێوە دەکرد. دەی ئەگەر تۆماو پیس بێ ولێن‌و کرانیدنی بەس نیە، دیارە گێرانەوەی شۆردن دەبرپردرێ بەسەر ئەوەدا کە سوننەتەو بۆ پەسەندکردنی پاکیەیە، بەم ساخکردنەوەیش کار بە کۆی بەلگەکان دەکرێ‌و هیچیان لەکار ناخرێ، جیاوازیش نیە لەنێوانی تۆماوی پیاوو ژندا، تۆماوی غەیری ئادەمیش، ئەگەر هی گیانلەبەرێکی پاك بوو تۆماوەکەش پاکە، ئەگەر هی گیاندارێکی پیس بوو خۆشی پیسە.

## ٣٥) شۆردنی پیسی:

شۆردنی پیسی پێویستە، چونکە وەك لە پێشەوە رابورد فەرمانی پێکراوە. چۆنێتێکەیشی ئاوایە: ئەگەر پیسیەکە قەبارەدار بوو، بە چاو دەبینرا، دەبێ قەبارە بینراوەکەی‌و تامەکەی‌و رەنگەکەی‌و بۆنەکەی لابرێ، ئەگەر تامەکەی ما، ئەوە شوێنە پیسبووەکە پاك نەبۆتەوە، بەلام زیانی نیە مانەوەی رەنگێ یا بۆنێ کە لاچوونیان گران بێ، وەك رەنگی خوێنی بێنوێژیی‌و بێنێ مەی. بەلام پیسیی برپاری‌و حوکمی، کە ئەوەیە بە چاو نابینرێ، وەك شلەمەنیە پیسەکان، کە تام‌و بۆن‌و رەنگیان نیە، پێویستە بە شۆردنێکی ئاسایی لابرێ، دەستی تێبخرێ‌و گوشاری لێبکرێ، بەلام هەرچی پیسبووبێ بە میزی منالی نێرینەی کەمتر لە دوو سال، کە جگە لە شیر هیچ خۆراکێکی تری نەخواردبێ، ئەوەنە ئاوی لێدەپرژێ کە شوێنی میزەکە دابگرێ‌و زال بێ بەسەریدا، ئیتر رەوانبوونی ئاو بەسەر شوێنەکەیدا پێویست نیە، بەلام میزی

کچۆڵە گەرەکە بشۆرێ، بەڵگەی ئەم جیاوازییە لە نێوانی کوڕو کچدا فەرموودەکەی عائیشەیە: کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کوڕێکی ساوای مەمکە خۆرەیان هێنا بۆی، منالەکە میزی کرد بە کۆشیدا، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} داوای ئاوی کردو ئاوەکەی کرد بەسەر جێگەی میزەکەدا ئیتر نەیشۆرد.. لە گێڕانەوەیەکدا: لێی پرژاند لە گێڕانەوەیەکی رتدا: پرژاندی بەسەر جێگەکەیداو ئیتر نەیشۆرد. ئەم گێڕانەوانە هەموویان دروستن، لە گێڕانەوەیەکی تیرمیذیدا: میزی کوڕ تا نانەخۆرە دەبێ ئاوی لێ دەپرژێنێ، میزی کچ دەشۆرێ. ئیمامی علی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: میزی کچۆڵەی بەرمەمکانە دەشۆرێ، میزی کوڕیش هەتا نانەخۆرە دەبێ ئاوی لێ دەپرژێنرێ. (ئەحمەد). بەڵام هەر کاتێ منداڵەکە لە جیاتی بژێوی و خۆراك خواردەمەنی خوارد، ئەوە بەبێ راجیایی پێویستە میزەکەی بشۆرێ. بۆیەیش سەبارەت بە کوڕ کار سووك کراوەو، بۆ کچ نەکراوە، چونکە دڵ پتر پەیوەندی بە کوڕەوە هەیە هەتا کچ لەبەر ئەو زیادە پەیوەنییە کوڕ زۆرتر دەکرێتە باوەش، جا وا هەڵ دەگرێ کە بۆ بارسووکی کارەکە ئاسان بکرێ، بەڵام ئەم مەبەستە لە مێینەدا نایەتەدی، بۆیە شۆردن بۆ میزی ئەوان چەسپاوە، لەسەر قیاس و پێدانی خۆی(*)

---

(*) ئەم بەڵگەیەی کە هێنراوەتەوە بۆ جودایی نێوان میزی منداڵی نێرومێ بەڵگەیەکی لاوازو نازانستییە خۆ ئەگەر هۆیەکەش نازاندرێ دەتوانین بڵێین (تعبدیە) ئەگینا خۆ کوڕو کچ چۆن یەکە ئەگەر باوك و دایکی و هەبن کوڕیان لە کچ خۆشتربوێ هی وایش هەن کچیان لە کوڕەکەیان خۆشتربوێ - محمود.

## ٣٦) بڕیار (حوکم)ی گیانداریٚ له ناوشتی شلدا بمریٚ:

کاتیٚ گیانداریٚ کەوتە ناو شتێکی شلەوە، وەك رۆن زەیتو رۆنو چێشت، وەتیامرد، ئەوە ئەگەر خوێنی رەوانیان هەبوو شتەکە پیس دەبیٚ، چونکە سەبارەت بە مشکی تۆپیوی ناورۆن لە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پرسیارکرا، فەرمووی: ئەگەر رۆنەکە توند بوو مشکەکەو دەوروبەرەکەی فڕەدەن، بەلاّم ئەگەر رۆنەکەش شل بوو ئەوا بیرێژن، لە گێڕانەوەیەکا: مشکەکەو دەورو بەرەکەی فڕەدەنو رۆنی خۆتان بخۆن. (ئەم فەرموودەیە بوخاری گێڕاویەتەوە).

جا فەرمانکردن بە رژانی، بەلگەیە لەسەر پیسبوونی، ئەم رایەیش رێبازی جەماوەری زاناکانە، دەستەیێ رایان جیایە، کەیەکێ لەوان زوهریو ئەوزاعین، دەفەرموون: بڕیاری شتی شل وێنەی بڕیاری ئاوە، پیس نابیٚ هەتا ، پیسییەکە نەیگۆڕی، ئەگەر نەگۆڕا پاکە، ئەمە رێبازی ئیبنو عەبباسو ئیبنو مەسعوودو بوخاریشە.

بەلاّم ئەگەر گیاندارەکە خوێنی رەوانی نەبوو، وەك مێشو مێشوولەو دووپشكو قالۆنچەو سیسرکو میروولەو وێنەی ئەمانە، ئەوە شلەمەنی بە مردنی ئەمانە لە ناویدا پیس نابیٚ، بەپێی فەرموودەی {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەگەر مێش کەوتە ناو حاجەتێکتانەوە ئاو یا شتی شلی تری تیابوو، لە پێشا مێشکە هەمووی نوقم بکەن ئینجا دەری بێننو فڕەی بدەن، چونکە بالێکی دەرمانی پێوەیەو ئەو بالەکەی تری دەردە. (بوخاری، ئەبو داوود، ئیبنو خوزەیمە، ئیبنو حەببان). دیارە

فەرمانکردن بە نوقمکردنی مێشەکە، کە گەڵێ جار سەردەکێشێ بۆ تۆپینی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پیسی ناکا، دەنا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی نەدەکرد بەنوقمکردن، وەکی تریش پاراستنی قاپو حاجەت لەم جۆرە وردە جانەوەرانە ئەستەمە، لەبەر ئەوە چاوپۆشی لێدەکرێ، بە مەرجێ ئەوەندە زۆر نەبێ کە شلاوەکە بگۆڕێ، دەنا پیس دەبێ.

بزانن پیسییەك کە بەچاو نەبینرێ وەك پریشکی میز، یا وەك پیسییەك کەوا بەپێی مێشەوە ئەویش وەك مرداری خوێنی رەوانی نەبێ چاو پۆشی لێ دەکرێ، لەسەر فەرمایشتی دامەزراو بەلای نەوەویەوە، چونکە ئەمە لە خوێنی کێچ دەکا خۆپاراستن لێی ستەمە.

## ٣٧) بڕیاری پاکیو پیسی گیاندار لەکاتی ژیانیدا:

لە بنەڕەتدا هەموو گیانداری پاکە، واتە: ئەصڵ ئەوەیە کە پاکن، چونکە بۆ قازانجی بەندەکانی خوا دروستکراون، بەبێ پاکیش سوودمەندی تەواو پەیدا نابێ، ئەمەیش بەم فەرموودەیە پاساو (تعليل)کراوە. پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: پشیلە پیس نیە، پشیلەیش لە ریزی کارەکەرو نۆکەرو ئەوانەیە کە بۆ خزمەت بەسەرتانا دەخولێنەوە (پێنج لە خاوەنەکانی کتێبە ناودارەکانی حەدیث ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، وە تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی دروستە. دروست واتە: ساغ) بەڵام سەگو بەراز بۆ پاکی لە هەموو گیانداری جیان، چونکە ئەم دووە خودپیس (نجس العين)ن،

سەگ بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: (پاکەوەکەری حاجەتێکتان: کە سەگ دەمی تێبنێ ئەوەیە: کە حەوت جار بە ئاو بیشۆرن، یەکەمجاریان بە خۆڵاو بێ (ئەحمەد، موسلیم) کە دەفەرموێ (پاکەوەکەر) مەبەست لێی یەکێکە لەم سێ شتە: یا پاکەوەکەری نانوێژییە (حەدەث) یا هی پیسییە، یا رێزلێنانە، دیارە کە نانوێژیی و رێزلێنان بۆ حاجەت نابێ، مایەوە سەپیسی، وەکی تریش بەم فەرموودەیە چەسپا کە نازدارترین بەشی لەشی سەگ کە دەمیەتی، لەبەر هاسکە هاسککردنی زۆر پیسە، دەی باقی مەندەی لەشی دەبێ زیاتر پیسبێ!.

بەرازیش بۆیە پیسە چونکە حاڵی لە حاڵی سەگ خراپترە. گەرچی ماوەردی {رەزای خوای لێبێ} ئەم ئایەتە ەکا بە بەڵگە لەسەر پیسێتی بەراز: {أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ} . وشەی (رجس) لە ئایەتەکەدا بە واتا (نجس)ە، لە شێوەی ئەوەیە لە کوردیدا بەپیس بڵێی چەپەڵ.

## ٣٨) بڕیاری پاکیو پیسی مردارەوەبوو:

هەموو مردوویەك (تەنها مردووی ئادەمیو ماسیو کوللەی لێدەرچێ) پیسە، لەبەر فەرمایشتی زاتی مەزن: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ – سورة المائدة – ٣/٥} واتە: هەموو مردارەوە بوویێ لە ئێوە قەدەغەکراوە. شتێکیش نە لە زاتی خۆیدا رێزداربێو نەخواردنیشی زیانی هەبێ، لەگەڵ ئەوەیشا حەرام بکرێ، دیارە کە ئەو قەدەغە کردنەی لەبەر پیسییەتی، چونکە حەرامکردنی شت لەبەریەکێ لەم

هۆیانەیە: یا لەبەر ڕێزیەتی، یا لەبەر زیانیەتی، یا لەبەر پیسییەتی، مردارەوەبوویش ڕێزی نیە، خواردنیشی زیانی نیە، چونکە لە ناچاریدا دەخورێ، ماوەی سەر ئەوە کە لەبەر پیسی حەرام کراوە.

مرداریش لە شەرعا بریتییە لەو گیاندارەی کە چەقۆی لەسەربێ‌و بەبێ سەربرینێکی شەرعی گیانی دەرچووبێ! گشت سەربڕاوێ جگە لەسەربڕوای خۆمان‌و خاوەن نامەکان بەر ئەم پێناسەیە دەکەوێ، هەروا ئەو گیاندارەیش کە گۆشتی ناخورێ باسەریش ببڕێ بەر ئەمە دەکەوێ‌و حەرامەو مردارە.

بەڵام لەبەر ئەم فەرموودەیە ماسی مردوو بەرناکەوێ: دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: ئاوی دەریا هەم پاکەو هەم پاکەوەکەریشە وە مردارەوەبویشی حەڵاڵەو، گیانلەبەری ئاوی کاتێ دەمرێ هەتا نەگەنێ خواردنی دروستە (هەر پێنجیان گێڕاویانەتەوە). کوللەیش لەبەر ئەم فەرموودەیە بەر ناکەوێ (دوو مردارمان بۆ حەڵاڵ کراوە: کە ماسی‌و کوللەن) (بە رشتەیەکی بێهێز ئیبنو ماجە گێڕاویەتەوە: بەیهەقیش {ڕەزای خوای لێبێ} گێڕاویەتەوەو فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی دروستە واتە ساغە) ئادەمیزدیش لەبەر ئەم ئایەتە بەرپێناسەی پیسی ناکەوێ‌و بە پاك دادەنرێ: {وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ - سورة الإسراء - ١٨/٧٠} واتە: ئێمە بە رەحمەتی خۆمان ڕێزو قەدرێکی زۆرمان بە نەوەی ئادەم بەخشیوە). مەسەلەی ڕێزلێنانیش ئەوە دەخوازێ کە مرۆڤ، چ موسوڵمان بێ‌و چ ناموسوڵمان بێ، بڕیاری پیسی نەدرێ. مەبەست لە {إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ} پیسی بیروباوەڕی ئەوانە، نەوەك هی جەستەیان، چونکە ئەگەر لەشیان چەپەڵ بوایە

لەسرمان فەرز دەبوو کە هەرکوێیەکمان لێیان بکەوێ بیشۆین.. وەکی تریش ئەگەر مرۆڤ بە مردن پیس ببێ، دەبێ فەرمان نەکرایە بە شۆردنی، وەك شتە خودپیسەکان (نجس العین)ەکانی تر، بەڵام ئەگەر کەسێ لەم قسەیە رەخنە بگرێو بڵێ/ ئەگەر ئەم قسە وابێ، دەبێ فەرمانیش نەکرابێ بە شۆردنی، وەك شتە خودپاکانی تر، دەڵێیت: مەرج نیە کە هەموو شتێکی پاك نەشۆررێ، چونکە ئاشکرایە گەلێ جار پاکیش وەك نانوێژ (موحدیث) دەشۆررێ، بەڵام قەت نەبووە شتی خودپیس بشۆرێ. دەستوورێکی شەرعی هەیە دەفەرموێ: سەربرینی دایك برێتیی سەربرینی بەچکەی ناوسکی دەکەوێ، لەبەر ئەمە بەچکەی ناوسکی گیانلەبەری سەر بڕوا بەر مردارەوەبوو ناکەوێ. (تەماشای زنجیرە سێی ئەم کتێبە بکە کە لە پێشەوە رابورد، لەژێر سەردێڕی: حوکمی ئاوی بەرماوە) (وەرگێڕ).

## ٣٩) پاککردنەوەی گلاویی سەگو بەراز:

کاتێ دەفرێ بەدەم تێنانی سەگو بەراز گلاو دەبێ، دەبێ حەوت جار بشۆرێ، جارێکیان بە خۆڵاوبێ، هی سەگ بەپێی ئەم فەرموودەیەیە: کاتێ سەگ دەمی نایە ناو دەفرێکتانەوە، شلەکەی ناوی برێژن، ئینجا حەوت جار بە ئاو بیشۆرن، یەکەمیان بە خۆڵاوبێ.. (موسلیم) لە گێڕانەوەیەکی ترمیذیدا: یەکەمجاریان یاخود جارێ لەو جارانە بە خۆڵاو بیشۆرن. جا هەر کاتێ ئاوا ساخبۆوە کە شۆردن پێویستە بەهۆی لیکەکەیەوە، کە نازدارترین دەردراویەتی، دیارە ئەوانی تری وەك میزیو گوویی و ئارەقیو وێنەی تری ئەمانەی زیاتر شایانی

پیسین. لەم فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر پیسی ئەو خۆراکەی کە سەگ دەمی تێدەنێ، چونکە فەرمان دەکا بە رشتنی، ئەگەر پاك بوایە فەرمانی نەدەکرد بە رشتنی، چونکە رشتنی شتی پاك بە فیڕۆدانی ماڵە، شتی وایش لە ئێمە قەدەغەیە، دیارە پیسە بۆیە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمان دەکا بەڕشتنی.

پیسیی بەرازیش بە پێودان (قیاس) لەسەر سەگ، لەبەر ئەوەیش کە ئەویش دەق وەك سەگ خود پیسە، بەڵکوو پیسترە، چونکە بە هیچ حاڵێ ڕاگرتنی دروست نیە، لەبەر ئەوەیش کە چەپەڵ و قیزاوییە. گوتراویشە: کە بەراز یەك جار دەشۆردرێ. وەك پیساییەکانی تر، گوایە: گڵاوی دەرکردنی گڵاوبووی سەگ بۆیە واگران کراوە هەتا عەرەبەکان بتەکێنەوە لە ڕاگرتنی سەگ کە لە مێژەوە خوویان پێیەوە گرتووە! سا بەشکوو ئیتر وەك جاران نەبێ بەهاوخۆراکیان!.

ئەوەوی {رەحمەتی خوای لێبێ} لە شەرحی موهەززەبدا دەفەرموێ: رای دامەزراو، سەبارەت بە بەڵگە، ئەوەیە کە یەك شۆردن بەسە، بەبێ خۆڵاو، زۆربەی ئەو زانایانەی کە بڕیاری پیسیی بەرازیان داوە ئەمە بڕیاری کۆتاییانە. چونکە نەبوونی پێویست بنەڕەتە هەتا شەرع بڕیاری پێویستبوونی دەدا، نەخوازەلا لەشتی وەك ئەم مەسەلەیەدا کە لەسەر بنیادی تەعەبوودی دامەزراوە.

لە لایەکی تریشەوە لێ ورد بۆ گڵاو دەرکردن دەبێ، چونکە بۆ تەیەمموومیش دەستدەدا، کەواتە بەپێوەدان (قیاس) لەسەر ئەو.

## ٤٠) پاككردنەوەی مەی بەوە دەبێ كەببێ بەسركە:

پاككردنەوەی شت وەك لە پێشەوە رابورد یا بەشۆردن یا بەخۆشەكردن یا بەخۆڵ دەبێ، جاری وایش دەبێ بەهۆی گۆڕانی خودی شتەكەوە دەبێ، كە لە حاڵەتێكەوە بگۆڕێ بۆ حاڵەتێكی تر، وەك ئەوە مەی ببێ بە سركە. جا هەر كاتێ مەی لە خۆیەوە بەبێ دەسكاری كەسێ ببێ بەسركە پاك دەبێتەوە، چونكە پیسیو حەرامبوونی مەی لەبەر ئەوەیە كە هۆی سەرخۆشبوونە، دەی هەر كاتێ كە ئەو هۆیە نەما ئەوانیش نامێنن، كاتێ مەی بوو بەسركە ئیتر هۆی سەرخۆشی نامێنێ. نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: شەرعزانان یەكیان گرتووە لەسەر ئەوە: هەركاتێ مەی لە خۆیەوە بەبێ دەسكاری كەسێ بوو بەسركە پاك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بەهۆی ئەوەوە بوو بەسركە كەشتێكی وەك پیازو هەویر ترشو شتی وای تێ كەوت ئەوە پاك نابێتەوە. بەڵگەیشی ئەم فەرموودەیەیە: پرسیار لە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} كرا: ئایا دروستە كە مەی بكرێ بە سركە؟ فەرمووی نەء (موسلیم). ئەوەتا: {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی كردووە لە دەسكاریی مەی بۆ ئەوەی ببێ بە سركە، شت تێخستنیشی دەبێ بە دەسكاریی، بەپێی ئەم فەرموودەیەی تریش بەڵگەسازی كراوە لەسەر حەرامبوونی بە سركەكردنی مەی: كاتێ طەلحە ئیسلام بوو {رەزای خوای لێبێ} هەنێ مەیی لەلا بوو، هی چەن هەتیوێ بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دروستە ئەم مەیە بكەم بە سركە؟ فەرمووی: نەء. ئەوەتا رێگەی نەداوە كە

دەسکاری بکاو بیکا بە سرکە. جیاوازی لە نێوانی ئەم دوو حاڵەتەدا ئەوەیە: ئەوەی دەکەوێتە ناو مەیەکە وە بەمەیەکە پیس دەبێ، لەوە دوا مەیەکە کەبوو بەسرکە پاك دەبێتەوە بەڵام بەهۆی ئەو شتەوە کە ئەم ئەوی پیسکردووەو ئەو ئەمی کردووە بە سرکە پیس دەبێتەوە. ئەم بڕیارە کاتێ وایە کە ئەو شتە لەناو مەیەکەدا بمێنێ هەتا دەبێ بەسرکە، بەڵام ئەگەر لە پێش بوونیا بەسرکە، ئەگەر بەیەك چرکەیش بووە دەربهێنرێ پاك مبێتەوە، چونکە کە بوو بەسرکە شتی پیسی تیانەماوە هەتا پیسیبکا!.

## ٤١) چاوپۆشیکردن لە هەندی پیسی:

### لە شەرعی پیرۆزدا چاوپۆشی لەم جۆرە پیسییانە دەکرێ:

١) لە قوڕی ڕێگەی پیس، با سوریش بزانرێ کە ئەو قوڕو چڵپاوە پیسە، چونکە خۆپاراستن لە شتی وا زەحمەتە.

٢) لە شتێ کە چاوی ساغ نەیبینێ وەك پرزی میزو مەی‌و شتێ کە بنووسێ بە قاچو شتی وای مێش‌و مێرووڵەو سیسارکەوە.

٣) خوێنی کێچ با زۆریش بێ، هەروا ڕیقنەی باڵندەیش لە ناو مزگەوتدا.

٤) ئەوەی بەپێی باوی ناوکۆمەڵ بەکەم دابنرێ لە کوڵك‌و مووی پیس، بە مەرجێ هی سەگو بەراز نەبێ، هەروا چاو پۆشی دەکرێ لە مووی وڵاخی سورایش با ئەندازەکەیشی زۆربێ.

٥) له دووکەڵی شتی پیس‌و لەو تەپوتۆزەی کە بادەیبا.

٦) لـه گیانـدارێ کـه بـەریان (مەنفـەذ)ەکـەی پـیس بووبـێ. کاتـێ بکەوێتە ناو ئاوەوە، لەبەر زەحمەتبوون.

٧) لــەو کەمــە خوێنــەی بەســەر گۆشــت‌و ئێــسقانی گیانــداری سەربڕاوەوە ماوەتەوە.

٨) ئەگەر گیانلەبـەرێکی پـاك، وەك پـشیلەو ئەمانـە دەمـی پـیس بـوو، لەپاشدا ماوەیەکی وا لـەپێش چاو ون بـوو، کـە دەسـتداو (مـومکین) بـێ دەم بکـا بــە ئـاوێکی زۆردا، ئــەوجا هاتــەوەو دەمــی نایــە نــاو خواردنەوەیــەکی پاکەوە پیسی ناکا.

٩) پەتی تەناف کە جلی پیسی لەسەر هەڵبخرێ، هـەرکاتێ خـۆر یـا هـەوا وشـکی بکاتـەوە، لـە لای حەنەفییـەکان دروستـە جلـی پـاکی لەسـەر هەڵبخرێ.

١٠) ئەگەر شتێ لە کەسێ کەوت، نەیدەزانی کەچییە، ئایا ئـاو بـوو یـامیزبوو؟ پێویـست نیــە لەســەری کــە لەچـییەتییەکەی پرسـیار بکـا، چونکە دەگێڕنەوە: جارێ عومەرو هاوڕێیەکی لـە شـوێنێکەوە دەڕۆن، لـە پلووسـکێکەوە شـتێ دەڕژی بەسـەر عومـەردا، هاوڕێیـەکی دەڵـێ: ئــەی خاوەن پلووسك! ئاوەکەت پاك بوو یا پیس؟ یەکسەر عومـەر دەفەرموێ: ئەی خاوەن پلووسك! باسی ئەوەمان بۆ مەکە، ئـیتر ڕۆیـشت‌و لەشتەکەی نەکۆڵیەوە.

١١) لـە زیـچکاوی زیپکـەو جوانـەزاو بالووکـەو ئەمانـە، بـە مـەرجێ نەبووبێ بە جەرەتاو، دەنا پیسە، ئەگینا چاو پۆشی لێدەکرێ.

١٢) ئـاژەڵی کاوێژکـەر، کـە ئەوەیــە لـە ســەرەتاوە خواردنەکـەی پەڵخورد دەکاو، لەورگیدا عەماری دەکاو، لەپاشدا لـەکاتی پشوودا پاروو پارووپەقی دەکاتەوەو بە وردی دەیجوێتەوە جا ئەم ئاژەڵە ئەگەر لـەکاتی کاوێژکردندا لە جاجەتی شتی خواردەوە پیس نابێ.

## ٤٢) بێنوێژیی‌و زەیستانیی‌و هەمیشە بێنوێژیی:

بێنوێژی (حەیز) لە شەرعدا بەو خوێنە دەڵێن کە بـەبێ نەخۆشـی‌و منداڵبوون، لەپاش رەسیدەبوونی ئـافرەت، لـە لای سـەرووی مانداڵدانـەوە لە رەگێکەوە دەردەچێ، بەپێی خوازە (موقتەزا)ی سروشتی ساخ. خوێنی هەمیــشە بێنوێــژی بەرناکـەوێ، چــونکە ئــەو ماکەکـەی نەخۆشــین‌و تێکچوونی سروشتە. لە عەرەبیدا حەیز نیفاسیـشی پێدەگوترێ، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: بە عائیشەی فەرمووە: (انفستِ؟) واتە: ئـەوە توشی نیفاس بـووی‌و کەوتیتـە سـەرخوێنی بێنوێـژی؟ وەکـوو زانراویشە عائیــشە منــاڵی نــەبووە. ســەر بەڵگـەی بێنوێــژیی ئــەم ئایەتەیــە: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ - سورة البقرة - ٢٢٢/٢}. واتـە: ئـەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خوا! موسوڵمانان لـە بـارەی حوکم‌و بڕیاری بێنوێژییــەوە پرســیارت لێدەکـــەن. هـــەروا ئـــەم فەرموودەیـــەی صەحیحەینیشە: ئەم بێنوێژییە شتێکە خودا نووسیویەتی لەسەر کچانی ئادەم‌و سووچی تۆی تیادا نیە.

( رەنگی ) : رەنگی خوێنی بێنوێژی ئەمە نیشانەکانیەتی :

١) تۆخێکی گەشن بەپێی ئەم فەرموودەیە: فاطمی کچی حوبەیش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! من لەوەختو ناوەخاتا دەکەومە سەر خوێن چارم چییە؟ فەرمووی {درودی خوای لەسەربێ}: ئەگەر خوێنی بێنوێژی بێ دیارە، چونکە خوێنێکی رەشی گەشی خەستی بۆگەنەو ژنان خۆیان باشی دەناسن. ئەم فەرموودەیە ئەبو داوودو نەسائیو ئیبنو حەببانو دارە قوطنی گێڕاویانەتەوە، دارە قوطنی فەرموویەتی پیاوانێ کە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە هەموویان بڕوا پێکراون.

٢) سوورێکە ئاڵ، چونکە رەنگی بەراستی (حەقیق)ی خوێن سورییە.

٣) زەرداو ئاوێکی زەردی لێڵە.

٤) لێڵاو، ئاوێکی لێڵی بۆرە. بەڵام لینجاوە سپییەکە دانانرێ بەبێ نوێژی. بەپێی فەرموودەکەی مەرجانەی کارەکەری ئازادکراوی عائیشە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: ئافرەتان قەعەدەیان نارد بۆ لای ئاعیشە، زەرداوی پاش خوێنی بێنوێژی بە گوڵەلۆکەوە، لەناو قەعەکەدابوو، گوتیان: ئایا ئەم زەرداوەیش دادەنرێ بە خوێنی بێنوێژی یان نا؟ عائیشەیش وەڵامی بۆیان نادرو فەرمووی: پەلەمەکەن لەکردنی نوێژو گرتنی رۆژوو کردنی شتی تر کە لە سەرپاکی دەکرێن، تا لینجاوە سپییەکەی هەروەها داووە دەبینن، کە وەك گەچاو وایە (مالیك).

**رۆژەکانی بێنوێژی:-**

لای خوارووی ماوەی هاتنی خوێنی بێنوێژی شەوو رۆژێکە، بەپێی یاسای لێگەڕان، کە لە شەرعا ناو دارە بە ئیستیقراء، کە بریتییە لەپەی هەلگرتنی یەکە یەکەی ژنان سەبارەت بە چۆنێتیی بێنوێژییان، دەگێڕنەوە کە ئیمامی ئەعلی ئەمەی فەرمووە، دەقی قسەی شافعیش لە زۆربەی کتێبەکانیدا هەمان رایە، وەلای زۆربەی رۆژانی بێنوێژی شەش رۆژ یا حەوت رۆژە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بە حەمنەی کچی جەحشی فەرموو: شەش رۆژ یا حەوت رۆژ خۆت دابنێ بەبێ نوێژ، وە باش ورد بەرەوە لە حاڵی ژنی بێنوێژ (لە کەسوکاری خۆتو لە هاوتەمەنی خۆت) سابەشکوو پەی بەریت بە ماوەی بێنوێژی راستەقینەی خۆت، بە قیاس لەسەر هی ئەوان، دەق وەك ئەو ماوەیەی کەوا لە زانستی خودادا، یادو ناوی هەتا هەتایە بەرزو پایەدابێ، ئینجا خۆت پاك پاك بشۆرەو بیستو سێ شەو بە رۆژەکانیەوە، یا بیستو چوارشەو بە رۆژەکانیەوە، نوێژی خۆت بکەو رۆژووی خۆت بگرە، ئیتر ئەمەت بەسە، وە هەموو مانگێ بەم چەشنە بکە، تا کۆتایی فەرموودەکە، کە ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە، مەبەست لەم فەرموودەیە روونکردنەوەی حوکمی بێنوێژیی زوربەی ژنانە، چونکە ئەستەمە کە هەموو وەك یەك بن، وەلای ژووروی بێنوێژیی پازدەشەوو پازدە رۆژە، بەپێی لێگەڕان، واتە: ئیستیقراء. هەروا لە عایشەوە ئەمەیان گێڕاوەتەوە. شافیعی فەرموویەتی: ژن گەلێکی زۆرم دیوە، لە حاڵی ئەوانەوە بۆم ساخبۆتەوە کە پازدە رۆژ دەکەونە سەر بێنوێژی.

## ٤٣) زەیستانی (النفاس):

زەیستانی بەو خوێنە دەگوترێ کە لەپاش منداڵبوون لە دامەنی ژن دەردەچێ، ئەو منداڵەبوونەی کە دەبێ بەهۆی تەواوبوونی عیددەی سکپڕ نەوەك گشت جۆرە مندال بوونێ، ئیتر منداڵکە بە مردوویی لەدایك ببێ، یا بە زیندوویی، بۆیە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ نیفاس، چونکە لە پاش پەیدابوونی (نفس = رۆح = گیان)ەوە پەیدا دەبێ.

**رۆژەکانی:-**

لای کەمی ماوەی هاتنی خوێنی زەیستانی یەك چاوترووکاندنە، لای ژووررووی شەست رۆژە، بەپێی لێگەران (ئیستیقراء) ئەوزاعی فەرموویەتی: ژن هەیە لە وڵاتی ئێمە دوو مانگی رەبەق زەیستانە. رەبیعەی مامۆستای مالیکیش فەرموویەتی: زۆر کەسم دیوە دەڵێن: لای ژووررووی زەیستانی ژن شەست رۆژە. لای زوربەکەیشی چل رۆژە، چونکە دەگێڕنەوە عائیشە {رەزای خوای لێبێ} فەرموویەتی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا {دروودی سڵاوی خودای لەسەربێ} ژنی زەیستان چل رۆژ لێ دەکەوتو لەو ماوەیەدا وازی لە نوێژو رۆژووو شتی وا دەهێنا (ئەبو داوودو تیرمیذی. تیرمیذی بە دروستی داناوە). برێ لە زانایانیش ئەم فەرموودەیەی کرووە بە بەڵگەی قسەی خۆیو فەرموویەتی: لای ژووررووی زەیستانی چل رۆژە، بەلام رێباز (واتە: رای فەتواپێدراو) قسەی یەکەمە، لەبەر لێگەڕان، چونکە فەرموودەکە ئەوە ناگەیەنێ: کە لای ژووررووی زەیستانی چل رۆژەو لە هەمان کاتا بەڵگەی نەبوونی زیاترییو نەفی زیادەی تیا نیە،

کەواتە دەبڕدرێ بەسەر کاتی زوربەییدا هەتا فەرموودەکەو لێگەڕان یەك بگرن‌و نەبن بە بەڵگەی دژی یەکتر.

**لای خوارووی پاکی:**

لای خوارووی کاتی پاکی لە نێوانی دوو بێنوێژیدا پانزە ڕۆژە، بەڵگەی ئەمەیش ئیستیقرایە، کە ئەم زاراوە لە کوردیدا پێی دەگوترێ: لێگەڕان. چونکە کاتێ کە سەلما، لای خوارووی بێنوێژی پازدەڕۆژە، پێویستە کەلای خوارووی پاکیش پازدە ڕۆژبێ، چونکە زۆربەی کات مانگ لە بێنوێژی‌و لە پاکی خاڵی نابێ، لای ژووورووی پاکی ئەندازەی بۆ دیاری نەکراوە، چونکە ژن هەیە قەت ناکەوێتە سەربێنوێژی. بەڵام ماوەی پاکی لە نێوانی بێنوێژی‌و زەیستانیدا، ڕەنگە لە پازدە ڕۆژ کەمتربێ، کاتی واتە:یە کە بڵێین: ژنی ئاوس دەکەوێتە بێنیوۆژییەوە کە ئەمەش ئەمەیش ساخترین فەرمایشتە لەم مەسەلەیەدا، کەواتە هەر ژنێکی دووگایان، لە پێش ژانی منداڵبووندا، ماوەی شەوو ڕۆژێ خوێنی لێرەوان بوو، ئەوە بە حەیزدار دادەنرێ.

## ٤٤) هەمیشە بێنوێژیی (الاستحاضة)

هەمیشە بێنوێژی بەو خوێنە دەگوترێ، کە لە ناو شەرم (فەرج)ی ئافرەتەوە، لە غەیری ڕۆژەکانی بێنوێژی‌و زەیستانیدا، دەردەچێ، کەواتە: هەرکاتێ ژن زیاتر لە ڕۆژانی لای ژووورووی بێنوێژی‌و لای ژووورووی زەیستانی خوێنی لێرەوان بوو پێی دەگوترێ: ژنی هەمیشە بێنوێژ (مستحاضه).

**هەمیشە بێنوێژ ئەم وەزعانەی هەیە:-**

**یەکەم:** نەوجاری جیاکەرەوە (موبتەدیئەی مومەییزە) کە ئەو ژنەیە بۆ یەکەم جار خوێن دەبینیٚ‌و رەنگی جۆرەکانی بە باشی لەیەك جیادەکاتەوە، بۆ نموونە دەبینیٚ ماوەی چەن رۆژیٚ خوێنەکەی زۆر گەش‌و ئاڵە، ماوەی چەن رۆژێکیش زۆر کاڵە، ئەوە هەموو خوێنە ئاڵ‌و گەشە کە بێنوێژییەو خوێنەکاڵەکەیش هەمیشە بێنوێژییە، بەلاّم بەم دوومەرجە: بە مەرجیٚ خوێنەئاڵەکە لە ماوەی لای ژووروویی بێنوێژی پتر نەبیٚ‌و لەماوەی لای خوارووویشی کەمتر نەبیٚ.

**دووەم:** نەوجاری جیانەکەر (موبتەدیئەی غەیرەمومەییزە) کە ئەو ژنەیە رەنگی خوێنەکەی لەسەر یاسای پێشوو بۆ جیاناکرێتەوە، ئەوە لە هەموو مانگێکدا شەوو رۆژێکی بۆ دادەنریٚ بە بێنوێژی‌و باقی مەندەی رۆژەکانی بە هەمیشە بێنوێژی، واتە: هەموو مانگیٚ بێست‌و نۆ رۆژی بە پاکی بۆ دادەنریٚ.

**سێیەم:** فێرەکاری جیاکەرەوە (موعتادەی مومەییزە) یاخوو داری فەرەقخەر، ئەو ژنەیە کە لەمەوپێش بێنوێژی‌و پاکی بەرێکوپێکی لە هەموو مانگێکدا هەبوە، بەلاّم ئێستا گۆڕاوەو وەك جاران نەماوە، ئەمە حوکم بەفەرق خستنەکەی ئێستای دەکا، نەك بە عادەتی پێشووی بێنوێژییەکەی.

**چوارەم:** فێرکاری جیاوەنەکەر (موعتادەی غیرە مومەییزە) ئەمە جۆری زۆرە، بەلاّم ئەم جۆرەیان کە خوێنەکە لەسەر یەك نیشان دەبینیٚ‌و ناتوانیٚ خوێنی بێنوێژی لە خوێنی هەمیشە بێنوێژی جیاوەبکا

ئەمە لەسەر عادەتە پێشووەکەی خۆی دەڕوا، بەمەرجێ ئەندازەو کاتی بێنوێژی جارانی خۆی بزانێ، وەك ئەوە جاران لە سەرەتای مانگەوە پێنج رۆژ بێنوێژی بوو، ئەوە ئێستایش هەروا دەکا، بەپێی ئەم فەرموودەیە کە ئوممو سەلەمە دەیگێڕێتەوە: دەفەرموێ: لەسەردەمی حەزرەتدا {درودی خوای لەسەربێ} ژنێ هەبوو کە دەکەوتە بێنوێژییەوە ئیتر هەرپاك نەدەبۆوە، منیش لە پێغەمبەرم پرسیارکرد بۆی، فەرموی {درودی خوای لەسەربێ} با ئەو ژنە باش سەرنجی ژمارەی ئەو شەوو رۆژانەبدا کە جاران هەموو مانگێ تیایدا دەکەوتە بێنوێژییەوە، بەرلەوەی کە تووشی ئەم حاڵە ببێ، جا لەپاش توشبوونی ئەم حاڵەیش هەموو مانگێ بە ئەندازەی دەستووری پێشوویو بە ژمارەی رۆژانی جارانی واز لە نوێژ بێنێ. (مالیك، نەسائی ، ئەبو داوود، بەیهەقی، تیرمیذی بە جوانی داناوە). عادەت بە یەکجار ئیسپات دەبێ.

**تێبینی:** لێرەدا هەست بە هەڵەی ئەنجامی پەلەپەل دەکرێ، بەپێی موغنیو شەریعەتی ئیسلام سێیەمو چوارەمم راست کردەوە، لەبەر ئەوەیە کە تەرجەمەکە لەگەڵ ئەصڵەکە جیاوازی هەیە، لە زۆرشوێنی ترشتی وا هەیە، رەنگبێ خوێنەری ئازیز وابزانێ کەمن لە مەسەلەکە حاڵی نەبووم بۆیە بە هەڵە تەرجەمەم کردووە، بەڵام من ئەم دوو دەقە دەخەمەبەرچاو تا بزانرێ هەق لە گەڵ کێیە، دەقی پەڕاوەکەی بەردەستمان ئاوایە:

**پالپا:** معتادة مميزة بأن سبق لها حيض وطهر وهى تعلمها قدرا ووقتا فترد اليها قدرا ووقتا وتثبت العاة بمرة.

**رابعا:** معتادة غير مميزة بأن رأته بصفة واحدة فلم تميز بين دم الحيض ودم الاستحاضة فهذه ترد لعادتها لما روت أم سلمه. باشه ئەمە ئەگەر وابێ فەرقی سێیەم چوارەم چیبوو؟ بەڵام راستییەکەی ئەمەیە کە لە شەریعەتی ئیسلام‌و موغنیدایە، لە مغنی المحتاجدا دەفەرموێ: أو كانت معتادة غير مميزة بأن سبق لها حيض، وطهر وهی تعلمها قدرا ووقتا فترد إليهما قدرا ووقتا كخمسة أيام من كل شهر، تا ئەوێ کە دەفەرموێ: ويحكم للمعتادة المميزة بالتميز لا العادة في الاصح. موغنی فەرمووده‌کەیش وەك ئێرە دەکا بەبەڵگەی حاڵەتی فێرکاری جیاوەنەکەر. مەبەست لەم روونکردنەوەیە دیفاعە، نەك خوانە خواستە هێرش‌و پەرلامارداران.

وەرگێڕ

١٩٩٥/٧/١٢

**نوری فارس حەمەخان**

بسم الله الرحمن الرحیم

## ٤٥) لای خوارووی ساڵی بێنوێژی:

لای خـوارووی سـاڵی بێنوێـژی ژن نـۆ سـاڵە، بەڵگـەی ئـەوەیش لێگەڕان و لێکۆڵینەوەیە، چونکە هەرشتێ لە شەرع و زماندا سنووری بۆ دیاری نەکرابێ، دەبـێ بگـەڕێی بـۆی بزانـی لـە بنەڕەتـدا چۆنە، شافیعی {رەزای خوای لێبێ} لـەم بـارەوە لێکۆڵینـەوەی کـردووە زانیـاری پەیـداکردووەو دەفـەرموێ: ئـەو ژنانـەی کـە زۆر زوو دەکەونـە بێنوێژییـە وە ژنـانی تیهامەن، بیستوومە کە بە نۆ ساڵ سەرو عوزر دەشۆرن و رەسیدە دەبن. سـەبارەت بـەم بابەتـە فەرموودەیـەکیش هەیـە بەیهـەقی لـە عائیـشەوە گێڕاویەتەوە.

کـاتی بێنوێـژی لای ژووروی بـۆ نیـە، چـونکە ژنـی وا هەیـە هـەتا مردن بێنوێژیی نابینێ.

## ٤٦) ماوەی مانەوەی کۆرپە لە سکی دایکیا:

لای خـوارووی مـاوەی مانـەوەی منـداڵ لـە ناوسـکی دایکیـدا شـەش مانگ و دوو چاو ترووکانە، ترووکەیێ بۆ کاتی پێکەوە دروستبوونی ژن و مێـردو تـرووکـەیێ بـۆ کـاتی لـە دایکبـوونی، چونکە جارێ لـە سـەردەمی جێنیـشینی عوسمانـدا {رەزای خـوای لێبێ} ژنێکیـان هێنـا بـۆلای، هـەتا داری حەددی لێبدا، ئەویش لە بارەی بەردەبارانکردنیەوە راوێژی بە هاوڕێیان

کرد، ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوایان لێبێ} فەرمووی: خوادی گەورە دەفەرموێ: {وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا – سورة الأحقاف – ٤٦/١٥} واتە: ماوەی مانەوەی ئادەمیزاد لە ناوسکی دایکیا لەگەڵ ماوەی بڕینەوەی لە شیر لەپاش لەدایکبوونی، ئەو دوو ماوەیە سیی مانگە) لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ – سورة لقمان – ٣١/١٤} واتە: ماوەی بڕینەوەی منداڵ لە مەمك دووساڵە) کەواتە: لە (٣٠) سیی مانگ بیستو چوارمانگی بۆ ماوەی شیرخواردن بێ، شەش مانگی دەمێنێتەوە بۆ ماوەی مانەوەی ناوسکی دایك. ئیتر هاوڕێیان چوونە سەر فەرمایشتەکەی ئەوو، کارەکە بوو بە ئیجماعو یەکگرتن.

بەڵام لای زۆورووی ماوەی سك چوار ساڵە، بەڵگەی ئەم فەرمایشتەیش لێگەڕان. مالیك {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ژنێکی دراوسێمان هەیە ژنی موحەممەدی کوڕی عەجلانە، خۆی ژنێکی ڕاسگۆیە، مێردەکەیشی پیاوێکی ڕاستگۆیە، سێ سکی کردووە بە دوازەساڵ، هەر منداڵەی چوار ساڵ لە سکیدا ماوەتەوە!.

موجاهید ئەمەی گێڕاوەتەوە. جارێکیش پیاوێ دێ بۆ لای مالیکی کوڕی دینار، عەرزی دەکا: ئەی باوکی یەحیا! لە خودا بپاڕێرەوە بۆ ژنی، ئەو چوار ساڵە سکی پڕە، زۆر حاڵی پەرێشانە، ئەویش بۆ بپاڕایەوە، جا پیاوێ ترهات بۆ لای پیاوەکەو پێی گوت: فریای ژنەکەت کەوە، جا پیاوەکە ڕۆیشت، لە پاشدا هاتەوە، منداڵێکی بە قەڵاندۆشکانیەوە بوو، تەمەنی چوار ساڵ بوو، پڕدەمی لە ددان بوو!.

## ٤٧) ئەوەی لە کاتی بێنوێژیو زەیستانیدا نادروستە:

**لەکاتی بێنوێژیو زەیستانیدا ئەم هەشت شتە نادروستە :**

**یەکەم:** نوێـژکردن، هەروا کوڕنووشی قورئانخوێنـدنو کوڕنووسی سوپاسیش، بەپێی فەرمایشتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ}: کاتێ سـەرەتای بێنوێژییەکەی جارانت دەستی پێکـردەوە، ئیتر نوێـژ مەکە هـەتا بەقـەد ئـەو ڕۆژانــە دەڕوا، تــا کۆتــایی فەرموودەکــە، وە لــەوە دوایــش قــەزای ناکاتەوە، بەپێی فەرموودەکـەی عائیـشە {ڕەزای خوای لێبێ} فـەرمووی: جـاران بە سەرینی پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەکەوتینە بێنوێژییەوە، لـەپاش پاکبوونـەوەو خۆشـۆردن، پێغەمبـەر {دروودی خـوای لەسـەربێ} فـەرمانی پێمـان دەکـرد: کـە ڕۆژووبگرینـەوە، بـەڵام نوێـژ نەگێڕینـەوە! (ئـەم فەرموودەیــە بوخــاریو موســلیم گێڕاویانەتــەوە) یــەکگرتنی زانایــانی شەرعیش بەکۆی دەنگ لەسەر ئەم مەسەلەیە دامەزراوە.

**دووەم:** ڕۆژووگـرتن چـونکە چـەمكو مـەفهوومی ئـەم فەرموودەیـە ئــەوە دەگەیــەنێ کــە دەفــەرموێ: فــەرمانی پێمــان دەکــرد کــە ڕۆژووبگرینــەوە. هــەروا ئــەم فەرموودەیــەش ئــەوە دەگەیــەنێ کــە دەفەرموێ: ئەی ئەوە نیە ژن کە دەکەوێتە بێنوێژییەوە نـە نوێـژ دەکاو نە بەڕۆژوو دەبێ؟ (شەیخان).

لـە هەمانکاتـدا نوێـژ زۆرەو هـەموو ڕۆژێ دەکـرێ، لەبەرئـەوە گێڕانـەوەی زەحمەتـە، بـەڵام ڕۆژوو سـاڵی یـەك مانگـە. خـودای گـەورەیش دەفـەرموێ: {وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ - سورة الحج - ٢٢} واتـە: وە لەم ئاییندا کاری ناهەموارو باری هەڵنەگیراو نەدراون بە سەرتاندا).

**سێیەم:** خوێندنی قورئان کەم و زۆری بۆ بێنوێژ نادروستە، چونکە زیان لە شکۆمەندی قورئان دەدا، لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) کە دەفەرموێ: نابێ ژنی بێنوێژو ئادەمیزادی لەشپیس هیچ شتێ لە قورئان بخوێنن (ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە) بەڵام ئەوەی کە زیکر بێ خوێندنی دروستە بۆیان، بەنیازی زیکر، نەك بە نیازی قورئان، وەك ئەوە بێنوێژ لە کاتی سواریدا بڵێ: {سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ – سورة الزخرف – ١٣} یا وەك ئەوە لەکاتی روودانی کارەساتو قۆرتو چورتمدا بڵێ: {إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ – سورة البقرة – ١٥٦/٢} هەروا دروستە بۆی خوێندنی ئایەتەکانی ئامۆژگاریو هەواڵو حوکمەکانی قورئان، بەمەرجێ بە نیازی قورئان نەیان خوێنێ، وەك ئەوە ئایەتەلکورسی بەنیازی نزابخوێنێ، بەڵام ئەگەر هەرشتێ لە قورئان بە نیازی قورئانو نزا، یا بەنیازی قورئانو زیکر بخوێنێ ئەوە نادروستە. نەوەوی لە (دەقائیق)دا ئەم باسەی روونکردۆتەوە. لەم بڕیارەدا جیاوازی نیە لە نێوان ئەو ئایەتانەدا کە نەظمو هۆنینەوەکەیان هەر لە قورئاندا هەیە وەك سوورەتی ئیخلاصو، لە نێوانی ئەو ئایەتانەدا کە هۆنینەوەو نظمەکایان لە غەیری قورئانیشدا هەیە، وەکو ئایەتی، بسم الله الرحمن الرحيمو ئایەتی، الحمد لله رب العالمين[1].

---

(١) ئورجووزەیەکم هەیە بە ناوی (بين يدی كتاب الله) لە بابەتی دەستووری قورئانخوێندنو پێڕستێکی تایبەتی سوورەتەکانی قورئانەوە، بە عەرەبییەوە، پتر لە پێنج

سەد شیعر دەبێ. ئەم چەند دێڕە لە مەتنو لە شەرحەکەی رادەگوێزم، بۆ زیادە فایدە:

للجـــنب تـــلاوة القـــرآن بغيـر قـصده، بـلا نقصان،
كـــأن تـــلا بنيـــة الاذكـــار والـحفظ مـن شـــرارة الأشـرار
وكـتب شـيء منـه فـى اناء وأكــل مــا فيه، وشـرب الماء
منــه، أجـز بنيــة الشفاء ثـم استعــن بخيـرة الـدواء!
يا تالي النور! اقتبس من نوره وكـن كمـن ينـور في حـضورة!
ولا تكـن كساذج الاطفـــال تجمع ضوء الشمس بالغربـال
اليـك مـا في محكـم الامثـال للمحدث الجعنه شرح الحـال:
لـلجـنب التالـــي فــم جـسور من مـدخن كيـف يثـور نـور؟!
ومـــع هـــذا لا ألـــوم مـن قـرا عن ظهـر غيـب جنبـا فيمـا أرى
هـــذا اذا لم يتخـــذهـــا عـادة ورام مـــن ورائـــهـــا افـــادة!

وتحل للجنب قرآءة لا بقصده كقوله بنية الذكر عند الركوب: (سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين) وعند المصيبة: (انا لله وانا اليه راجعون). قال في مغني المحتاج: (أفتى شيخي بأنه لو قرأ الرآن جميعه لا بقصد القرآن جاز) أقول (أنا المترجم) تظهر فائدة الإجراءات لجنب أو حائض يتعاهد حفظ القرآن حتى لا ينساه، وهذا في الحائض أظهر، لان فترة انقطاعها اطول، فتستطيع تعاهده على أحدى هذه الكيفيات وقلب ورقه بعود ونحوه للنظر فيه. ومعلوم ان النظر في المصحف عبادة، وان تعاهد القرآن حتى لا ينسى من أعظم القربات. وقد جاء في الارجوزة:

النظر في المصحف عبادة والموت في سبيله شهادة
الموت فرض ذائق الـولادة اكرم في الفوز بالشهادة

(المترجم)

١٩٩٥/٧/١٥

**چـــوارەم:** دەســـت دان لـــە قورئـــان یـــا هـــەلگرتنی، چـونکە خـــوا دەفـــەرموێ: {لَّـا يَمَـسُّهُ إِلَّـا الْمُطَهَّـرُونَ – سـورة الواقعـة – ٤/٣٤} واتـــە: ئـــەم قورئانـــە نابـــێ لـــە زەویشدا کـــەس دەســتی لێبـدا تـــەنیا ئـــەو موسـولّمانانە نـەبێ کـە پـاکن لـە لەشپیـسیو لـە بـێ دەسـنوێژی) هـەروا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: موسـولّمانی پـاك نـەبێ نابـێ کـەس دەست لە قورئان بدا، (دارە قوطنی) جا لـە شـوێنێ دەسلێدانی نادروست بێ هەلگرتنی زیاتر، بەلاّم دروستە هەلگرتنی لەناو شمەکدا، بـە مـەرجێ بە نیازی هەلگرتنی قورئانەکە نەبێ.

**پێنجەم:** راوەستانو مانەوە لە ناو مزگەوتدا، یا هاتوچۆ لـە ناویـدا، چونکە شتی وا بۆ لەشپیس نادروستە، دەی نانوێژی (حـەدەث)ی بێنوێـژ لەهی لەشپیس بەتینترە! لەبەر ئەم فەرمودەیەیش کـە دەفـەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: من چوونە ناو مزگەوت رەوا نابینم نـە بـۆ ژنـی بێنوێـژو نـە بۆ لەشـپیس (ئـەبو داوود). بـەلاّم دروسـتە ژنـی بێنوێـژ بـە رێبـواری بـە ناومزگەتـد تێپـەرێ، هـەروەك ئەمـە بـۆ لەشپیـسیش رەوایـە، بـەپێی فەرمایـشتی خـوای گـەورە: {إِلاَّ عَـابِرِي سَـبِيلٍ – سـورة النـساء – ٤/٣٤} واتـــە: ئـــەی موســـولّمانینە! بەلەشـــی پیـــسەوە نزیکـــی نوێژمەکەونەوە، هەروا لـە ناومزگەتدا مەمێننـەوە! مەگـەر بـە رێبـواری بەناویـدا تێپـەڕن! ئەمـەیش کـاتی دروسـتە بـۆی کـە دڵنیابـێ لـەوە کـە مزگەوتەکـە پـیس ناکـا، دەنـا دروسـت نیـە. دەق وەك بێنوێـژ وایـە لـەم بڕیارەدا کەسێ گیرۆدەی میزەچوڕکە بێ یا برینێکی نمداری وای پێوەبـێ کە مەترسی ئەوەی هەبێ لەکاتی تێپەڕبوونیدا مزگەتەکە ناپاك دەکا.

**شەشەم:** هەڵسوڕان بە دەوری خانەی خودادا، کە ناودارە بە تەوافی بەیت، چونکە عائیشە هاوسەری حەزرەت {دروودەی خودا لە حەزرەت بێ و رەزای خودا لەو} لەکاتی حەجەکەیدا، کاتێ کەوتە بێنوێژییەوە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: ئەمە شتێکە خودا نووسیویەتی لە چارەی کچانی ئادەمو سووچی تۆی تیادا نیە، جا هەرچی حاجی دەیکا لە حەجەکەیدا تۆیش بیکە، بەلاّم تەوافی بەیت مەکە هەتا لە بێنوێژییەکەت پاك دەبیتەوە (شەیخان گێڕاویانەتەوە).

**حەوتەم:** دروستبوونو جووتبوون، بەپێی فەرمایشتی خوای گەورە: {فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ - سورة البقرةی - ٢٢٢/٢} واتە: لەکاتی بێنوێژیدا مەڕۆنە لای ژنانو بە نیازی چوونەلایان نزیکیان مەبنەوە هەتا لە بێنوێژی پاك دەبنەوەو لەشپیسی خۆیان دەردەکەن).

**هەشتەم:** لەززەت وەرگرتن لە نێوانی ناوكو ئەژنۆی حەلاڵو هاوسەر بەرووتی. ئیبنو مەسعوود {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لە پێغەمبەری خودام پرسی: کاتێ ژنەکەم بێنوێژ بێ چی ئەو دروستە بۆ من؟ فەرمووی: لەسەر بەرکۆش (ئیزار: پۆشاك: پەشتەماڵ)ەوە هەموو شتێك بۆ هەیە (ئەبو داوود) موسلیمیش لە مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەرەوە فەرمودەیێ لەم بابەتە دەگێڕێتەوە کە ئێستا عائیشە دەیگێڕێتەوە: جاران پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئەگەر یەکێ لە ژنەکانی بێنوێژ بوایەو بیویستایە کە لەززەتی شەرعی لێ وەربگرێ فەرمانی پێ دەکرد کە پشتەماڵێ بدا بە بەرکۆشیا، ئەوجا لەسەر ئەو پستەماڵەوە،

لەززەتی شەرعی لێ وەردەگرت (موسلیم) بۆیە لەزەت وەرگرتن لەم ناوچەیە نادروستە، چونکە پاوان و پارێزگای شەرمگایە، واتە: حەریمی فەرجە، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: کەسێ لە دەوری پاوەند گرپخوا بەرە بەرە تێی دەکەوێ. لە یەکێ لە فەرمایشتە دێرینەکانی شافیعیدا دەفەرموێ: ئەوەی لەم لایەنەوە کە نادروستە تەنیا رۆیشتنە لایەو دروستبوونە لە شەرمگاوە. واتە: دروستە پیاو خۆی بەهەموو شوێنێکی حەلاڵی خۆی رەحەت بکاو لەززەتی لێ وەربگرێ تەنیا بەپێش و بەپاشی نەبێ بەلگەی ئەم فەرمایشتەیش ئەم فەرموودەیەی ئەنەسە (رەزای خوای لێبێ) کە دەفەرموێ: میللەتی جوولەکە دەستووریان وابووکە ژنیان دەکەوتە بێنوێژییەوە ئیتر نە لەگەڵیاندا دەخواردن و نە لە ماڵیشەوە لە گەڵیان دادەنیشتن، بەڵکوو پارێزیان لێ دەکردن و جێیان لێ جیادەکردنەوە، هاوڕێیانی پێغەمبەریش سەبارەت بەم کارە لێیان پرسی، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە {فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ - سورة البقرة - ٢٢٢/٢} ئەوجا حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو شتێ لە گەڵیاندا بکەن، تەنیا چوونەلا نەبێ (موسلیم) ئەوەی دەفەرموێ: ئەمە رای پەسەنکراوە، هەروا ئەوەوی ئەم رایەی لە کتێبی تەحقیق و لەشەرحی تەنبیهدا پەسەند کردووە، هەروا لە وسیطیشدا — جا ئەگەر پیاو لەگەڵ حەلاڵی خۆیدا، کە لە بێنوێژیدا بێ، دروست ببێ، لە هەمانکاتدا بزانێ کە ئەوە نادروستە، ئەوە تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدا، پێویستە لە سەری کە تەوبەی لێبکا، لە هەمانکاتدا سوننەتە کە دینارێکی زێڕ بکا بەخێر، ئەگەر کارەکەی لە سەرەتای بێنوێژییەکەوە ئەنجام دابوو، بەڵام ئەگەر

له دوایی بێنوێژییه‌كه‌دا ئه‌نجامدابوو، با نیو دیناری زێڕ ببه‌خشێته‌وه، چونكه ده‌فه‌رموێ {دروودی خوای له‌سه‌ربێ}: پیاو ئه‌گه‌ر له بێنوێژیدا چووه لای ژن ئه‌گه‌ر خوێنه‌كه سووربوو ئه‌وه دیناری بكا به‌خێر به‌لاّم ئه‌گه‌ر خوێنه‌كه زه‌ردبوو ئه‌وه نیو دینار بكا به‌خێر. (ئه‌بو داودو حاكم گێڕاویانه‌ته‌وه، حاكم به صه‌حیحی داناوه) زه‌یستانییش قیاس له بێنوێژیی ده‌كرێ. بۆیه‌ش ئه‌م خێره‌ش پێویست نیه‌و سوننه‌ته چونكه چوونه‌لاكه له‌م كاتی بێنوێژییه‌دا له‌به‌ر ئازار نادروسته، ئازاریش نابێ به‌هۆی پێویستبوونی كه‌فاره‌ت.

## ٤٨) ئه‌وه‌ی بۆ له‌شپیس نادروسته:

### ئه‌م پێنج شته بۆ له‌شپیس نادروسته :-

**یه‌كه‌م:** نوێژ، له‌به‌ر یه‌ككرتنی رای زاناكان له‌سه‌ر ئه‌وه.

**دووه‌م:** خوێندنی قورئان، با ئایه‌تێ، یا پیتێكیش بێ، خوا نوێژه‌كه نوێژی ئاشكرابێ یا نوێژی نهێنی (سڕی) بێ هه‌ر نادروسته، چونكه ده‌فه‌رموێ {دروودی خوای له‌سه‌ربێ}: نابێ ژنی بێنوێژو له‌شپیس هیچ شتێ له قورئان بخوێنێ (تیرمیذی). له‌به‌ر ئه‌م فه‌رمایشته‌ی عه‌لیش {ره‌زای خوای لێبێ} بێجگه له له‌شپیسی هیچ شتێ رێگه‌ی قورئانخوێندنی له پێغه‌مبه‌ر نه‌ده‌گرت. ئه‌گه‌ر به نیازی زیكرو نزا هه‌ندێ له ئه‌زكاری قورئانی خوێند ئه‌وه دروسته، وه‌ك ئه‌وه له سه‌ره‌تای خواردن‌و خواردنه‌وه بڵێ: (بسم الله، له دوایه‌وه بڵێ: الحمد لله یا له كاتی سواریدا بڵێ: سبحان الذی سخر لنا هذا وما كنا له مقرنین) به‌مه‌رجێ هه‌ر به نیازی زیكرو

دووعا بێ، بەڵام ئەگەر هەر بەنیازی قورئان بوو، ئەوە دروست نیە، هەروا ئەگەر بەنیازی نزاو قورئان بوو هەر دروست نیە، ئەگەر بە نیازی هیچ نەبوو، یابەس بە نیازی نزا بوو ئەوە حەرام نیە!.

**سێیەم:** دەستدان لە قورئانو هەڵگرتنی، لەبەر ئەوەی لە پێشەوە باکرا.

**چوارەم:** هەڵسوڕان لەسەر شێوەی تایبەت بەدەوری خانەی خواداد، چونکە دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ}: تەوافی بەیتیش هەر نوێژە! (حاکم) دەیشفەرموێ: رشتەکەی دروستی تەواوە: هەروا دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ} تەوافی بەیت لەپایەی نوێژایە تەنیا ئەوەندە هەیە کە خوا قسەکردنی لەکاتی تەوافا حەلاڵ کردووە، جا هەر کەسێ لەکاتی تەوافی بەیتدا قسەی کرد باقسەی خێربکاو بەس. حاکیم دەفەرموێ: فەرموودەیەکی ساخی دروستە، بەپێی مەرجی ئیمامی موسلیمە، کە بۆ فەرموودەی صەحیحی داناوە لە صەحیحی موسلیمدا.

**پێنجەم:** مانەوە لە مزگەوتا بەڵام رابووردن بەناو مزگەوتدا رەوایە، یەزدانی پاك دەفەرموێ: {وَلاَ جُنُبًا إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ - سورة النساء} پێغەمبەری ئازیزیش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: من مانەوە لە مزگەوتدا بۆژنی بێنوێژو بۆ لەشپیس رەوا نابینم. (ئەبو داوود) ئەمە کاتێ وایە کە بەهانەی رەوای نەبێ، دەنا ئەگەر بەهانەی هەبوو وەکوو ئەوە لە مزگەوتا خەوتبوو، وەشەیتانی بوو، ئەوە نەوەوی {رەحمەتی خوای لێبێ} دەفەرموێ: لەکاتی وادا ئەگەر رێگەی ئەوەی نەبوو کە لە مزگەوتەکە بچیتە دەرەوە دەبێ تەیەمموم بکا. رافیعی دەفەرموێ: لە

کاتی وادا تهیهمموم کارێکی جوانه. ڕێبواریش به ناو مزگهوتا ئهگهر مهبهستێکی دورستی ههبوو. ئهوه بهپێی ئایهتهکه کارهکهی رهوایه وه هیچ ناپهسهندییهکی تیادا نیه.

## ٤٩) ئهوهی بۆ بێدهسنوێژ نادروسته:

**ئهم سێ شته بۆ بێدهسنوێژ نادروسته :-**

**یهکهم:** نوێژێ که چهمینهوه (روکوع)و کڕنووشی تیادابێ، ئهمه به یهکگرتنی رای زاناکان لهسهری وایهو دروست نیه بهبێ دهستنوێژ بگرێ، ههروا کڕنوشی قورئانخوێندنو کوڕنووشی سوپاسو نوێژی تهرم، بهلام ههندی دهڵێن {درووده خوای لهسهربێ} ئهم سێیه بهبێ دهسنوێژیش دروسته. له فهرمووده‌دا دهفهرموێ: خودا نهنوێژ بهبێ دهسنوێژو پاکی گیرا دهکاو نهخێر له گزیو دزی گیرا دهکا. تیرمیذی {رهزای خوای لێبێ} دهفهرموێ: ئهم فهرموودهیه دروسترین بهڵگهیه بۆ ئهم بابهته.

**دووهم:** تهوافی ماڵی خوایه، پێغهمبهر {درووده خوای لهسهربێ} دهفهرموێ: تهوافی ماڵی خودایش ههر نوێژه، وهك له پێشهوه رابرود.

**سێیهم:** دهستدان له قورئانو ههڵگرتنی، خوای گهوره دهفهرموێ: {لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ} (ئهم نیشانهیه واته ئهم دهقه له پێشهوه رابردووه – وهرگێڕ) ههندێ گوتوویانه: مهبهست لهم کتێبه که ئهم ئایهته باسی دهکات لهوحولهحفووفه، بهلام ئهمه دووره، چونکه ئایهتهکهی دوا ئهم ئایهته دهفهرموێ: {تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ

- سورة الواقعة - ٥٦/٨٠} واتە: ئەم قورئانە پەروەردگاری جیهانیان ناردوویەتە خوارەوە) ئەمە دەیسەلمێنێ ئەوەی کە هاتۆتە خوارەوە قورئانە، نەوەك لەوحول مەحفووز چونکە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) کاغەزێکی بۆ خەڵکی یەمەن نووسی ئەمەی تیادا بوو: بەس موسوڵمانی پاك دەست لە قورئان دەدا، (ئیبنو حەببان لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە).

حاکمیش فەرموویەتی: رشتەکەی بەپێی مەرجی صەحیحە. هەروا نادروستە دەستدان لەو پارچە قورئانە کە بۆ دەرس خوێندن نووسراوەتەوە، بالە ئایەتێکیش کەمتربێ، وەك ئەوەی لە تەتەڵە دارو تەختەڕەش و شتی وا دەنووسرێ، چونکە قورئانەکە بە مەبەستی وانەگوتنەوە نووسراوە لێی، لەبەر ئەوە لە موصحەف دەچێ. بەڵام ئەو پارچانەی کە بۆ غەیری وانە گوتنەوە نووسراون وەکوو ئەوەی لە پارەو کاغەزی نامە دەنووسرێ ئەوە دەست لێدان و هەڵگرتنی دروستە چونکە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) نامەیەکی بۆ هیرەقل نووسی، ئەم ئایەتەی تیابوو: {يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ - سورة آل عمران - ٣/٦٤} لەگەڵ ئەوەیشدا فەرمانی بەهەڵگری نامەکە نەکرد کە دەستی بە دەسنوێژبێ.

بۆ بێ دەسنوێژ درستە کە پەڕەی قورئان بەپەلەکەداری، یا بە شتێکی وا هەڵبگێڕێتەوە، چونکە ئەوە نەهەڵگرتنەو نە دەسلێدان، نووسینی قورئان لەسەر دیوار شتی وا باش نیە، باهی مزگەوتیش بێ، هەروا لەسەر جل و بەرگ و خۆراك و شتی وایش باش نیە، بەڵام

خـواردنی خۆراکـێ بـڕێ قورئـانی لێنووسـرابێ ناپەسـەند نیـە، بـە پێـچەوانەی قووتـدانی، چـونکە لـەحاڵی یەکەمـدا خـەتی قورئانەکـە لـە ناودەمـدا دەکۆژێتـەوە، پـێش ئـەوەی بگاتـە نـاو پیـسایی نـاو گـەدە، بـە پێچەوانەی حـاڵی دووەم، دروسـتەو نابـاش نیـە کـە بـڕێ لـە قورئـان لـە حاجـەتێ بنوسـرێو ئاوەکـەی بـۆ شـیفا دەرخـواردی کەسـێ بـدرێ، شـتێ قورئـانی لێ نووسـرابێ، بـە مەبەسـتی پاراسـتنی لـە بێرێـزی، دروسـتە بسووتێنرێ، چـونکە ئیمـامی عوسمـان (رەزای خـوای لێبـێ) چـەند قورئـانی سووتاند بە مەبەستی پاراستنی رێزی، ئەگـەر بەهانـەی هـەبوو، دروسـتە بەبێ دەسنوێژ هـەڵی بگرێ، وەك ئـەوە مەترسی ئـەوەی هـەبێ کـەپیس بێ، یا لە ناوبچێ، چونکە ئەوە دەیپارێزێ، دروست نیە قورئـان ببرێ بـۆ خاکی بێ بڕوایـان، ئەگـەر ترسـی ئـەوەی هـەبوو بکرێتـە دەسـتی ئـەوان، دروست نیـە بکرێ بە سەرینو پشتیو سەری بکەوێتە سـەر، با مەترسی دزینیشی هەبێ، بەڵێ ئەگـەر ترسـی ئـەوەی هـەبوو کـە بفـەوتێ، بـەهۆی نوقمبوونی نـاو ئـاوو شـتی واوە یـا ترسـی ئـەوەی هـەبوو کـە پـیس ببـێ، یابکەوێتە دەستی بێبڕوا، ئەوە دروسـتەو بخرێتـە ژێرسـەر، بـەڵکوو ئـەوە پێویستە، چونکە ئەوە لە فەوتان دەیپـارێزێ، هـەروا دروسـتە قورئـان لـە ناوشمەکـدا بـەهۆی هـەلگرتنی شمەکەکـەوە هـەڵ بگیرێ، هـەروا دروسـتە دەسدان لە کتێبی تەفسیرو هەلگرتنی، ئەگەر تەفسیرەکە لـە قورئانەکـەدا زۆرتر بوو.

## ٥٠) دەستدان لە قورئان لەبەر فێربوونو فێرکردن:

منداڵی فامیدەی بێدەسنوێژ قەدەغە ناکرێ لە هەڵگرتنو دەسدان لە قورئان، کە لەبەر مەسەلەی فێربوون بێ، چونکە فێربوون پێویستییە، وە زەحمەتیشە بەردەوام دەستی بە دەسنوێژ بێ، بەڵام سوننەتە دەسنوێژی هەبێ، وەڵێ ئەگەر فامیدە نەبوو ئەوە دروست نیە کە رێگەی ئەوەی بدرێ، نەبادا رێزو شەقڵی بشکێنێ. هەروەها بۆ مامۆستا، بێ دەسنوێژ، دەسلێدانو هەڵگرتنی، بە مەبەستی پێشوو، وە لەبەر هەمان هۆ دروستە، خوای گەورەیش دەفەرموێ: {وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ - سورة الحج - ٢٢/٧٨}.

## ٥١) نوێژ (الصلاه):

نوێژ لە زمانی عەرەبدا پێی دەڵێن صەڵات، سەلاتیش پاڕانەوەیە، نزای باشە، خوای گەورە دەفەرموێ: {وَصَلِّ عَلَيْهِمْ - سورة التوبة - ٩/١٠٣} واتە: ئەی محمد! دووعلو نزای خێریشیان بۆ بکە - لە شەرعیشدا نوێژ بریتییە لە چەند گوتارو کردارێ، کە لە ئەڵڵاهو ئەکبەر دەستیان پێ دەکرێو بە سلاودانەوە کۆتاییان پێدێ. سەر بەڵگەی پێویستبوونی نوێژ قورئانو سوننەتو یەکگرتنی رای زانایانی گەلی ئیسلامە لەبەر ئەوە هەرکەسێ باوەڕی پێی نەبێ یا گاڵتەی پێبێ بێ بڕوایەو لە ئایینی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە. یەزدانی پاك دەفەرموێ:

{وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ – سورة البقرة – ٢/١٠} نوێژەكانتان بە ڕێكوپێكی بەجێ بهێنن - واتە: بەباشی ئاگادارییان بكەن لەم بارەیەوە فەرموودە هەر زۆر زۆرە، حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە شەوی شەوڕەوی‌و میعراجدا خودا پەنجا نوێژی لەسەر ئومەتم دانا، لەپاشا لەسەر ئامۆژگاری مووسا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} چەند جاری چوومەوە خزمەتی وتكام لێكرد كە كەمیان بكاتەوە، ئەویش تكاكەی گرتم‌و جار لەگەڵ جاردا كەمی دەكردنەوە هەتا لەدوا جاردا لە هەموو شەوو ڕۆژێكا كردنی بە پێنج نوێژ (شەیخان) كاتێكیش حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} موعازیكرد بە فەرمانڕەوای سەر یەمەن‌و ناردی بۆ ئەوێ پێی فەرموو: وە هەوڵیان بدەرێ كە خودا لە هەموو شەووڕۆژێكا پێنج نوێژی لە سەریان داناوە. سەربەڵگەی دیاریكردنی كاتی نوێژەكان ئەم ئایەتەیە: {فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ. وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ – سورة الروم – ٣٠/١٧ – ١٨} ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: لەم ئایەتەدا كاتی پێنج نوێژەكان دیاریكراون، چونكە مەبەستی خوا لە (حين تموسون) نوێژی شێوان‌و خەوتنانە، مەبەستی لە (حين تصبحون) نوێژی بەیانییە، لە (عشيا) نوێژی عەصرە، لە (حين تظهرون) نوێژی نیوەڕۆیە.

## ٥٢) کاتەکانی نوێژ:

زانینی کاتی نوێژەکان کارێکی هەرەگرنگە، چونکە بە داهاتنی کات نوێژەکە پێویست دەبێ، بە بەسەرچوونی نوێژەکە دەچێ. سەربەڵگەی دیاریکردنی کات قورئانو سوننەتو یەکگرتنی ئوممەتە بەکۆی دەنگ لەسەری، خوای گەورە دەفەرموێ: {إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا - سورة النساء - ١٠٣/٤} واتە: بەراستی نوێژ لەسەر موسوڵمانان فەرزێکە بەسراوە بە کاتی تایبەتی خۆیەوە، پێویستە هەموو نوێژێ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا بە باشی بکرێ - خۆشەویستیش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: جوبرائیل {دروودی خوای لەسەربێ} دوو رۆژ لەکن کەعبە بەرنوێژی نوێژەکانی بۆ کردم لەسەر ئەم شێوەیە: لە رۆژی یەکەما ئەو کاتە بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم کە سێبەر بە قەد قەیتانێ دەبێ. واتە: خۆربەدیمەن لە ناوەراستی ئاسمان لای دابوو، وەسێبەری تاقی ئێوارە بەحاڵ لە زیادبوونبوو، وە ئەوکاتە بەرنوێژیی نوێژی عەصری بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێ بە قەد خۆی دەبێ، وە ئەوکاتە بەرنوێژیی نوێژی شێوانی بۆ کردم کە خۆر ئاوا دەبێو رۆژووەوان رۆژوو دەشکێنێ، وە ئەوکاتە بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆ کردم کە سوورایی کەناری ئاسمان گوم دەبێ، وە ئەوکاتە بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ کردم کە شەبەق دەداو خۆراك لە رۆژووەوان یاساخ دەبێ، بەڵام لە لە رۆژی دووەمان ئەوکاتە نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێ بەقەد خۆی دەبێ، کە دەق دەکاتە کاتی نوێژی عەصری رۆژی یەکەم، وە ئەوکاتە نوێژی عەصری بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێ دووجار بەقەد خۆی دەبێ، وە نوێژی

شـێوانی لـه کـاتی پێـشووی خۆیـدا بـۆ کردمـەوە، وە ئەوکاتـە نوێـژی خەتنانی بۆ کردم کە سێیەکی شەودەڕوا، وە ئەوکاتـە نوێـژی بـەیانی بـۆ کـردم کـە سـەرزەوی روونـاك دەبێتـەوەو کانـاری ڕۆژهـەلات زەرد هەڵدەگەڕێ، ئینجا جوبرائیـل {درودی خوای لەسەربێ} رووی تێکـرم فـەرمووی: ئـەی موحەمـەد! ئـەم کاتانـە کـاتی نوێـژی پێغەمبـەرانی پـێش تۆبـوون، وەکاتی نوێـژی تـۆش لـە ناوەنـدی ئـەم دووکاتەدایـە کـە دوێنـێو ئـەمڕۆ نیشانتمدا. (ئـەبو داوودو تیرمیـذی گێڕاویانەتـەوە) تیرمیـذی بـە جـوانی دانـاوە، ئیبنـو خوزەیمـەو حـاکمیش بـە (دروسـت: صـەحیح)یـان دانـاوە تیرمیـذی فەرموویـەتی: بوخـاری دەفـەرموێ: سـەبارەت بـە دیـاریکردنی کاتی نوێژەکان ئەم فەرموودەیە دروستترین بەڵگەیە.

سێبەری کاتی نێوەڕۆ بەپێی ولات دەگۆڕێ، لە شوێنی کە کێلی قنج سـێبەری نـەبێ لـەکاتی نیـوەڕۆدا، لەگـەڵ سـێبەری پەیـداکرد ئـیتر نیوەڕۆیـە، ئەمـەیش وەك مەککەو صەنعای یەمـەن، لـە شـوێنێکیش کـە کێلی قنج لەکاتی نیـوەڕۆدا سێبەری هـەبێ هـەر لەگـەڵ دەسـتی کـرد بـە زیـادکردنی ئـیتر دەبـێ بەنیوەڕۆو نوێـژ دەبـێ، وە ئـەوە سـەرەتای کـاتی نوێژی نیوەڕۆیە، دوا کاتیشی ئەوەیە کە سێبەری هەرشتێ بە قـەد خـۆی دەبێ بێجگە لە سێبەری کاتی ئیستسواء، کە ڕۆژ وا لە ناوەڕاستی ئاسمانـا، وە ئەوە سەرەتای کاتی عەصریشە، بـەپێی فەرموودەکەی پێـشوو، بـەڵام تـۆزێ لـەوە زیـاد بکـا، چـونکە بەسەرچوونی کـاتی نیـوەڕۆ بـەهۆی ئـەو زیادەوە دەزانرێ. نوێـژی عـەصر دەمێنـێ هـەتا گـۆی خـۆر ئـاوا دەبـێ، وا باشە کە دوا نەکەوێ لەو کاتە کە سێبەری شت لە دوو قاتی خـۆی لادەدا، ئەمـــە پێـی دەگـوترێ: کـاتی هەڵبـژاردەی، بۆیــە وانـاونراوە چـونکە

جوبرائیل هەڵی بژاردووە. لەدوائەوە هەتا خۆرئاوابوون کاتی دروستبوونیەتی، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەتا خۆرئاوا دەبێ کاتی عەصر دەمێنێ (موسلیم).

نوێژی شێوان یەك کاتی هەیە کە خۆرائاوا بوونە بەپێی فەرموودەکەی، چونکە جوبرائیل لەهەر دوو رۆژەکەدا لە یەك کاتدا بەرنوێژی شێوانی بۆ پێغەمبەر کرد، رای زاناکان لە بارەی بەسەرچوونی کاتی شێوانەوە جیایە، دوو فەرمایشتیان هەیە.

**فەرمایشتی یەکەم:** کە دیارترە، واتە: اظهرە، دەفەرموێ: کاتەکەی ئەوەندەیە کە بەشی دەسنوێژێك و پۆشینی شەرمگاو بانگو قامەتو کردنی پێنج رکات بکات، چونکە رووکار (ظاهیر)ی فەرموودەکە نیشانەی ئەمەیە، لەسەر فەرمایشتی تر: حەوت رکات لە جیاتی پێنج رکات، ئەم قسەیەی دووەمە لەسەر ئەمە دامەزراوە: کە وەك سوننەتە لە پاش شێوانەوە دوورکات سوننەت بکرێ، سوننەتیشە لە پێشەوە دوو رکات بکرێ، کەواتە: (٢ + ٣ + ٢ = ٧) ئەمەیش کە دوورکات لە پێشەوە سوننەت بێ، رای دامەزراوە. بۆ دیاریکردنی ئەندازەی رکاتەکانیش ئیعتیبار بە نوێژی مرۆڤێکی میانڕەوی مامناوەندییە.

**فەرمایشتی دووەم:** نوێژی شێوان دەمێنێ هەتا سووریی کەناری ئاسمان لەلای خۆرنشینەوە لەچاو ون دەبێ! ئەمەیش بەپێی ئەم فەرمایشتەی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ}: کاتی نوێژی شێوان لە خۆرئاوابوونەوە دەست پێ دەکات هەتا سووری کەناری ئاسمان نامێنی (موسلیم).

بورەیدە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پیاوێ لە پێغەمبەری خودای پرسی: کاتی نوێژەکان کەیو کەیە؟ فەرمووده‌کە کە باسی کاتی هەموو نوێژەکان دەکا، ئەوەیشی تیایە: کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمان بەم پرسیارکەرە دەکا کە دووڕۆژ نوێژ بە جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەرو یارانی بکا، فەرمووده‌کە بۆ نوێژی شێوان دەفەرموێ: لە ڕۆژی یەکەما ئەو کاتە نوێژی شێوانی بۆکردن کە خۆر ئاوادەبێ، لە ڕۆژی دووەما پێش ئەوەی کە سووریی کەناری ئاسمان ئاوا ببێ. لە دوایی فەرموودەکەدا دەفەرموێ ئەوجا: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: فەرمووی: کوا پرسیارکەرەکە؟ پیاوەکە فەرمووی: ئەمەتام ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: کاتی گشت نوێژێ لە نێوانی ئەم دوو کاتەدایە: کە من لە ڕۆژی یەکەمو لە ڕۆژی دوەما بە بەرچاوتانەوە نوێژەکانم بۆ کردن! (موسلیم).

فەرموودە بۆ پشتگیری ڕای دووەمی زاناکان لە بارەی ماوەی کاتی شێوانەوە زۆرە، ئیبنو خوزەیمەو خەطابیو بەیهەقیو غەزالیو بەغەوی ئەم ڕای دووەمەیان پەسەند کردووە. ڕافیعی دەفەرموێ: دەستەیێ لە هاوڕێیان (ئەصحابی ڕێبازی شافیعی) لە بارەی کاتی نوێژی شێوانەوە ئەم ڕایەی دووەمیان پەسەند کردووەو بە فەرمایشتی دامەزراویان داناوە. ئەوویش دەفەرموێ: فەرموودەی دروستی زۆر بە ڕاشکاری بڕیاری ئەمە دەدەن.

سەرەتای نوێژی خەوتنان بە نەمانی سووریی کەناری ئاسمان دەست پێدەکا، بەپێی فەرموودەکان، کاتی نایابی ئەم نوێژە هەتا سێیەکی شەو دەمێنێ، بەپێی فەرموودەی جوبرائیل {دروودی خوای لەسەربێ}: دوو ڕۆژ لەلای

کەعبە بەرنوێـژیی نوێـژەکانی بـۆ کـردم. لەسـەر فەرمایـشتێ ئـەم کـاتی نایابییە هەتا نیوەی شـەو دەمێنـی، بـەپێی فەرمایـشتەکەی خۆشەویـست {دروودی خوای لەسەربێ}: کـاتی نوێـژی خـەوتنان هـەتا نیـوەی شـەوە، نـەوەوی دەفـــەرموێ: ئەمـــە فەرموودەیـــەکی دروســـتە. لـــە گێڕانەوەیـــەکا: نەبادازەحمـەتی ئۆمـەتم بـدەم ئـەگینا نوێـژی خـەوتنانم دوادەخـست بـۆ نیـوە شـەو (حـاکم ئـەم فەرموودەیـەی بـە دروسـت دانـاوە، دەفـەرموێ: بەپێی مـەرجی بوخـاریو موسـلیمە) هەرچۆنێك بێـت نوێـژی خـەوتنان هـەتا شـەبەقی بـەیان دەمێنـێ، بـەپێی فەرموودەیـەکی موسـلیم کـە دەفەرموێ: خەو قەیدی نیە، بەڵام ئـەوەی قەیـدی هەیـە ئەوەیـە کـە بـە خەبەریيو بە ئارەزوو نوێژ نەکەی تا کاتەکەی بەسەردەچێ، بـەداهاتنی کاتی نوێژەکـەی تـر کـەوا لـە دوایـەوە ئـەم فەرموودەیـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوە کە کـاتی هـەموو نوێـژێ بـەردەوام دەبـێ هـەتا کـاتی نوێژەکـەی تـر دادێ، تەنیا نوێژی بەیانی نەبێ، کاتەکەی دەمێنـێ هەتا گۆشەی سەرووی گۆی خۆر لە ئاسۆ هەڵدێ، یەکگرتن لەسەر ئـەوە هەیـە کـە کـاتی نوێـژی بـــەیانی بـــە هـــەڵهاتنی خـــۆر دێتـــە کۆتـــایی، بـــەپێی رووکـــاری ئـــەو فەرموودەیـەیش کـە جوبرائیـل پێـشنوێژی بـۆ پێغەمبـەر دەکـات کـاتی بـەیانی لەگـەڵ گزنگـی هـەتاودا کۆتـایی دێ. ئـەو وڵاتانـەی کـە سـوورایی کەناری ئاسمانیان ون نابێ چاو لە نزیکترین وڵات لـە خۆیانـەوە دەکـەنو ونبوونی سوورایی ئاسۆی ئەوان دەکەن بەسەر مەشق بـۆ خۆیـان. نوێـژی بـەیانی دادێ بـە دەرکـەوتنی سـپێدەی بـەیان: کـە برێتییـە لـە کـاتی بڵاوبوونەوەی رووناکی بە پانایی کەناری ئاسمانا لای رۆژهەڵاتـەوە، کـاتی نایابی دەمێنـێ هـەتا ئاسـتی رۆژهـەلات زەرد دەبـێو دنیـا تـەواو رووناك

دەبێتـەوە ئەمـەیش بـەپێی ڕوونکردنەوەکـەی جوبرائیـل بـۆ پێغەمبـەر، وەك پێشەوە ڕابورد، بەڵام کاتی دروستبوونی (کـە پێـی دەگـوترێ وەقتـی جـەواز) هـەتا گزنگـی خـۆر دەمێنـێ[1] بـەپێی فەرمایـشتی خۆشەویـست {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ فریایـەك ڕکاتی نوێـژی بـەیانی بکـەوێ لـە پـێش خۆرکـەوتنا ئـەوە فریـای نوێـژی بـەیانی بـە تـەواوی دەکـەوێ، بـە مەعنا بە حازری دەیکا نەك بەقەزا (موسلیم).

بـزانن کـاتی دروسـتبوون (بـەبێ ناپەسـەندیی = کەراهـەت) هـەتا پەیـدابوونی سـوورایی ئاسـۆیە، لـە پاش پەیـدابوونی ئـەم سوراییە کـاتی ناپەسەندی (کەراهەت)ە،هەتا گزنگی خۆر، ئەمە کاتێ وایـە کـە بەهانـەی ڕەوای نـەبێ، نووسـتن لـە پـێش کردنـی نوێـژی خەوتنانـدا ناپەسـەندە، هەروا قسەکردن لە پاشیەوە، مەگەر قسەی خێر، لەبەر ئەم فەرمایشتەی ئەبو بەرزەی ئەسلەمی {ڕەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نووستنی لە پێش کردنی نوێژی خەوتنانـدا پێناخۆشـبوو، هـەروا قسەکردن لە دوایەوە (شەیخان).

---

(١) مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە شەریعەتی ئیسلامدا دەفەرموێ: (وە ئەمێنێتەوە هەتا هەندێ لە قورسی ڕۆژ دەردەکەوێ و هـەتاو ئـەدا لەسـەر بەرزان). فەرهەنگی خاڵ دەڵێ:- گـزنگ تیـشکی ڕۆژە لـە بەیانیانـدا کـە یەکـەم جار ئـەدا لـە شوێنێکی بەرز. لە عەرەبییەکەشدا دەڵێ: یبقی الی طلـوع الـشمس. مەبەسـتم ئەوەیـە: ئێمـەیش لـە کوردیـدا بەرەبـەرە هـەوڵی ئـەوە بـدەین کـە زاراوەی لـەبار، بـۆ زاراوە شەرعییەکان لە زمانەکەی خۆماندا دابنێین، چونکە ئەوە گرنگترین هەنگاوە.
- وەرگێڕ -

## ٥٣) مەرجەکانی پێویستبوونی نوێژ:

**مەرجی پێویستبوونی نوێژ ئەم چەند شتەیە :**

**یەکەم: ئیسلام.**

**دووەم: باڵقبوون.**

**سێیەم: هۆشیاری.**

**چوارەم: پاکی لە بێنوێژیو زەیستانی.**

کەواتە نوێژ لەسەر ناموسوڵمانێ کە لەبنەڕەتدا ناموسوڵمان بێ نیە، چونکە نوێژ تاعەتەو هەموو تاعەتێکیش هۆی نزیکبوونەوەیە لەخوا، شتی وایش لە حاڵی بێبڕواییداو لە کەس داوا ناکرێ، هەتا ئەگەر بیشی کات نە دادەمەزرێو نەدروستەو نە گیرادەبێ. ئەوەندە هەیە پاشگەزبوو (مورتەدد) بەبێ راجیایی نوێژی لەسەر پێویستە، هەرکاتێ کە موسوڵمان بووەوە پێویستە لەسەری هەر نوێژێکی لەکاتی پاشگەزیدا فەوتاوە قەزای بکاتەوە، چونکە ئەو لە سەرەتاوە بە قبووڵی ئیسلام ئەم ئەرکەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی، دەی بەهۆی پاشگەزبوونەوە لە کۆڵی ناکەوێ، هەروەك چۆن ئەگەر کەسێ چووە ژێر ماڵێ لە پاشا لە ئیسلامیش هەڵ بگەڕێتەوە ماڵەکەی هەر لەسەر دەمێنێو بەوە لە کۆڵی ناکەوێ ئەمیش ئاوا. هەروا منداڵو شێتو بێهۆشو سەرخۆشێ کە دەستی خۆیانی تیادا نەبێ نوێژیان لەسەر نیە، خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: قەڵەمی تەکلیف لەسەر ئەم سێ کەسە هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تا خەبەری دەبێتەوە، لەسەر منداڵ تا رەسیدە دەبێ، لەسەر شێت تا هۆشی دێتەوە) ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە،

تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە، واتە: حەدیسێکی حەسەنە. بەڵام منداڵ کە فامی کردەوە پێویستە لەسەر هەقدارەکەی کە لەتەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمانی پێبکا بە نوێژکردن، لە دەساڵیدا لەسەر نوێژلێیبدا، بەڵام لێدانێکی نەرمی ئاسایی، لەکاتی نووستنیشدا ئەگە چەند منالێ بوون جێگەیان لە یەکتر بۆ جیابکاتەوە، خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژکردن، لە تەمەنی دەساڵیدا لەسەر نوێژ لێیان بدەن، لەکاتی نووستنیشدا نوێنیان لە یەکتری بۆ جیابکەنەوە. پێویستە لەسەر باوك‌و دایك منداڵەکانیان فێری فەرمانەکانی پاکی‌و خاوێنی‌و نوێژ بکەن. هەروا ژنی بێنوێژو ژنی زەیستان نوێژیان لەسەر نییە، بەڵکوو دروست نیە نوێژ بکەن، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ سەرەتای بێنوێژییەکەی جارانت دەستی پێکردەوە ئیتر نوێژ مەکە زەیستانیش لە حوکمی بێنوێژدایە.

## ٥٤) مەرجەکانی دامەزرانی نوێژ:

بزانن کە نوێژ چەن مەرج‌و بنیات‌و ناو کارو ناوباری هەیە، واتە شەرت‌و روکن‌و ئەبعاض‌و هەیئاتی هەیە، نوێژ بەبێ بوونی مەرج‌و بنیات دانامەزرێ، جیاوازی مەرج‌و بنیات ئەوەیە: مەرج بەشێ نیە لە چییەتی‌و ماهییەتی نوێژ، وەك پاکیی ئەندام لە پیسی‌و لە نانوێژی (الحدث) بەڵام بنیات ( کە پێشی دەگوترێ روکن) بەشێکە لە ناوەڕۆکی نوێژ، وەکوو چەمینەوەو کوڕنووش.

## ٥٥) مەرجی دامەزراندنی ئەم پێنجەن:

**یەکەم:** پاکیی نوێژکەرە لەبێ دەسنوێژیو لەشپیسی، یا بڵێین: لە نانوێژیی بچووكو گەورە، (حەدەثی ئەصغەرو ئەکبەر) چونکە خوا فەرمانی بەمە کردووە بە پێی ئایەتی (إذا قمتم الى الصلاة) هەتا ئەوێ کە دەفەرموێ: (فاطهروا) هەروا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا نە نوێژ بەبێ دەسنوێژو پاکی گیرا دەکاو نە خێر لە دزیو گزی گیرا دەکا.

**دووەم:** پاکیو خاوێنی لەشو پۆشاكو جێگەی نوێژە لەو پیسییانە کە چاو پۆشییان لێ نەکراوە، بەڵگەی مەرجبوونی پاکی جەستە ئەم ئایەتەیە: {وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ – سورة المدثر – ٥/٧٤} (واتە: خۆت لە تاوانو گوناە بپارێزە) بە قسەی دانەر بێ روجزنەجەسە، دیارە نەجەسیش بەواتا پیسییە، بەپێی ئەم تەفسیرە واتە: خۆت لە پیسی بپارێزە، بەڵگەیەکی تریش هەیە کە ئەم فەرموودەیەیە: کاتێ سەرەتای بێنوێژییەکەی جارانت... بەڵگەی مەرجبوونی پاکی پۆشاك ئەم ئایەتەیە: {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ – سورة المدثر – ٤/٧٤} واتە: پۆشاکەکەت پاك رابگرە. لە فەرموودەیشدا وەك لە پێشەوە رابورد فەرمان کراوە بە شۆردنی جلو بەرگ، ئەگەر خوێنی بێنوێژییان بەرکەوت. بەڵگەی مەرجبوونی پاکی جێ نوێژیش فەرموودەی عەرەبە سارانشینەکەیە کە لەناو مزگەوتەکەدا میزی کرد، وەك لە پێشەوە رابورد، ئەگەر کەسێ پیسییەك بە جێگەیەکیەوە بوو، بەبێ ئەوەی پێی بزانێ نوێژی پێوەکرد، ئەوە دەبێ هەرکاتێ پێی زانی ئەو نوێژە

بگێڕێتەوە چونکە ئەم جۆرە پاکییە پێویستەو بەپێ نەزانین (جەهل) لە کۆڵ ناکەوێ، دەق وەك چۆن پاکی لە بێدەسنوێژیو لەشپیسی بە پێنەزانینل لە کۆڵ ناکەوێ ئەمیش وا، هەیشە دەڵێ: گێڕانەوە پێویست نیە ئەم قسەیە ئیبنو لمونذیر پەسەندی کردووە، هەروا نەوەویش لە شەرحی موهذەبدا. بەڵام ئەگەر بەو پیسییەی زانیبوو بەڵام لە بیری چووبوو، ئەوە گێڕانەوەی بەبێ راجیایی لەسەرە، چونکە لەم بارەیاندا خۆی سووچدارە، لەوەدا کە پیسییەکەی نەشۆردووە،

**سێیەم:** داپۆشینی شەرمگایە، بە پۆشاکێکی پاك، هەتا لە کاتی تەنیاییو تاریکیشدا، دەبێ شەرمگا لە نوێژا داپۆشرێ، مەبەست لە شەرمگا لەم شوێنەدا ئەو شوێنانەیە لە لەش کە دەبێ لە نوێژدا داپۆشرێن مەرجبوونی داپۆشینی، لەش بەپێی ئەم ئایەتەیە: {خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ - سورة الأعراف ٣١/٧} واتە: ئەی نەتەوەی ئادەم! بەرگی باشی پاکی جوان لەبەر بکەن بۆ داپۆشینی شەرمگا، لەلای هەموو مزگەوتێکا، چ بۆ تەواف بڕۆن بۆ ئەوێ یا بۆ نوێژکردن). بەپێی ئەم فەرموودەیەی خۆشەویستیش {دروودی خوای لەسەربێ}: خودا نوێژی ژنی سەرو عوزرشۆر بەبێ لەچکە گیرانەکا •تیرمیذی گێڕاویەتەوە، حاکم بە فەرموودەیەکی جوانی داناوەو فەرموویەتی: بەپێی مەرجی ئیمامی موسلیمە کە دایناوە بۆ فەرموودەی دروست) لە دەقی عەرەبی فەرموودەکەدا وشەی (خیمار) هەیە، کە بەلەچكو سەرپۆش دەگوترێ، بڕێ دەڵێن: بە هەموو پۆشاکێك دەگوترێ. یەکگرتن هەیە لەسەر پێویستیی پۆشینی شەرمگا لە نوێژدا، بەمەرجی توانا، جا ئەگەر توانای خۆ داپۆشینی نەبوو ئەوا بە رووتی نوێژە دەکا،

وەکردنەوەیشی لەسەر نیە، چونکە ئەوە بەهانەیەکی ڕەوای گشتییە، دوورنیە کە درێژ بکێشێ، دەی لە باری وادا ئەگەر بڵێین کردنەوەی نوێژەکە پێویستە کارێکی ئەستەمە. مەرجە پۆشاکەکە ئەوەندە سفتو ئەستوور بێ ڕەنگی پێست لە بنیەوە دەرنەکەوێ، کەواتە ئەگەر ئەوەندە تەنك بوو شەرمگای نەدەشاردەوە ئەوە بەس نییە، ئەگەر هەر هیچی دەست نەکەوت ئەوەندە بەسە کەبە قوڕداپپۆشێ! پێویستە پۆشاك شەرمگا لە لای ژووروو تەنیشتەوە داپۆشێ، بەڵام لەخوارەوە پێویست نییە، جا ئەگەر لەلای ژووروو لەتەنیشتەوە شەرمگای دەبینرا، وەك لە یەخەیەوە ڕانی دەردەکەوت، ئەوە بەس نییەو نوێژەکەی بەتاڵە، لەبەرئەوە پێویستە کە بەقۆپچەو دوگمە یا بە پشتێنو بەستن خۆی توند بکاتەوە، هەتا شەرمگای لەو دوو جێگەیەوە نەبینرێ. سەلەمەی کوڕی ئەکوەع {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئایا بەکراسەوە نوێژبکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئەگەر بە چقلێکیش بووە یەخەکەی داخە (بوخاری) گریمان بەس جلێکی پیسی هەبوو، ئاویش نەبوو بیشۆرێ نوێژی پێوە دەکاو لەپاشا کەی دەستیدا بۆی بەجلێکی نوێژییەوە نوێژەکەی دەکاتەوە، لەسەر فەرمایشتێ بەڕووتی نوێژ دەکاو کردنەوەیشی لەسەر نییە، بۆ ژن ناپەسەندە لەکاتی نوێژکردندا پەچە بگرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەمزوگەوتا بوو، وە بێگانەی لێ بوو، پارێزیان لە ڕوانینی نارەوا نەدەکرد، وەمەترسی ئاژاوە هەبوو، ئەوە پێویستە لەسەری پەچە بپۆشێ، نادروستە پەچەکەی لاببات.

**چوارەم**: ئەوەیە کە بزانێ کاتی نوێژەکە داهاتووە، چونکە نوێژ لەپێش کاتی خۆیا دانامەزرێ، جا ئەگەر کاتی نەدەزانی، لە سەریەتی کە

هەوڵی زانینی بدا، چونکە بەوە فەرمانی پێکراوە، هەوڵو تێکۆشانیش بەوێرد خوێندنو دەوری قورئانو وانە گوتنەوە دەبێ، هەروا بۆی هەیە کە باوەڕ بە خوێندنی کەڵەبابێکی بەراوردکراو بکا، یا بەدەنگی بانگ، بەمەرجێ بانگدەرەکە لەرۆژانی سایەقەدا متمانە پێکراو بێ، بەڵام ئەگەر رۆژەکە هەور بوو، بانگدەرەکەیش شارەزایی رۆژانی سایەقەی نەبوو، بەڵکوو بەکۆشش بانگی دەدا، ئەوە دروست نییە، باوەڕی پێ بکا، چونکە کۆششکار (موجتەهید) کۆششکارێکی تری وەك خۆی نابێ بکا بەسەرمەشق بۆ خۆی، ئەگەر کەسێ گومانی بەهێزی وابوو کەنوێژ بووە، وە نوێژی کرد، وەلەوە دوا حاڵەکەی بۆ روون نەبۆوە ئەوە نوێژەکەی تەواوەو هیچی لەسەر نییە، هەروا ئەگەر بۆی دەرکەوت کە نوێژەکەی لەکاتی خۆیدا بووە، یالە دواکاتی خۆی بووە، بەڵام ئەگەر بۆی دەرکەوت کە لەپێش کاتدا بووە ئەوە دەیگێڕێتەوە، ئەگەر ئەستێرە شوناس بەحیسابگەری کاتی ساخ کردەوە، کار بەو ساخ کردنەوەیە دەکا، ئەستێرە شوناس لەشەرعدا بەو زانا ئاسمانییە دەگوترێ، کە شارەزایی لە زانستی ئەستێرەدا هەبێ، رێو شوێنو قۆناخو خولگەی رۆژو مانگو ئەستێرەکان بزانێ، کە بەهۆی ئەوەوە خۆر گیرانو مانگگیرانو کاتەکانی نوێژوشتی تریش دەزانێ، دیارەکە مەبەست ئەو فاڵچیو رەملگرەوەیانە نییە کە بەدرۆ دەم لەزانینی نهێنی خوایی دەکوتنو فاڵو دانە دەگرنەوەو رەمڵ لێدەدەن، ئەم جۆرە کەسانە بەدکارو بێ ئایینن، فەرموودەی دروستی ساخ لەبارەیانەوە هاتووە دەفەرموێ: ئەوەی بڕوا بۆلای فاڵچیو لەبارەی شتێکی غەیبییەوە پرسیاری لێبکاو باوەڕی پێبکاو بەختی لەلا بگرێتەوە ئەوە نوێژی چل شەوی گیرا نابێ.

له گێڕانەوەیەکی موسلیمدا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەوەی بڕوا بۆ لای فالگرەوە (عەرراف)ێك، یا بۆ لای کوڵەنانییەك، وەبڕوا بە قسەی بکا کە گوایە بە درۆی خۆی بە هۆی هەندێ شتەوە نهێنیە خوداییەکان دەزانێ، ئەوە باوەڕی نیە بەو قورئانە کە هاتۆتە خوارەوە بۆ موحەمەد.

**پێنجەم:** رووکردنە لە رووگە، ئەوەی نزیکە پێویستە لەسەری رووبکاتە زاتی رووگەخۆی، ئەوەی دوورە روو بکاتە ئاستی، رووکردنە رووگە بۆ کەسێ بتوانێ مەرجە، بەڵام لە کاتی ترسی توندا و لە نوێژی سەفەری رەوادا مەرج نیە، وەك لە دواوە دێ، بەپێی ئایەت کە دەفەرموێ: {فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ – سورة البقرة – ٢/١٥٠}. سادەی لە مەولا لە نوێژدا روو بکە بۆ لای مەسجیدولحەرام، کە کابەی شەریف وا لە ناوەڕاستی حەوشەکەیدا، ئێوەیش ئەی موسوڵمانینە! لەهەر لایەك بوون لە نوێژدا رووبکەنە لای ئەو مزگەوتە. بۆیە دەڵێین: لە نوێژدا رووکردن لە رووگە مەرجە، چونکە ئەم ئایەتە فەرمان دەکا بە رووکردن لە رووگە، ئاشکرایە کە لە غەیری نوێژدا رووکردن لە رووگە پێویست نیە، کەواتە مایەوە سەر کاتی نوێژ، بۆ ئەم بابەتە بەڵگەی لە فەرموودەیشدا هەیە، دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: کاتێ چوویت بەلای نوێژەوە دەسنوێژێکی تێرو تەسەل بگرە، ئەوجا رووبکەرە رووگە (شەیخان) نوێژگای نوێژی فەرز مەرجە چەسپ بێ، مەگەر نوێژکەر لە ناو کەشتیدا بێ، چونکە ئەستەمە لە پاپۆڕەکە دابەزێ، هەر شتێکی تر وەك کەشتی وابێ هەمان بڕیاری بۆ هەیە. وەك شەمەندەفەر، بزانن ئەگەر

کەسێ خۆی هەق رووگەی دەزانی ئیتر دروست نیە بۆی کۆشش (ئیجتیهاد)بکا بۆ دۆزینەوەی رووگە، یا بکەوێتە شوێن قسەی خەڵك، ئەگەر خۆی هەق رووگەی نەدەزانی، بەڵام کەسێکی باوەڕ پێکراوی وا هەبوو کە بەیەقین شوێنی رووگەی دەزانی ئەوە دەبێ بکەوێتە شوێن قسەی ئەو، بۆ ئەم مەبەستەیش پیاوو ژنو بەندە یەکسانن!

بەڵگەی دۆزینەوەی رووگە زۆرن، وەك قسە وەك ئاماژە، جا ئەگەر کەسێکی وای دەست نەکەوت رووگەی پێبڵێ، وە خۆی دەیتوانی کۆشش بکا ئەوا بە کۆششی خۆی جێگەیێ دیاری دەکاو رووی تێدەکا، بەزەینی خۆی کوێی بەرووگەزانی رووی تێ دەکا. مەرجە بۆ کۆششکار ئاگای لە بەڵگەو نیشانەکانی دیاریکردنو دۆزینەوەی رووگە هەبێ، دەنا دەبێ شوێن قسەی موسوڵمانێکی دادپەروەری شارەزا لە بەڵگەکان بکەوێ، یەکێ لەو بەڵگانە دەرزی قوطب نومایە، کە پێشی دەگوترێ قیبلەنما، کە ئامێرێکی نوێیە ئاستی رووگە دیاری دەکا، یەکێ تریان ئەستێرەی قوطبە.

## ٥٦) روونەکردنە رووگە لە دوو کاتدا دروستە:

**رووکردن لە رووگە مەرجی نوێژە، مەگەر لەم دوو کاتەدا :-**

**یەکەم:** لەکاتی ترسی زۆرداو لەکاتی تێکرژانو تێکبەربوون لە ریزی شەڕدا لەگەڵ دوژمن، ئەوکاتە بەهەر جۆرێ بۆیان بکرێ نوێژ بکەن دروستە، بەسواری بێ یا بە پیادەیی، روویان لە رووگەبێ یانا، بەپێی ئایەتی {فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا – سورة البقرة –

٢٣٩/٢} واته: کاتێ شەڕ گەرم بوو یاخود ترسی زۆرتان هەبوو، بەهەر جۆرێك بۆتان رێ دەکەوێ نوێژەکانتان بکەن، بە سواری بێ یا بە پیادەیی، رووتان لە رووگەبێ یا نا. ئیبنو عومەر ئاوا راڤەی ئەم ئایەتە دەکا، نافیع کە ئەم راڤەو تەفسیرەی لە ئیبنو عومەر گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: بەزەینم ئەم قسەیەی لە پێغەمبەر بیستووە بۆیە وا دەفەرموێ: (مالیك گێڕاویەتەوە) ماوەردیش دەفەرموێ: ئیمامی شافیعی بە رشتەی خۆی ئەم تەفسیرەی لە ئیبنو عومەرەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە واتە: حەدیسەکەی مالیك مەوقووفە، هەمان حەدیس شافیعی بە مەرفوعی گێڕاویەتەوە(*).

(*) داخەکەم لەم شوێنەدا، عیبارەتی دەقە عەرەبیەکە رەشۆکییە، لەسەر شێوەی بەهێزو بەپێزی عیبارەتی فیقهی نییە، بگرە زوربەی ئەم پاساودانو بایست نیشاندانە بە تەصەڕروفێکی ناسەر کەوتوانەوە لە موغنی موحتاجەوە راگوێزکراون بۆ ئێرە، جا من ئەگەر دەسکاری دەکەمو دەیبەمەوە سەر ئەصڵە راستەکەی خۆی هێنەکەی منیش دەبێ بە تەصەرروفو دەستێوەردان، ئەوەیش لە وەرگێڕاندا ناشایستەیە. لە راستیدا ئەم کتێبە ئەگەر بەوردی ساخ بکرێتەوە پەلەپەلو پچڕپچڕیو رووبازاریی پێوە دەردەکەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەمیشە پەراوێکی بە کەڵکە، زوریەی خەڵك دەتوانن بەهرەی لێ وەربگرن، بەهۆی روونیو رەوانیو ئاسانی زوربەی دارشتنی بابەتەکانیەوە. بەهەر حاڵ بەپشتی خودا بەندە بە قەد تەوانا، بەبێ تەحقیق بەسەر هیچ شوێنێکیدا گوزەر ناکەم، بفەرموون سەرنجدەن: لە موغنیدا دەفەرموێ: (... فیصلی .. کیف أمکن راکبا وماشیا لقوله تعالی: (فان خفتم فرجالا أو رکبانا) وقال ابن عمر *(رضی الله تعالی عنهما)* في تفسیر الآیة: مستقبلی القبلة وغیر مستقبلیها. قال نافع: لا أراه الامرفوعا. رواه البخاری. کەچی ئاوا تێکەڵو پێکەڵی ویصلون حینئذ رکبانا ومشاة مستقبلی القبلة وغیر

ئەمـــە وا، وەکـــی تـــریش ناچـــاری وا دەخـــوازێ کـــە لـــەکاتی وا مەترسیداردا نوێژ ئاوا بکرێ، وەك روون کرایەوە، جا لە بارودۆخی وادا نـە لـەکاتی ئـەڵڵاهو ئەکبـەری نوێژدابەسـتنداو نـە لـە کاتی کردارەکانی تـری ناونوێـژدا رووکـردن لـە رووگـە پێویسـت نیـە، نـەبۆ سوارو نـە بـۆ پیادە، بەغەوی‌و زانایانی تریش وایان فەرمووە، نوێژکردنەوەیشی لەسەر نیـە چونکە بـەهیچ بیانوویـەك بـۆی نیـە کـە نوێـژ لـەکاتی دیاریکراوی خۆی دوا بخا، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزەیـە کـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە دەبـێ نوێـژ لـەکاتی خۆیـدا بـەجێ بهێنـرێ: ﴿إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا﴾. جا لـەناو نوێـژی ترسـدا لـەکاتی ترسـی زۆرو تێکرژانـدا هـەروەك پێویسـت نیـە نوێژکـەر روو بکاتـە رووگـە دروسـتە بەپێی پێداویستی، کاری زۆریـش بکـا، وەك شمـشێر وەشـاندن‌و رم لێـدان، بـەڵام بـەهیچ جـۆرێ دروسـت نیـە کـە قیـژەو هـات‌و هـاوار بکـا، چـونکە پێویستی بـەوە ناکـا. نوێـژ لەسـەر ئـەم شـێوەیە لـە هـەموو ئـەم کاتانـەدا دروسـتە: لـە گەرمـەی شـەڕی بێباوەڕانـداو لـە شـەڕی چـەتەو رێگـرو یاخیبوانیداو لەکاتی بەرگری لە سەرو ماڵ‌و ناموسدا، ماڵەکە زینـدەماڵ بێ یا مردەمـاڵ بـێ، لـە کـاتی هـەڵهاتن لەبـەر لافـاوو ئـاگر، ئەگـەر چاری

---

مستقبلها، لقوله تعالى: (فان خفتم فرجالا أو ركبانا) هكـذا فسرها ابـن عمـر. قـال نـافع: لا أراه قـال ذلـك الا عـن رسـول الله - صلى الله عيلـه وسـلم - رواه مالـك. (وەرگێڕ) (١)

(١) بۆ راست‌و دروستی ئەم سەرنجە تەماشای (كفاية الاخيار) بەفەرموو.

- وەرگێڕ -

تری نەبوو، هەروا لە کاتی راکردنا لەبەر قەرزاری، بەمەرجێ نەتوانێ بەلگەی دەستەوسانی خۆی راست بکاتەوە، یا لەکاتێکدا کە لەترسی تۆڵە لێسەندن هەلّبێ، بەلاّم بەمەرجێ ئومێدی لێخۆشبوونی هەبێ.

**دووەم:** لە نوێژی سوننەتی سەفەریشدا (وەك کاتی ترس) روو لە رووگەکردن مەرج نیە، چ بەسواری بێ چ بە پایدەیی بێ هی کاتی سواری بەپێی ئەم فەرمایشتە کە ئیبنو عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: جاران لەسەفەردا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} بە سواری ولاّخ نوێژی سوننەتی دەکرد، بەمەرجێ ولاّخەکە لەژێریا رووی لە شوێنی مەقصەدبوایە - شەیخان) لە گێرانەوەیەکی بوخاریدا دەفەرموێ: بەسەر پشتی ولاّخەوە نوێژی سوننەتی دەکرد، بەرەو هەر لایە بوایە، بەمەرجێ رووی لەو جێگەیە بوایە کە بۆی دەچوو، بەلاّم حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} کاتێ دەیویست نوێژی فەرز بکا لە ولاّخەکە دادەبەزی، بەپێی ئەم فەرموودەیەی جابیر: جاران پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} بە سواری ولاّخ نوێژی سوننەتی دەکرد، بەمەرجێ ولاّخەکە لە ژێریا رووی لە جێگەی مەبەست بوایە، بەلاّم کە دەیویست نوێژی فەرز بکا لە ولاّخەکە دادەبەزیو رووی دەکردە رووگە (بوخاری). جا لەکاتی وادا ئەگەر لە رێبوار داوابکرێ کە روو بکاتە رووگە سەر دەکێشێ بۆ وازهێنان لە ویردو نوێژی سوننەتی پیادەیش بە قیاس لەسەر نوێژی سوننەتی سوار، چونکە لە مێشدا هەمان مەعناو مەبەست هەیە، ئەمەیش کاتێ وایە کە نەتوانێ روو بکاتە رووگە، دەنا گەرەکە رووی تێبکا، بەلایەنی کەمەوە لەکاتی نییەتهێنانا، وەك ئەوە ولاّخەکە سەری نەرمبێو جلەوەکەی لە دەستی خۆیدا بێ.

بەلگەیش ئەمەیە: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): لە سەفەردا کە دەیویست نوێژی سوننەت بکا لە پێشا رووی وشترەکەی دەکردە قیبلە، ئەوجا بەرەو قیبلە بە ئەللاهو ئەکبەر نوێژی دادەبەست، ئیتر نوێژەکەی تەواو دەکرد وشترەکەی رووی لە هەرلابکردایە مەبەستی نەبوو، بەمەرجێ بەرەو مەبەست بڕۆیشتایە، (ئەبو داوود بە رشتەیەکی جوان گێڕاویەتەوە)، ئەوەندە هەیە ئەو جێگەیەی رێبوار بۆی دەچێ رووگەیەتی، ئەگەر بەلای غەیری قیبلەدا رووی لێوەرچەرخان نوێژەکەی پووچو بەتاڵە، نوێژ خوێنی سوار دەبێ لەکاتی روکوعا کەمێ دابنەوێتەوە، لەکاتی کوڕنووشا زیاتر لەو ئەندازە دابنەوێتەوە، هەتا لە یەکیان جیابکاتەوە، بەلام بۆ پیادە پێویستە لەکاتی نوێژدابەستنداو لەکاتی چەمینەوەو کوڕنوشدا روو لە رووگە بکاو کوڕنووشەکەی لەسەر زەوێ تەواو بکا، بۆی هەیە لەکاتی خوێندنی تەحیاتا بڕوا بەرێگەدا، هەروا لەکاتی خوێندنی فاتیحاو سوورەتدا، چونکە ئەم دووکاتە درێژن، بەلام سەرنشینی پاپۆڕو شتی وا پێویستە لەکاتی نوێژی سوننەتا رووی لە رووگەبێ، چونکە ئەوەی بۆ دەکرێ.

## ٥٧) روکنەکانی نوێژ: روکن = بنیات = ستوون:

### واتە ئەو شتانە کە نوێژ بەوانە پێك دێ:

وەك لە پێشەوە زانیت نوێژ برێتییە لە چەن روکنێكو چەن مەرجێكو چەن سوننەتێکی تر، کە پێیان دەگوترێ ئەبعاضو هەیئات، روکنەکانی ئەمانەن:

١) **نیازهێنان (نیەت)** واتە: مەبەستی دڵ، لە شەرعیشدا بریتیە لە قەستیکردنی شتێ، هاوکات لەگەڵ کردنیدا، جێگەکەی ناو دڵە، گوتنی بەزمان لە سوننەتدا نەبیستراوە، لەبەر ئەوە فەرز نیە، کەواتە: گوتنی بە زمان بەبێ قەستی دڵ بەس نیە، مەرجی نیەت برپیاردانی کردنی نیەتلێهێنراوە، دەبێ ئەم نیەتە لەکاتی گوتنی ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستندا لەناو دڵدا هەبێ، سەربەڵگە لە بابەتی نیەتەوە فەرمایشتی خوای گەورەیە: {وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ – سورة البينة – ٩٨/٥} واتە: فەرمانیان پێکراوە کە بەس خوای گەورە بپەرستن‌و بەنیازێکی پاك ئایینداریی بۆ بکەن) ماوەردی دەفەرموێ: ئیخلاص نیەتە! لەگەڵ ئەم فەرموودەیەیە: هەموو کردەوەیێ بەپێی نیازو نیەتەکەیەتی. زانایانی گەلی ئیسلام بە تێکرایی دەنگ رایان لەسەر ئەوەیە کە نیەت لە نوێژا پێویستە. جا ئەگەر نوێژی فەرزی کرد پێویستە قەستی کردنی نوێژەکەو دیاریکردنی ناوو رەچاوکردنی فەرزیەتی ببێ، هەتا لە غەیری نوێژو لە نوێژی فەرزی ترو لە نوێژی سوننەت جیاببێتەوە. رەچاوکردنی فەرزێتی بۆ منداڵ پێویست نیە، چونکە نوێژی منداڵ بە سوننەت دادەمەزرێ.

٢) **رووکنی دووەم**: راوەستانە بۆ خوێندنی فاتیحاو سوورەت، بۆ کەسێ توانای هەبێ، لەکاتی نەتوانیندا دانیشتن‌و پاڵکەوتن‌و راکشان جێگەی راوەستان دەگرێتەوە، بەپێی ئەم فەرموودەیە: عیمرانی کوڕی حوصەین فەرمووی: مەیاسیریم بوو، بۆ چۆنێتی کردنی نوێژی نەخۆش پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): کرد فەرمووی: ئەگەر توانیت بەراوەستانەوە نوێژبکە، ئەگەر بەراوەستانەوە نەتتوانی بەدانیشتنەوە

بیکە، ئەگەر بە دانیشتنیشەوە نەتتوانی لەسەر تەنشت بەرەورووگە بیکە (بوخاری گێڕاویەتەوە) نەسائی ئەمەی لێ پترکردووە: خۆشەویستی ئەگەر لەسەر تەنیشتیش نەتتوانی ئەوا لەسەر پشت بیکە. حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لە کۆتایی فەرمایشتەکەیدا بۆ پشتیوانی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا - سورة البقرة - ٢٨٦/٢} واتە: خوا ئەرکێ ناخاتە سەرشانی کەسێ کە لە توانایا نەبێ! مەرجی راوەستان ئەوەیە کە زنجیرەی پشتی رێك بوەستێ، ئەگەر دەیتوانی رابوەستێ، بەلاَم ئەگەر بەتەواوی توانای چەمینەوەو کورنووشی نەبوو، لەبەر نەخۆشی پشت ئەوە دەبی رابوەستێ بۆ خوێندنی فاتیحەو بەپێی تواناش چەمینەوەو کورنووش جێبەجێ بکا، ئەگەر بۆ راوەستان ئاتاجی بەشتێ بوو کە خۆی پێبگرێ پێویستە وا بکا. بزانن مەبەست لە نەتوانین ئەوەیە کە مەترسی فەوتان یا پەرەسەندنی نەخۆشی، یا زەحمەتێکی زۆر، یا ترسی نوقومبوونو خنکانو سەرەخۆلێی هەبێ، ئەمەیان بۆ سەرنشینی گەمیو شتی وا شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەوەیە کە بە زەحمەتێکی لە رادە بەدەر نەبێ بۆی نەکرێ!.

راکشان دەبێ لەسەر تەنیشتی راست بێ، ئەگەر نەیتوانی لەسەر لای چەپ رابکشێ، لە هەردوو حالەتدا رووی لە رووگەبێ، ئەگەر هەر نەیتوانی لەسەر پشت رابکێشێ، بەلاَم شتێ بخاتە ژێر سەری هەتا رووی لە رووگە بێ، ئەگەر توانای چمینەوەو کورنووشی نەبوو بە هێماو بە ئامازە بەرەو رووگە بیانکات، دەبێ کورنووشەکەی لە چەمینەوەکەی نەویتربێ. ئەگەر ئەمەیشی بۆ نەکرا بەترووکەی چاو ئامازەیان بۆ بکا،

چونکه ئەوە لای خوارووی توانایە، ئەگەر توانای ئەوەیشی نەبوو بەدڵ نوێژەکەی بکاو بەریز کردارەکانی نوێژ بەدڵیا رابیوێری.

جا لەم حاڵەدا ئەگەر بە زبان توانای گوتنی ئەڵلاهو ئەکبەرو خوێندنی قورئانو تەحیاتو سلاودانەوەی هەبوو ئەوا بە زبان بیانڵێ، دەنا رایان دەبوێری بە دڵیدا، هەتا هۆشی لەسەر خۆبێ نابێ واز لە نوێژ بێنێ، ئەگەر لەسەر ئەم حاڵو شێوەیە نوێژیکرد گێرانەوەی لەسەر نیە، غەزالی (بەرەحمەتبێ) ئەم فەرمایشتەی خۆشەویست {درووودی خوای لەسەربێ} دەکا بە بەڵگەی ئەمە کە دەفەرموێ: کاتێ فەرمانم پێکردن بەکردنی کارێ، چەندەی بۆ تان دەلوێ لەو کارە بیکەن. هەروا ئەم ئایەتەیش: {وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ – سورة الحجر – ٩٩/١٥} واتە: لە طاعەتو خواپەرستی ساردمەبەرەوە لەسەر یەقینی تەواوو ئیمانی کامل دەمری). دیارە کە نوێژ یەکێکە لەعیبادەتە گرنگەکان، جا دەبێ هەتا دوا هەناسە بیکا، مادەم هۆشی هەبێو ئاگای مابێ. بزانن لە سێدارەداراو لە سەریەتی کە بەپێی توانای خۆی لەو حاڵەیشدا نوێژ بکا، شافیعی {رەزای خوای لێبێ} بە دەق ئەمەی فەرمووە.

٣) روکنی سێیەم: ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنە، کە پێی دەگوترێ: تەکبیرەتول ئیحرام، چونکە هەندێ شت کە لەپێش ئەودا بۆ نوێژکەر حەڵاڵە، لەپاش ئەو لێی حەرام دەبێ وەك خواردنو قسەکردنو کارێ پەیوەندی بە نوێژەوە نەبێ، بەڵگەی ئەمەیش ئەم فەرموودەیەیە: دەسنوێژ کلیلی نوێژەو ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن سەرەتای حەرام بوونی هەموو شتێکەی لەناو نوێژدا کە پەیوەندی نوێژەوە نەبێو،

سلاودانەوەیش هۆی حەڵاڵ بوونەوەی ئەو شتانەیە کە بەهۆی ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنەوە لێی حەرام بوون. ئەبوو داوودو خەڵکی تریش بەرشتەیەکی دروست گێڕاویانەتەوە) هەروا ئەم فەرموودەیەی تریشە، کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژ نارەوانەکە (مُسيئُ الصَّلاَت)ەکەی فەرموو: کاتێ چوویت بەلای نوێژەوە لە پێشا دەسنوێژێکی تێرو تەسەل بگرە، ئینجا رووبکەرە رووگەو ئەوجا بە گوتنی ئەڵڵاهو ئەکبەر نوێژ دابەستە) گوتەی تایبەتی نوێژ دابەستن (الله أكبر)ە چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: کاتێ دەستی دەکرد بە نێژ لەپێشدا رووی دەکردە رووگەو هەردوو دەستی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: الله أكبر. (ئیبنو ماجەو ئیبنو حەببان گێڕاویانەتەوە، ئیبنو حەببان بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە) ئەمە بۆ کەسێ وایە کە توانای گوتنی ئەم وشەیەی هەبێ، بەزمانی عەرەبی، ئەگەرنا وەر گەڕاوەکەی بە زمانێکی تر بڵێ، وەکوو (خودا لە هەموو کەسێ گەورە ترە) بەڵام ئەگەر دەیتوانی فێری ئەم وشەیە ببێ ئەوە دەبێ فێری ببێ، ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە تووشی سەفەریش ببێ دەبێ سەفەر بکا، چونکە لەم حاڵەدا ئەو سەفەرە رێگەچارەیە بۆ ئەنجام دانی پێویستێ، هەرشتێکیش رێگە چارەی پێویستبێ خۆشی پێویستە.

٤) **بنیات (روکن)ی چوارەم:** خوێندنی فاتیحەیە، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ لە نوێژا، لە هەموو رکاتێکا سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نیە (شەیخان گێڕاویانەتەوە). لە گێڕانەوەیەکا: هەر نوێژی پیاو سوورەتی فاتیحای تیادا نەخوێنێ لە کۆڵ ناکەوێ (دارە قوطنی بە رشتەیەکی دروست

گێڕاویەتەوە، ئیبنو حەببانو ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحی خۆیاندا گێڕاویانەتەوە) دیارە لەم جۆرە حکومانەدا ژنیش ڕێك وەك پیاو وایە. شافیعیش بە ڕشتەی خۆی فەرموودەی پیاوە نوێژ نارەوانەکەی گێڕاوەتەوە، لەوێدا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پێی دەفەرموێ: جا ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن بکەو ئەوجا سوورەتی فاتیحە بخوێنە. لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەسێ هەر نوێژی بکاو سوورەتی فاتیحای تیا نەخوێنێ ئەوە ئەو نوێژی نابەکامە، وە ناتەواویشە، بە ئەبو هورەیرە گوترا: ئەی باشە ئەگەر لە پشت پێشنوێژەوە بە جەماعەت نوێژمان دەکرد لەم کاتەدا چۆن؟ فەرمووی: لەم کاتەدا بە پەنامەکی لە دڵی خۆتەوە بیخوێنە (موسلیم). بزانن کە (بسم الله الرحمن الرحیم) ئایەتێکی تەواوە لە سەرەتای فاتیحاوە، بەڵگەی ڕۆشنی ئەمە ئەوەیە کە بوخاری لە تەئریخەکەیدا باس دەکا: کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: ئایەتەکانی فاتیحە دەژمێریو دایان دەنێ بە حەوت ئایەتو بیسمیللایش دادەنێ بە ئایەتێ لێی. بەپێی ئەم فەرموودەیەی حەزرەتیش {دروودی خوای لەسەربێ}: کاتێ سوورەتی ئەلحەمدو دەخوێنن، لەسەرەتایەوە (بسم الله الرحمن الرحیم) بخوێنن، ئەم سوورەتە ئەم ناوانەی تریشی هەیە: ئوممو لقورئانو ئوممولکیتابو ئەل - سەبعولمەسانی. (بسم الله الرحمن الرحیم)یش یەکێکە لە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە! (دارە قوطنی گێڕاویەتەوەو دەفەرموێ: پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە گشتیان جێگەی باوەڕی فەرموودە زانەکانن).

ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەریش {دروودی خوا لە پێغەمبەرو ڕەزای خوایش لەوبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: بیسمیللای دانا بە ئایەتێ لە

فاتحا (ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەکەی خۆیدا گێڕاویەتەوە) أبو نصری المؤدب دەفەرموێ: قورئانزانەکانی کووفەو شەریعەتزانەکانی مەدینە رایان یەکە لەسەر ئەوە: کە بیسمیللا ئایەتێکە لە فاتیحە. ئەگەر کەسێ بڵێ لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: عائیشەی هاوسەری حەزرەت دەفەرموێ: دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): وابوو سەرەتای نوێژی بە (الله أكبر) دەست پێدەکردو سەرەتای قورئانخوێندنی بە (الحمد لله رب العالمين) دەست پێدەکرد، ئیتر ئێوە چۆن دەڵێن: (بسم الله) سەرەتایە؟ لە وەلامیدا دەڵێین: مەبەست لەم فەرموودەیەی عائیشە دیاریکردنی خوێندنی ئەو سوورەتەیە کە نازناوی (الحمد لله رب العالمين)ە. ئەگەر گوترا: ئەم قسەیە پێچەوانەی رووکارو ظاهیری فەرموودەکەیە؟ وەلامەکەی ئەمەیە: لەم شوێنەدا چەند بەلگەیەكو چەند رایەك هەیە، بەم تەئویلە کار بە هەموو راو بەلگەکان دەکرێو هیچیان پشت گوێ ناخرێن، کەواتە: بڕیاری دیاریکردنی ئەم واتایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم یاسایە کە پێی دەگوترێ: کارکردن بە کۆی بەلگەکان! لەکاتی راوەستانداو لەو کاتانەدا کە لە جیاتی کاتی راوەستانن دەبێ فاتیحە بخوێنێ، بۆ خوێندنی فاتیحەیش پێشنوێژو پاشنوێژو نوێژ خوێنی تەنیا یەکسانن، ئیتر نوێژەکە پەنهانی بێو بە دەنگی نزمبێ یا ئاشکرابێو بە دەنگی بەرزبێ، بەهەرحاڵ لەکاتی دەسەوسانی (عیجز)داوەرگەڕاوو تەرجەمەکەی دەست نادا، بەلکوو تەرجەمەی دروست نیە، چونکە لە فزەکەی موعجیزو سەرئاسایە، بە ئادەمیزاد ناکرێ، پێویستە هەموو فاتیحە بەرەوانی بخوێنێ، یەك پیتی لێ نەبوێرێ، چواردە گیراوی (شەددە)ی تیادایە هەر چواردەیا ئەنجام بداو

هیچیان بەرنەدا. جا ئەگەر بە ئارەزوو پیتێکی پەڕاند، یا گیراویەکی بەردا، یا پیتێکی کرد بە پیتێکی تر وەك (صاد) بکا بە (سین) ئەوە نەقورئانخوێندنەکەی دادەمەزریّو نەنوێژەکەی. ئەگەر بەقەستی هەڵەیەکی زمانەوانی وای کرد کە واتای وشەکەی دەگۆڕی، وەك (ئەنعەمتە) بە (ئەنعەمتو) یا بە (ئەنعەمتی) بخوێنیّ، ئەوە نوێژکەی پووچە، بەڵام ئەگەر بە قەستی نەبوو ئەوە دەبیّ گورج بگەڕێتەوە سەریّو ئەوهەڵەیە چاك بکاو ئەو جێگەیە بە دروستی بخوێنیّ، ئەمە بۆ توانا بەسەر خوێندنی فاتیحادا وایە، بەڵام بۆ کەسیّ فاتیحەی بە جوانی لەبەر نەبیّ، لەسەریەتی کە فێری ببیّ، یا لەناو قورئاندا بیخوێنیّ، ئەگەر یەکیّ نەیتوانی فێری فاتیحە ببیّ پێویستە حەوت ئایەتی تر لە قورئان بخوێنیّ، خوای بە یەکەوە بن یا لەیەك دابڕاوبنو هەر ئایەتەی هی شوێنیّ بن، ئەگەر ئەمەیش فێرنەبوو زیکر بخوێنی، حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویّ: جا ئەگەر قورئانت دەزانی بیخوێنە، دەنا لە جیاتی ئەوە (الحمد لله) و (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) بکەو سوپاسی خوای گەورە بکەو تەلیلە بکەو باسی گەورەیی خودا بکە، ئیمامی نەوەوی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمویّ: فەرموودەیەکی جوانە. بۆیەیش مەرجە حەوت ئایەت بخوێنی چونکە فاتیحە حەوت ئایەتە. ئەمیش کەوەجەڵی ئەوە دەبیّ بەقەد ئەوبیّ. ئیبنو حەببانیش لە صەحیحەکەی خۆیدا گێڕاویەتەوە: کە پیاویّ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من ناتوانم کە قورئان فێرببم، دەی بفەرموو کەشتێکی وام فێربکە کە برێتی خوێندنی قورئانەکە بکەویّ؟

فەرمووی: بڵێ:- (سبحان الله والحمد لله، ولا اله الا الله والله أكبر، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم).

## ٥٨) گەورەیی فاتیحە لەچاو هینی تردا:

ئەبو سەعیدی کوڕی موعللا {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: جارێ لە مزگەوت نوێـژم دەکـرد، لە نـاو نوێژەکەدا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: بانگی کردم وەرامم نەدایەوە، کە نوێژەکەم تەواو کرد چوومە خزمەتی، فەرمووی: بۆچی بانگم کردیو نەهاتی؟ عەرزیم کرد: قوربان! ئەوکاتە کەتۆ گازت کردم نوێژم دەکرد، بۆیە وەرامم نەدایەوە، فەرمووی: بۆچی ئەی خوا نافەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ - سورة الأنفال - ٢٤/٨) واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بە ئایینی ئیسلام! بە پەلە وەڵامی خوداو پێغەمبەری خودا بدەنەوەو بە زوویی بچن بە دەنگیانەوە، هەر کاتێ پێغەمبەری من بانگیکردن بۆ سەر ئەو کارانەی کە دەبن بە مایەی سەربەرزی ژینی جیهانتانو بەهۆی ڕووسووریو ژیانی جاویدانی خۆشی بێئیشو ئازاری ئەو جیهانتان) لە پاشا فەرمووی: هۆشیاربە! لەپێش ئەوەدا کە لە مزگەوت بچیتە دەرێ سوورەتێکت نیشان دەدەم کە گەورەترین سوورەتە لەناو قورئاناو خێرو پاداشتی زیاترە؟ ئینجا حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەستی گرتم، جا کەویستمان لە مزگەوت دەربچین عەرزیم کرد: قوربان! جۆ تۆ فەرمووت سورەتێکت پێنیشان دەدەم گەورەترین سوورەتە لە قورئانا؟ فەرمووی: ئەو سوورەتە {الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}ە کە ئەو

(سبعا من المثانی) و {وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ}ەیە کە خودا داوێتی بە من کە لەم ئایەتەدا باسی ئەوە دەکاو دەفەرموێ: {وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ الْمَثَانِي - وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ - ١٥/٨٧} واتە: بەراستی ئێمە حەوت ئایەتی قورئانمان بەتۆ داوە کە لە هەموو رۆژو شەوێکا چەن جار لەناو نوێژدا دووپات دەکرێنەوە، سەرەڕای ئەم حەوتەی دووبارە پاتەیش باقی قورئانم پێ داوی کە گشتی گەورەیەو خاوەن پایەو مایەیە) (بوخاریو ئەبو داوود گێڕاویانەتەوە)[1].

حاکمیش لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە (خوای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئومێد دەکەم کە لە مزگەوت نەچیتە دەرەوە هەتا سوورەتێکی وا فێر ببی کە نە لە تەوراتو نە لە ئینجیلو نە لە قورئانا وێنەی نیە، کە ناوداوە بە (السبع المثانی) و (فاتحة الکتاب).

٥) **بنیاتی پێنجەمی:** نوێژ چەمینەوەیە، کە ناسراوە بە روکووع، ئەمەیش بەقورئانو سوننەتو یەککگرتنی کۆمەڵەی ئیسلام چەسپاوە، قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا - سورة الحج - ٢٢/٧٧) واتە: ئەی ئیمانداران! نوێژ بکەنو لەناو نوێژەکەدا

---

[1] لە ئەصڵەکەدا ئەم فەرموودەیە لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە، ریوایەت کراوە، ئەوە هەڵەیە، تەماشای تاجول ئوصول بەرگی چوارەم ص ١٥، هەروا (عمدە القاریو ج/١٨ ص ٨٠. بکە.

- وەرگێڕ -

چەمینەوەو کوڕنووش ئەنجام بدەن. پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} بە پیاوە نوێژ نارەوانەکەی فەرموو: ئینجا بچەمێرەوەو روکووع ببەو ئەوەندە لە چەمینەوەدا بمێنەرەوە تا لەشت لە جمو جووڵ دەکەوێ‌و ئەندامەکانت ئارام دەگرن.

٦ ) **بنیاتی شەشەم:** ئارام بوونەوەی ناو روکووعە، بەپێی فەرموودەکەی پێشەوە، لای کەمی چەمینەوە ئەوەیە: کە توانای ئەندام تەواو ئەوەندە دابنەوێتەوە کە هەر دوو بەری دەستی بگەن بە هەردوو کەشکە ئەژنۆی، جا ئەگەر نەیتوانی بە ترووکانی چاو ئاماژە بکا. لای هەرەتەواویشی ئەوەیە: کەپشت‌و ملی لە دانەوینا رێك بن‌و هەر دوو لاقی رێك راوەستێنێ‌و هەردوو کەشکە ئەژنۆی بە دەستەکانی بگرێت‌و پەنجەکانی بەرەو رووگە بڵاو بکاتەوە، لە سوننەتدا وا دەفەرموێ: ئەمە بۆ کەسێ وایە کە بە راوەستانەوەبێ، بەڵام بۆ دانیشتوو لای کەمی چەمینەوە ئەوەیە: کە ئەوەندە بچەمێتەوە کە دەمووچاوی لە بەردەمیەوە بگاتە ئاستی زەوییەکەی بەردەم ئەژنۆکانی، لای هەرەتەواویشی ئەوەیە: کە ئەوەندە دابنەوێتەوە کە تەوێڵی رێك لە ئاستی جێگە کڕنووشەکەی بێ، لای کەمی ئارام بوونەوە ئەوەیە: کە لەشی ئەوەندە لە جووڵە بکەوێ‌بەرزەوەبوونی لە دانەوێنی جیا بکرێتەوە، بە مەبەستی چەمینەوە، یا راستبوونەوە، یا کوڕنووش. کەوابێ ئەگەر یەکێ دانەوییەوە بە مەبەستی کوڕنووشی قورئانخوێندن‌و لە پاشاکردی بە چەمینەوەو کوڕنووشی نەبرد، ئەوە دروست نیە، هەروا ئەگەر دانەوێ بۆ چەمینەوەو جم‌و جووڵی بەردەوام بوو، هەتا هەڵسایەوە، ئەوە پێی ناگوترێ چەمینەوە، چونکە ئارام بوون

پەیدانەبووە، چونکە ئارام بوونەوەی بەراستی ئەوەیە کە لەپاش جووڵە ئارامی یەك پەیدا ببێ بە ئەندازەی (سبحان ربی العظیم) (چەمینەوە = رکوع).

٧) **بنیاتی حەوتەم:** راستبوونەوەیە لە چەمینەوە، چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە نوێژ ناڕەوانەکەی فەرموو: ئەوجا سەرت بەرزەوەکە هەتا رێك لەسەر پێ رادەوەستێت، راست بوونەوەی پێویست ئەوەیە کە لەپاش تەواوکردنی چەمینەوە پشتی راست بکاتەوەو بچێتەوە سەر ئەو حاڵەتەی کە لەپێش چەمینەوەدا لەسەری بووە، دەبێ لەم راستبوونەوەیە مەبەستی شتێ تر نەبێ، ئەگەر لە چەمینەوەدا مارێکی دی، لەترسی ئەوە سەری بەرزکردەوە ئەوە حلێب ناگرێ بۆیو ئەو سەربەرزکردنەوەیە بەراست بوونەوە دانانرێ.

٨) **بنیاتی هەشتەم:** ئارامبوونەوەی ناو راستبوونەوەیە، بەپێی فەرموودەکەی نوێژ ناڕەوانەکە. گەرەکە ئەندامەکانی لە جووڵە بکەون وەکوو کاتی پێش چەمینەوەی.

٩) **بنیادی نۆیەم:** کوڕنووشە، خوا دەفەرموێ: {ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا} پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) بە نوێژ ناڕەوانەکەی فەرموو: ئینجا کوڕنووش ببەو ئەوەندە لە کوڕنووشدا بمێنەرەوە هەتا جەستەت لە جمو جووول دەکەوێ.

١٠) **بنیاتی دەیەم:** ئارامبوونی ناو کوڕنووشە، بەپێی فەرموودەی نوێژ ناڕەوانەکە. لای کەمی کوڕنووش ئەوەیە کە هەندێ لە تەوێڵی بەرووتی دانێ لەسەر جیگەی نوێژەکەی، بە شێوەیەکی وا کە پێی

بگوتریّ کورنووش. پێویستە کە قوورسیی سەری بکات، بە شوێن کوورنووشەکەی، بە جۆریّ ئەگەر لۆکە لە کورنووش گاکەیدابیّ بپەستێتەوەو پەستانی پێوە دیاربیّ، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویّ: کاتیّ کورنووش دەبەی تەوێلت لەسەر زەوییەکە گیربکە، نابیّ وەك مەل دەنووك لە زەوی بدەیت بە ناوی کورنووشەوە! (ئیبنو حەببان لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە). جا ئەگەر لەسەر لاجانگ یا لەسەر لووتی، یا لەسەر مێزەرەکەی، یا لەسەر چمکی فەقیانەکەی کورنووشی برد ئەوە بەس نیە، لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرمویّ: لەبەر گەرمیو داخیی چەوو لمی کورنووشگا لە خزمەت حەزرەتدا {دروودی خوای لەسەربێ} سکالآمان کرد، سا بەشکوو چارێکمان بۆ بدۆزێتەوەبەلاّم سکالای نەپرسین! بەیهەقی ئەمەی لەم فەرموودەیە پتر کردووە: کە چەوو لمە گەرمەکە ئازاری ناوچەوانو لەپمان ئەدا، چارێکمان بکە. بۆ شوێن ناوچاوانو شوێن لەپمان. رشتەکەی ساخە. قسەی راستتر ئەوەیە کە پێویستە هەردوو بەری لەپیو هەردوو ئەژنۆیو هەردوو نووکی پێکانیشی دابنیّ لەسەر زەوی، واتە: بەشیّ لەم ئەندامانە لەسەر زەوییەکە دابنیّ لە دەستو پێدا عیبرەت بەبەری دەستو سنگی پەنجەی پێیە. خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویّ: خودا فەرمانی پێکردووم کە لەسەر ئەم حەوت ئێسکە کورنووش ببەم! لەسەر تەوێڵو لووتو، لەسەر بەری هەردوو دەستو، لەسەر هەردوو ئەژنۆو، لەسەر سەرپەنجەکانی هەردوو پیّ!. (ئەم فەرموودەیە پەسەندی هەردوولایە) مەرجە لەکاتی کورنووشدا قورسیی سەری بخاتە سەر جیّ کورنووشەکەیو پشت قنگی بەسەر سەرو ملیدا بەرزبکاتەوە، چونکە

بەرای کوڕی عازیب پاشڵی خۆی بەرزەوەکردو فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئاوەها لەسەر ئەم شێوەیە کوڕنووشی دەبرد. (ئەبو داوودو نەسائی و ئیبنو حەببان گێڕاویانەتەوە. ئیبنو حەببان بە فەرموودەیەکی دروست و ساخی داناوە) جا ئەگەر کەسێ تەوێڵی زامدار بوو، بە مەندیلێ پێچرابوو، وە لەسەر ئەو مەندیلە کوڕنووشی برد ئەوەی بەسەو کردنەوەی لەسەر نیە، چونکە لە شوێنێ کەسێ بەهێما کوڕنووش ببا دووبارەکردنەوەی لەسەر نەبێ ئەم باشتر لە سەری نیە. ئەگەر نەیتوانی کوڕنووش ببا بەسەری ئاماژەی بۆ بکا، ئەگەر بەسەریش نەیتوانی بە تروکانی چاو، بەپێی فەرموودەی: کاتێ فەرمانم پێکردن بەکردنی کارێ چەندەی بۆتان دەلوێ لەوکارە ئەنجامی بدەن!.

١١) **بنیاتی یازدەهەم:** دانیشتنی نێوانی دوو کوڕنووشەکان، بەرەنگێ لەشی لەجەم و جووڵ بکەوێ، بە نوێژ نارەوانەکەی فەرموو: ئینجا سەر بەرز کەرەوە تا قنج دادەنیشیت، ئینجا دیسانەوە کوڕنووشێکی تری وەك کوڕنووشی یەکەم بەرەوە ئیتر نوێژەکەت تاسەر بەم شێوەیە بکە (شەیخان) لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): دەستووری وا بوو کە سەری لە کوڕنووشی یەکەم هەل دەبڕی هەتا ڕێك دانەنیشتایە کوڕنووشی دووەمی نەدەبرد.

١٢) **بنیاتی دەوانزەدەهەم:** ئارام بوونی نێوانی دوو کوڕنووشەکانە بەپێی فەرموودەی نوێژ نارەوانەکە: ئەوجا سەرت لە کوڕنوووش هەڵبڕەو کە بە دانیشتنەوە لەشت لەجەم و جووڵ کەوت و ئەندامەکانت ئارام بوونەوە ئەوسا کوڕنووشی دووەم ببە.

١٣ و ١٤ و ١٥ ) بنیاتی سیازدەهەمو چواردەهەمو پازدەهەم: دانیشتنه بۆ تەحیاتی دووەمو تەشەهودی ناویەتیو سەلاواتدانە لەسەر پێغەمبەرلە ناویدا. مەبەست لە تەشەهود خوێندنی تەحیاتە. ئیبنو مەسعوود {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: لەپێشدا کە لەپشتی پێغەمبەرەوە {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژمان دەکرد، لەپێش فەرزبوونی تەحیات لە سەرمان، دەمانگوت: سلاو لەخوا، سلاو لەم، سلاو لەو، هەتا رۆژێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: فەرمووی پێمان: وامەڵێن، بەلام کاتێ لە نوێژدا دادەنیشن بۆ خوێندنی تەحیات بڵێن: (التحیات لله.. هەتەد). (دارە قوطنیو بەیهەقی بەرشتەیەکی دروست گێراویەتەوە) رستەی لەپێش فەرزبوونی تەحیات لە سەرمانو وشەی: (بڵێن) ئەم دووە بە دیمەن بەلگەن لەسەر پێویستبوون، لە صەحیحەیندا فەرمان بە خوێندنی تەحیات کراوە، کاتێ خوێندنی تەحیات چەسپاو پێویستبوو، دانیشتنیش بۆی پێویست دەبێ.

دوو گێڕانەوەی دروست بۆ گوتەکانی تەحیات هەیە، هی ئیبنو مەسعودو هی ئیبنو عەبباس، گێڕانەوەی ئیبنو مەسعوود ئاوایە: (**التحيات لله والصلوات والطيبات، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين. أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله**). گێڕانەوەی ئیبنو عەبباسیش ئاوایە: فەرمووی: جاران پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چۆن فێری قورئانی دەکردین ئاوەهایش فێری تەحیاتی دەکردین، گشت جارێ دەیفەرموو: (**التحيات المباركات**

**الصلوات الطيبات لله، السلام عليك أيها النبى ورحمة الله وبركاته. السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين. اشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله)** (شافیعیو موسلیمو ئەبو داوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە) شافیعی دەفەرموێ: چەند فەرموودەیەکی جیاجیا لە بارەی تەحیاتەوە ریوایەت کراوە، من ئەمەیانم لە لاپەسەندترە، چونکە تەواوترینیانە. حافیظ دەفەرموێ: لە شافیعی پرسیارکرا هۆی چییە تەحیاتەکەی ئیبنو عەبباس هەڵدەبژێرێ؟ فەرمووی: چونکە گوشادو فرەوانەو خۆیشم بە رشتەیەکی دروست بیستوومە هەتا سەر ئیبنو عەبباس، لەبەر ئەوە بەلامەوە داگرترەو گوتەکەی لە هینەکانی تر زیاترە، هەر لەبەر ئەوە پەسەندم کردووە، بەلام سەرکۆنەی کەسیش ناکەم ئەگەر گوتەیەکی تری تەحیات پەسەند بکا، لە گۆتە دروستەکانی. لای هەرەتەواوی تەحیات ئەوە: کە لەم ئەندازەیەی باس کرا ئەمە پتر بکا: **(اللهم صل على محمد وعلى ال محمد كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم، وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم، انك حميد مجيد)** بەڵگەی پێویستبوونی سەلاواتدانیش لەسەر پێغەمبەر (درووده خوای لەسەربێ) ئەم فەرموودەیەیە: لە پێغەمبەر (درووده خوای لەسەربێ) پرسیار کرا: کاتێ نوێژ دەکەین لەناو تەحیاتدا چۆن چۆنی سەلاواتت لە سەربدەین؟ فەرمووی: بڵێن: **(اللهم صل على محمد وعلى آل محمد)** (شەیخان) ئەگەر توانای تەحیاتی نەبوو تەرجەمەی دەکا بەزمانێکی تر.

١٦) **بنیـــاتی شـــازدەهەم:** ســـلاّودانەوەی یەکەمـــە، وەك لـــەم فەرموودەیـەدا رابـوورد: دەسـنوێژ کلیلـی نوێـژە.. تـا کۆتـایی. لای کـەمی ســلاّودانـەوە ئـەوەنـدەیــە: (الــسـلام علــیکم) نـــەوەوی (خـوای لێ رازی بێت) دەفـەرموێ: چـەند فەرموودەیـەکی دروسـت هەیـە کـە پێغەمبـەر ئـاوا سلاّوی دەدایەوە: (السلام علیکم) گەڵێ جارانیش دەیفـەرموو: (الـسلام علیکم ورحة الله).

١٧) **بنیـاتی حەڤدەهـەم:** تەرتیبـە، واتـە: ریزکـردنـی ئـەم بنیاتانـە بەرودوا لەسەر ئەم شێوەیەی لە پێشەوە باسکرا، ئەمـەیش بـۆ پـەیڕەوی کردنــی پێغەمبــەر، وە بــەپێی فــەرموودەی: (صــلوا کمــا رأیتمــونی أصلی)، کە ئەمە کوردییەکەیەتی: چۆن من نوێژ دەکەم لەبەر چاوتان ئاوا نوێژ بکەن. وەلحاڵ پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ): لە ژیانیدا لەسەر ئەم شـیوە ریزکـراوە نوێـژی دەکـرد. لەسـەر رای فەرمایـشتی دروسـت: نیـەت هێنانی لە نوێژ دەرچوون پێویستو واجب نیە.

## ٥٩) ئەو شتانەی لە پێش دەستکردن بـە نوێـژ سوننەتن:

دووشت سوننـەتن لە پێش دەستکردن بە نوێـژ: کـە بـانـگو قامـەتن، کە بە واتا جاڕدانو ئاگادارکردنـەوەن، لـە شەرعیـشدا وێردێکـی تایبـەتن، کراون بە دەستوور بۆ بانگەوازکرن بۆ نوێژی فـەرزو بـەس. ئـەم دوەیـش بەپێی قورئانو سوننـەتو یـەکگرتنی کۆمەڵەی گـەلی ئیـسلام کـراون بـە

سوننەت. خوای گەورە دەفەرموێ: {وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا – سورة المائدة – ٥/٥٨) واتە: (کاتێ ئێوە موسوڵمانان بانگ دەکەن کە بێن بۆ نوێژکردن ئەوان ئەو نوێژە، یا ئەو بانگدانی ئێوەیە دەکەن بەگاڵتەو مەزاق) پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ نوێژ دەبێ با یەکێکتان بانگتان بۆ بدا، وە کێتان گەورەتر بوو با ئەو بەرنوێژیتان بۆ بکا، (شەیخان) لە گێڕانەوەیەکا: منو هاوڕێیەکم چووین بۆ خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} کاتێ ویستمان لە خزمەتی بگەڕێینەوە، پێی فەرمووین: کاتێ کە نوێژ دەبێ بانگ بدەن، لە پاشا قامەت بکەن.

وەکی تریش بێشك بۆ نوێژی فەرزی جەماعەتی پیاوان بانگ سوننەتە، بۆ تاکیش کە بەتەنیا نوێژ بکا بانگدان سوننەتە، گوتراویشتە: کە سوننەت نیە بۆی، چونکە ئاگادارکردنەوە لەئارادا نیە. بەڵام قسەی راست ئەوەیە کە بانگ بۆ تەنیایش سوننەتە چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: بە ئەبو سەعیدی خودری فەرموو: دەتبینم کە تۆ حەزت لە ماڵاتو مەڕداریو دەشتە، جا هەرکاتێ لەناو مەڕو ماڵاتەکەتا بوویتو بانگتدا، یا لەو دەشتە بوویتو بانگتدا، تەواو دەنگ لە بانگەکە هەڵبڕە، چونکە هەرچی لە قەری دەنگی بانگدەردابێو گوێی لێبێ، جنۆکەبێ، مرۆڤبێ، شێتێ تربێ، لە رۆژی قیامەتدا ئەو شایەتییەی. بۆ ئەدا (شەیخان). سوننەتە بانگو قامەت بەراوەستانەوەبن، سوننەتە روو بەقیبلەبن، سوننەتە باگدەرو قامەتکەر دەسنوێژیان هەبێو لەشیان پاك بێو بانگدەر دەنگی خۆشبێو دەنگ بەرز بێو بە دادبێ، ئەگەر پێویستیش بوو بانگەکە لەسەر شوێنێکی بەرز بێ، یا لە سەربانی

مزگەوتبێ، وە لەجاری یەکەمی (حی علی الصلاة)دا بەسەر لابکاتەوە بەلای راستا، وە لە جاری دووەما بگەڕێتەوە بۆ سەر وەزعی خۆی، وە لەجاری یەکەمی (حی علی الفلاح)دا بەسەر نەك بەسینگ، لابکاتەوە بەلای چەپا، وە لەجاری دووەمدا بگەڕێتەوە بۆ سەر وەزعی خۆی. سوننەتە دەنگ تەواو لە بانگ هەڵبڕێ، با تەنیا هەر خۆشی بێ، لەبەر فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودری.

مەرجە ئەوکەسەی کە بانگو قامەت دەخوێنێ موسوڵمان بێ، مەرجە بانگدەر فامیدەبێو خاوەن تەمیزو هۆش بێو نێرینەبێ. لەبەر ئەوەی بانگدان بەسراوە بە سەرنجو تەماشای بانگدەرەوە پێویستی بە فەرمانی پێنوێژ نیە بەڵام قامەتکردن بەساروە بە فەرمانی پێشنوێژەوە، لەبەر ئەوەی دەبێ لەسەر فەرمانی ئەوبێ.

## ٦٠) لە سەرەتاوە هۆی دامەزراندنی بانگو قامەت چی بوو؟:

عەبدوڵڵای کوڕی زەید فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: فەرمانی فەرموو کە ناقوسێ دروست بکرێ، هەتا لێی بدەن بۆ ئەوەی خەڵکەکە کۆببنەوە بۆ نوێژی جەماعەت، لەخەوما پیاوێکم بینی زەنگێکی گەورەی پێبوو پێم گوت: ئەی بەندەی خودا! ئایا ئەم زەنگە دەفرۆشی؟ گوتی: بۆچیتە؟ گوتم: بانگەوازی پێدەکەین بۆ کۆبوونەوە بۆ نوێژ. گوتی: ئەی بۆ شتێکت پێنیشان نەدەم کە لەوە باشتربێ؟ گوتم: ئادەی بفەرموو، فەرمووی: لەباتی ئەوە دەڵێیت: (الله أکبر، الله

اكبر الله اكبر. اشهد ان لا الـه الا الله. اشـهد أن لا الـه الا الله. أشـهد أن محمدا رسول الله اشهد ان محمدا رسول الله حـى علـى الـصلاة حى على الصلاة. حى على الفلاح حـى علـى الفلاح. الله اكبر الله اكـبر. لا الـه الا الله) ئينجـا پياوەكـە كـەمێ دوور كەوتـەوەو ئـەوجا فەرمووی: بۆ قامەتی نوێژيش بڵێ: (الله اكبر الله اكبر، اشهد أن لا الـه الا الله، اشهد أن محمـدا رسـول الله، حـى علـى الـصلاة، حـى علـى الفلاح، قد قامـت الـصلاة قـد قامـت الـصلاة، الله اكـبر الله أكـبر، لا اله الا الله).

جـا كـە رۆژم لێبـووەوە چـوومە خزمـەتی جـەزرەتو ئـەم خـەوەم عـەرزی كـرد، فـەرمووی: خـوا ياربـێ ئەمـە خـەونێكی راسـتو دروسـتە دەهەڵسە لەگەڵ بيلالا، ئەوەی لەم خەونەدا ديوتە پێـی رەوان بكـەو پێـی بڵێ، با بانگی پێ بدا، چونكە ئەو دەنگی لەتۆ زولاڵترە!.

ئيتر منيش لەگەڵ بيلالدا هەڵسامو وشە بە وشە بۆيم رەدكـردەوەو ئەويش يەكەم بانگيدا، عومەر لەماڵەوە گوێی لەم بانگـە دەبـێ، بـە پەلـە دەردەچێو پۆشاكەكەی بەكێش كردو هاتو فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خودا! بەو كەسە كە تۆی كردووە بە پێغەمبەری راستو دروسـت، منـيش وەك ئەو ئەم خەونـەم ديوە. پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: دەی سوپاس بـۆ خـوا (ئەحمـەد گێراويەتـەوە) تـەرجيعو تـەثويب سوننەتن، تەرجيع ئەوەيە بانگدەر لەپێش ئـەوەدا كـە بـە دەنگـی بـەرز دوو وشـەی شەهادەت بڵێ، لەژێرلێوەوە بە پەنامەكی ئەم دوو وشەيە بڵێ، ئەوجا بـە دەنگـی بـەرز بيانڵێـت. تـەثـويبـيش ئەوەيـە: لـە

بانگی بەیانیدا، بانگدەر لە پاش (حی علی الفلاح) دوو جار بڵێ: (الصلاة خیر من النوم) ئەم دووە سوننەتن بەپێی فەرموودەکەی ئەبو مەحذوورە، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} بانگی فێرکردم نۆزدە وشە بوو.. تا ئەوێ کە دەفەرموێ: ئەگەر بۆ نوێژی بەیانی بانگت دەدا بشڵێ: (الصلاة خیر من النوم الصلاة خیر من النوم) نوێژ لە خەو باشرە، نوێژ لە خەو باشترە. (موسلیم‌و ئەبو داوودو تیرمیذی‌و نەسائی گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی دروستە). سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە گوێی لە بانگ‌و قامەت بێ، ئەوەی ئەوان دەیڵێن ئەمیش بیڵێ، بێجگە لەهەر دوو گوتەی (حی علی الصلاة) و (حی علی الفلاح) لەمانا بڵێ: (لا حول ولا قوة الا بالله) بێجگە لە وەڵامی (الصلاة خیر من النوم) لێرەدا بڵێ: (صدقت وبررت وبالحق نطقت) بێجگە لە وەڵامی (قد قامت الصلاة) لێرەدا بڵێ: (اقامها الله وأدمها وجعلنی من صالحی أهلها). بەڵگەی ئەمانە ئەم فەرموودەیانەن: کاتێ بیلال {ڕەزای خوای لێبێ} دەیفەرموو: (قد قامت الصلاة) پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەیفەرموو: (اقامها الله وأدامها) عومەریش {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: کاتێ بانگدەر گوتی: (الله أکبر الله أکبر) کەسێکیش لە ئێوە بڵێ: (الله أکبر الله أکبر)، وە کاتێ ئەو گوتی (اشهد أن لا اله الا الله)، ئەویش بڵێ: (اشهد ان لا اله الا الله)، وە کاتێ ئەو گوتی: (اشهد أن محمدا رسول الله) ئەویش بڵێ: (لا حول ولا قوة الا بالله)، وەکاتێ ئەو گوتی: (حی علی الفلاح)، ئەویش بڵێ: (اشهد أن محمد رسول الله) وە

کاتێ ئەو گوتی: (حی علی الصلاه) ئەویش بڵێ: (لا حول ولا قوة الا بالله) وەکاتی ئەو گوتی (الله أکبر الله أکبر)، ئەویش بڵێ: (الله أکبر الله اکبر) وەکاتێ ئەو گوتی (لا الـه الا الله) ئەویش بڵێ (لا الـه الا الله) وه ئەم گوتنی وەڵامانەی لە دڵەوەبێو بۆ رەزای خوابێ، ئەوە ئەو کەسە دەچێتە بەهەشت ( موسلیم گێراویەتەوە) سوننەتە وەقفەو وەستان بەزەنەی رێ، لەکاتی گوتنی هەموو (الله أکبر)ێکا، چونکە دەفەرموێ (درووده‌ی خوای لەسەربێ): ئەی بیلال! کە بانگ دەدەیت لەسەرەخۆ، بەشێنەیی بانگ بدەو پەلەی لێ مەکە بەڵام قامەت بە گورجی تێ پەڕێنە: (یا بلال اذا اذنت فترسل في أذانك واذا أقمت فاحدر) لە شەرحی تیرمیذیدا موحەممەدی کوڕی عەبدورەحمان دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کە بانگدەر هەموو وشەیێ لە وشەکانی بانگ بەسەریەکەوە بەیەك هەناسە دەڵێ. سوننەتە بۆ بانگدەرو قامەتکەر لەپاش بانگو قامەتەکەوە سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر بدەنو نزا ناسارەوکە بخوێنن، بڵێن: (اللهم صل وسلم وبارك على النبي الكريم وآلـه. اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت سيدنا محمداً الوسيلة والفضيلة والدرجة الرفيعة وابعثه مقاما محمودا الذي وعدته انك لا تخلف الميعاد).

عەبدوڵلای کوڕی عەمر دەفەرموێ: لە خۆشەویستم بیست دەیفەرموو (درووده‌ی خوای لەسەربێ): کاتێ گوێتان لە بانگ دەبێ، بانگدەر چ دەڵێ ئێوەیش ئەوە بڵێنەوە، لەپاشا صەڵاوات لە دیاری من بدەن، چونکە ئەوەی یەك صەڵاوات لەسەر من بدا خودای گەورە لە باتی ئەوە دە

رەحمەت دەرێژێ بەسەریدا، لەپاش ئەوەیش داوای پایای (الوسیلە)م لە خودا بۆ بکەن، کە یەکێکە لە پایە هەرەبەرزەکانی بەهەشت، دانراوە بۆ بەندەیەکی باش لە بەندە هەرە باشەکانی خودا، وە بۆ ئەو بەندەیە نەبێ بۆ کەسی تر دەست نادا، وە من ئومێد دەکەمو هێوام هەیە کە خۆم ئەو بەندەیە بم، جا ئەوەیش بزانن ئەو کەسەی کە داوای ئەم پایەی ئەلوەسیلەیە لە خودا بۆ من بکا ئیتر تکاو شەفاعەتی منیش بۆ ئەو سەردەگرێ (موسلیم) لە جابیرەوە {رەزای خوای لێبێ} خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ لە پاش بیستنی بانگ بڵێ: (اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاما محمدا الذى وعدته) هەر کەسێ لەو کاتەدا ئەمە بڵێ لە ڕۆژی قیامەتا تکای من بۆ ئەو قەبووڵ دەبێ. (بوخاری).

وە سوننەتە لەنێوان بانگو قامەتدا هەموو کەسێ نزای باش بکا بۆ ئیشی دینو دنیای خۆیو موسوڵمانان. چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: نزا لە نێوانی بانگو قامەتدا ڕەت نابێتەوە. (ئەبو داوودو نەسائیو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە) تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی دروستە، ئەمەیشی لێ پتر کردووە: گوتیان: قوربان! چی نزایێ باشە تا بیڵێین؟ فەرمووی: لە خودا داوای عەفوو عافێتو ئاسوودەیی دینو دنیا بکەنو داوای لێبوردنی تاوانو لەشی ساغی لێبکەن!.

# ٦١) باسی ئەو شتانەی کە لەناو نوێژدا سوننەتن و پێیان دەگوترێ (ئەبعاض) واتە: گرنگە سوننەتەکان:

**ئەو شتانەی کە لەناو نوێژدا سوننەتن:-**

**یەکەم:** تەحیاتی یەکەم، بەپێی ئەم فەرموودەیە کە عەبدوڵلای کوڕی مالیکی کوڕی بوجەینە دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: لە نوێژی نیوەڕۆدا تەحیاتی یەکەمی نەخوێندو هەڵسایەوە، بەڵام کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد دوو کوڕنووشی هەڵەی برد. (شەیخان). دیارە ئەگەر تەحیاتی یەکەم فەرز بوایە تەرکی نەدەکردو بۆی دەگەڕایەوە، کەواتە: ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە سوننەتە، بۆ تەحیات هەرچۆن دابنیشێ دەبێ، بەڵام لە تەحیاتی یەکەما ئیفتیراش سوننەتە، کە ئەوەیە پێی چەپی لەژێر خۆیا رادەخاو پێی راستی هەڵ دەنێ و سەرەپەنجەکانی پێی راستی دەکاتە رووگەو لەسەر قاپە رەقەڵەی پێی چەپی و سەرپەنجەکانی پێی راستی دادەنیشێت. لە تەحیاتی دواییشدا تەوەررووك سوننەتە، کە وەکوو ئیفتیراش وایە، بەڵام ئەوەندە هەیە لەمدا پێی چەپی لە ژێر خۆیەوە لەلای راستیەوە دەردەکاو لاقنگی دەلکێنێ بە زەوییەکەوە (لە ئەصڵەکەدا تەوەرووك فەرامۆش کرابوو، نازانم بۆ. (وەرگێڕ).

**دووەم:** قونووت خوێندنە لەپاش راستبوونەوە لە چەمینەوەی رکاتی دووەمی نوێژی بەیانی، هەروا لە نوێژی وەتردا لە نیوەی دووەمی رەمەزاندا. بەڵگەی قونووتی بەیانی ئەم فەرموودەیەی ئەنەسە

دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} تا لە دنیا دەرچوو هەمیشە لە نوێژی بەیانیدا قونووتی دەخوێند. (ئیمامی ئەحمەدو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە). ئیبنو صەلاح دەفەرموێ: پتر لە کەسێ لە حوففاظی حەدیث بڕیاری دروستیی ئەم فەرموودەیان داوە. یەکێ لەوانە حاکم‌و بەیهەقی‌و بەلْخییە. بەیهەقی دەفەرموێ: کارکردن بە گوێرەی ئەم فەرموودەیە لە چوار جێنشینەکەوە وەرگیراوە، واتە: لە خولەفای ئەربەعەوە، بەڵگەی ئەوەیش کە قونووت لەپاش سەربەرزکردنەوەیە لە چەمینەوەی ڕکاتی دووەم فەرموودەکەی (شەیخەین‌و ئەبو داوودە) کە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: لە نوێژی بەیانیدا لە ڕکاتی دووەما، لەپاش (ربنا ولك الحمد)ەوە دەیفەرموو: (اللهم أنج الوليد..) تا کۆتایی فەرموودەکە، کە پوختەو پاڵفتەکەی ئەمەیە: لە داستانەکەی شەهیدەکانی بیری مەعوونەدا، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە نوێژی بەیانیدا لەپاش هەڵسانەوە لە چەمینەوەی ڕکاتی دووەم، قنووتی دەخوێند، حەدیسێکیش لە موستەدرەکی حامکدا هەیە، موغنی موحتاج نەقلی کردووە ئەویش دەقە لەسەر ئەمە[1].

---

[1] لێرەدا (كفاية الاخيار) و (الفقه المسير)ە کە چونیەکن. بەڵام هەر دوو ئەصڵەکە شەڵەژاون، بەپێی تاج الاصول وشەرحی صەحیحی موسلیم‌و موغنی موحتاج‌و عومدەتول قاری شەرحی صەحیحی بوخاری) ڕاستم کردەوە، ئەصڵەکان ئاوایە: (وكون القنوت في الركعة الثانية فلما رواه البخاري في صحيحه، وكونه بعد رفع الرأس من الركوع فلما رواه الشيخان عن أبي هريرة *(رضي الله عنه)* أن رسول الله *(صلى الله عليه وسلم)*: لما قنت في قصة قتلى بئر معونة قنت بعد الركوع فقسنا عليه قنوت

سوننەتی قونووت بە هەموو نزاو پارانەوەو وەسپدانەوەی خوای گەورە دەبێ، تەنانەت بە خوێندنی ئایەتێکیش کە نزاو وەسپدانەوەی خوای تیادابێ، بە نیازی قونووت، سوننەتەکە بە ئەوەندەیش دێتە جێ، بەڵام لەسەر شێوە بیستراوەکەی خۆی باشترە. یەکێ لە نزا بیستراوەکانی ئەمەیە: (**اللهم اهدنى فيمن هديت وعافنى فيمن عافيت، وتولنى فيمن توليت وبارك لى فيما أعطيت وقنى شر ماقضيت فانك تقضى ولا يقضى عليك وانه لا يذل من واليت تباركت ربنا وتعاليت**). (ئەبو داودوو تیرمیذیو نەسائیو کەسانی تریش بە رشتەیەکی راستو دروست گێڕاویانەتەوە) رافیعی دەفەرموێ: لە پێش

---

الصبح؟!) جارێ حەیدثی وا بەم لەفظە لە صەحیحەیندا نیە، ئەم جۆرە ریوایەتە نەریوایەت لە لەفظە نە بە مەعنایە، نە موودرەجە، نە نەقلّ بە تەصەرووفە، حەدیپ وا ریوایەت ناکرێ. بەڵێ لە داستانەکەدا، کە یەکێ لە ریوایەتەکانی، ئەو حەدیسەی شەیخەینو ئەبو داوودە کە من استشهادم پێی کرد بەڵگەی ئەم دوو کارەی تیادایە. گەرچی لە صەحیحەیندا رێوایەتێ هەیە لە ئەنەسەوە، لەسەر ئەوە کە جاران پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە پێش بەرزەوەبوون لە روکوع قونووتی دەخوێنند، بەڵام بەیهەقی دەفەرموێ: کەسانێ کە گێڕاویانەتەوە قونووت لەپاش بەرزبوونەوە بە ژمارە زۆرترو بە حیفظ بە حیفظترن، کەواتەقسەی ئەوان لە پێشترە (لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: عاصیم فەرمووی: لە ئەنەسم پرسی: قونووت لە پێش روکووعدایە یا لەپاش روکوع؟ بەڵام دەقی ئەصڵەکە کە دەڵێ: (يقنت قبل الرفع من الركوع) ئیهامی ئەوە دەکا، کە قونووت لەناو روکوعدا بخوێنرێ، وا دەزانم لێرەدا وشەی (الرفع) موقحەمە گەرچی ئەم رستەیە لە (كفاية الاخيار)یشدا هەیە، هەرچۆنبێ ئاڵۆزەو ئەنجامی کەمتەرخەمییە.
- وەرگێڕ -

رستەی (تبارکت ربنا وتعالیت)ەوە، زاناکان ئەم رستەیان پتر کردووە: (ولا یعز من عادیت) لە گێڕانەوەیەکی بەیهەقیدا لەپاش رستەی (تبارکت ربنا وتعالیت)ەوە ئەمەیش هەیە: (فلك الحمد علی ماقضیت أستغفرك وأتوب الیك). بۆ پێشنوێژ سوننەتە بە لەفزی کۆمەل قونووتەکەی بخوێنێ، بەلکوو ناپەسەندە کە نزاکەی هەر بۆ خۆی بێ، بەپێی فەرمووودەکەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: هەرکەسێ بەرنوێژی بۆ کۆمەلێ بکاو نزای باش بەس بۆ خۆی بکاو بۆ ئەوانی نەکا، ئەگەر وابکا بەراستی ناپاکییان لێدەکا. (ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوەو تیرمیذی بە جوانی داناوە). سوننەتیشە پێشنوێژو پاشنوێژو قونووتخوێن دەست بەرز بکەنەوە، تا کۆتایی قونووت، بەلاّم دەست هێنان بە دەموچاودا سوننەت نیە، چونکە چەسپاو (ثابت) نیە، ئەمە فەرمایشتی بەیهەقیە. بەبێ راجیایی مستهێنان بەسەر سنگدا سوننەت نیە، بەلکوو کۆمەلێ زانا بەدەق دەفەرموون: شتی وا ناپەسەندە، ئەمەیش لە (الررضە)دا وا دەفەرموێ: بەلگەی قونووتی وەتری نیوەی دووەمی رەمەزان، تیرمیذی لە ئیمامی علییەوە، ئەبو داوود لە ئوبییەی کوڕی کەعبەوە گێڕاویانەتەوە.

## ٦٢) ئەم شتانەیش لەناو نوێژدا سوننەتن و پێیان دەگوترێ (هەیئات) واتە: سوننەتە سووکەڵەکان:

ئەم سوننەتانە پازدەن، بە کورتی هەڵە پڕناکرێنەوە، واتە کە فەوتان بە سەجدەی سەهوو جەبر ناکرێنەوە.

**یەکەم**: دەست بەرزکردنەوەیە لەم کاتانەدا: لە کاتی (الله أكبر)ی نوێژدابەستنداو، لەکاتی دانەوینەوە بۆ چەمینەوەو، لەکاتی سەربەرزکردنەوە لە چەمینەوەو، لەکاتی هەڵسانەوە لەپاش تەحیاتی یەکەم، لەسەر ئەم شێوەیە: هەردوو دەستی بە رووتیو بەکراوەییو لەگەڵ کەمێ بڵاوی پەنجەکانی بەرزدەکاتەوە هەتا سەری پەنجەکانی دەگاتە ڕێکی لای ژوورووی گوێیو، ناو لەپەکانی دەگەنە ئاستی هەردوو سەرشانەکانی. ئیتر بۆ ئەمە وەك یەکە. کە بە پێوە نوێژبکا، یا بە دانیشتنەوە، یا بەراکشانەوە، وە نوێژەکە فەرز بێ یا سوننەت، وە نوێژکەرەکە پیاو بێ یا ژن، پێشنوێژ بێ یا پاشنوێژ ئەمانەیش سوننەتن بەپێی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە گوتنی (الله أكبر) نوێژی دادەبەست، وە لەکاتی ئەڵلاهو ئەکبەرکردندا هەر دوو دەستی، تا بەرابەر هەردوو سەرشانی بەرزدەکردەوە، وە کاتێ دەچوو بۆ روکووع ئەڵلاهو ئەکبەری دەکردو دیسان بەو چەشنە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، وە کاتێ لە چەمینەوە هەڵ دەسایەوە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) وە لەم کاتەیشدا بەو چەشنە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە تا ئاستی هەردوو

سەرشانی، ئینجا دەیفەرموو: (ربنا ولك الحمد). لە گێڕانەوەیەکدا: هەروەها هەمان چەشن هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە لەوکاتەدا کە دوو رکاتی تەواو دەکردو هەڵ دەسایەوە بۆ رکاتی سێیەم، بەڵام لەکاتی کوڕنووشداو لەو کاتەدا کە سەری لە کوڕنووش هەڵ دەبڕی دەستی بەرز نەدەکردەوە (ش/د/ت/ن – بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی گێڕاویانەتەوە).

دووەم: بە دەستی راستی مووچی دەستی چەپی بگریٚ، قوبەیصەی کوڕی هەلیب لە باوکیەوە دەفەرمویٚ: جاران پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کاتێ بەرنوێژی بۆ دەکردین، بە دەستی راستی مووچی دەستی چەپی خۆی دەگرت. (تیرمیذی) پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: یەکێکە لە رەفتارە بەرزەکانی پێغەمبەران کە لەناو نوێژدا بە دەستی راست مووچی دەستی چەپ بگیریٚ (شەیخانو نەسائیو حاکم). دەست دانان لە خواروو ناوکەوە، یا لە سەروویەوە، چونیەکە، چونکە ئەم دوو جۆرە لە هاڕێیانی پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە، عەلی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمویٚ: سوننەتە لە نوێژدا، لەکاتی راوەستانا، دەستی راست لەسەر دەستی چەپ لە خوار ناوکەوە دابنریٚ. (ئەبو داوودو ئەحمەدو ئیبنو ئەبی شەیبە). تیرمیذیش دەفەرمویٚ: هەندیٚ وا بەباش دەزانن کە دەستەکانی لە ژوور ناوکیەوە دابنیٚ، هەندێکیش وا بەباش دەزانن کە لە خوار ناوکیەوە دایان بنیٚ، هەموو ئەمانە بەلایانەوە مەودای گوشادە. وائیلی کوڕی حوجریش دەفەرمویٚ: لەگەڵ پێغەمبەردا بە جەماعەت نوێژم کرد، دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دانا، لەسەر سینگی. (ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەکەیداو، ئەبو داوودو نەسائی

گێڕاویانەتەوە) ئەمە گفتەی نەسائیە: ئەوجا دەستی ڕاستی لەسەر پشتی دەستی چەپی، لەئاستی موچی باسکی خۆی دانا.

**سێیەم**: نزای سەرەتای نوێژ، کە بریتییە لەمە: نوێژکەر لەپاش ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژدابەستن بڵێ: **(وجهت وجهي للذي فطر السموات والارض حيفا مسلما وما أنا من المشركين. إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين، لا شريك له بذلك أمرت وأنا من المسلمين)** (موسلیم) لە گێڕانەوەیەکدا: علی {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە هەڵدەسا بۆ نوێژ لە پێشا ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژداستنی دەکرد، ئینجا یەکسەر دەیفەرموو **(وجهت وجهي)** هەتا کۆتایی (م/د/ت/ن)[1]، ئەگەر بە قەستی، یا لەبیری نەبوو، نزای سەرەتای نەخوێندو اعوذو بیللای کرد مافی ئەوەی نابی کە بگەڕێتەوە بۆی، چونکە کاتی بە سەرچوو. ئەبو هورەیرەیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: عادەتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو، لە دوای ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژدابەستن، لەپێش خوێندنی فاتیحادا ئێستێکی دەکر، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بە باوكو دایکمەوە بەقوربانتبم لەم ئێستەدا چی دەخوێنی بە نهێنی؟ فەرمووی: دەڵێم:- **(اللهم باعد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقني من خطاياي كما نقنى الثوب الابيض من الدنس، اللهم**

---

[1] زوربەی ئەم ویردو نزایانەی ناونوێژم لەبەرگی یەکەمی تاجول ئوصولدا کردووە بە کوردی، ئەگەر ئەو تەرجەمانە ڕۆژێ لە ڕۆژان لێرەیش بنوسرێن کارێکی پیرۆزە.

- وەرگێڕ - ١٩٩٥/٨/٩

اغسلنى من خطايای بالثلج والماء والبرد) (شەیخان/د/ن) عومەریش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: یاسای پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} وابوو لەپاش ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژدابەستن دەیفەرموو: (سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ولا اله غيرك) (موسلیمو دارە قوطنی گێڕاویانەتەوە).

چوارەم: لە هەیئاتی نوێژ – ئەعوذوبیللا کردنە، چونکە خوا دەفەرموێ: {فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ – سورة النحل – ٩٨/١٦) واتە: کاتێ دەست ئەکەیت بە قورئانخوێندن بڵێ: (اعوذ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ – پەنا دەگرم بە خودا لە شەڕی شەیتانی دوور لە رەحمەت).

جوبەیری کوڕی موطعیم دەفەرموێ: حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} کە دەستی دەکرد بە نوێژ لە سەرەتاوە سێ جار دەیفەرموو: (الله أكبر كبيرا والحمد لله كثيرا وسبحان الله بكيرة وأصيلا) ئەوجا دەیشی فەرموو: (اللهم انى أعوذ بك من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه) ئەی خوایە! پانادەگرم بەتۆ لە شەڕی شەیتانی بەشبڕاو لە رەحمەتی خودا، لە خۆی، لە دەست لێوەشاندنی، لە پسەپسی شیعر گوتنی، لە فشەکردنی!. شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: اعوذوبیللاکردن بە گشت گۆتەیێ دەبێ، کە پەناگرتن بە خودای تیابێ. باشتر ئەوەیە کە بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) ئیبنو لمونذیر دەفەرموێ: لە پێغەمبەرەوە هاتووە، کە لەپێش قورئانخوێندندا دەیفەرموو: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بۆ قورئانخوێندنی

هەموو رکاتێ (اعوذ بالله)کردن سوننەتە، چونکە هەموو دوو قورئانخوێندنێ، بەهۆی چەمینەوەو شتی ترەوە، لەیەکتریی دادەبڕێن ولێك تەرازان (فەصل) دەکەوێتەنوێوانیان. گوتراویشە: کە تایبەتە بە رکاتی یەکەمەوە.

**پێنجەم**: بە دەنگی بەرزخوێندن لە شوێنی خۆیداو بە دەنگی نزم خوێندن لە شوێنی خۆیدا، پێشنوێژ لەم نوێژانەدا قورئان بە دەنگی بەرز دەخوێنێ، لە بەیانیو هەینیو هەردوو جەژنەکانو تەراویحو وەتری رەمەزاندا، هەروا لە رکاتی یەکەمو دووەمی شێوانو خەوتناندا، .ئەمەیش بەکۆی دەنگو بەپێی یەکگرتن، نوێژکەری تەنیایش لەم نوێژانەدا بۆی هەیە بەدەنگی بەرز بخوێنێ، چونکە ئەو وەك پاشنوێژ فەرمانی پێکراوە بە گوێڕاگرتن لە پێژنوێژ، کەواتە وەزعی لە وەزعی پێشنوێژ دەچێ، کەواتە بۆ ئەمیش سوننەتە کە بەدەنگی بەرز بخوێنێ.

**بەلام پاشنوێژ – واتە : مەئمووم** – لە نوێژی ئاشکراو نهێنیدا هەر بە دەنگی نزمو بە پەنامەکی قورئان دەخوێنێ، چونکە ئەم فەرمانی پێکراوە کە گوێ لە قورئانخوێندنی پێشنوێژ رابگرێ.

سوننەتە بیسمیلایش لە نوێژی ئاشکرادا بە ئاشکرا بخوێنرێ، چونکە گێڕانەوەیەکی دروست هەیە لە عەلیو ئیبنو عەبباسو ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرەو عائیشەوە (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی حازردا بیسمیلای بە دەنگی بەرز دەخوێند، لە موغنیدا دەفەرموێ: لەسەر فەرمایشتی دارە قوطنی فەرموودەیەکی ساخی دروست لە ئەنەسەوە هەیە دەفەرموێ: ئەنەس خۆی بیسمیللای بە

دەنگی بەرز دەخوێندو، دەیفەرموو: هەتا بۆم بکرێ لە نوێژا چاو لە پێغەمبەر دەکەم، واتە: نوێژەکەی دەکەم بە سەرمەشق بۆ چۆنێتی نوێژی خۆم (وەرگێر).

ئەگەر کەسێ نوێژی فەوتاوی گێڕایەوە، لەسەر ئەم یاسایە بە ئاشکرا یا بە پەنامەکی دەخوێنێ: ئەگەر فەوتاوی شەوی لەشەوا دەگێڕایەوە ئەوە بە ئاشکرا دەخوێنێ، ئەگەر نوێژی فەوتاوی رۆژی لە رۆژدا دەگێڕایەوە بە پەنامەکی دەخوێنێ بەلام ئەگەر نوێژی چووەی رۆژی لە شەودا دەگێڕایەوە، یا بە پێچەوانەوە، ئەوە فەرمایشتی راستتر ئەوەیە کە بایەخو ئیعتبار بە کاتی گێڕانەوەکەیە، کەواتە: ئەگەر بە رۆژ نوێژی خەوتنانی گێڕایەوە ئەوە بە نهێنی دەیخوێنێ، ئەگەر بەشەو نوێژی نیوەڕۆی گێڕایەوە بە ئاشکرا دەخوێنێ.

**شەشەم:** سوننەتە هەرکەسێ فاتیحای تەواوکرد بڵێ (ئامین) خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ پێشنوێژ دەڵێ: (غير المغضوب عليهم ولا الضالين) ئێوەش بڵێن: ئامین، چونکە هەرکەسێ بۆی رێ بکەوێ لەگەڵ فریشتەکانا ئامین بکا، خودا لە گوناهی لەوەپێشی دەبووری. (شەیخان). هەم پێشنوێژو هەم نوێژخوێنی تەنیا، لە نوێژی ئاشکرادا، دەنگی لێ هەڵدەبڕێ، لە فەرموودەدا دەفەرموێ: یاسای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وا بوو، کاتێ لە خوێندنی فاتیحا دەبۆوە، بە دەنگی بەرز دەیفەرموو: ئامین. (دارە قوطنی بە رشتەیەکی جوان گێڕاویەتەوە، ئیبنو حەببانو حاکمیش بە دروستیان داناوە، حاکم دەیشفەرموێ: ئەم فەرموودەیە پلەی ساخیو دروستییەکەی بەپێی

مەرجی بوخاریو موسلیمە کە بۆ فەرموودەی راستو دروستیان داناوە).
هەروا پاشنوێژیش بە ئاشکرا دەیڵێ. شافیعی لە (الام)دا، دەفەرموێ: موسلیمی کوڕی خالید هەواڵی پێماندا، لە ئیبنو جورەیجەوە، لە عەطائەوە، عەطاء فەرمووی: بە گوێی خۆم لەم پێشەوایانەم بیستووە، لە ئیبنو زوبەیرو لە وانەی پاش ئەو، کە پێشنوێژییان دەکرد، لەپاش خوێندنی فاتیحا دەیانفەرموو: ئامین، ئەوانەیشی کە لە پشتیانەوە نوێژیان دەکرد دەیانفەرموو: ئامین، تەنانەت مزگەوتەکە دەنگی دەدایەوەو گرمەی دەهات! بوخاریش بە تەعلیق لە ئیبنو زوبەریرەوە ئەمەی باس کرووە.

**حەوتەم:** سوننەتە نوێژخوێن لە پاش خوێندنی فاتیحە، لە نوێژی بەیانیو هەینیو لەرکاتی یەکەمو دووەمی هەموو نوێژێکی تردا، جگە لە نوێژی تەرم سوورەتێ بخوێنێ، لە نوێژی تەرما لە پاش فاتیحا سوورەت نەخوێنێ، سەربەڵگەی ئەم مەسەلەیە ئەمەیە کە ئەبو قەتادە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەستووری وابوو لە رکاتی یەکەمو لە رکاتی دووەمی نوێژی نێوەڕۆدا سوورەتی فاتیحاو سوورەتێکی تری دەخوێند، ئەو سوورەتەی کە لە رکاتی یەکەما دەیخوێند درێژتر بوو لەو سوورەتەی کە لەرکاتی دووەما دەیخوێند، جار جارەیش دەنگی ئەوەندە بەرز دەکردەوە، کە ئایەتەکە دەبیسترا، لە نوێژی عەصریشا هەروای دەکرد، لە رکاتی یەکەمی بایانیشدا سورەتی درێژ تری دەخیوێند لە سوورەتی رکاتی دووەم (شەیخان) ئەگەر لە پاش فاتیحا هەر چەندێ قورئان بخوێنێ دەبێ، با سوورەتی تەواویش نەبێ یا سوورەتێ لە هەردوو رکاتەکەدا دووبارە بکاتەوە. لێرەدا ئاوا نووسراوە:

(فعن قتادة رضي الله عنه فيمن قرأ سورة واحدة في ركعتين أو ردد سورة في ركعتين: كل كتاب الله) ئەمە تێکەڵو پێکەڵە، بەڵام من چارم ناچارە کە بیبەمەوە سەرمەبەستی راستی، بۆیە ئاوا تەرجەمەی دەکەم. لە قەتادە پرسیارکرا: ئەگەر کەسێ سوورەتێ دابەش بکا بەسەر دوورکاتا، یا سوورەتێ دووبارە بکاتەوە لە هەردوو رکاتەکەدا دەبێ یانا؟ فەرمووی: دەبێ، چونکە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا قورئانی خوێندووە کە نامەی خوایە[1].

عەبدوڵڵای کوڕی سائیبیش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: جارێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە مەککەی موکەرەمە نوێژی بەیانی بۆ دەکردین، لەپاش فاتیحاوە، لە سەرەتای سوورەتی موئمینوونەوە دەستی پێکرد، تا گەیشتە سەرباسی مووساو هاروون، یاخود گەیشتە سەرباسی حەزرەتی عیسا، لەوێدا کۆکەیەك گرتی، ئیتر قورئانخوێندنەکەی بڕیو سوورەتەکەی تەواو نەکردو چوو بۆ روکووع! (شەیخان).

پیاوێکی جوهەینیی، فەرمووی: گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر لە هەردوو رکاتەکەی نوێژی بەیانیدا هەر سوورەتی (اذا زلزلت الارض)ی خوێند، جا ئەوەیان نازانم کە ئایا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە بیری چووبوو کە لە رکاتی یەکەمیشا هەر ئەم سوورەتەی خوێندبوو، یاخود بە ئارەزوو ئاوای کرد، تا ئێمەیش جاروبار چاو لەو بکەینو ئاوا بکەین (ئەبو داوود بە رشتەیەکی دروستو دارە قطنی بە رشتیەکی بەهێز

---

[1] تەماشای عمدە القاری بەرگی شەشەم لاپەرە (٤٢) بکە.

- وەرگێڕ -

گێڕاویانەتەوە[1]). رافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: سوورەتی تەواو باکورتیشبێ خێرترە لە پارچەیێ لە سوورەتی درێژ!

نەوەوی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەمە کاتێ وایە کە سوورەتە تەواوەکەو پارچە سوورەتەکە بەقەد یەك بن، بەلام ئەگەر پارچەی سوورەتی درێژ لە سوورەتە کورتەکە درێژ تربوو ئەوە خوێندنی پارچەکە خێرترە چونکە زۆرتر.

بەلام وادەخوازێ کە ئەمە پێوەندبێ بەمەوە: ئەمە کاتێ وایە کە پارچەی سوورەتی درێژ سەرەتاو کۆتایی‌و واتای تەواوو روون بێ دیارە لەکاتی وادا کە ئەو باشترە لە سوورەتی کورت[2].

---

[1] هەر حەدیسێ تەحقیق بکەم بە پێی شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم‌و عومدەتولقاری لەسەر صەحیحی بوخاری‌و (كفاية الاخيار في حل غاية الإختصار)و بەپێی غایەتو لمەئموول لەسەر تاجول ئوصول تەحقیقی دەکەم، لەبەر ئەوە تەحقیقەکە جێگەی متمانەیە، ئەگەر لەواندا، نەم دۆزییەوە بەپێی موغنی موحتاج، ئەگەر لەوێشا نەم دۆزییەوە، وەك خۆی دەیهێڵمەوە.

- وەرگێڕ -

[2] کەواتە: نوێژخوێن نابێ هەر لە خۆیەوە پارچەیێ لە سوورەتێ بخوێنێ، مەگەر ئەو پارچەیێ لە لایەن پسپۆڕانەوە سەرەتاو کۆتایی دیاری کرابن‌و بڕیاریش دارابێ کە لەلایەن واتایشەوە دانەبڕاوە لە پێش‌و پاشی خۆی. ئەمەیش پێویستی بە مەسحێکی سەراسەری ئایەتەکانی قورئانە، کە تا ئێستا بە شێوەیەکی سەربەخۆ، بەپێی ئاگاداری من نەکراوە.

- وەرگێڕ - ١٩٩٥/٨/٣٠

حەزرەت خوّی (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی بەیانیداو لە هەموو نوێژێکی تردا رکاتی یەکەمی درێژتر دەکردەوە لە رکاتی دووەم، بە تایبەتی لە بەیانیدا زۆرتر درێژی دەکردەوە، چونکە خوا دەفەرموێ: {وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا - سورة الإسراء - ٧٨/١٧} (واتە: وە نوێژی کاتی دەرکەوتنی سبەینێش بەجێ بێنە، چونکە بە راستی نوێژی بەیانی فریشتە پۆل پۆل دێنە دیاری). دیسان لەبەر ئەوەیش هەتا کەمیی ژمارەی رکاتەکانی، بە زۆریی قورئانخوێندن پربکرێتەوە، لەبەر ئەوەیش کە لە دواخەوە، مەردوم بەشی خۆیان حەساونەتەوە، هێشتا نەپلکاون بە مشوورو هەوڵی گوزەرانەوەو تێکەڵی سەرقاڵیی دنیا نەبوونەتەوە، کەواتە هەتا دڵیان لە خەیاڵی گوزەران خاڵییە با دەمێکی خۆش لەگەڵ خودای خۆیاندا، دوور لە موزاحەمەی ئەغیار، گفتوگۆ بکەن، لەبەر ئەوەیش کە نوێژی بەیانی بناغەی کاری ئەو رۆژەیەو سەرەتایەتی شتیش هەر لەسەرەتاوە بەگرنگی بیگری چاکترە، لەبەر ئەمانە هەموو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) جاری وادەبوو دەوری شەست ئایەت هەتا سەت ئایەتی لە نوێژی بەیانیدا دەخوێند، یا سورەتی (ق) یا سوورەتی (رووم) یا سوورەتی (اذا الشمس کورت)ی تیادا دەخوێند، لە سەفەریشدا فەلەق و ناسی دەخوێند، جاری وادەبوو کە ژنی منداڵ بەبەر لە ریزی جەماعەتا لە پشت حەزرەتەوە نوێژی دەکرد، منداڵەکەی لە دورەوە دەگریا، حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) هەر کە گوێی لە گریانی منداڵەکەی دەبوو نوێژەکەی بە کورتی ئەنجام دەدا، رەحمی بە منداڵەکەو بە دایکەکەی دەکرد، نەبادا بەهۆی درێژ کردنەوەی نوێژەکەوە تووشی سەخڵەتی ببن، لە نوێژی بەیانی رۆژی هەینیدا

سوورەتی (ألم تنزيل)ی سەجدەو سوورەتی (هل أتى على الانسان)ی دەخوێند، ئەم دوو سوورەتەی بە تەواوی دەخوێند، لە حەزرەتەوە وارید نەبووە کە پارچەیێ لە سوورەتێکیان لەهەریەکێ لە رکاتەکانی نوێژی بەیانیدا بخوێنێ، کەواتە: ئەوەی وا بکا بە پێچەوانەی رابەریی ئەو زاتەوە کار دەکا {دروودی خوای لەسەربێ}. ئەوەیش رێنمایی کە ئەم دوو سوورەتە بە تەواوی بخوێنرێن پەندو جیکمەتەکەی ئەمەیە: باسی سەرەتای بوونەوەرو سەرەنجامی کاری ئەم بوونەوەرەو زیندوو بوونەوەو دروستکردنی ئادەمو چوونە بەهەشتو دۆزەخو شتی تریشیان تیادایە، کە دەبن بەهۆی هۆشیاریی نەتەوەی ئیسلام لە بارەی رووداوەکانی رۆژی رەستاخێزەوە، هەتا پەندو ئامۆژکارییان لێ وەربگرن.

پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} جاری وادەبوو نوێژی نیوەڕۆی درێژ دەکردەوە، جاری وادەبوو بە مام ناوەندی دەیکرد. ئەبو سەعید {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: نوێژی نیوەڕۆ دادەبەسترا، زەلام بەپێ دەچوو بۆ بەقیع، ئیشی خۆی لەوێ تەواو دەکردو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەو دەسنوێژی دەگرتو ئەوجا دەهات بۆ مزگەوت، لەگەڵ ئەوەیشا فریای رکاتی یەکەمی ئەو نوێژە لەپشت پێغەمبەرەوە دەکەوت، چونکە ئەوەندەی درێژ دەکردەوە. (موسلیم) جاری وایش هەبوو (سبح اسم ربك الأعلى)ی تیادەخوێند، یا (والليل اذا يغشى) یا (والسماء ذات البروج) یا (والسماء والطارق).

عەصریشی ئاوای دەکرد: ئەگەر درێژی بکردایەتەوە بەقەد نیوەی نوێژی نیوەڕۆی درێژدەکردەوە، ئەگەر کورتیشی بکردایەتەوە بە قەد

نێوەڕۆ دەبوو، لە حاڵەتی کورتیی نیوەڕۆدا. لە شێوانیشا ئەمە ڕێبازی بوو: جارێ قورئانی زۆری تیادەخوێند، جارێ کەم، چونکە سەلماوە: کە جاری وابووە (ئەعراف)ی تیاخوێندووە، بەلاّم دابەشی کردووە بەسەر رکاتی یەکەمو دووەمیدا، هەروا (الطور)ی تیا خوێندووە هەروا (المرسلات) و (سبح اسم ربك الاعلی) و (والتین والزیتون)و (فەلەق) و (ناس) خوێندنی ئەم سوورەتانە لەم نوێژانەدا، لە فەرموودەی دروستی بە ناوبانگدا هەیە.

نوێژی خەوتنانی ئاوا دەکرد: خۆی (والتین والزیتون)ی تیا خوێندووە، ئەم سوورەتانەیشی بۆ موعاذ دەست نیشان کردووە کە لە نوێژی خەوتناندا بیانخوێنی: (والشمس) و (سبح اسم ربك الاعلی)و (واللیل اذا یغشی)و هاوچەشنی ئەمانە، نارازی بوو لەوە کە موعاذ سوورەتی (بەقەرە)ی لەبەر نوێژیی خەوتناندا خوێندبوو، جارێ موعاذ لە پشت پێغەمبەرەوە {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژی خەوتنان بە جەماعەت دەکا، ئەوجا دەچێ بۆ ناو هۆزەکەی خۆی بەر نوێژی خەوتنانیان بۆ دەکاو، سوورەتی بەقەرەی تیا دەخوێنێ، پیاوێ لە لای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سکالاّی لە دەست ئەم کارەی موعاذ کرد، کە نوێژەکەی زۆر درێژ کردەوە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: لە موعاذ تووڕەدەبێو پێی دەفەرموێ: ئەی موعاذ! مەبە بە ئاژاوە بەرپاکەری ناو کۆمەڵەی نوێژکەرەکان، ئەوجا ئەو سوورەتانەی بۆ دەست نیشان دەکا کە ناومان هێنان، لە نوێژی هەینیدا ئەم سوورەتانەی بە تەواوی دەخوێند: لە رکاتی یەکەمدا سوورەتی (الجمعه) یا (الأعلی)ی دەخوێند، وە لە رکاتی

دووەما سوورەتی (المنافقون) یا (الغاشیة)ی دەخوێند {درودی خوای لەسەربێ}
بەڵام هەرگیز پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: شتی وای نەکردووە کە بچێ کۆتایی هەریەك لەم دوو سوورەتانە لە هەریەك لە دوورکاتەکەی نوێژی هەینیدا بخوێنێ، کاری وا بۆچی دوورە لە ڕێگەی راستی ئەوەوە (ئەمە نیوەی راستەو نیوەی هەڵەیە، کاری وا دوورە لە ڕێگەی راستی پێغەمبەری رەهبەر؟ لە باسی هەیئەتی حەوتەمی ئەم باسەدا کە باسی ژمارە/ ٦٢ وە، دانەر بۆ بەڵگە لەسەر دروستبوونی بەشێ لە سوورەتێ یا چەند ئایەتێ لە ورەتێ لە رکاتێکا، ئەثەرەکەی قەتادەی هێنایەوە، ئەم قسەیەی پێچەوانەی ئەوەیە (وەرگێڕ) لە دوو جەژنەکەیشدا خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} لە پاش فاتیحا لە رکاتی یەکەما سوورەتی (ق)ی بە تەواوی دەخوێند، یا سوورەتی (سبح اسم)ەی بە تەواوی دەخوێند، لە رکاتی دووەمیشا یا سوورەتی (اقتربت)ی بە تەواوی دەخوێند، یا سوورەتی (هل اتاك)ەی بە تەواوی دەخوێند، لەسەر ئەم رێبازە پیرۆزە بەردەوام بوو هەتا گەیشتەوە بەدیداری یەزدانی مەزن.

چوار جێنشینە هەقناسەکانو زانا پێشەواکانیش هەروایان دەکرد، {ڕەزای خوا لە هەموویان بێ}. پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} هیچ سوورەتێکی بە تایبەتی بۆ هیچ نوێژێ دیاری نەکردووە، جگە لەم سوورەتانەی کە ناومان هێنان بۆ نوێژی هەینیو دوو جەژنەکەو بەیانی رۆژی هەینی. عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیرییەوە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: سوورەت بە سوورەتی ئەو بەشەی قورئان کە پێی دەگوترێ موفەصصەل، گەورەو گچکەی، بە گوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە، کە بەر نوێژیی پێدەکردن، لە نێژە فەرزەکاندا بۆ مەردوم. (ئەبو داوود).

له نوێژی فەرزدا نەبیستراوەو ساخ نەبۆتەوە کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: خۆی لە یەك رکاتدا پتر لە یەك سوورەتی خوێندبێ، بەڵام لە نوێژی سوننەتدا ئەوەی کردووە (ئەمە بۆنی ئەوەی لێدێ کە شتی وا ناباشە، بەڵام ئەمە ناباش نییە چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئەمەی تەقریر کردووە، بەڵکوو وەسپی ئەو کەسەیەی کردووە کە ئەمەیکردووە. تەماشای عومدەتولقاری ب/٦/ل/٣٩ بکە (وەرگێڕ).

**هەشتەمو نۆیەم:** (لە هەیئاتی نوێژ) ئەڵڵاهو ئەکبەر کردنە، لە کاتی دانەوینەوەو سەربەرزەوە کردنداو گوتنی (**سمع الله لمن حمده**) وەلەکاتی سەربەرزەوەکردندا لە چەمینەوە، سەربەڵگەی — ئەمەیش ئەوەیە کە ئەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: جاران پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} کاتێ دەستی دەکرد بە نوێژ، رێك رادەوەستاو بە گوتنی (الله أكبر) نوێژی دادەبەست، کاتێکیش دەچوو بۆ چەمینەوە: (الله أكبر)ی دەکرد، کاتێ لە چەمینەوە پشتی راست دەکردەوە دەیفەرموو: (**سمع الله لمن حمده**) ئەوجا کە دادەبەزی بۆ کوڕنووش دەیفەرموو: (الله أكبر) ئەمەی لە هەموو نوێژێکیدا دەکرد، هەروا لەو کاتەیشدا کە دوو رکاتی تەواو دەکردو هەڵ دەسایەوە بۆ رکاتی سێیەم ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد. (بوخاریو موسلیم).

**دەیەم:** ویردو تەسبیحاتی ناو چەمینەوەو کوڕنووش. ئەبو داوود ئەم فەرموودەیەی گێڕاویەتەوە: کاتێ (**فسبح باسم ربك العظيم**)ی هاتە خوارەوە، خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: بیکەن بە بە ذیکری ناوچەمینەوەتان، واتە لەناو روکووعدا بڵێن: (**سبحان ربي**

العظیم) کاتێکیش ئایەتی (سبح اسم ربك الاعلی) هاتە خوارەوە، خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: بیکەن بە ذیکری ناو کورنووشتان، واتە: لەناو سەجدەدا بڵێن: (سبحان ربی الاعلی). وا باشە کە ئەم ویردە سێ جار بڵێ: بەپێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: هەر کەسێ لە ئێوە لەناو چەمینەوەدا سێ جار بڵێ (سبحان ربی العظیم) ئەوە چەمینەوەکەی گوتنی سێ جار لای کەمیی تەواوی چەمینەوە، هەرکەسەشتان لەناو کورنووشدا، سێ جار بڵێ: (سبحان ربی الأعلی) ئەوە کورنووشەکەی تەواوە، بەڵام گوتنی سێ جار لای کەمی تەواویی ویردی ناو سەجدەیە. (تیرمیذیو ئەبو داوود). هەرەتەواوەکەی لە نۆجارەوە دەست پێدەکا هەتا یازدەجار خوێنی.

ماوەردی دەفەرموێ: ئەمە کاتێ وایە کە پێشنوێژبێ. بەڵام نوێژخوێنی تەنیا بۆی هەیە چەندە خۆی ئارەزوو دەکا ویردو نزا بە دوورو درێژی بخوێنێ، بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: هیچ کاتێ بەندە وەك کاتی ناو کورنووش لە خواوە نزیك نابێتەوە، کەواتە: لەوکاتەدا دوعاو نزا زۆر بکەن، جێگەی خۆیەتی کە پاڕانەوەکەتان قەبووڵ بکرێ. (موسلیمو ئەبو داوود). پێشنوێژیش ئەم مافەی بۆ هەبێ. هەیە بەمەرجێ پاشنوێژەکانی رەزایان لەسەر درێژکردنەوەکە هەبێ. خۆشەویست خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} لەناو چەمینەوەو کورنووشدا پاڕانەوەو نزاو ویردی زۆری دەخوێند، ئەوەتا حەزرەتی عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}:

له چەمینەوەو کوڕنووشـدا زۆر دەیفـەرموو: (سـبحانك اللـهم وبحمـدك اللـهم اغفـر لی) (شـەیخانو ئەحمـەدو کەسـانی تـریش گێڕاویانەتـەوە).

دیسان له عائیشەوە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: زۆرجار حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لـه چـەمینەوەو کوڕنووشـدا دەیفـەرموو: (سـبوح قـدوس رب الملائكـة والـروح) (م/ د/ ن/). لـه ئیمـامی عەلیـەوە {رەزای خـوای لێبـێ} فەرمووی: یاسـای پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ}: وابـوو لـەناو چـەمینەوەدا دەفەرمووو: (اللـهم لـك ركعـت وبـك آمنـت ولـك أسلمـت، أنـت ربـی، خشع سمعی وبصری ومخـی وعظمـی وعـصبی ومـا اسـتقلت بـه قدمی لله رب العالمین) (ئەحمەدو موسلیمو ئەبو داوودو کەسانی تـر).

دیسان لەوەوە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: خۆشەویست {دروودی خـوای لەسەربێ} زۆر جاران لـه کوڕنووشـدا دەیفـەرموو: (اللـهم لـك سـجدت وبـك آمنـت ولـك اسلمت، سجد وجهی للذی خلقه فصوره فأحسن صـوره فـشق سمعـه وبصره فتبارك الله أحسن الخالقین) (م).

**یازدەهەم:** هەردوو دەستی لەسەر هەردوو رانی دادەنێ له دانیـشتنی تـەحیاتی یەکـەمو تـەحیاتی دووەمـا، دەسـتی چـەپی دەکاتـەوەو بـەری دەستی لەسەر رانی لـەنزیکی سـەر ئەژنۆیـەوە دادەنـێ، دەسـتی راستیـشی لەسەر رانی راستی له نزیکی سەر ئەژنۆیەوە دادەنێ، پەنجـەکانی دەسـتی راستی دەنووقێنـێ، تەنها پەنجـەی شـایەتمانی نـەبێ، کـه بـەری دەداتـەوە، کاتێ گەیشته (الا الله) بەرزی دەکاتەوەو کەمێ بـه کـووڕی بـەرەو رووگـه بیگرێو ئیتر نەیجوولێنێ، وه نیازی لەو جوولەیه ئاماژه بێ بـۆ یـەکتایی خوا هەتا گوتارو کردار له ددانـنان به یەکتایی خوادا یەك بگرن.

ئیبنوعومەر {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} زۆر جار کە لە تەحیاتا دادەنیشت لەپی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەناو لەپی چەپی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا، پەنجەی شایەتمانی بەرەلا دەکردو لەکاتی گوتنی وشەی (الا الله)ی ناو شایەتماندا بەرزی دەکردەوەو ئیتر چاوی تێ دەبڕی (ئەحمەدو موسلیمو نەسائی).

**دوازدەهەم:** لە هەموو تەحیاتێکا کە سلاوی تیادا نەدرێتەوە دانیشتن بە شێوەی (افتراش – پێراخستن) سوننەتە، کە بریتییە لەوە: پێی چەپی ڕابخا لە ژێریداو لە سەری دابنیشێو پێی ڕاستی بە پەنجەکانیەوە هەڵ بنێو ڕووی سەرە پەنجەکانی بکاتە ڕووگە، لە تەحیاتی دواییشتدا لەسەر شێوەی (تورك – لاسمتەنشین) دابنیشێ، لاسمتەنشینیش وەکوو پێراخستنە، بەلام لەمدا پێی چەپی لە ژێر خۆیەوە دەر دەکا بۆ لای ڕاستی، وە نەرمەی لاسمتی دەنووسێنێ بەزەوییەکەوە.

ئەم دوو شێوەیە لە صەحیحەیندا هەیە: لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا دەفەرموێ: ئەبو حومەیدی ساعیدی {ڕەزای خوای لێبێ} بە چەن کەسێ لە یارانی پێغەبەری فەرموو: من لە هەمووتان باشتر ئاگام لێیەتی کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژی چۆن بوو: سەرنجم دەدا کە ئەللاهو ئەکبەری دەکرد، هەردوو دەستی تا ئاستی هەردوو سەرشانەکانی هەڵ دەبڕی، کە ڕوکووعیشی دەبرد هەر دوو دەستی لە هەردوو ئەژنۆکانی خۆی گیر دەکرد، وەرێك پشتی خۆی دەچەماندەوە، پشتو ملی خۆی ڕێك لە یەك ئاست بەبێ کووڕی ڕادەگرت، کە سەریشی هەڵ دەبڕی لە چەمینەوە ڕێك هەڵ دەسایەوەو قنج ڕادەوەستایەوە، تایەك یەك

برپڕاگەکانی پشتی دەچوونەوە شوێنی خۆیان، کە کورنووشیشی دەبرد هەردوو لەپی دەستی دادەنا لەسەر زەوییەکە، بەڵام باسکی خۆیی رانەدەخست لەسەر زەوییەکەو کەمێ باسکەکانی بەرزدەگرتو نەشی دەنووساندن بە لاتەنیشتی خۆیەوە، بەڵکوو هەر دووباڵی خۆیی بڵاو دەکردەوە، وەسینگی پەنجەکانی هەردوو پێی لەسەر زەوی دادەناو نووکی پەنجەکانی قاچی روویان دەکردە رووگە، لە تەحیاتی یەکەمیشدا لەسەر قاچی چەپی دادەنیشتو قاچی راستی هەڵ دەنا، لە دوارکاتیشدا پێی چەپی لەژێر خۆیەوە رەت دەکردو لە ژێر پێی راستیەوە نووکەکەی دەردەکرد، وە پێی راستیشی هەڵ دەناو لەسەر لاڕانی خۆی دەدەنیشت. (دانەر بەشی کۆتایی ئەم فەرموودەیەی نووسیبوو، من بە تەواوی نووسیم، چونکە دەبێ بە بەڵگەی رۆشن بۆ زۆر لە کردارەکانی نوێژ — وەرگێڕ).

**سیازدەهەم:** نزاو پاڕانەوەی دانیشتنی نێوان هەردوو کورنووش. پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} لە دانیشتنی نێوان کورنووشەکاندا دەیفەرموو: (رب اغفر لی رب اغفر لی) (نەسائیو ئیبنو ماجە).

ئیبنو عەبباس {رەزای خوا لە خۆی و بابی} دەفەرموێ: یاسای پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ}: وابوو، لە دانیشتنی نێوانی دوو کورنووشەکاندا دەیفەرموو: (اللهم اغفر لی وارحمنی وعافنی واهدنی وارزقنی) (ئەبو داوود) لە گێڕانەوەیەکی تیرمیذیدا: (واجبرنی)یە لە جیاتی (عافنی).

**چواردەهەم:** دانیشتنی وچانە،کە برێتییە لە دانیشتنێکی سووکەڵە، لە پاش لێبوونەوە لە کورنووشی دووەمی رکاتی یەکەمو، لە پاش

لێبوونەوە لە کوڕنووشی دووەمی رکاتی سێیەم، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خۆی ئەوەی کردووە، دوو گێڕاونەوەیش هەیە لە ئیمامی ئەحمەدەوە، یەکێکیان ئاوا دەڵێ.

**پازدەهەم:** نزازو پاڕانەوەی پاش تەحیاتی دوایی، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود، گێڕاویەتەوە، کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} تەحیاتی فێرکردوون، لە کۆتاییدا فەرموویەتی: ئینجا بە ئارەزووی خۆی بپارێتەوە بۆ خۆیو حەزی لەچی بێ لە خودا داوای بکا (م).

عەلی {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: یاسای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: وابوو لە تەحیاتا لە ناوەندی شایەتمانهێنانو سلاودانەوەدا دەیفەرموو: (اللهم اغفر لی ما قدمت وما أخرت وما أسررت وما أعلنت وما أسرفت وما أنت أعلم به منی أنت المقدم وأنت المؤخر لا اله الا أنت) (موسلیم).

عەبدوڵلای کوڕی عەمر {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: ئەبو بەکری صەدیق {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی بە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: نزایەکم فێربکە کە لە نوێژەکەما بیکەم، فەرمووی: بڵێ: (اللهم انی ظلمت نفسی ظلما كثيرا ولا يغفر الذنوب الا أنت فاغفر لی مغفرة من عندك وارحمنی، انك أنت الغفور الرحيم) (شەیخان). ئەبو هورەیرەیش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: یاسای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: وابوو لە نوێژدا، لە کۆتایی تەحیاتی پێش سلاودا دەیفەرموو: (اللهم انی أعوذ بك من عذاب القبر ومن عذاب النار ومن فتنة المحيا والممات ومن فتنة المسيح الدجال) (م).

**شانزەهەم:** سلاودانەوەی دووەمە، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} بەلای راستو بەلای چەپی خۆیدا سلاوی دەدایەوە (م).

## ٦٣) سوننەتە پەیوەستەکانی نوێژە فەرزەکان:

ئەو نوێژە سوونەتانەی کە پەیوەستن بە فەرزەکانەوە نۆزدە رکاتن! دوو رکات لە پێش نوێژی بەیانیدا، چوار رکات لە پێش نیوەڕۆدا، دوو رکات لە پاشی، چوار رکات لە پێش ئەصردا، دوو رکات لە پێش شێواندا، دوو رکات لە پاشی، سێ رکات لە پاش خەوتنان، کە ئاخر رکاتیان وەتربوو، سوننەتە دامەزراوەکانیان دە رکاتن، کە بریتین لەو سوننەتە پەیوەستانە کە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} سەرومڕ کردوونی، کە ئەمانەن: دوو لە پێش بەیانیدا، دوو رکات لە پێش نیوەڕۆدا، دوو رکات لە پاشی، دوو رکات لە پاش شێوان، دوو رکات لە پاش خەوتنان، بەلگەی ئەمەیش فەرموودەکەیە کە ئیبنو عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لە خزمەت پێغەمبەردا {دروودی خوای لەسەربێ} دوو رکات لە پێش نێوەرۆداو، دوو رکات لە پاشیەوەو، وو رکات لە پاش شێوانەوەو، دوو رکات لە پاش خەوتنانەوە، نوێژی سوننەتم کردووە، حەفصەی خوشکیشم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، قسەی بۆ کردووم: کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە پاش شەبەق دوو رکات نوێژی سوننەتی سووکەلەی دەکرد. (شەیخان).

ئەوانەی کە دەفەرموون چوار لە پێش نیوەڕۆوە سوننەتە بەلگەکەیان ئەم فەرموودەیە: کە بوخاری لە عائیشەوە دەیگێڕێتەوە:

پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چوار رکات نوێژی سوننەتی لە پێش نوێژی نیوەڕۆوە تەرك نەدەكردا. ئەوانەیش كە دەفەرموون: چوار لە پێش عەصرەوە هەیە، بەڵگەیان ئەم فەرموودەیەی تیرمیذییە: عەلی {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە پێش عەصردا چوار ركات سوننەتی دەكرد، بەینی دەخستن، لە گێڕانەوەیەكدا: ڕەحمەتی خودا لەو كەسەبێ كە لە پێش عەصردا چوار ركات سوننەت دەكا. تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەكی جوانە، ئیبنو حەببانیش بە فەرموودەیەكی دروستی داناوە. دوو ركاتەكەی دوا خەوتنانیش ئیبنو عومەر حەدیسێكی گێڕاوەتەوە لە بارەیانەوە. دوو ركاتەكەی پێش شێوانیش بەپێی گێڕانەوەی بوخاری: لە پێش نوێژی شێوانەوە نوێژی سوننەت بكەن. لەپێش نوێژی شێوانەوە نوێژی سوننەت بكەن. لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ كەسێ ئارەزوو بكا.

لە موسلیمدا دەفەرموێ: ئەنەسی كوڕی مالیك {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: جاران كە لە مەدینە بووین، كاتێ بانگدەر بانگی شێوانی دەدا، یاران پەلاماری پەنا كۆڵەكەكانی ناو مزگەوتیان دەدا، هەتا فریابكەون لە پێش دابەستنی جەماعەتی شێواندا، سەرو دوو ركات سوننەت خێرا بكەن، تەنانەت خەڵكێكی ئەوەندە زۆر خەریكی كردنی ئەو دوو ركاتە سوننەتە بوون لەو كاتەدا، پیاوی نەشارەزا كە دەهاتە ژوورەوە لەو وایە كە ئەوە نوێژی شێوانە دەیكەن!

## ٦٤) نوێژی سوننەتی زۆر سوننەت:

سێ جۆر نوێژی سوننەت زۆر خێرن:

یەکەم: شەو نوێژ.

دووەم: نوێژی چێشتەنگاو،

سێیەم: نوێژی تەراویح.

پێشەوایانی گەلی ئیسلام بەکۆی دەنگ یەکیان گرتووە لەسەر ئەوە کە شەونوێژ زۆر خێرە، خوای مەزن دەفەرموێ: {وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ - سورة الإسراء - ٧٩/١٧) واتە: سەرەڕای نوێژە فەرزەکان بەشەو واز لە خەو بێنەو خەو لە خۆت بزڕێنە، هەندێ شەو نوێژبکەو قورئانی تیابخوێنە، دیسان خوای مەزن دەفەرموێ: {كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ - سورة الذاريات - ١٧/٥١) واتە: ئەو تەقواکارانە ڕەوشتێکی تری بەرزیان هەبوو ئەوەبوو کە بەشەو سەرخەوێکیان دەشکانو ئیتر زوربەی شەو هەر سەرقاڵی نوێژ بوون هەروا زاتی هەرەمەزن دەفەرموێ: {تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا - سورة السجدة - ١٦/٣٢) واتە: بەشەو دوورە پارێزن لە نوێنو نووستنو هەر سەرگەمی شەو نوێژو خواپەرستینو لە خودا دەپاڕێنەوە، لاڵەو پاڵەو سکاڵا لە دەرگای پەروەردگاری خۆیانا دەکەن، هەم لە ترسی سزاو تۆڵەی سەختیو هەم بە هیوای ڕێژنەی ڕەحمەتی) لە پێشدا شەو نوێژ فەرز بوو، لە دواییدا ئەو بڕیارە لابرا.

**له فەرموودەیشدا دەفەرموێ:** حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خوو بگرن بەشەو نوێژەوەو بیکەن بە پیشەی هەمیشەتان، چونکە شەو نوێژ هەر لە مێژەوە پیشەی پیاوچاکان بووە، سەرەڕای ئەوەیش دەبێ بەهۆی نزیکبوونەوە لە خواوە، وە دەبێ بە کەفارەتی خراپەو هەروەها لە گوناهیش دەتان گێڕێتەوە! (لە گێڕانەوەیەکی تاجول ئوصولْدا: دەردیش لە لەش دەردەکا – وەرگێڕ).

(حاکم گێڕاویەتەوەو فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە دروستو ساخە، چونکە بەپێی مەرجی ئیمامی بوخارییە کە بۆ فەرموودەی دروست (حەدیثی صەحیح) دایناوە. لە لایەکی تریشەوە لە فەرموودەدا هەیە دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ} هەر کەسێ هەر شەوێ سەت ئایەت لەشەو نوێژدا بخوێنێ، لەناو تۆماری دەستەی بێ ئاگایاندا، لەو شەوەدا ناوی نانوسرێ، هەر کەسێکیش هەر شەوێ لە شەو نوێژدا دووسەد ئایەت بخوێنێ ناوی لە دەفتەری خواپەرستە بێ گەردە کانا دەنوسرێ (حاکم گێڕاویەتەوەو فەرموویەتی: ئەمە بەپێی مەرجی ئیمامی موسلیم)ە.

**بزانە:** کە ناوەراستی شەو باشترین کاتە بۆ شەو نوێژ، چونکە کاتێ لە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} پرسیارکرا: لە دوا نوێژە فەرزەکان کام نوێژێ خێری زۆرترە؟ فەرمووی: نوێژی ناو جەرگەی شەو. چونکە لەکاتەدا جەنگەی گەرمەی خەوە، زۆربەی خەڵك لەوکاتەدا بێ ئاگان، لەوکاتی وایشدا خواپەرستی زۆر ئەستەمە! بەهەرحاڵ نیوەی دوایی لە نیوەی پێشوو باشترە بۆ شەونوێژ، چونکە خوا دەفەرموێ: {وَبِالْأَسْحَارِ

هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ – سورة الذاريات – ١٨/٥١} واته: له بەرەبەیانـدا بە کوڵی دڵ لە خودای میهرەبان دەپاڕێنەوە کە لە تاوانیان خۆش بێ، بە تایبەتی لە تـاوانی ئـەوە نـەبادا لـەو شـەوەدا درێغییـان کردبێ لـە هـەقی جێبـەجێکردنی بەندایەتیـدا). دیـسان لەبـەر ئـەوەیش چـونکە خـودای پەروەردگار هەموو شەوێ لە سێیەکی کۆتایی شەودا تەشریفی دادەبـەزێ بـۆ ئاسمـانی یەکـەمو دەفـەرموێ: ئـای بـۆ بەختـەوەرێ بێـت لـەم کـاتی رەحمەتبارانەدا لێم بپاڕێتەوە تا بچم بە هاواریەوە، ئای بۆ کەسێ داوای بەشی باشم لێبکا هەتا بەشی بدەم. ئای بۆ کەسێ داوای لێخۆشبوونم لێبکا هەتا لێی خۆش بم (ش/ د/ ت) ئەم دابەزینە دابەزینی نیشانەکانی دەسـەڵاتی خوایـە نـەك مەبەسـت لێـی ئـەوەبێ کـە زاتـی خـودا خـۆی داببەزێ، هەتا کەسێ بڵێ: ئەمە سەردەکێشێ بۆ ئامێتە بوونو توانـەوەی دروستکەرو دروستکراو لەناو خۆیانـداو سەردەکێشێ بـۆ ئـەوە کـە بڵێن خـوا لـەشو جەسـتەو ئەنـدامی هەیـە، کـە بەمـە لـە زاراوەی هەنـدێ گوروهدا ەگوترێ (حلول) و (تجسیم) چونکە خوا لە بارەی بێچوونیی خۆیـەوە دەفـەرموێ: {لَـيْسَ كَمِثْلِـهِ شَـيْءٌ وَهُـوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ – سورة الشورى – ١١/٤٢} (واتە: لەوێنەی زاتی خوا هیچ شتێ نیە).

ناباشـە کەسـێ شـەو سەراسـەر هەرشـەو نوێـژبکا، چـونکە بـەپێی فـەرموودە شـتی وازیـان دەدا لـە لـەشو تەندروسـتی. کەسـێ خـوو بگـرێ بەشەو نوێژەوەو لە پاشا وازی لێبێنێ شتی وا ناباشـە، چونکە پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) بە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصی فەرموو: ئـەی عەبدوڵلا! وەك فیسارەکەس مەبە کە جاران شـەو نوێـژی دەکـرد، کەچـی ئێستا نایکا (ش).

بەلگەی ئەوەیش کە نوێژی چێشتەنگاو زۆر سوننەتە ئەم ئایەتەیە: {يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ - سورة ص - /١٨} واتە: ئێمە کە پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەین کێوەکانمان رام کردبوو کە لەگەڵ داوود پێغەمبەردا سەر لە ئێواریو سەر لە بەیانی تەسبیحات بۆ خودا بکەن).

ئیبنو عەبباس {رەزای خوا لە خۆی واتە: عەبباسی باوکی} دەفەرموێ: مەبەست لە (الاشراق) لەم ئایەتەدا نوێژی چێشتەنگاوە. لە صەحیحەیندا لە ئەبو زەررەوە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} ئەم سێ ئامۆژگارییەی کردووم: کە هەموو مانگێ سێ رۆژ بە رۆژوو بم، وە هەموو رۆژێ دوو رکات چێشتە نوێژبکە، وە هەموو شەوێ لە پێش خەوتندا نوێژی وەتر بکەم[1]

بوخاری {رەزای خوای لێبێ} ئەمەی پتر کردەوە: بەپشتی خوا هەتا مردن ئەم سێ ئامۆژگارییە پشت گوێ ناخەم[2].

---

[1] بەپێی ئاگاداری من ئەم فەرموودەیە لە صەحیحەیندا ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە نەوەك ئەبو زەڕ، لە موسلیمدا ئەبو دەردایش ئەمە دەگێڕێتەوە، بە زەینم (ئەبو زەڕ) یا هەڵەی چاپ یا تەحریفی ئەبو دەردایە، یا شتێکی تری ئاوایە، بە هەرحاڵ لەبەر ئەوەی إحاط و ئاگاداری بوون لە هەموو گێڕانەوەو شێوەکانی فەرموودە لە صەحیحەیندا شتێکی هەروا ئاسن نیە لەبەر ئەوە بەم ئاگادارییە ئیکتیفام کرد.

[2] روونکردنەوەیێ: ئەم فەرموودەیە بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە، لەسەر ئەم شێوەیەی ئێرە، موسلیم لە ئەبو دەردائیشەوە ریوایەتی کردووە،

لای کەمی نوێژی چێشتەنگاو دوورکاتە، لای زۆرەکەی دوازدە رکاتە، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} بە ئەبو زەڕ دەفەرموێ: ئەگەر دوانزە رکات نوێژی چێشتەنگاو بکەی خودا لە بەهەشتا کۆشکێکت بۆ دروست دەکا. (بەیهەقی دەیگێڕێتەوە بەڵام بە لاوازی داناوە). ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: لای زۆرەکەی هەشت رکاتە، زوربەی زاناکانیش هەروا دەفەرموون، لە حەدیسەکەی شەیخەینیشا کە لە ئوموو هانیئەوەیە دەفەرموێ: رۆژی ئازادکردنی شاری مەککە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هەشت رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد، لە هەموو دوو رکاتێکا سلاوی دەدایەوە.

کاتی دەستپێکرنی لەوحەوەیە کە خۆر بە قەد رمێ بەرزەوە دەبێ، وە هەتا (استواء) واتە: گەیشتنی خۆر بە ناوەڕاستی ئاسمان.

بەلگەی ئەوەیش کە نوێژی تەراویح زۆر سوننەتە، ئەمەیە: یەکگرتنی زانایانی نەتەوەی ئیسلام لەسەر ئەم بڕیارە، چەن کەسێ ئەم قسەیە دەکەن کە ئیجماع هەیە لەسەر ئەوە، لە صەحیحەینیشدا دەفەرمووێ: کەسێ شەو نوێژی رەمەزان بکا (واتە تەراویح) بە ئیمان‌و باوەڕەوە، ساخ لەبەر رەزای خودا، خودا لە گوناهەکانی لەوەو پێشی خۆش دەبێ. عائیشە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: شەوێ لە شەوەکانی رەمەزان حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لەناو جەرگەی شەودا لەماڵ دەرچوو،

---

نسائی لە ئەبو ذەڕەوە، تەماشای عمدە القاری بەرگی حەوتەم لاپەڕە ٢٤٣ بکە. لە (کفایة الاخیار)یشدا، هەر دەفەرموێ: وفي الصحيحن عن أبي هريرة (ض) قال: (أوصاني خليلي بثلاث) الحدث.

ڕۆیشت بۆ مزگەوتو لەوێ دەستی کرد بەشەو نوێژ، وە چەند پیاوێ لە یاران لە پشتیەوە ئیقتیدایان پێی کوردو دەستیان کرد بە تەراویحکردن لەگەڵیدا، جا کاتێ ڕۆژبۆوە،خەڵکەکە ئەم باسەیان گێڕایەوەو هەواڵەکە بڵاوبۆوە، جا لە شەوی دووەما خەڵکێکی زۆرتر گردەوەبوونو پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دیسان بەر نوێژی تەراویحی بۆ کردنەوە، وە بۆ سبەینێ ئەم باسە تەواو بڵاوە بوو، جا بۆ شەوی سێیەم خەڵکێکی زۆر زۆر لە مزگەوت گردەوەبوونو دیسانەوە شەو نوێژیان بە جەماعەت لە پشت پێغەمبەرەوە کردەوە، جا لە شەوی چوارەما هاوڕێیانی حەزرەت: {درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوان بێ} ئەوەندە کۆبووبوونەوە مزگەوت نەیدەگرت، بەلاّم پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لەم شەوەدا نەهات بۆ ناویان، بۆ شەو نوێژی تەراویح، جا سبەینێ کە تەشریفی چوو بۆ ناویانو نوێژی سبەینێی بۆ کردن، ڕووی تێکردنو شایەتمانی هێناو فەرمووی {درودی خوای لەسەربێ}: من ئەمشەو ئاگادار بووم لە هاتنی ئێوە بۆ مزگەوتو ئاگام لە حاڵتان بوو، بەلاّم بۆیە نەهاتم بۆ لاتان مەبادا ئەم تەراویحە فەرز بکرێ لەسەرتان، وە ئێوەیش بۆتان نەکرێ ئیتر هەتا حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} کۆچی دواییکرد شەونوێژیی ڕەمەزان هەر لەسەر ئەم شوەیە بوو (ش/د).

ئیتر ئەم سوننەتە لەسەر ئەم شێوەیە بەردەوام بوو لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیو ئەبو بەکرو سەرەتای جێنیشینیی عومەردا، هەتا شەوێ عومەر تەماشای کرد مەردومەکە، یەکە یەکەو دووکەس دووکەسو سێ کەس، سێکەس خەریکن نوێژی تەراویح دەکەن. جا هەموویانی کرد بەیەك کۆمەڵو ئوبەییەی کوڕی کەعبی کرد بە

پێشنوێژییان‌و ئەوە بڕیاریانداو بەوو بە یەکگرتن، عومەر بۆیە ئەمەی کرد چونکە تازە مەترسی ئەوە نەمابوو کە تەراویح فەرزببێ لەسەر بیست رکاتی بڕیاردا بۆیان، هاوڕێیانیش لەسەر موسوڵمانان، چونکە لە پاش پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} ئەوەی خۆی فەرز نەبووبێ لە ژیانی ئەودا بە هیچ فەرز نابێ. تەراویح بۆ پیاوان‌و ژنان وەك یەك سوننەتە. عەرفەجە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئیمامی عەلی {رەزای خوای لێبێ} موسوڵمانەکانی هان دەدا لەسەر تەراویحی رەمەزان. پیاوێکی دانابوو پێشنوێژیی تەراویحی بۆ پیاوان دەکرد، پیاوێکیشی دانابوو پێشنوێژیی بۆ ژنان دەکرد، من خۆم پێشنوێژی تەراویحی ژنان بووم. کاتی نوێژی تەراویح دەست پێدەکا لە پاشکردنی نوێژی خەوتنانەوە، بەڵام لە پێشکردنی وەتردا، وە هەتا بەرەبەیان دەمێنێ[1] باشتر وایە تەراویح

---

[1] بە قسەی ئەحمەد عاشوور، نەك بەپێی کتێبە گەورەکانی شەرع، نوێژی تەراویح بەهەشت رکات خێری زۆرترە، بەڵام وەك لە شەریعەتی ئیسلامدا دەفەرموێ: (ئەصلی نوێژی تەراویح‌و جەماعەت کردن لە هەشت رکاتیا سوننەتی پێغەمبەرە، وە لە دوانزە رکاتەکەیا ئیجماعی بێ دەنگیی ئەصحابەو باقی موسوڵمانی لەسەر دامەزراوە، ئەمەی کەوتمان لە (فتح الباری) شەرحی (بخاری)و لە (تحفە)و (شیروانی)و حاشیەی (جمل)دا نووسراوە (شەریعەتی ئیسلام بەرگی یەکەم لاپەڕە (١٧٨) چاپی یەکەم.

لە راستیدا ئەم جۆرەکەسانەی کە پەیدابوون، کە بەبێ پەروا، بەبێ بەڵگەیەکی لەبار، موخالەفەی رای دامەزراوی مەزهەبی خۆیان دەکەن، گوایە دەیانەوێ هەموو شتێ ببەنەوە سەر حاڵی سەردەمی پێغەمبەر خۆی، بەراستی ئەم جۆرەکەسانە بەرەبەرە مەزهەبەکان تێك دەدەن‌و موسوڵمانان بەرەو بێمەهەبی دەبەن، ئەوەیش سەرەتایە بۆ

بەهەشت رکات بکرێ، لەمەدا پێغەمبەر بکرێ بە سەرمەشق، ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حببان لە (صەحیحە)کانی خۆیاندا دەیگێڕنەوە لە جابیرەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} هەشت رکات تەراویحو رکاتێ وەتری بۆ کردین، لە شەوی ئایندەدا چاوەنوارپیان کرد، بەڵام پێغەمبەر نەچوو بۆ مزگەوت. ئەبو یەعلاو طەبەرانی بە رشتەیەکی جوان حەدیسێ دەگێڕنەوە دەفەرموێ: ئوبەیی کوڕی کەعب هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم شەو شتێ لە من روویدا، فەرمووی: چی روویدا ئەی ئوبەی؟ فەرمووی: چەن ژنێ لە ماڵەوەم گوتیان: ئێمە ئەم شەو قورئان ناخوێنین لە جیاتی ئەوە نوێژی تەراویح لە پشت تۆوە دەکەین، منیش هەشت رکات نوێژی تەراویحم بۆ کردن لەگەڵ وەتردا. پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} هیچی نەفەرموو، واتای وایە هەشت رکات تەراویح سوننەتێکە کە رەزای پێغەمبەری لەسەرە. عائیشەیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر نە لە رەمەزانو لە غەیری رەمەزانا لە یازدە رکات زیاتر نەدەکرد.

سەبارەت بە قورئانخوێندنی ناو تەراویح شتێکی دیاری کراو نەهاتووە، بەڵام مامناوەندیی‌و میانڕەوی لە خوێندنی قورئانی ناو تەراویحدا پەسەندە، نابێ شتی وا دوورو درێژ بخوێنێ کە لە شانی

---

تێکدانی شەریعەت بە گشتی بۆ دروستی ئەم قسەیە تەماشای (کفایة الاخبار) ص٥٤ — قم / ئێران بکە، کە چۆنێتی اجماع لە سەربیست رکات روون دەکاتەوە.

- وەرگێڕ -

نوێژکەرەکان گرانبێ، بە تایبەتی لە وەرزە شەو کورتەکاندا، مەگەر خۆیان بە درێژەپێدان قاییل بن ئەوە قەیدی نیە، لە فەرموودەیەکا ئەبو زەڕ {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لە شەوی بیستو حەوتدا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} خێزانو ژنەکانی خۆیو خەڵکی تری گردکردەوە لە مزگەوتو هەر تەراویحی بۆکردین، هەتا مەترسی ئەوەمان لێ نیشێت کە فریای فەلاح (رێگەی رزگاری) نەکەین، قسەبەر (راوی) دەڵێ: گوتم مەبەست لە فەلاح (کە بەمانا رێگەی رزگارییە) چیە؟ گوتی: مەبەست پارشێوە. (د/ت/ن – س/س – وەرگێڕ) واباشە لە تەراویحی مانگەکەدا خەتمەیێ تەواو بکات هەتا خەڵکەکە گوێیان لە هەموو قورئان بێ لەو مانگەدا، ئەوە خێرێکی زۆر گەورەیە، بەلام لە خەتمەیێ پتر نەبێ، مەبادا نوێژ خوێنەکان تووشی سەخڵەتی ببن!.

## ٦٥) گوتەکانی دوا نوێژەکان:

١) **سوننەتە بۆ نوێژخوێن:** لە پاش سلاودانەوە دەست بهێنێ بەسەر تەوێڵێداو ئەوجا بڵێ (اشهد أن لا اله الا الله الرحمن الرحيم: **اللهم أذهب عنى الهم والحزن**)، یا دەست بێنێ بەسەر سەریداو بڵێ: (**لا اله الا الله الرحمن الرحيم: اللهم اذهب عنى الهم والحزن**)، ئەم نزایە گەرچی لە رێگەیەکی لاوازەوە دامەزراوە، بەلام یاسایەکی ئوصولی هەیە دەڵێ: لە بابەتی کردەوە باشەکانا کار بە فەرموودەی لاوازیش دەکرێ.

٢) ئینجا سێ جار بڵێ: (أستغفر الله) داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم. لە دوا ئەوە بڵێ (اللهم أنت السلام ومنك السلام تباركت ياذا الجلال والاكرام).. (رواه الجماعة الا البخاری).

٣) ئینجا بڵێ: (اللهم أعنی علی ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} بە موعاذی فەرمووە: ئەی موعاذ! ئامۆژگارییەکت دەکەم: لەدوا هەموو نوێژێ بڵێ: (اللهم أعنی علی ذكرك) هەتا دوایی فەرموودەکە (ئەبو داوود، نەسائی، ئیبنو خوزەیمە، حاکم) حاکم بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە.

٤) ئەوجا بڵێ: (لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو علی كل شیء قدير، اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطی لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد) چونکە موغەیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە پاش گشت نوێژێکی فەرزەوە دەیفەرموو: (لا اله الا الله وحده لا شريك له.. تاد (شەیخان).

٥) ئینجا موعەوویزەکان بخوێنێ:، کە بریتین لە سوورەتی (قل هو الله أحد) و: (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) چونکە عوقبەی کوڕی عامیر دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمانی بە من فەرموو کە لەدوا هەموو نوێژێ دوو (قل أعوذ)و وەکە بخوێنم. گفتەی ئەحمەدو ئەبو داوود لەم فەرموودەیەدا لە جیاتی (دوو – قل أعوذ)و وەکە ئاوایە: (قل أعوذو وەکان). (ئەحمەد/ ئەبو داوود/ تیرمیذی/ نەسائی).

**٦ ) وە بۆی هەیە ئایە تەلکورسیش بخوێنێ،** چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ لە دوا هەموو نوێژێکی فەرزەوە ئایەتەلکورسی بخوێنێ، هەر لەگەڵ مرد یەکسەر دەچێتە بەهەشت﴾. (نەسائی/ ئیبنو حەببان).

**٧ ) ئەوجا سیی و سێ ( سبحان الله )و سیی و سێ ( الحمد لله )و سیی و سێ ( الله أكبير ) بکاو لە تەواوی سەددا بڵێ: (لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)** چونکە دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ}: هەکەسێ لە دوا هەموو نوێژێ سیی و سێ جار (سبحان الله) بکاو سیی و سێ جار (الحمد الله) بکاو سیی و سێ جار (الله أكبر) بکا کە ئەمە هەمووی دەکاتە نەوەدو نۆجار وە لەسەری جاری سەدهەما بڵێ: **(لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)**، هەر کەسێ لە پاش هەموو نوێژێ ئاوا بکا خوا لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبێ، هەر چەند تاوانەکانی وەك کەفی دەریایش زۆربن. (ش/د). یا دەجار بڵێ: **(سبحان الله)** و دەجار بڵێ: **(الحمد لله)**و دەجار بڵێ (الله اكبر) چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: دوو خووی جوان هەن، هەر کەسێ سەرەوکارییان بکا دەیبەنە بەهەشت، ئەو دووە گەرچی ئاسانن بەڵام کەم کەس دەیانکا، یاران {رەزای خوایان لێبێ} عەرزیانکرد: قوربان: ئەو دووە چی و چین؟ فەرمووی: ئەوە تا کە لەدوا گشت نوێژێکی فەرزەوە دەجار بڵێی: **(الحمد لله)**و دەجار بڵێی (الله اكبر) دەجار بڵێی **(سبحان الله)** کاتێکیش چویتە سەر نوێنی نووستنەکەت سەد **(سبحانه الله)**و (الله

أكبر)و (الحمد لله) بكە، ئەمەیش دووسەدو پەنجایە بە زمانو دوو هەزارو پێنج سەدە بە تەرازوو قەپان، دەی كێ هەیە لە ئێوە كە شەوو رۆژی دوو هەزارو پێنج سەد گوناە بكات؟ یاران گوتیان: ئەی بۆ ئەوانەی كە كار بەم دوو خووە جوانە دەكەن كە مەن؟ فەرمووی: چونكە شەیتان لە دوا نوێژ دێ بەلاتانەوەو شتی تری بێخێرتان، لە كارو باری خۆتان بیر دەخاتەوە، هەتا بەوانەوە خەریك بنو ئەم ویردەتان لە بیربچێتەوە، هەروا لە كاتی خەوتنیشدا دێ بەلاتانەوەو دەتانخەوێنێو ناهێڵێ ئەو ویردە بخوێنن! (ئەبو داوودو تیرمیذی) تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەكی جوانی دروستە. سوننەتە كە لەدوا نوێژی بەیانیو لەدوا نوێژی شێوان دەجار بڵێ: (**لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد بيده الخير يحيى ويميت وهو على كل شىء قدير**).

چونكە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەركەسێ لە سەرجێ نوێژەكەی، پیش ئەوەی بەجێی بهێڵێو قاچە چاماوەكانی راست بكاتەوە، لە دوا نوێژی شێوانو بەیانی دەجار بڵێ: (**لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، بيده الخير، يحيى ويميت، وهو على كل شىء قدير**).

بە هەرجارەی دە چاكەی بۆ دەنوسرێ، وە دە خراپەی لێ دەسڕێتەوە، وە دەپایەیش پلەی بەرزدەكرێتەوە، سەرەڕای ئەوەیش دەبن بەقەلا بۆی لە هەموو ناخۆشییەكو دەبن بە سوپەرو پەنا لە شەیتانی بەشبڕاو لە رەحمەتی خوا، بە هیچ گوناهێ بە فەتارەت ناچێ مەگەر بەفرەخوایی‌و هاوەڵدانان بۆ خوا، یەكێكیش دەبێ لەو كەسانەی كە

کردەوەیان زۆر باشە، کەس لەو باشتر نیە، مەگەر کەسێ کە لەو باشتر بڵێ. (ئەحمەد) تیرمیذیش گێڕاویەتەوە، بەڵام بەبێ رستەی (بیدە الخیر). هەروا سوننەتە کە لە دوانوێژی بەیانی حەوت جار بڵێ: (اللهم أجرنی من النار): ئەی خودایە! پەنام بدە لە دۆزەخ، وە لە دوا شێوانیش حەوت جار بڵێ: (اللهم انی أسألك الجنة، اللهم أجرنی من النار): ئەی خودایە! داوای چوونە ناو بەهەشتت لێدەکەم، ئەی خودایە! پەنام بدە لە ئاگری دۆزەخ. چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ نوێژی بەیانی دەکەی پێش ئەوەی قسەی دنیایی لەگەڵ کەسێ بکەی حەوت جار بڵێ: (اللهم أجرنی من النار)، چونکە ئەگەر لەو رۆژە تابمری خودای گەورەو مەزن پسووڵەی پەنادانت لە ئاگر بۆ دەنوسێ، کاتێکیش نوێژی شێوان دەکەی، لە پێش ئەوەدا کە قسەی دنیایی لەگەڵ کەسێ بکەی، حەوت جار بڵێ: (اللهم انی أسألك الجنة، اللهم أجرنی من النار). چونکە ئەگەر لەو شەوە تا بمری خودای باڵادەستو خاوەن شکۆ، پسووڵەی پەنادانت لەئاگر بۆ دەنووسێ (ئەحمەد/ ئەبو داوود).

ئەبو حاتم دەگێڕێتەوە: حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} یاسای وا بوو لە پێش ئەوەدا جێ نوێژەکەی بەجێ بهێڵێ دەیفەرموو: (اللهم أصلح لی دینی الذی هو عصمة أمری، وأصلح لی دنیای التی جعلت فیها معاشی اللهم انی اعوذ برضاك من سخطك وأعوذ بعفوك نقمتك، وأعوذ بك منك، لا مانع لما أعطیت ولا معطی لما منعت ولا ینفع ذا الجد منك الجد).

## ٦٦) ژن له چەن شتێکا جیایه له پیاو:

بۆ نوێژکەر لەکاتی چەمینەوەدا سوننەتە پشتیو ئەستۆی لەیەك ئاست ڕێك بگریو هەردوو لاقەکانی ڕێك ڕاوەستێنی، وەك سنجووق، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} بە شێوەیەکی ڕێکی وا پشتو ئەستۆی لە یەك ئاست ڕادەگرت، ئەگەر کەمێ ئاو بکرایەتە سەر ناوڕاستی گازەرەی پشتی ئاوەکە ڕێك لە شوێنی خۆیدا ڕادەوەستاو بەهیچ لایەکا نەدەڕژا. ئیمامی شافیعی {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: دەبێ سەریو ملیو پشتی وەك دووخ لە یەك ئاست بگرێ، نابێ پشتی کوڕبکاتەوە، هەر دوو لاقەکانی ڕێك ڕاگرێ، نابێ سەری شۆڕبکاتەوە، چونکە لە فەرموودەدا شتیوا کە نوێژخوێن سەری شۆڕبکاتەوە بە باش نەزانراوەو چووێنراوە بەلاکە لاکی سەری گوێرێژو لۆژەلۆژی، لەژێر باری قورسدا!!

ئەم ئەندازەیە بۆ پیاوو ژن چونیەك سوننەتە، بەلام ژن لەم چەند شتەدا جیایە لە پیاو:

**یەکەم**: سوننەتە بۆ پیاو هەردوو ئانیشکی لە چەمینەوەدا کەمێ دور بگرێ لە لاتەنیشتەکانی، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وایدەکرد، عائیشە {ڕەزای خوای لێبێ} لە حەدیسێکا ئەوەی گێڕاوەتەوە، بەلام سوننەتە بۆ ژن خۆی بنوسێنێ بە یەکەوە، چونکە بۆ ئەو واباشتر لەشی دادەپۆشرێ.

**دووەم**: سوننەتە بۆ پیاو، لە کوڕنووشدا، هەردوو بەری دەستەکانی لەسەر زەوی دابنێو باسکەکانی ڕانەخا لە سەریو کەمێ بەرز بیانگرێو

نەشیان نووسێنێ بە لاتەنیشتەکانیەوەو بەڵکوو بڵاویان بکاتەوە، چونکە لە فەرموودەدا دەفەرموێ: پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} کە نوێژی دەکرد، لەناو کوڕنووشدا، هەردوو بلی حۆی بڵاو دەکردەوە، تەنانەت جارو بار سپیدەی بنباخلی دەردەکەوت. (شەیخان) بەڵام ژن واباشە لە کوڕنووشیدا خۆی بنووسێنێ بە یەکەوە، چونکە ئاوا باشتر لەشی دادەپۆشرێ.

**سێیەم**: پیاو لە کوڕنووشدا سکی دووربگرێ لە رانەکانی چونکە لە دیسا دەفەموێ: پێغەمبەر لەکاتی کوڕنووشدا وەها هەردوو باڵی خۆی بڵاو دەکردەوە، کاروبەرخیان بە ژێردا رەت دەبوو بەڵام بۆ ژن وا باشە سکی بنووسێنێ بە رانیەوەو خۆی کۆبکاتەوە، چونکە ئاوا باشتر جەستەی دەرناکەوێ.

**چوارەم**: لە نوێژە ئاشکراکانا سوننەتە بۆ پیاو بە دەنگی بەرز فاتیحاو قورئانی دوا فاتیحا بخوێنێ، وەك لە پێشەوە روون کراوەتەوە، بەڵام ئافرەت بە مەرجێ ئەوەی بۆ هەیە کە پیاوی بیانی لەوێ نەبێ، لەم کاتەدا سوننەتە بۆ ئەویش بە دەنگی بەرز بخوێنێ، کاتێ کە بەر نوێژی بۆ ژنان بکا، یا کاتێ کە خۆی بە تەنیا نوێژ بکا، بەڵام دەبێ بەقەد پیاو دەنگ هەڵ نەبڕێ هەرکاتێکیش پیاوی بیانی ئامادەبوو بە پەنامەکی بخوێنێ.

**پێنجەم**: پیاو کاتێ لەناو نوێژدا، شتێکی نامۆ روویدا، وەك ئەوە ویستی پێشنوێژەکەی لە هەڵەیێ ئاگادار بکاتەوە، یا کوێرێ لە مەترسییەك هۆشیار بکاتەوە، ئەوە دەبێ (سوبحانەڵلا) بکا، بەڵام ژن دەبێ چەپەڵە لێ بدا، چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دەفەموێ:

هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ روودا با سوبحانەڵلا بکا، چونکە کە سوبحانەڵلا دەکاتێ دەگەن لە حاڵەکە، وەلێ چەپەڵە لێدان لەناو نوێژدا، لەکاتی وادا، بۆ ژنانە (شەیخان). ئەوەندە هەیە دەبێ مەبەستی لە تەسبیحاتکردنەکە هەم یادی خوداو هەم هۆشیار کردنەوەبێ، شێوەی چەپڵەکەیش ئاوایە: ژنەکە ناولەپی دەستی راستی بکێشێ بە پشتی چەپیدا، ئەگەر چەپڵە دووبارەبۆوە بەهۆی دووبارەبوونەوەی هۆیەکەیەوە قەیدی نیە، تەسبیحکردنیش هەروا.

## ٦٧) شەرمگای پیاوو ژن:

شەرمگای پیاو (ئازاد بێ یا کۆیلەبێ) ناوەندی ناوكو ئەژنۆیەتی، چونکە خۆشەویست {درووده خوای لەسەربێ} دەفەموێ: هەرکاتێ کەسێ لە ئێوە کەنیزەکێکی هەبوو، وە مارەیکرد لە کەسێکی تر، وەك بەندەو رەنجبەری خۆی، ئیتر ئەو کەنیزەکە نابێ تەماشای شەرمگای ئاغاکەی بکا، چونکە دەبێ بەژنی مێرددارو ئاغاکەی لەم لایەنەوە دادەنرێ بە بێگانە، شەرمگایش ناوەندی ئەژنۆو ناوکە (بەیهەقی). لە فەرموودەیەکی تردا حەزرەت {درووده خوای لەسەربێ} بە جەرهەد دەفەرموێ: رانت داپۆشە، چونکە ران شەرمگایە (تیرمیذی) لە فەرموودەیەکی تردا بە عەلی دەفەرموێ {درووده خوای لەسەربێ}: نە رانی خۆت دەربخەو نە تەماشای رانی کەسیش بکە، چ هی زیندوو چ هی مردوو (ئەبو داوود/ ئیبنو ماجە/ حاکم).

**بزانە:** گەرچی ناوكو ئەژنۆ بەشێ نین لە شەرمگا، بەڵام داپۆشینیان پێویستە، چونکە یاسایەکی ئوصولی فیقە هەیە دەفەرموێ:

هەرشتێ پێویست (واجب) بەبێ ئەو تەواو نەبێ ئەو شتە خۆشی پێویستە. شەرمگای ژنی ئازاد،هەموو لەشیەتی جگە لە دەم‌و چاوو هەردوو دەستی هەتا جمگەی مووچ، مەبەست ناو نوێژو تەواف‌و ئیحرام بەستنی کاتی حەجە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ} . هەندێ دەبێژن: روخسارو هەردوو دەست تا مووچ لە هیچ کاتێکا شەرمگانین، گەرچی تەماشاکردنیان ناڕەوایە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا – سورة النور– ٢٤/٣١} . واتە: ژنان خشڵ‌و هۆی ئارایش‌و شوێنەکانیان لە لەشیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی کەوا بەدەرەوە).

زانایانی تەفسیرو ئیبنو عەبباس‌و عائیشە {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموون: مەبەست لەوەی کەوا بەدەرەوەیە لەم ئایەتەدا روخسارو هەر دوو دەستە هەتا مووچ لەبەر ئەوەیش جارێ ئەسمای کچی ئەبو بەکری صەدیق کە ژنخوشکی پێغەمبەربوو، جلێکی تەنکی لەبەردابوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە ئەوەی دی، پێی فەرموو: ئەی ئەسماء! هەر کاتێ ژن رەسیدەبوو، دروست نیە هیچ کوێی دەربکەوێ ئیرەو ئیرەی نەبێ، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} ئاماژەی کرد بۆ روخساری‌و بۆ هەردوو دەستی.

**بەلام شەرمگای كەنیزەك دوو فەرمایشتی لە سەرە:**

**یەكەم:** كەرای دروستترە: ئەوەیە كە وەك هی پیاو وایە، چونكە بە یەككگرتن (ئیجماع) سەری كەنیزەك شەرمگا نیە، چونكە عومەر {رەزای خوای لیبێ} كەنیزەكێكی خێڵی ئەنەسی لەسەر ئەوە تەمێ كرد كە سەری خۆی داپۆشیبوو، وەپێی فەرموو: ئەوە دەتەوێ لاسایی ژنە ئازادەكان بكەیتەوە؟ جا لە شوێنێ سەری شەرمگا نەبێ، كە زۆربەی جوانی جەستە وا بەسەرەوە، دیارە شەرمگای وەكوو هی پیاوە، كە برێتییە لە ناوەندی ناووكو ئەژنۆ وەك هی پیاو.

**رای دووەم:** ئەو ئەندازەیە، لە لەشی كە لەكاتی كارو فرمانكردندا دەردەكەوێ، كە برێتین لە سەرو ملو باسكو باریكەی لاق، شەرمگانین، چونكە ناچارە كە دەریان بخا لەكاتی كارو ئیشا وە ئەستەمە كە دایان بپۆشێ، بەلام باقی مەندەنی جەستەی شەرمگایە.

# ٦٨) ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە:

**نوێژ بە یازدەشت پووچ دەبێتەوە:**

**١**) بەقسەی قەستی ئاسایی نێوانی مەردوم، ئیتر پەیوەندی بە نوێژەوە هەبێ یانەیبێ، چونكە لە صەحیحەیندا – كە بوخاریو موسلیمن – دەفەرموێ: زەیدی كوڕی ئەرقەم فەرمووی: ئێمە لە پێشدا لەناو نوێژدا، قسەمان لەگەڵ یەكتردا دەكرد، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە كە دەفەرموێ: {رەزای خوای لیبێ} {وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ – سورة البقرة – ٢٣٨/٢} واتە: لە نوێژدا بەسەر كزیو بەمل

کەچی راوەستنو دەم بە یادو ذیکری خودابنو قسەی دنیایی مەکەن. ئیتر هاتنی ئەم ئایەتە فەرمانمان پێکرا بە خامۆشیو قسەکردنمان لێقەدەغە کرا) هەروا لە صەحیحەینو شوێنی تردا دەفەرموێ: بە راستی نوێژ خەریکبوونی دەوێ. موسلیمیش دەگێڕێتەوە: حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بە راستی ئەم نوێژە بە کەڵکی قسەی دنیایی نایێ، بەڵام ئەگەر لە بیری نەبوو قسەی کرد، یا لەبەر ئەوەی نۆ موسوڵمان بوو، تازە ئیسلام بوو بوو نەیدەزانی قسەکردن لەناو نوێژدا نادروستە، یا بەبێ مەبەست قسەیێ لە دەمی دەرچوو، یا پێکەنین زۆری بۆ هێنا، لەم کاتانەدا نوێژەکەی پووچ نابێتەوە، چونکە بێ سووچە، چونکە پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خودا تۆڵەو سزای ئەم سێ جۆرە گوناهەی لەسەر ئومەتم هەڵگرتووە:

**یەکەم**: گوناهێ کە خاوەنەکەی بەهەڵە بیکا،

**دووەم**: گوناهێ خاوەنەکەی لە بیری نەبێ.

**سێیەم**: ئەوشتانەی بە زۆر پێیان بکرێ. (طەبەرانی لە ئلکەبیردا گێڕاویەتەوە). جارێکیش موعاوییەی کوڕی حەکەمی ئەل - سوللەمی، لەناو نوێژدا بوو نوێژکەرێ لە پالیا پژمی، نزای پژمینی بۆ کردو پێی گوت: (رحمك الله)و لەبەر ئەوەی نەیدەزانی قسە لە نوێژا ناڕەوایە قسەی کرد، بەڵام پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لێی نەگرتو فەرمانی پێنەکرد کە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە. ئەگەر کۆکەو پژمە زۆری بۆ هێنا، نوێژەکەی پووچ نابێتەوە، با دوو پیتیشی لێ دروست ببێ، وەك ئەوە بەدەم کۆکەوە بڵێ: ئح، چونکە زۆری بۆ هاتووە، سووچی ئەو نیە،

ئەگەر نوێژکەر نەیدەتوانی بەبێ کۆکین روکنێکی قەولی بخوێنێ ئەوە قەیناکا بکۆکێ.

بەڵام مافی ئەوەی نیە کە بۆ دەنگ بەرزکردنەوەو بەئاشکرا خوێندن بکۆکێ، چونکە ئەوە سونەتە، هەموو سونەتەکانی تریش بریاری بە ئاشکرا خوێندنیان بۆ هەیە، وەکوو سوورەت و قونووت و ئەڵلاهو ئەکبەری گواستنەوەکان لە نێوانی بنیات (روکن)ەکانی نوێژدا، بۆ خوێندنی ئەمانە مافی کۆکەی نیە، چونکە ئەوە ناچاری نیە.

۲) بەکاری زۆری لە شوێنیەك، وەك سێ هەنگاوی لە سەریەك نوێژ پووچ دەبێتەوە، هەروەها سێ پیاکێشان، سەربەڵگەی ئەمەیش یەکگرتنی رای زانایانی ئیسلامە لەسەر ئەم بریارە، کە نوێژ بەکاری زۆر پووچ دەبێتەوە، چونکە کاری زۆر شێوەی نوێژ دەگۆرێ، بەڵام ئەگەر کارەکە لەسەر یەك نەبوو، بەم رەنگە هەنگاوێکی ناو بەقەد ئارامبوونەوەیێ راوەستا، ئەوجا هەنگاوێکی تری نا، وە هەروەها ئەوە نوێژەکەی پووچ نابێ، هەروا بەکاری کەمیش پووچ نابێ، چونکە لە نوێژدا پێویستی بەوە دەبێ و جێکاری پێویستییە (مَحَلّ الحاجە) هاوکات لەگەڵ ئەوەدا سرەوت گرتن لەسەر یەك بار نەستەمە، بە پێچەوانەی قسەوە بەردەوام بوون لەسەر بێ دەنگی کارێکی زۆر ئاساییە، جا لەبەر ئەوەیە نوێژ بە یەك وشە پووچ دەبێ، بەڵام بە یەك هەنگاو پووچ نابێ، وەکی تریش پرسیار لە حەزرەتکرا، لە بارەی تەختکردنی زیخ و چەوی شوێن سوژدەوە، فەرمووی {درودی خوای لەسەربێ}: ئەگەر هەر ناچاربوون شتیوا یبکەن بە یەکجار بیکەن {رەزای خوای لێبێ} (موسلیم).

پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە لایەکی ترەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە نوێژ بەکردنی کاری سووکەڵە لە ناویدا پووچ نابێتەوە، ئەوەتا فەرمانی کردووە بە نوێژکەرەکە ڕێگەی هامۆشکەر بە بەردەمیدا نەدا، هەروا فەرمانی کردووەبە کوشتنی مارو دووپشك لەناو نوێژدا، جارێکیش ئیبنو عەبباس لە پشتیەوە لەلای چەپیەوە هەڵسا نوێژبکا پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} سەری گرتو سوورانیەوەو بردی لەلای ڕاستی خۆیەوە ڕای وەستان‌و لەگەڵ خۆیدا کردی بە ڕیزێ، گەلێ جاریش عائیشەی هاوسەری لە بەردەمیدا دەخەوت‌و قاچی لە جێگە سوژدەکەی حەزرەتدا رادەکێشا، کە حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەهات بۆ سوژدە بە دەستی تێوەی دەژەند هەتا جێگە سوژدەکەی بۆ چۆڵ بکا، جارێکیش لەناو نوێژدا ئاماژەی بۆ جابیر کرد، کە ئاواوایی ناو قەدی خۆی ببەستێ، هەموو ئەم باسانە وان لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەردا[1]، مەرجی ئەو تاقە کارەیش کە نوێژی پێ پووچ نابێتەوە ئەوەیە: شتێکی ناقۆلای نابەجا نەبێ، دەنا ئەگەر وابوو، وەك قەڵەمبازێ ئەوە نوێژ پووچ دەکاتەوە، چونکە شتی وا زەق، ناشێ بۆ ناو نوێژ.

بزانن کە نوێژ پووچ نابێتەوە بە وردە جووڵە، وەك خورادنی لەش بە پەنجە، یا زۆریش پەجەکانی بجوولێنێ، یا جووڵەکان یەك لە دوای

---

[1] تەماشای تاجول ئوصول (کوردی) بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم لاپەڕە (٢٤٠ ف – ٣ + ل – ٢٤٤ ف – ٥ + ل – ٣٣٨ ف – ٢ + ل – ٣٨٨ ف – ١) بەرگی چوارەم لاپەڕە (٣٥٦) کە. بۆ ساخکردنەوەی ئەم باسانە. ف = فەرمووده.

- وەرگێر -

یەکیش بن، چونکە شتی وا نە زیان بە شکۆمەندیی نوێژەکە دەگەیەنێو، نە پێچەوانەی ملکەچیی ناو نوێژە. بەڵام ئەگەر بەری دەستی سێ جار بەسەر لەشیدا بە کێش کردو جەستەی بە لەپی خۆی لەو ماوەیەدا خوراند ئەوە نوێژەکەی پووچە، مەگەر ئاڵۆشێکی زۆری هەبێ وەك گەڕی، وە نەتوانێ ئوقرەی لەسەر بگرێ، ئەوە بە مەهانەی ڕەوا وەردەگیرێ.

٣) نوێژ پووچ دەبێتەوە بە پەیدابوونی نانوێژیی (حەدەث) ئیتر بە قەستی بێ یا بە هەڵە، وە لە پێشیەوە نانوێژیی ناهەمیشەی (حەدەث غەیرە دائیم) هەبوو بێ یا نەبووبێ چون یەکە، چونکە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان لەناو نوێژدا بایەکی لێ بووەوە، با نوێژەکەی ببڕێو دەسنوێژ بگرێتەوەو نوێژەکەی لە نووکەوە بکاتەوە (ئەبو داوود گێڕاویەتەوە) تیرمیذی فەرموویەتی: فەرموودەیەکی جوانە، یەکگرتنیش دامەزراوە لەسەر ئەم شێوانەی باسکران، جگە لە شێوەی هەبوونی نانوێژیی لە پێشیەوە.

٤) نوێژ پووچ دەبێتەوە بە پەیدابوونی پیسی بە جلەکەیەوە یا بە لەشیەوە، یا لەجێ نوێژەکەیدا، چونکە پاکیی ئەم سێ شتە مەرجە بۆ دامەزراندنی نوێژ، وەك لە پێشەوە باس کرا، وەلێ ئەگەر پیسییەك کەوتە سەر شوێنێکی دەسبەجێ لایدا قەیناکا. خاڵ حەرامە، چونکە لە شەرعا ڕێگەی لێگیراوە، جا دەبێ کوێری بکاتەوە ئەگەر مەترسی ئەوەی لێ نەدەکرا کە شوێنەکەی ببێ بە زامێکی وا ناچاری بکا تەیەمموم بکا، بەڵام ئەگەر مەترسی ئەوە. هەبوو ئەوە پێویست بە لابردنی خاڵەکە

ناکــا، لەبــەر ئــەوەی ئــەو خاڵــەوە هــەم نوێــژی دروســتەو هــەم بەرنوێژیکردنی، گریمان زامەکەی بە دەرمانێکی پیس تیمارکرد، یا بە دەزوویــەکی پــیس دوورییــەوە، یــا جێگەیــەکی لەشــی شــەق کــردو پارچەیەکی پیسی تیا موتوربەکرد، وەك ئەوە بە ئێسکێکی پیس شکستی بگرێتــەوە، ئــەوە پێویــست ناکا ئــەو شــتە پیــسە دەربکێشی، لــەکاتی وادا نوێژەکەی دامەزراوە.

٥) نوێژ پووچ دەبێتەوە بە دەرکەوتنی شـەرمگا، چونکە پێویستە لـەناو نوێـژدا داپۆشـری، وەك لـە پێشەوە رابـورد، جـا ئەگـەر خـۆی بـە قەستی دەری خست نوێژەکەی پووچە، بەڵام ئەگەر با دەری خست دەبـێ گورج دایپۆشێ، ەنا نوێژەکـەی پـووچ دەبـێ، هـەروا ئەگـەر پشتەماڵەکەی کرایــەوە، یــا بەنەخوێنەکــەی پــچڕاو گــورج خــۆی کۆکردەوە نوێژەکـەی دروستە.

٦) گـۆڕینی نییـەت، وەك ئەوەنییـەتی دەرچـوون لـە نوێـژ بهێنـێ چونکە مەرجی نییـەت ئەوەیـە تـا دوابەشـی نوێژەکە بمێنـێ، هـەر وایـە ئەگـەر نییەتەکـە لـە فەرزێکـەوە بگـۆڕێ بـۆ فـەرزێکیتر، بـەڵام ئەگـەر فـەرزێکی کـرد بـە سوونەتی رووت، بـۆ ئـەوەی بـە جەماعـەتێکی رەوادا بگـا، وەك ئـەوە بـە تـەنیا نوێـژی فـەرزبکاو، لـە پـاش دوو رکـات سـڵاو بداتەوە، هەتا فریای جەماعەت بکەوێ، ئـەوە دەبـێ، بـەڵام ئەگـەر کـردی بـە نوێـژێکی دیـاریکراو، وەك دوورکـاتی چێـشتەنگاو ئـەوە دروسـت نیـە، چـونکە نوێـژی دیـاریکرو لـە سـەرەتاکەیەوە کـاری بـە دیـاریکردن هەیـە لەکاتی نییەتهێناندا. هەتا ئەگەر بڕیاریدا کە نوێژەکەی ببڕێ دەسبەجێ

پووچ دەبێتەوە، چونکە پێویستە نییەت (نیاز) بەردەوام بێ تاکاتی لێبوونەوە، هەروا ئەگەر گومانی بوو: کە ئایا بیبڕێ یانا؟ نوێژەکەی پووچەوە دەبێ، بەڵام ئەگەر بە خەیاڵ دەهات بە دڵیدا، وەك حاڵی مرۆی رارا ئەوە وەسوەسەو خەیالاتە نوێژ پووچ ناکاتەوە!.

٧) پشتکردنە رووگە نوێژ پووچ دەکاتەوە، هەروا وەرچەرخانی سینگ لێی بەبێ مەهانە، چونکە مەرج بۆ دانراو نامێنێ بە نەمانی مەرجەکەی، دیارە کەرووکردنە رووگە مەرجی دامەزراندنی نوێژە.

٨,٩) **هەشتەم و نۆیەم**: لەو شتانەی کە نوێژیان پێ پووچ دەبێتەوە خواردن و خواردنەوەیە، چونکە لە شوێنێ بە یەکێ لەم دووە رۆژوو پووچ ببێتەوە نوێژ چاتر پووچ دەبێتەوە پێیان، سەرەڕای ئەوەیش بەهۆی خواردن و خواردنەوەکەوە نوێژەکە پشت گوێ دەخا، لە راستیدا مەبەست لە پەرستنی جەستەیی (عیباداتی بەدەنی) تازەکردنەوەی باوەڕە لەناو دڵداو، گفتوگۆی دڵە لەگەڵ خوداو گەڕانەوەیە بۆ پەنای سێبەری رەحمەتی خودا، دیارە کە خواردن و خواردنەوەیش دژی ئەوەیە. بەڵام ئەگەر لە بیری نەبوو شتی خوارد یاشتی خواردەوە، یانەیدەزانی کە ئەوە نادروستە، چونکە نۆ موسوڵمان بوو، یا لە بەرشتێ تری ئاوا، وەك ئەوە پەروەردەی دەشت و دەرو چۆڵەوانی و دوور لە مەلاو زانابێ، ئەوە ئەگەر کەمبێ نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام ئەگەر زۆربێ، ئیتر بە نەزانی بێ، یا لەبەر لە یاد چوونبێ، ئەوە نوێژی پێ پووچ دەبێ، چونکە نوێژ وەك رۆژوو نیە، چونکە نوێژ برێتییە لە چەند کارێکی ریزکراو، کە کاری زۆر لە نێوانیاندا —

ریزەکەیان دەپچڕێنێ. کەسێ بە زۆر شتی دەرخوارد بدری نوێژەکەی پووچ دەبێتەوە چونکە شتی وا زۆر کەمە، مەگەر بە دەگمەن روو بدات.

**١٠**) پێکەنینێ بە قاقابێو دوو پیتی لێ پەیدا ببێ نوێژ پووچ دەکاتەوە، بە مەرجێ بە قەستی بێ، ئەگەر زۆری بۆ هاتبوو قەیناکا. بەلاّم ئەگەر دوو پیتی لێ پەیدا نەبوو، لەبەر ئەوەی بە قسە دانانرێ نوێژ پووچ ناکاتەوە.

**١١**) لە ئیسلام وەرگەڕان، ئیتر هەلگەڕانەوە کە بەکردەوە بێ، وەك کڕنووش بردن بۆ بت، یا بە قسەبێ، وەك ئەوە بلّێ سێ خوا هەیە، یا بە بیرو باوەڕبێ، وەك ئەوە باوەڕی وابێ کە خوا نیە، ئەوە لەم کاتانەدا دەسبەجێ بێ باوەڕ دەبێو نوێژەکەی پووچو بەتاڵ دەبێتەوە.

بزانە یەکێکە لە وانەی کە نوێژ پووچ دەکەنەوە دواکەتنی پاشنوێژە لە پێشنوێژەکەی بە دوو بنیات، کە هەردوکیان بنیاتی کردەوەیی (روکنی فیعلی)بن، بەلاّم بە مەرجێ بە قەستی دوابکەوێ.

وەك ئەوە لەگەڵی دا نەفریای چەمینەوەو نەفریای راستبوونەوە لە چەمینەوە بکەوێ، هەروا نوێژەکەی پووچ دەبێتەوە ئەگەر بەقەستی بەدوو روکنی فیعلی پێش پێشنوێژەکەی بکەوێ، چونکە ئەوە پێچەوانەیەکی زۆر ناقولاّو دزێوە، هەروا نوێژ پووچ دەبێتەوە بەقوتدانی چلّمێ کەلەسەرەوە دابەزێ، بەمەرجێ بتوانێ فڕەی بدا.

# ٦٩) کوڕنووشی هەڵەو هۆیەکانی:

( **پێناسەکەی** ): هەڵەلەزمانا لەبیر چوونی شتەو بێ ئاگا بوونە لێی، لە زاراوی شەرعدا: بێ ئاگا بوونە لەشتێ لەناو نوێژدا کوڕنووشی هەڵە بۆ ئەوە دامەزراوە کەزەدەی ناو نوێژ چارە سەر بکا، ئەمەیش لەفەرزو سوننەتدا، لەسەر فەرمایشتی دامەزراو، چون یەکە، واتە: بۆ هەردوولالەکاتی هەڵەدا کوڕنووشی هەڵە سوننەتە.

**کۆکەرەوەکەی:**

زابیتەو کۆکەرەوەی کوڕنووشی هەڵە ئاوایە: سوژدەی هەڵە سوننەتە لەبەرکردنی شتێکی وا کەنەیی لێ کرابێ لەنوێژا، وەکوو زیادەی راوەستان، یاروکوعێکی زیادە، یاکوڕنووشێکی زیادە، یاتەحیاتێکی زیادە، کەلەشوێنی خۆیانا نەبن‌و بەهەڵە بکرێن، یالەبەر لەبیرچوونی شتێکی وا کەفەرمانی پێ کرابێ، وەك نەکردنی چەمینەوە یاکوڕنووش، یاراوەستان بۆ فاتیحا، یادانیشتن بۆ تەحیاتی پێویست، یانەخوێندنی شتی پێویست وەك فاتیحاو تەحیاتی فەرز، جا ئەمانە دەبێ بەسەر بگیرێنەوەو ئەوسا کوڕنووشی هەڵەیان بۆ دەبرێ لەو شوێنەدا کەبۆی دیاری کراوە، جائەگەر کابرا لەناو نوێژەکەدا ئەم هەڵەیەی وەبیرکەوتەوە ئەوە بەسەری دەگرێتەوەو شتەنەکراوەکە دەکاو تەواو، بەلام ئەگەر لە دوا سلاودانەوەی بیری کەوتەوەو زۆریشی بەسەردا تێ نەپەڕیبوو ئەوە ئەوەی کەپەڕاندوویەتی دەگەڕێتەوە سەری‌و بەتەواوی دەیکاو کوڕنووشی هەڵەیش دەبات، بەلام ئەگەر کاتێکی درێژی بەسەردا،

تێپەڕی ئەوە دەبێ سەر لەنوێ ئەو نوێژە بکاتەوە، بۆ درێژیی کاتیش دوو فەرمانیشت هەیە: یەکەمیان دەفەرموێ دەگەڕێینەوە وبۆ سەر عورف، دووەمیان: دەفەرموێ: ئەوەیە زیاتر بێ لەئەندازەی رکاتێ!

بەڵام جیاوازیی نییە لەنێوانی ئەم شێوانەدا: لەپاش سلاّودانەوە قسە بکا یا نەیکا، لەمزگەوت دەرچووبێ یانا، پشتی کردبێتە رووگە یانا، ئەمە هەمووی کاتێ وایە کەسوور بزانێ ئەوشتەی نەکردووە، بەڵام ئەگەر سلاّوی دایەوەو کەوتە گومانەوە کە ئایا ئەو بنیاتە یائەو رکاتەی کردووە یا نا؟ ئەوە لە شێوەی وادا هیچی لەسەر نییە، نوێژەکەی تەواوە، ئەمەیش بەپێچەوانەی ئەوەوەیە کەلە ناو نوێژدا گومانی بۆ پەیدا ببێ، کەئەو شتەی کردووە یانا؟ ئەوە لەم شێوەیەدا کام لا یەقین بوو لەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو دەکاو کار بەبنەرەت (ئەصلّ) دەکا، چونکە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەگەر کەسێکتان لەنوێژدا گومانی بۆ پەیدا بوو، وەنەی دەزانی کەچەن رکات نوێژی کردووە، وەك ئەوەنەیدەزانی کەسێ رکاتی کردووە یاچوار، ئەوە با گومانەکەی توورِ بدا، چەندەی لەلا یەقینو بێ گومانە، بالەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو بکا، لەپاشا لەپێش سەلام دانەوەوە دوو کورنووشی هەڵە ببات، جا ئەگەر لەڕاستیدا پێنج رکاتی کردبوو ئەوا ئەو دوو کورنووشە نوێژەکەی دەکەنەوە بەجووت،ئەگەر چواری تەواویشی کردبوو ئەوا ئەو دوو کورنووشە دەبن بەهۆی نوشوستیو سەر شۆڕی بۆ شەیتان (موسلیم). ئەمە سەبارەت بە پێشنوێژو نوێژکاری تەنها وایە، بەڵام پاشنوێژ نابێ لەخۆیەوە بەتەنها کورنووش ببا بەبێ پێشنوێژەکەی، چونکە پێشنوێژەکەی بەر پرسیاریی هەڵەکەی ئەو هەڵ دەگرێ.

جا ئەگەر پاشنوێژ لەناو تەحیاتدا بۆی دەرکەوت کەچەمینەوەی نەکردووە، یافاتیحەی نەخوێندووە، یاشتێکی وا، وە ئەمەی لە شوێنی خۆیدا لەبیر نەبووە، یالەم بارەیەوە، گومانی بۆ پەیدا بوو، جا ئەگەر پێشنوێژەکەی سلاوی دایەوە، ئەو دەبێ گورج هەڵسێ رکاتێ بەتەواوی بکا، بەلام کورنووشی هەڵە نەبات، چونکە ئەو گومانەی کەبۆی پەیدا بووە لەو کاتەدا بووە کەئەم لە حاڵەتی ئیقتیدا بووە، لەبەر ئەوە پێشنوێژەکەی ئەوەدەگرێتە ئەستۆی خۆی. سوننەتە گرنگەکانیش کەپێیان دەگوترێ: ئەبعاز، وەك تەحیاتی یەکەم و سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر لە تەحیاتی یەکەماو قونووتی بەیانیو قونووتی نیوەی دوایی رەمەزان، ئەمانە گەرچی لەکورۆکی نوێژ نین، بەلام سوننەتە بەکورنووشی هەڵە پڕ بکرێنەوە، ئەگەر بەهەڵە تەرك کرابوون، چونکە بەهۆی نەکردنیانەوە زەدە لەنوێژەکەدا پەیدا دەبێ. سەر بەڵگە لەتەحیاتی یەکەم دا: ئەم حەدیثەی بوخاریو موسلیمە، کەعەبدوڵلای کوڕی بوجەینە {رەحمەتی خوای لێبێ} دەفەرموێ: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} تەحیاتی یەکەمی نەخوێند، بەلام لەپێش ئەوەدا کەسلاو بداتەوە کورنووشی هەڵەی بۆ برد، جا ئەوانی تریش بەقیاس لەسەر ئەو. غەزالی {رەحمەتی خوای لێبێ} لە بارەی هۆی قیاسکردنی ئەم ئەبعازانەی تر، لەسەر تەحیات دەفەرموێ: (چونکە ئەمانیش رێك وەك تەحیات، لەدروشمو نیشانە دیاریو تایبەتی یەکانی ناو نوێژن) جا ئەگەر نوێژ خوێن یەکێ لەم سوننەتە گرنگانەی نەکردو دەستی کرد بەکردنی فەرزێکی ناو نوێژ، ئیتر دروست نیە بۆی بگەڕێتەوە بۆ سەری، دەنا ئەگەر بزانێ کە ئەوە نادروستە، وە بەقەستی بگەڕێتەوە بۆ سەری ئەوە نوێژەکەی پووچە، جا

ئەگەر لەبیری نەبوو تەحیاتی یەکەمی نەخوێندو دەستی کرد بەراوەستان بۆ خوێندنی فاتیحە، یالە حاڵەتی هەڵسانەوەدا بوو، لە راستبوونەوەوە نزیکتر بوو هەتا لەدانیشتنەوە، ئەوە دروست نییە بۆی بگەڕێتەوە بۆ دانیشتن، بەلاّم کوڕنووشی هەڵە بۆ ئەم حاڵەتە دەبا، بەلاّم ئەگەر لەدانیشتنەوە نزیکتر بوو ئەوە دادەنیشێو کوڕنوشیش دەبا، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان لەرکاتی دوەم دا تەحیاتی نەخوێندو ئەزنەکی دا هەڵبسێتەوە، بەلاّم هێشتا بەتەواوی راستەوە نەبوو بوو، ئەوە بادابنیشێتەوە، بەلاّم ئەگەر بەتەواوی راستەوەبوو بوو، ئەوا بادانەنیشێتەوە، وەدوو کوڕنووشی هەڵە ببات. (ئەحمەد/ ئەبو داوود/ ئیبنو ماجە/ لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە) ئەگەر قونووتی نەخوێندو دەستی کرد بەدانیشتن، ئیتر نابێ بگەڕێتەوە بۆی، دەنانوێژەکەی پووچ دەبێ، بەمەرجێ بەقەستی وابکاو بیشزانێ کە ئەوە قەدەغەیە، وەدوو سوژدەی هەڵە لەم کاتەدا دەبا لەباتی تەرکی قونوتەکە، ئەمە بەس بۆ قونووتی بەیانیو وەتری نیوەی دوەمی رەمەزان وایە، بەلاّم قونووتی کارەسات (کەناوادارە بەقونووتی نەوازیل) بەقەستی تەرك بکرێ، یابەهەڵە، کوڕنووشی هەڵەی ناوێ.

**وردە سوننەتەکان**: وەکوو وێردەکانی چەمینەوەو کوڕنووش‌و ئەڵلاهو ئەکبەرەکانی گواستنەوەو نزای سەرەتای نوێژو شتی تری لەم بابەتە، نەلەباری قەستی داو نەلەباری هەڵەدا، کوڕنووش بۆ تەرکیان سوننەت نییە، بایستی ئەوە ئەمەیە: کوڕنووشی هەڵە خۆی لەناو نوێژدا زیادەیە، کەواتە دروست نییە بکرێ مەگەر لە رێگەی تەوقیفەوە، جا لەهەندێ لەئەبعاضدا دەقی شەرعی لە سوننەتدا هەیە، وەکوو کوڕنووش

بردنی هەڵە، لەکاتی تەرکی تەحیاتی یەکەما، ئیتر ئەو شتانەی تریش کەوەك ئەو سوننەتی گرنگن و لەئەبعاضن، قیاس لەوە دەکرێن، بەڵام وردە سوننەتەکانی تر کە لە ئەبعاض نین لەسەر بنەڕەت (ئەصڵ) دەمێننەوە.

جێگەی کوڕنووشی هەڵە لەپاش خوێندنی تەحیاتەوەیە، لەپێش سڵاودانەوەدا، وەك لەپێشەوە لەدوو گێڕانەوەکەی بوخاری و موسلیم دا رابورد. ئیبنو شەهابیش دەگێڕیتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەسەر چەند شێوەیێ کوڕنووشی هەڵەی دەبرد، بەڵام دواشێوەی ئەوەبوو: لەپێش سڵاوەوە کوڕنووشی هەڵەی ئەبرد. کوڕنووشی هەڵە سوننەتە فەرز نییە، چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: رکاتەکەو دوو کوڕنووشەکە دەبن بەسوننەت.

## ٧٠) ئەو کاتانەی کەنوێژیان تیادا نا پەسەندە:

ئەو کاتانەی کەنوێژیان تیادا ناباشە پێنجن، واتە: نوێژێ کە هۆیەکی تایبەتی نەبێ لەم پێنج کاتەدا ناباشە، سیان لەم پێنجە پەیوەندییان هەیە بەوەختەوە:

١) کاتی گزنگدانی خۆر هەتا بەقەدەر رمێ بەرز دەبێتەوە.

٢) کاتی گەیشتنی خۆر بەناوەڕاستی ئاسمان هەتا کەمێ لادەدا

٣) کاتی زەردەپەڕ هەتا بەتەواوی خۆر ئاوا دەبێ.

بەڵگەی ڕۆشنی ئەمەیش ئەوەیە کەئیمامی موسلیم دەیگێڕێتەوە: عوقبەی کوڕی عامیر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لەم سێ دەمەدا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} نەیی لێ دەکردین کەنوێژیان تیا بکەین، یا مردووی خۆمانیان تیا بنێژین: کاتێ خۆر گزنگ دەدا هەتا بەرزەوە دەبێ، کاتێ خۆر دەگاتە ناوەڕاستی ئاسمان هەتا کەمێ لائەدا، کاتێکیش خۆر زەرد هەڵدەگەڕێ‌و تەواو دەنیشێ تا ئاوا دەبێ. هۆی ئەم ناباشییە ئەمەیە: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ خۆر هەڵدێ شاخی شەیتان لەگەڵێدا هەڵدێ، کاتێ بەرزەوە دەبێ لێی جیا دەبێتەوە کاتێ گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان جووت دەبێتەوە لەگەڵی، کاتێ لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدا دیسان لێی جیا دەبێتەوە، کاتێ دەست دەکا بە ئاوابوون جووت دەبێتەوە لەگەڵی کاتێ ئاوا دەبێ لێی جیا دەبێتەوە (شافیعی).

مەبەست لەشاخی شەیتان گەلی شەیتانە، شەیتانپەرستەکانە، کەلەم وەختانەدا کوڕنووشی بۆ دەبەن، گوتراویشە: شەیتان خۆی لەم حەلانەدا، سەری لەخۆرەوە نزیك دەکاتەوە، هەتا ئەوەی کوڕنووش بۆ خۆر دەبا کوڕنووش بۆ ئەویش ببات.

ئەو دوانەکەی تریشیان پەیوەندی یان بەکارەوە هەیە، یەکەمیان هەرکاتێ نوێژی عەصر کرا، هەتا خۆر ئاوا دەبێ، دووەمیان لەپاش کردنی نوێژی بەیانی هەتا خۆر دەکەوێ. بەڵگەی ئەمیش ئەمەیە شەیخان لەئەبو هورەیرەوە دەیگێڕنەوە: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: نەیی کردووە لەنوێژ لەدوا نوێژی عەصر هەتا خۆر ئاوا دەبێ، وەلەدوا نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵ دێ.

لەم کاتانـە، کـاتی گەویـشتنی خـۆر بەناوەراسـتی ئاسمـان، لـە رۆژی هەینیدا، چەرت (استثناء) دەکریٚ، لەم بارەیەوە فەرموودەیەکی مورسـەل هەیە، ئەبو داوود گێڕاویەتـەوە، هـۆی ئـەوە کەنوێـژ لـەم کاتـەدا لـەڕۆژی هەینیدا ناباش نییە دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوە کەوەنـەوزو خـەو لـەم حەلـەدا زۆر بۆ دانیشتوەکان دەهێنیٚ کەچاوەڕوانی دوانو نوێـژی هـەینی دەکـەن، جاوا باشە بەهۆی نوێژی سوننەتەوە خـەو لـەخۆی دوور بخاتـەوە، نـەبادا خەو بردنەوە دەسنوێژەکەی بشکێنیٚ، جا ناچار دەبیٚ کەهەنگاو هەڵ نـیٚ بەسـەر سـەری مەردومەکـەدا، بـۆ دەسـنوێژ گرتنـەوە. لـە شـوێنەکانیش مەککەی پیرۆز چەرت دەکریٚ، خودای گەورە رێزو قەدری پـتر بفـەرمویٚ، چـونکە دەفـەرمویٚ {دروودی خوای لەسەربێ}: ئـەی بـەنی عەبدومـەناف! ئەگـەر کەسیٚ لەئێوە بـوو بـەکار بەدەسـتی موسـڵمانان هەکەسـیٚ لـە هەرکاتێکدا ویستی تەوافی ماڵی خوا بکا یانوێژی لەناودا بکا ڕێگـەی لیٚ مـەگرن، ئـیتر چ شـەوبیٚ چ بـەڕۆژ، (تیرمیـذیو کەسـانی تـریش گێڕاویانەتـەوە). بـەڵام نوێـژ لـەم حەلەیـشدا زۆر بـاش نییـەو پێـچەوانەی چـاکترە (خیلافـی ئەولایـە) هـەتا دەربـاز بـبین لەکێـشەی راجیـایی، چـونکە مالیكو ئـەبو حەنیفـە لـەم بارەیـەوە رایـان جیایـە. بـەڵام نوێـژیٚ کەهۆیـەکی هـەبیٚو، هۆیەکـەیش لـە پێـشیەوە رووی دابـیٚ، وەك گێڕانـەوەی نوێـژە چـووەکان، لەفەرزو لەسوننەتو لەو نوێژە سوننەتانەی کـەمرۆڤ وەك وێـرد خووی پێوە گرتبن، کردنی ئەم نوێژانە لەم کاتانەدا هیچ ناباشییەکی تیا نییـە. چـونکە خۆشەویـست {دروودی خوای لەسەربێ} جـاریٚ لـەدوا نوێـژی عەصـر، دوو رکـات نوێـژی سـوننەتی کـرد، کـە عـەرزیان کـرد ئـەم نوێـژە لـەمکاتی ناباشییەدا چی بوو؟ فەرمووی: ئەمە دوو رکاتە سوننەتەکەی دوا نوێـژی

نیوەرۆیە ئێستا گێڕامەوە. (شەیخان) هەروا نوێژێکیش کە هۆیەکی وای هەبێ کەهاوکات بێ لەگەڵ خۆیدا، کردنی ناپەسەند نییە، وەك نوێژی تەرمو کرنووشی قورئانخوێندنو کورنووشی سوپاسو نوێژی خۆر گیرانو مانگگیرانو نوێژە بارانە، بەڵام نوێژێ کە هۆیەکەی لەدوایەوە بێ کردنی ناباشە لەم کاتانەدا، وەك نوێژی ئیستیخارەو دوو رکاتەکەی ئیحرام دابەوستنی حەجو عەمرە.

## ٧١) نوێژی بەکۆمەڵ (نوێژی جەماعەت):

سەر بەلگەی رەوایی نوێژی بەکۆمەڵ قورئانو سوننەتو یەککرتنی گەلی ئیسلامە. یەزدانی پاك دەفەرموێ: {وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ – سورة النساء – ١٠٢/٢) واتە: کاتێ تۆ لەناویانا بووی‌و بەرنوێژیت بۆ کردن، ئەوە با تاقمێکیان بەرەو رووی دوژمن راوەستێو تاقمێ لەوان راست ببنەوە دەس بکەن بەنوێژ لەگەڵ تۆدا.

ئەوەتا لەم ئایەتەدا هەتا لەکاتی گەرمەی جەنگدا خوای گەورە فەرمان دەکا، بەکردنی نوێژی جەماعەت، دیارە لەکاتی ئاسایشو هێمنیو ئاشتی دا جەماعەت گەلێ چاکترە، حوکمی جەماعەت لەنوێژی هەینی دا فەرزی عەینە لەسەر هەموو کەسێ کە نوێژی هەینی لەسەر بێ، بەڵام لەنوێژەکانی تردا راجیایی هەیە: فەرمایشتی راستو دروست ئەوەیە کەسوننەتێکی دامەزراوی زۆر گەورەیە، چونکە خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوێژی جەماعەت لەنوێژی تەنیا بەبیستو

حەوت پلە گەورەترە. دەی وشەی (گەورەترە) کە بۆ موفاضەلەیە، واتە: ئەوە دەگەیەنێ کە هەردوو کارەکە دروست بن، بەلام لایەکیان لەولایەکەی تریان باشتر بێ، دەنا ئەگەر لایەکیان نادروست بوایە موفاضەلە دروست نەدەبوو! چونکە موفاضەلە پلەدانانە بۆ دووشتی باش!

گەرچی هەندێ زانا دەفەرموون: نوێژ بەکۆمەڵ فەرزی کیفایەیە ئەگەر لەشوێنی هەندێ کەسیان بیکەن لەکۆڵ هەموویان دەکەوێ بەلام ئەگەر کەسیان نەیان کرد هەموویان گوناهبارن، بەلگەیشیان ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە {درودی خوای لەسەربێ}: هەرکاتێ سێ موسڵمان، یاپتر لەسێ موسڵمان، لەشوێنێکدا یەکیان گرت، چ گوندنشین بن چ کۆچەری، وەنوێژی جەماعەت نەکەن، ئەوە بێ گومان کە شەیتان زاڵ بووە بەسەر یاناو فریوی داون، دەی ئەی پیاوی موسڵمان! ئامادەی جەماعەت بەو هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵ بەو لەگەل جێ مەمێنەو بەتەنیا مەبە، چونکە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کەلە گەلە بڕ دەبێ!. (ئەبو داوود/ ئیمامی ئەحمەد/ نەسائی/ ئیبنو حیبان/ حاکم).

**هەیشە دەفەرموێ:** جەماعەت فەرزی سەرە، واتە فەرزی عەینە لەسەر هەموو کەسێ، چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بەو کەسە کەگیانی منی وا لەدەستدا نیازم هەبوو کەبەپیاوێ بڵێم: لەجیاتی خۆم بەرنوێژیی یەکە بۆ خەڵکەکە بکا، وەخۆشم بڕۆم بۆ سەر ئەو پیاوانە کەلە نوێژی جەماعەت دوا دەکەون، وە فەرمان بدەم کەبە باوشەدار ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنن. (شەیخان). بەلام ئەم فەرمایشتە ئاوا رەت کراوەتەوە: کە ئەم رووداوە سەبارەت بەناپاکان بووە، سەرەرای

ئەوەیش پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} هەڕەشەکەی جێ بەجێ نەکردووە، وەئەوەی بووە لەم لایەنەوە تەنیا نیازێکی رووت بووە، کردەوەی لەگەڵ دانەبوە.

بەلاّم بزانە کەجاری واهەیە جەماعەت، بەهۆی هۆیەکی لاوەکییەوە، پێوویست دەبێ، وەك ئەوە دەبینێ ئیمامێ لەناو روکوعدایە، هەق دەزانێ ئەگەر نوێژ لەگەڵیا دابەستێ فریای رکاتێ دەکەوێ‌و نوێژەکەی بەهۆی ئەوەوە دەبێ بەئەدا، دەنا دەبوو بەقەزا، چونکە بە تەنیا فریای رکاتێ ناکەوێ لەکاتدا، ئەوە نابێ بەتەنها نوێژەکەی بکا، جاری وایش هەیە جەماعەت حەرامە، وەك ئەوە دەبینێ پێشنوێژێ لەتەحیاتی کۆتایی دایە، ئەگەر ئیقتیدای پێ دەکا فریای رکاتێ لەکاتدا ناکەوێ، بەلاّم ئەگەر بەتەنها نوێژ بکا فریای رکاتێکی نوێژەکەی لەناو کاتی خۆی دا دەکەوێ، هەر نوێژێکیش فریای رکاتێکی کەوتی لەکاتەکەیدا بەحازر دادەنرێ، ئەوە دەبێ لەم حەلەدا بەتەنها ئەو نوێژە بکا. زاتی جەماعەت بەئەوەندەیش دێتە جێ کەپیاو لەماڵەوە لەگەڵ ژنەکەی‌و کەسانی تردا نوێژ بەکۆمەڵ بکا. وەلێ لەمزگەوتا گەلاّ خێرترە، بەڵکوو مزگەوت هەتا کۆمەڵەکەی زۆر تربن جەماعەتەکەیشی خێرترە، جا ئەگەر لە نزیکیەوە مزگەوتێ هەبوو، نوێژکەرەکانی کەمتر بوون، لەدووریشیەوە مزگەوتێ تر هەبوو نوێژکەرەکانی پتر بوون، ئەوە (لەدوو شێوەدا نەبێ) جەماعەتی مزگەوتە دوورەکە خێر ترە، شێوەی یەکەم: ئەگەر ئەم بچێ بۆ دوورەکە جەماعەتی نزیکەکە بەهۆی چوونەکەی ئەوەوە پەکی بکەوێ، وەك ئەوە ئیمامیان بێ. شێوەی دووەم: پێشنوێژی دوورەکەیان بیدعەتکاربێ، بۆ ئەمە بەدکار (فاسیق)یش وەك بیدعەتکار

وایه. هەر کەسێ بەیەك هەناسە، یا بەکەمتریش، لە پێش سلاّودانەوەی پێشنوێژدا فریای نوێژدابەستن بکەوێ لەپشتیەوە، ئەوە فریای جەماعەت دەکەوێ و لەخێرەکەیدا بەشدار دەبێ، چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ دین بۆ نوێژ ئەگەر ئێمە لەناو کورنووشدا بووین، ئەوا نوێژ دابەستن‌و یەك سەر کورنووش ببەن، بەلاّم بەهیچی مەژمێرن، واتە: بەرکاتی حلێب مەکەن، وەلێ ئەوەی فریای چەمینەوە بکەوێ لەگەلْ بەر نوێژدا ئەوە فریای ئەو رکاتە دەکەوێ. (ئەبو داوود).

بزانن کاتێ پاش نوێژ فریای چەمینەوە دەکەوێ کەفریای ئارامبوونەوە لەگەلْ پێشنوێژدا بکەوێ لەناویدا، چونکە بەبێ ئارامبوونەوە چەمینەوە حلێب نییە، واتە: دەبێ لەچەمینەوەدا فریای ئەوە بکەوێ کەبلێ (سبحان ربی العظیم) یا بەئەندازەی گوتنی ئەم ویردە رابوەستێ پێش ئەوەی بەرنوێژ لە چەمینەوە بەرزەوە ببێ.

مەرجی دەسکەوتنی جەماعەت ئەوەیە: کەپاشنەێژ واتە: (مەئموم) لەکاتی نوێژدا بەدابەستنەوە نێتی جەماعەت بێنێ، چونکە چاولێکردن‌و شوێنکەوتنی پێشنوێژکردەوەیەو کارە، کاریش لە عیباداتدا پێویستی بەنیازو نێت هەیە، کەواتە: بەر حوکمی گشتی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەکەوێ: هەموو کردەوەێی بە پێ ی نیازو نێتە کەیەتی... بۆ ئازادی رەسیدە دروستە لەپشت بەندەو منالْەوە نوێژی جەماعەت بکا، دروستبوونی پەیرەویی (ئیقتیدا) بە بەندە، بەپێ ی ئەمەیە کەبوخاری دەیگێڕێتەوە: کەعائیشە {رەزای خوای لێبێ} بەندەیەکی هەبوو، ناوی کوران بوو {رەزای خوای لێبێ} ئەم زەگوانە بەر

نوێژیی بۆ عائیشە دەکرد، پەیڕەوی بەمناڵیش بەپێ ی ئەمەیە: عەمری کوڕی سەلەمە لە سەردەمی پێغەمبەردا لەتەمەنی حەوت ساڵیدا بەرنوێژی بۆ هۆزەکەی خۆی دەکرد. (ئەم باسە بوخاری گێڕاویەتەوە). پەیڕەویی پیاو بەژن دروست نییە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء – سورة النساء – ٣٤/٤} واتە: پیاوان سەرکاری سەر ژنانن‌و چاو دێرن بەسەریانەوە). پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لەو شوێنانەدا کەخوا ژنانی خستۆتە دواوە بیانخەنە دواوە، لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: هۆشیار بن هیچ ژنێ بەرنوێژیی بۆ هیچ پیاوێ نەکات. (ئیبنو ماجە) هەندێ زانایش ئەمەیان کردووە بەبەڵگە لەم مەسەلەیەدا، کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرموویەتی: هەرگەلێ کاروباری گرنگی خۆیان بسپێرن بەژنێ‌و ژن بکەن بەسەرۆك‌و ئاغای خۆیان ئەو گەلە سەر کەوتوو نابن! . (بوخاری‌و نەسائی‌و تیرمذی‌و ئیمامی ئەحمەد لەئەبو بەکرەوە گێڕاویانەتەوە) لەبەر ئەوەیش کەئافرەت شەرمگایە، ئەگەر ببێ بەپێشنوێژ بۆ پیاو دەبێ بەهۆی گرفتاری، وەکی تریش ئەگەر کەسێ پەیڕەوی (ئیقتیدا) بەژن بکا واتای وایە کەدەستە جڵەوی نوێژەکەیی داوە بەدەستی ئەوەوە. مەبەست لەخوێنەوار (لە بابەتی پێشنوێژیدا) ئەوەیە کەبەجوانی بتوانێ‌فاتیحە بخوێنێ، هەروا مەبەستیش لە نەخوێندەوار لێرەدا ئەوەیە کەفاتیحای ڕەوان نەبێ، جا پەیڕەویی خوێنەوار بەنەخوێنەوار دوو فەرمایشتی لە سەرە: هەرە ئاشکراکەیان ئەمەیە: ئەوە دروست نییە، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرمووێ: ئەوکەسە بەر نوێژیی بۆ کۆمەڵێ دەکا، کەلەهەموویان باشتر قورئان بخوێنێ، لەبەر ئەوەیش

جارو بار پێشنوێژ بەرپرسیار دەبێ لەقورئانخوێندنی پاشنوێژ، وەك ئەو شێوەیەکە پاشنوێژ لە چەمینەوەدا فریای پەیڕەویی بکەوێ، دیارە کە نەخوێندەوار، بەم واتایەی کەبۆمان دیاری کرد بەرگەی ئەوە ناگرێ‌و ناتوانێ ئەو بەر پرسیاری یە بگرێتە ئەستۆی خۆی، بەلاَم ئەگەر خوێنەوار لەنوێژی پەنامەکیدا پەیڕەویی بەنەخوێندەوار کرد، ئەوە نوێژەکەی دامەزراوەو پێویست ناکا لەحاڵی بکۆڵێتەوە، نەخوێندەواریش پەیڕەویی بەنەخوێندەوارێکی وەك خۆی بکادروستە، هەروا پەیڕەویی ژن بەژن دروستە*.

مەرجی دامەزراندنی پەیڕەویی کردن ئەوەیە کەئاگای لە چۆنێتی نوێژی بەرنوێژەکەی بێ، هەتا بتوانێ پەیڕەویی ئەو بکا، ئەو ئاگادارییەیش بەم شێوەیە دێتەدی: کە چاوی لە هەڵسوکەوتی پێشنوێژ بێ یا گوێی لەدەنگی بێ، یاگوێی لە دەنگی راگەیێین (مبلغ) بێ، یائاگای لە هەڵسان‌و دانیشتنی نوێژکەرەکان بێ، کە ئەوان ئاگایان لە حاڵی پێشنوێژە. مەرجێکی تری ئەوەیە: کە پاشنوێژ پێش نەکەوێ لە پێشنوێژ لە جێگە نوێژدا، چونکە وەك زانراوە ئەوانەی کە پەیڕەوییان بەپێغەمبەرەوە دەکرد لەنوێژدا لێی پێش نەدەکەوتن، هەروا ئەوانەیش کەلە دواجێنشینە راشیدەکانەوە نوێژیان دەکرد، بەلاَم ئەگەر هەردوو لا

---

* بەهێزترین بەڵگە لەسەر ئەوە کەژن بەرنوێژیی نەکا بۆ پیاو ئەوەیە: کە ذەکوان بەرنوێژیی دەکرد بۆ عائیشە، ئەگەر بەپێچەوانەوە دروست بوایە شتی واتە: لە عائیشە {رەزای خوای لێبێ} شاراوە نەدەبوو.

- وەرگێڕ -

له ئاستی یەك له شانی یەكدا وەستا بوون ئەوە زیانی نییه، بەلام باشیش نییه، وەكی تریش ئەم بڕیاره بۆ ئەوانە وایه كەئەڵقەیان نەدابێ بەگردی كابەدا، چونكه بۆ ئەوان، بۆ پاشنوێژ (بەمەرجێ لەلای پێشنوێژەوه نەبێ) زیانی نیه ئەگەر ئەو لەپێشنوێژ له رووگەوه نزیكتر بێ، بزانه سێ شێوه هەیه بۆ پێشنوێژو پاشنوێژ:

**شێوەی یەكەم:** هەردوو لایان لەناو مزگەوتدابن.

**شێوەی دووەم:** پێشنوێژ لەناو مزگەوتدا بێو پاشنوێژ له دەرەوەی.

**شێوەی سێیەم:** هەردوو لایان لەدەرەوەی مزگەوت بن.

**شێوەی یەكەم:** پەیڕەوی پێ كردن (اقتداء) دروسته، ئیتر خوا ریزەكان لەناو خۆیانا پەیوەست بن یا پچڕابن چونیەكه، هەروا ڕێگرو نێوان له نێوانیاندا هەبێ یانەبێ، هەروا چون یەكه هەردوولا لەیەك شوێندا بن یانا، بۆ نموونه: ئەگەر پێشنوێژ له منارەیەكا بێو پاشنوێژ لەبیرێكا بێ، یابه پێچەوانەوه، ئەوه له هەموو ئەم وێنه یانەدا پەیڕەوی پێ كردن دروسته، چونكه شوێنەكه مادەم مزگەوته گشتی بەیەك جێگه حلێبەو هەمووی بەنیازی نوێژ دروست كراوه.

**شێوەی دووەم:** ئەوەیه پێشنوێژ لەناو مزگەوتابێو پاشنوێژ لەدەرەوەی مزگەوت بێ، لەم شێوەیەدا پەیڕەوی پێ كردن بەم مەرجانه دروسته: نێوانیان لەنزیكەی سێ سەد باسك، بەباسكی ئادەمی كەبرێتیه له دووبست، زیاتر نەبێ، ئەم ئەندازەیه لەئاخری سنووری مزگەوتەكەوه حلێب دەكرێ: لەهەمان كاتدا پاشنوێژ ئاگای لەبزووتنەوەكانی پێشنوێژ هەبێ، وەك لەپێشەوه روون كرایەوه.

**شێوەی سێیەم:** ئەوەیە پێشنوێژ لە دەرەوەی مزگەوت بن، جا ئەگەر لە دەشتابوون، ئەوە مەرجی دامەزراندنی پەیڕەوی پێکردن ئەوەیە: ماوە (مەسافە)ی نێوانیان، لە نزیکەی سێ سەد باسك (ذیراع) پتر نەبێ، ئەمەیش لەسەر فەرمایشتی دامەزراوتر. چونکە راوەستان لەسەر ئەم شێوەیە لە دەشتا، بەپێی باوی ئاسایی، لە حوکمی کۆبوونەوەدایە، لەبەر ئەوەیش زۆربەی کات، لە ماوەی ئاوادا، دەنگی پێشنوێژ لەکاتی دەنگ هەڵبڕینی نوێژی ئاشکرادا، بە ئاسایی دەگاتە پاشنوێژ، بەلاّم ئەگەر لە دەشتا نەبوون، وەك ئەوە پێشنوێژ لە خانوو یەکابێ‌و پاشنوێژ لە خانوویەکی تردا بێ، ئەوە مەرجی دامەزراندنی پەیڕەوی پێکردن ئەوەیە: پەیوەست بن، هەتا پەیوەندی‌و ئاگابوون لەحاڵی پێشنوێژ هەبێ، چونکە لەکاتی وادا جیایی خانوو مایەی لەیەك جیابوونەوەی پێشنوێژو پاشنوێژە، لەبەر ئەوە پەیوەست بوون‌و نزیکی لە یەکتری بەمەرج دەگرین لەگەڵ نەبوونی ڕێگر (حائیل) چونکە ڕێگر کۆبوونەوە قەدەغە دەکا هەروا مەرجی دامەزراندنی پەیڕەوپێکردنە کشێوەو شێوازو دەستوری نوێژی هەردوولا چون یەك بن، ئەگەر وانەبوون‌و شێوازی نوێژەکانیان لە یەکتری جیابوو ئەوە پەیڕەویپێکردن دروست نیە، وەك نوێژی ئاسایی‌و نوێژی مانگ‌و ڕۆژ گیران‌و نوێژی تەرم. بەلاّم دروستە بۆ کەسێ کە نوێژی جازربکا پەیڕەوی بکا بە کەسێ کەنوێژ بگێڕێتەوە، یابەپێچەوانەوە، هەروا دروستە کەسێ فەرز بکا پەیڕەوی بکا بەکەسێ کەسوننەت بکا، یا کەسێ نوێژی نیوەڕۆ بکا پەیڕەوی بکا بەکەسێ کەنوێژی بەیانی بکا، دەق وەك نوێژی لێ پێش

کەوتوو (مەسبووق) لەپاش سلاودانەوەی پێشنوێژەکەی، مسبوق نوێژەکەی خۆی تەواو دەکا.

مەرجێکی تری دامەزراندنی پەیڕەوپێکردن ئەوەیە: کە نیەتی پاش نوێژ لەنیەتی پێشنوێژ دوابکەوێ، وەبە دوو بنییات (واتە بەدوو روکن) پێشی نەکەوێ، یاپاشی نەکەوێ، لەم دوو شێوەیەدا مەبەست لەم دوو بنیاتە بنیاتی کردەوەیی یە، لەکاتی پاش کەوتن دا ئەگەر مەهانەی رەوای هەبوو، وەك ئەوە ێشنوێژ، بەپەلە بوو، پاشنوێژیش خووی بەسستیەوە گرتبوو، ئەوە تاسێ بنیات چاوپۆشی دەکرێ، دەنا نوێژەکەی پووچە، لەهەمان کاتدا دەبی زانایش بی بەوە کەکاری وا نادروستە. چونکە بەراستی کاری وا بەوپەڕی سەرپێچی کردن دادەنرێ، بەلام بەپێچەوانەی ئەوەوە کەلەیادی نەبێ، یانەزانێ، بەلام هەرچۆن بێ ئەو رکاتەی بۆ حل ناکرێ، کە تیایدا لە پێشنوێژ پێش (یاپاش) کەوتووە، لەبەر ئەوە دەبێ لەدوا سلاودانەوەی پێشنوێژەکەی رکاتێ بکا.

سوننەتە نێرینە، ئەگەر هەر خۆی بوو، بامنالیش بێ، لەلای راستی پێشنوێژەوە رابوەستێ و، کەمێ لێی دوا بکەوێ، چونکە پێغەمبەر خۆی وایکردووە، ئێمەیش ئێستا بۆ پەیڕەوی ئەو وادەکەین، بەمەو وێنەی ئەمە دەگوترێ: (اتباع) هاوکات لەگەڵ ئەم بەڵگەیەدا شتی وا لەزاتی خۆیدا پەیڕەوی باوو نەریتی جوانی ناو کۆمەڵە. جا ئەگەر لەوەدوا نێرینەیەکی تر هات، لەلای چەپیەوە نوێژ دابەستێ، ئەوجا یاپێشنوێژ بچێتە پێشەوە، یا ئەوان بچنە دواوە، ئەمەیش لەکاتی راوەستانا دەکەن، ئەگەر لەسەرەتاوە دوو نێرینە بون لەپشتیەوە ببن بەیەك ڕیز، ئەگەر یەك ژن بوو لەپشتیەوە ببێ بەریزێ، ئەگەر ژن

زۆریش بوون هەروا، ئەگەر پیاوو منالّو ژن بوون لەسەر ئەم شێوەویە دەوەستن: لەپشتیەوە پیاوەکان ریز دەبەستن، چونکە سەروەوریی بۆ ئەوانە، ئەوجا منالّەکان لەپشت پیاوانەوە ریز دەبەستن، بەلاّم ئەمە کاتێ وایە کەریزی پیاوەکان پڕبووبێتەوەو کەمی نەبێ، دەنا بەمنالّ پڕ دەکرێتەوە، ئەوسا نێرومێ (خنثى) لەپاش ریزی منالاّنەوە رادەوەستن چونکە هەلّ دەگرن ژن بن، کەژنیش بن لەنوێژا جێگەیان وا لەدوا منالاّنەوە، ئەوجا ریزی ژنان، چونکە ئەمە بەپێی پەیڕەویی پێغەمبەر خۆیەتی {دروودی خوای لەسەربێ}و لەمەدا چاو لەحەزرەت دەکەین.

سوننەتە ئەو ژنەی کە پێشنوێژی بۆ ژنان دەکا لەناوەراستیاندا رابوەستێو کەمێك لێیان پێش بکەوێ، وەلێ ئەگەر پێشنوێژەکەیان ژن نەبوو، دەبێ پێشیان بکەوێ، ناباشە پاشنوێژ بەتەنها ڕاوەستێ، بەلّکوو ئەگەر لەریزدا شوێنی دەسەکەوت بڕواتە ریزەوە، ئەگینا لەپاشەوە نێتی نوێژ دابەستن بەجەماعەت بهێنێو ئەوسا یەکێ لەپاشنوێژەکان لەناو ریزەکەوە ڕابکێشێ بۆ لای خۆیو لەگەلّ ئەودا ببن بەڕیزێ. سوننەتە ئەو کەسەیش بەگوێ ی بکاتو نەرم بێ بەدەستیەوە.

دروستە دەسنوێژدار پەیڕەوی بکا بەتەیەمومکەرەوە، بەلاّم بەمەرجێ تەیەمموم کەرەکە کردنەوەی لەسەر نەبێ، دەنا دروست نییە، هەروا دروستە پەیڕەوی بکا بەکەسێ کەمەسحی خوففی کرد بێ، هەروا پەیڕەویکردنی راوەستاو بەدانیشتوو دروستە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە نەخۆشییەکەی سەرە مەرگیدا بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد، ئەبو بەکرو خەلّکەکەیش بەپێوە بوون، هەروا دروستە موسلّمانی دادپەروەر پەیڕەوی بکا بە ئازادی بەدکار (حوڕی فاسق) بەلاّم نوێژ لە

پشت فاسقەوە گەرچی دروستە بەڵام ناباشە. بەڵگەی دروستبوونی نوێژ لەپشت بەدکارەوە: شەیخان دەگێڕنەوە: کەئیبنو عومەر، ئەو هاوڕێ نازدارەی پێغەمبەر، لەپشت حەججاجی فاسقەوە نوێژی بەجەماعەت دەکرد. ئیمامی شافیعی {ڕەزای خوای لێبێ} سەبارەت بەحەججاج دەفەرموێ: پیاوی فاسقی شەرعی وەك حەججاج دەبێ!.

## ٧٢) کورتکردنەوەی نوێژی چوار رکاتی:

**بە زۆری سەفەر بۆ یەکێ لەم دوو مەبەستەیە:** یاهۆی رزگار بوونە لەناخۆشی، یامایەی گەیشتنە بەئاوات! سەفەریش (لەزاتی خۆیدا) رێگەی هاتو نەهاتەو زۆربەی کات دەبێ بەهۆی سەخڵەتیو زەحمەت، مشەقەتو زەحمەتیش دەبێ بەهۆی بارسووکیو کار ئاسان کردن، لەبەر ئەمە یاسادانەر (شارع) لەئیسلاما کە خوای گەورەیە، لەنوێژی چوار رکاتی، دوو رکاتی داشکاندووە. لە هەمان کاتدا قورئانو سوننەتو یەکگرتن بەڵگەن لەسەر ئەوە کەلە سەفەری رەوای درێژدا دروستە نوێژ کورت بکرێتەوە. لە قورئانا دەفەرموێ: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ – سورة النساء – ١٠١/٤} (واتە: کاتێ چوون بۆ سەفەر ئەگەر نوێژەکانتان کورت بکەنەوە. گوناهتان لە سەر نیە). کورت کردنەوەی نەبەستراوە بەکاتی ترسەوە، چونکە یەعلای کوڕی ئومەییە فەرمووی: گوتم بەعومەری کوڕی خەطاب {ڕەزای خوای لێبێ}: خودا لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ

اَن یَفْتِنَکُمُ الَّذِینَ کَفَرُواْ} ئەوەتا بەپێی ئەم ئایەتە کورتکردنەوە بەستراوە بەکاتی ترسەوە، خۆ ئێستا ترس نەماوە مەردوم هێمن بوونەتەوە، کەوابو چۆن دروستە بۆ ئێمە نوێژ کورت بکەینەوە؟ ئەویش فەرمووی: ئەمەی سەرنجی تۆی ڕاکێشاوە سەرنجی منیشی ڕاکێشاو منیش وەکوو تۆ لەمە سەرسام بووم، بەڵام کەلەمبارەیەوە لەپێغەمبەرم {درودی خوای لەسەربێ} پرسی، فەرمووی: ئەمە خەڵاتێکەو خودا بەخشیوێتی پێتان دەی ئێوەیش خەڵاتەکەی وەربگرن (موسلیم).

بەڵگەش لە سوننەتا لەسەر کورتکردنەوەی نوێژ وەك ئەوە ئیبنو مەسعوود {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لەپشتی پێغەمبەرەوە لەسەردەمی خوێدا لەسەفەردا نوێژی چوار رکاتیم بەدوو رکات کردووە، هەروا لەپشتی ئەبو بەکرو عومەریشەوە نوێژی چوار رکاتیمان کورت دەکردەوەو بەدوو رکات دەمانکرد، هەرکەسەیان لەکاتی جێنشینی خۆیانا (شەیخان). ئیبنو عەمەریش دەفەرموێ: بۆ خۆم لە خزمەت پێغەمبەرو ئەبو بەکرو عو مەردا سەفەرم کردووە، ئەم زاتانە لەکاتی سەفەردا نوێژی نیوەڕۆیان بە دوو رکات دەکرد، هەروا نوێژی عەصریشیان بە دوو رکات دەکر.

نوێژکورتکردنەوە هەر لە نوێژی چوار رکاتیدا دروستەو بەس لەبەر ئەوە نوێژی شێوانو بەیانی کورت ناکرێتەوە بەس نوێژی نیوەڕۆو عەصرو خەوتنان کورت دەکرێتەوە، هەر نوێژەیان بە دوو رکات دەکرێن.

# ٧٣) مەرجی سەفەرەكە:

**ئەو سەفەرەی نوێژكورتكردنەوەی تیادا رەوایە ئەم چەند مەرجەی هەیە:**

١) ئەوەیە سەفەرەكە رەوا بێو پێی گوناهبارنەبێ. وەك سەفەری حەجو دانەوەی قەرز، كە ئەم جۆرە سەفەرە لە زاتی خۆیاندا فەرزن، یا وەك سەفەری حەجی سوننەتو سەردان لە خزمو كەسوكار، كە ئەم جۆرە سەفەرانە لە زاتی خۆیاندا سوننەتن، یا وەك سەفەری بازرگانیو گەشتكردن، كە ئەم جۆرە سەفەرانەیش لە زاتی خۆیاندا رەوان، بەلام نەفەرزن، نە سوننەتن، نە ناباشن، یا وەك سەفەری تاكە كەس، كە بەبێ هاوڕێ سەفەر بكا ئەم جۆرە سەفەرانەیش لە زاتی خۆیانا ناباش (ومەكرووە)ن.

بەلام سەفەری گوناه هەقی كورتكردنەوەی نیە، چونكە كورتكردنەوە روخصەتو بارسووككردنە، رێگەیش بۆ گوناه خۆش ناكرێ، سەفەری گوناه وەك رێگریو دزیو جەردەییو هێنانو بردنی مەیو بادەو بەنگو تلیاك، سەفەری ژن بەبێ رێپێدانی مێردەكەیو سەفەری قەرزارێ كە توانای دانەوەی قەرزەكەی هەبێ بەبێ رێگەپێدانی خاوەن قەرزەكە، لە سەفەری گوناها رێبوار نەهەقی نوێژكوتكردنەوەی هەیە، نە هەقی كۆكردنەوەی هەیە، واتە: نە مافی قەصرو نە مافی جەمعی نیە. هەروا مافی ئەوەی نیە كە نوێژی سوننەت بە سواری بكا، یا تاسێ رۆژ لە سەفەردا لە دەسنوێژا مەسحی خوفف بكا، هەروا دروست نیە بۆی لە كاتی ناچاریدا مردار بخوا، سوفیانی ثەوری {رەحمەتی خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەگەر ستەمكارێ، لە بانێكابێ، نانو ئاوی لێ برابێ، ئەگەر

له برسانا بمریٚ، یا له توونیانا بخنکیٚ نابیٚ کەس نان‌و ئاوی بداتیٚ، هەتا ولاٚت‌و مەردوم‌و دارو درەخت‌و ئاژەلٚ له دەستی رزگاریان بیٚ[1].

٢) ئەوەیە سەفەرەکە دریٚژبیٚ، بە حسیٚبی کاروانی بریٚتییە لە دوو قۆناغی تەواو، واتە دوو رۆژە ریٚ، بە رۆیشتنی ئاسایی چونکە خۆشەویست {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: هەر سەفەریٚ لە چوار بەرید کەمتر بیٚ، نویٚژی تیا کورت ناکریٚتەوە، (چوار بەرید دەکاتە شانزە فرسەق) دەق بەقەد ماوەی نیٚوانی مەککەو عوسفان. وەك هەموو دەزانین عوسفان لە مککەوە دوو رۆژە ریٚ دوورە. ئەم ماوەیە بە کیلومەتر دەکاتە نزیکەی (٨٤) کیلومەتر، بزانە: دەبیٚ ریٚبوار بزانیٚ کە بۆ شویٚنیٚ دەچیٚ لە دوو قۆناغ کەمتر نیە، کەواتە: بۆ کەسیٚ سەری خۆی هەلٚبگریٚ‌و بەبیٚ نیازی شویٚنیٚکی دیاری بسووریٚتەوە بەناو ولاٚتا، مافی نویٚژکورتکردنەوەی نیە، هەتا سەفەرکەی زۆریش دەریٚژە بکیٚشیٚ.

٣) ئەوەیە ئەو نویٚژەی کە دەیکا نویٚژی چوار رکاتی حازربیٚ، هەر نویٚژیٚ وانەبیٚ کورت ناکریٚتەوە، نویٚژی قەزایش ئەم دریٚژەپیٚدانەی تیادایە: ئەگەر نویٚژەکە لە مالٚەوە فەوتا بوو بەلاٚم ویستی لە سەفەردا

---

[1] ئەگەر ئەم کوردستانە نازدارەی خۆمان، کە دەتگوت: پارچەیەکی رازاوەیە لەسەر زەمینی بەهەشتی بەرین، ئیٚستا لەم بارو دۆخی پاشاگەردانی‌و گوشت‌و برەدا، تەماشا بکەی، کە چۆن بەدەست دزو جەردەو ستەمکارەوە بووە بە گۆمی خویٚن‌و بووە بە پارەرچەییٚ ئاگر لە دۆزەخی سوور،، ئەو کاتە رەحمەت بۆ گۆری سوفیانی پەهـ وری دەنیٚری.

- وەرگیٚر -

بیگێڕێتەوە، پێویستە لەسەری کە بە تەواوی بیکا، چونکە ئەو نوێژە بە تەواوی بووە بەماڵ لەسەری، بەڵام ئەگەر لە سەفەردا چوو بوو، وە هەر لە سەفەردا ویستی بیگێڕێتەوە ئەوە بۆی هەیە کە کورتی بکاتەوە، ئەگەر لە ماڵەوە ویستی بیگێڕێتەوە دەبی بە تەواوی بیکا. ئەگەر گومانی بوو نەیدەزانی: ئایا لە ماڵەوە ئەو نوێژەی چووە یا لە سەفەردا، ئەوە دەبێ بە تەواوی بیکا، چونکە تەواوکردن بنەڕەتە (واتە: ئەسڵە) بزانن کە کورتکردنەوە پێنج مەرجی هەیە:

**یەکەم**: نییەتە، چونکە تەواوکردن بنەڕەتە، جا ئەگەر لە سەرەتاوە لەکاتی نوێژدابەستندا نییەتی کوتکردنەوەی نەبێ، نوێژەکەی لەسەر بنەڕەت دادەمەزرێ، کە تەواو کردنە.

**دووەم**: دەبێ ڕێبوار لە دەستپێکردنی نوێژەکەوە هەتا تەواوکردنی ڕەفتەنی بێ، چونکە یەزدانی مەزن دەفەرموێ: (اذا ضربتم في الارض) واتە: هەر کاتێ چوون بۆ سەفەر، دەی ئەگەر لە سەفەردا نەبێ مافی کورتکردنەوەی نیە.

**سێیەم**: دەبێ نوێژکەر ئاگاداربێ لە چۆنێتی کورت کردنەوەی نوێژ، ئەگینا مافی ئەوەی نیە، یەزدانی مەزن دەفەرموێ: {فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ – سورة النحل – ٤٣/١٦} واتە: ئەگەر خۆتان شتێکتان نەدەزانی لە زانست پەروەرو ماموّستایانی پسپۆڕی زانست بپرسن، لەهەر گرۆهێ ببن).

**چوارەم**: پەیڕەوی بە نیشتەجێ ناکا، یا بە نوێژکەری تەواو کەرناکا، ئەگەر پەیڕەوی پێبکا دەبێ نوێژەکەی بە تەواوی بکا، چونکە

شوێنکەوتن (متابعە)ی پێشنوێژ پێویستە. لەم بارەیەوە، ئەوە ئەم پرسیارە لە ئیبنو عەبباس کرا: ئەوە بۆ ڕێبوار ئەگەر بە تەنها خۆی نوێژبکا نوێژی چوار ڕکاتی بە دوو ڕکات دەکا، کەچی ئەگەر بە جەماعەت لە پشت پێشنوێژێکی نیشتەجێوە نوێژبکا دەبێ چوار ڕکات بکا؟ فەرمووی: لەبەر ئەوە نوێژکردن بەم دوو شێوەیە لەم دوو کاتەدا سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی. (ئەحمەد)

**پێنجەم**: نوێژە کوتکراوەکە دەبێ چوار ڕکاتیبێ، دەنا کورت ناکرێتەوە، وەك بەیانیو شێوان، چونکە شتی وا کە نوێژی سێ ڕکاتیو دوو ڕکاتی کورت بکرێنەوە ساخ نەبۆتەوە.

## ٧٤) کەی ڕێبوار دەست دەکا بە کورتکردنەوە:

سەرەتای سەفەر لەوێوە دەست پێدەکا کە ڕێبوار لە ئاوەدانی ئەو شوێنەی کە سەفەری لێوە دەکا تێدەپەڕێ. ئیبنو لونذیر دەفەرموێ: بەپێی ئاگاداری من پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): لەهەر سەفەرێکا نوێژی کورت کردبێتەوە هەتا لە سنووری شاری مەدینە نەچووبێتە دەرەوە دەستی نەکردووە بە کورتکردنەوە، هەتا سەفەرەکەی تەواو دەبێ مافی کورتکردنەوەی هەیە، بەلام ئەگەر لە شوێنێ مایەوە لەبەر کارێ کە چاوە نواڕی بوو، تاماوەی چوار ڕۆژ نوێژ کورت دەکاتەوە، لەدوا ئەوە ئەگەر لەوێ مایەوە دەبێ نوێژی تەواوبکا، خوا کارەکەی جێبەجێ بووبێ یا نە بەبووبێ، چونکە لە صەحیحەیندا هەیە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە بەیانی ڕۆژی چوارەمی مانگی قوربانـدا گەیشتە

مەککە، ڕۆژی چوارەمو پێنجەمو شەشەمو حەوتەم لەوێ مایەوە، لەو ماوەیەدا کە چوار ڕۆژ دەکا، نوێژی کورت دەکردەوە، لە ڕۆژی هەستەما نوێژی بەیانی لەوێ کرد، ئەوجا بەرەو مینا کەوتەڕێ! جا لەسەر ئەم بنیاتە ڕێبوار لەکاتی مانەوەدا لە جێگەیێ هەتا چوار ڕۆژ بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە، لە فەرمایشتێ لە فەرمایشتەکانی شافیعی لەم مەسەلەیەدا: بۆی هەیە هەتا نۆزدە ڕۆژ، یا هەژدە ڕۆژ نوێژ کورت بکاتەوە، بەپێی ئەم فەرمایشتە کەوا لە صەحیحی بوخاریدا: ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوایان لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە شاری مەککەی ئازاد کرد نۆزدە شەو لەوێ مایەوە، لەومانەوەیەدا نوێژی کورت دەکردەوە. واتە نێژە چوارینەکانی دەکرد بە دوو ڕکات. جا لەبەر ئەمە ئێمەیش هەرکاتێ چووین بۆ سەفەر هەتا نۆزدەشەو لە شوێنێ دەمێنینەوە، هەر هەقمان هەیە کە نوێژ کورت بکەینەوە، بەڵام ئەگەر لە شوێنی لە ئەوەندە پترماینەوە ئیتر نوێژی تەواو دەکەین. لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە مەککە هەژدە ڕۆژمایەوە، لە ڕۆژی غەزای فەتحی مەککەوە.

## ٧٥) کۆکردنەوەی دوو نوێژ:

بۆ ڕێبوار دروستە کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەصر، وە شێوانو خەوتنان، ئەگەر لەکاتی نوێژی یەکەما بیانکا پێی دەگوترێ: جەمعە تەقدیم، واتە کۆکردنەوەی پێشخراو، ئەگەر لەکاتی نوێژی دووەما بیانکا پێی دەگوترێ: جەمعە تەئخیر، واتە: کۆکردنەوەی

دواخـراو. سـەر بەڵگـەی ئەمـە ئەوەیـە کـە موعـاذی کـوڕی جەبـەل دەیگێرێتەوە: فەرمووی: لە غەزای تەبووکدا عادەتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو: ئەگەر لە پێش ئەوەدا کە بکەوێتەڕێ‌و دەرچێ بۆ سـەفەر خـۆرلای بدایـەو نیـوەڕۆ ببوایـە ئـەوا نوێـژی نیـوەڕۆو عەسـری کۆدەکردەوەو بـە جەمعەتەقـدیم: بـە کۆکردنـەوەی پێشخراو دەیکـردن، ئەگـەر لـە پـێش نیوەڕۆشـدا بکەوتایەتـە ڕێ ئـەوا نوێـژی نیـوەڕۆی دوا دەخست، هەتا دادەبەزی بۆ نوێـژی عەصر، ئەوکاتـە هـەردوو نوێژەکـەی پێکەوە بە کۆکردنەوەی دواخراو دەکرد، لە شێوانیشا هەروەها: ئەگەر لە پـاش ئـاوابوونی خـۆر بکەوتایەتـە ڕێ نوێـژی شـێوان‌و خـەوتنانی کـۆ دەکـردەوە، واتـە: نوێـژی خـەوتنانی دەهێنـا بـۆ لای شـێوان‌و لـە پێـشدا نوێژی شێوانی دەکردو سڵاوی دەدایەوەو دوا بەدوای ئەو بەبێ درنـگ بـە جەمع نوێژی خەوتنانیشی دەکرد، ئەگـەر لـە پـێش ئـاوابوونی خۆریـشدا بکەوتایەتـە ڕێ نوێـژی شـێوانی دوا دەخـست، هـەتا دادەبـەزی بـۆ نوێـژی خەوتنان، ئەوکاتە هەردوو نوێژەکەی بە کۆکردنەوە (بە جـەمع) دەکـرد، لە پێشا شێوان دوا بە دوای ئەو خەوتنانی دەکرد کۆکردنـەوەی پێـشخراو سێ مەرجی هەیە:

**یەکـەم**: ئەوەیـە نوێـژی یەکـەم لـە پـێش دووەمـدا دەکـرێ، واتـە: نێـوەڕۆ لـە پـێش عەصـرو شـێوان لـە پـێش خەوتنانـدا دەکـرێ، چـونکە کاتەکە هی یەکەمە، دووەم پاشکۆی ئەوە، پاشکۆیش پێش پێشکۆی خـۆی ناکەوێ.

**دووەم**: دەبـێ لـە سارەتای کردنـی نوێـژی یەکەمـەوە، یـا لـە پـێش تەواوبوونیدا نییەتی کۆکردنەوەی هەردوو نوێژەکەی ببێ.

**سێیەم:** ئەو دوو نوێژە یەك لە دوای یەك بکاو بەینیان زۆر نەخا، چونکە دووەمیان پاشکۆی یەکەمیان، پاشکۆیش نابێ لە پێشکۆی خۆی داببڕێ، لەبەر ئەوە نوێژە سوننەتە دامەزراوەکان لە نێوانیاندا ناکرێن، بەڵام لە نێوانیاندا سوننەتە ئیقامە بکرێ، چونکە ساخ بۆتەوە کە لەنەمیرە، لەکاتی حەجی ماڵاواییدا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژی نیوەڕۆو عەصری بە جەمع کردووەو لە نێوانیاندا بە فەرمانی ئەو قامەت کراوە.

وەڵێ کۆکردنەوەی دواخراو تەنیا ئەوەندە مەرجە کە لەکاتی یەکەما نێتی داوخستن بێنێ. بۆ نیشتەجێ دروستە لەبەر بارشت لەکاتی نوێژی یەکەما، نوێژی نیوەڕۆو عەصر، یا شێوان‌و خەوتنان بە جەمع بکا، چونکە زەحمەتە، لەبەر ئەوەیش کە بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە: ئیبنو عەبباس {رەزای خوا لە خۆی‌و لە باوکی} دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} لە مەدینە، نیوەڕۆو عەصری بە جەمعکرد، بە حەوت رکات کردنی، لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە مەدینە نوێژی بە جەمعکرد، نەترسی هێرشی دوژمنی هەبوو، نە لە سەفەریشدا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەو مەرجانەی بۆ کۆکردنەوەی پێشخراو هەیە لە سەفەردا، ئەمانەیش مەرجە: لە سەرەتای هەردوو نوێژەکەو لەکاتی سڵاودانەوەی نوێژی یەکەمدا باران بباری. وە نوێژەکە لە شوێنێ بکرێ ئەگەر گریمان بچێتەوە بۆی باران لێی بداو جلەکانی تەڕ ببن.

کۆمەڵێ لە هاوڕێیانی شافیعی‌و لە کەسانی تریش دەفەرموون: بەهۆی نەخۆشیشەوە کۆکردنەوە، دروستە. هەندێ لەم زاتانە ئەم زانا

گەورانەن: قازی حوسەین‌و موتەوەللی‌و رەویانی‌و خەتابی‌و ئیمامی ئەحمەدو چەند کەسێکی تریش لە شوێنکەوتووەکانی، ئینو عەبباس خۆی ئەمە دەکا، بەڵام پیاوێ رەخنەی لێدەگرێ، ئیبنو عەبباس پێی دەفەرموێ: کابرای بێ دایك! تۆ من فێری سوننەت‌و شەریعەتی پێغەمبەر دەکەی! ئەوجا ئیبنو عەبباس باسی ئەوە دەکا کە پێغەمبەر خۆی ئەمەی کردووە. ئیبنو شەقیق دەفەرموێ: دڵم لەم مەسەلەیە چەکەرەی دەکرد، بۆیە چوومە خزمەت ئەبو هورەیرە، بۆ ئەم باسە لێم پرسی، فەرمایشتەکەی ئیبنو عەبباسی بە راست دانا، ئەم داستانەی ئیبنو عەبباس‌و کاباری تەمیمی رەخنەگرو پرسیارکردنەکەی ئیبنو شەقیق، هەمووی لە صەحیحی موسلیمدا تۆمارە. نەوەویش (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: بڕیاری کردنی جەمعی نوێژ لەبەر نەخۆشی، فەرمایشتێکی راشکاوی لە رووی پەسەندە، چونکە لە صەحیحی موسلیمدا تۆمارکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە مەدینە بەبێ مەهانەی رەوا، وەك ترسی هێرشی دوژمن‌و باران، نوێژی بە کۆکردنەوە کردووە، ئیسنانی دەفەرموێ: ئەمەی کە نەوەوی پەسەندی کردووە، شافیعی لە (موختەصەرو لوزەنی)دا بەدەق دەیفەرموێ. مەبەست‌و ناوەرۆکیش پشتگیری ئەوە دەکا، چونکە نەخۆشی دەبێ بەهۆی دروستبوونی نەگرتنی رۆژووی فەرز، دەق وەك سەفەرەکە دەبێ بەهۆی دروستبوونی نەگرتنی رۆژووی فەرز، کەواتە: دەبێ نەخۆشی باشتر ببێ بەهۆی کۆکردنەوەی نوێژ، بەڵکوو کۆمەڵێ لە زاناکان بۆ ئەوە چوون کە دروستە بۆ نیشتەجێ، لەبەر پێداویستی، نوێژ بە جەمع بکا، بەمەرجێ نەیکا نەپیشە. ئەمە فەرمایشتی ئەبو ئیسحاقی مروزییە لە قەففالەوە

راگوێزی کردووه، خەتابی لە دەم کۆمەڵێ لە دەستەی فەرموودەوە، دەگێڕێتەوە، ئیبنو لومنذیر بە پەسەندی دادەنێ، ئەمە فەرمایشتی ئەشهەبیشە کە لە هاورێیانی مالیکە، هەروا قسەی ئیبنو سیرینیشە، فەرمایشتەکەی ئیبنو عەبباسیش دەبێ بە نیشانە بۆی کە دەفەرموێ: مەبەستی پێغەمبەر لەو جۆرە جەمعە ئەوەبوو کە ئوممەتەکەی تووشی مەشەققەت نەکا. چونکە ئەوەبوو کە فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆو عەصری پێکەوە کۆکردەوەو شێوان و خەوتنانیشی پێکەوە کۆکردەوە، بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا، وەك ترس و باران، سەعیدی کوڕی جوبەیر لێی پرسی: قوربان! دەبێ لە بەرچی وای کردبێ؟ فەرمووی: هەتا نەتەوەکەی تووشی سەخڵەتی نەکا (نەتەوە: واتە: ئوممەت — وەرگێڕ).

ئەوەتا ئیبنو عەبباس پاساوی ئەم کارەی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} بەوە ناداتەوە کە گوایە نەخۆشبووە، یا بەشتێکی تری ئاوا.

## ٧٦) گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو:

نەکردنی نوێژ یا لەبەر بەهانەی ڕەوایە، یا بەبێ بەهانەیە دیارە هەرکەسێ، بە قەستی، بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا، نوێژ نەکا، ئەوە لە خوا یاخی دەبێ، وەخۆی تووشی گوناهێکی گەورە دەکا، لەو گوناهەگەورانە کە دەبن بە مایەی ڕەنجەڕۆیی! پێویستە لەسەری زۆر بە زوویی پەشیمان ببێتەوە، لەسەر دەستی خوادا تەوبە بکا، وەبەبێ دواخستن دەسبەجێ ئەو نوێژە چواوە بگێڕێتەوە، جا ئەگەر ئەوەی کرد ئەوا

ئـەرکی سەرشـانی خـۆی بـەجێ هێنـاوە، دەنـا پێویـستە لەسـەر مـیری موسوڵمانان شەڕی لەگەڵ بکا، بەپێی فەرمایشتی خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} کـە دەفـەرموێ: خـودای گـەورە فـەرمانی بـەمن کـردووە کـە شـەڕ بکەم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا هەتا شایەتمان دێنن‌و بە زمـان ئیعلانـی ئیمـان دەکەن‌و دەڵێن (لا الـه الا الله) وە دوا ئـەوە نوێـژێکی ڕێکوپێـك دەکـەن‌و بەپێی توانـا زەکـات دەدەن‌و حـەجی مـاڵی خـوا دەکـەن‌و مـانگی ڕەمـەزان بەڕۆژوو دەبن، ئیتر ئەو کەسـەی ئەمـە بکـا، سـەروماڵی خـۆی لـە هـەموو کەسێ قەدەغە دەکـاو، گیان‌وسامان‌و نامووسـی لـە هـەموو کەسـێ حـەرام دەبێ، مەگەر بـەپێی شـەرعی خـوا! جا لەسـەر ئـەم بنیاتـە نوێـژ نەکـەر ئەگەر پەشیمان بووەوەودڵی داهێنا، ئەوا پێویـستە لـە سـەرمان وازی لـێ بهێنین، چونکە یەزدانی مەزن دەفەرموێ: {فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ – سورة التوبة – ٥/٩} واتـە: تەوبـەیان کـردو نوێـژێکی ڕێکوپێکیـان کـردو بـەپێی توانـا زەکاتیانـدا، ئـیتر وازیـان لێبهێـنن‌و بیانوویـان پـێ مـەگرن. بـەڵام ئەگـەر هەرسـوور بـوو لەسـەر نوێژنەکردن ئەوە سوور دەکوژرێ!.

ئەگەر نەکردنی نوێژ لەبەر مەهانەیێ بوو، وەك خەو، یا بەهەڵە، یا لە بیری چوو، ئەوە گوناهی لەسە نیە، بەڵام پێویستە لەسەری لـەوەدوا بیگێڕێتەوە، هەنـدێ دەڵێن: نوێـژی وا ئەدایـە، دەبـێ نییـەتی ئـەدای لـێ بهێنـرێ، کاتەکەیـشی ئـەو کاتەیـە کـە مەهانەکـەی نـەمێنێ، چـونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفـەرموێ: هەرکەسـێ بـەهۆی خەوتنـەوە نوێژێکی لەکاتی ئاسایی خۆیدا نەرکد، یا بـەهۆی لەبیرچوونەوە، کـاتی کردنی ئەو نوێژە ئەو کاتەیە کە بیری دەکەوێتەوە).

سوننەتە نوێژە چووەکان لەسەر ریزو تەرتیبی خۆیان بکرێن، هەروا سوننەتە نوێژی فەوتاو لە پێش نوێژی حازرەوە بکری، بە مەرجێ بۆ نوێژە حازرەکە ئەوەندە کاتی خۆی بمێنێ کە بەشی یەك رکاتی بە ئەدا بکا. جا کاتێ دەستی کرد بە گێڕانەوەی نوێژێ، ئەگەر تەماشای کرد ئەگەر تەواوی بکا نوێژە حازرەکەی دەفەوتێ یا بەلایەنی کەمەوە فریای رکاتێکی لە کاتی خۆیدا ناکەوێ، ئەوە دەبێ یا بیبڕێ، یا بیکا بە سوننەتو یەکسەر نوێژە فەرزەکەی بکا (تەماشای نامیلکەی — حکم تارك الصلاة — بکە کەھی دانەر خۆیەتی).

## ٧٧) نوێژی هەینی (صلاة الجمعة):

نوێژی هەینی بە عەرەبی پێی دەگوترێ جومعە، جومعەیش واتە: کۆبوونەوە، جا لەبەر ئەوەی کە مەردوم لەم نوێژەدا کۆدەبنەوە ناونراوە جومعە. یا لەبەر ئەوە ناونراوە جومعە چونکە لە رۆژی هەینیدا خێرێکی زۆر کۆدەبێتەوە. ئەم نوێژە گەورەترینی هەموو نوێژەکانە، رۆژەکەیشی لە هەموو رۆژەکانی تری حەفتە گەورەترە، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: رۆژی هەینی گەورەترین رۆژە کە هەتاوی تیا هەڵدێ، ئادەم لە رۆژی هەینیدا خودا دروستی کردووە، هەر لەم رۆژەیشدا براوەتە ناو بەهەشت، هەر لەم رۆژەیشدا لە بەهەشت دەرکراوە، قیامەتیش هەر لە رۆژی هەینیدا هەڵ دەستێ! (موسلیمو ئەبو داوود نەسائیو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە {رەحمەتی خوای لێبێ} .

## ٧٨) نوێژی جومعه، سوننه‌ته یافه‌رزه؟:

نوێـژی هـه‌ینی بـه‌پێی نامـه‌ی خـوداو سـوننه‌تی پێغه‌مبـه‌رو یـه‌ككگرتنی نـه‌توه (ئوممـه‌ت) فـه‌رزه. یـه‌زدانی مـه‌زن فه‌رموویـه‌تی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ – سورة الجمعة – ٩/٦٢}. خۆشه‌ویستیش {درووده‌ی خوای له‌سه‌ربێ} ده‌فه‌رموێ: به‌و كه‌سه كه گیانی منی بۆ ده‌سه نیازم هه‌بوو كه به پیاوێ بڵێم له جیاتی خۆم به‌رنوێژییكه بۆ خه‌ڵكه‌كه بكا، وه خۆشم برۆم به سه‌ر ئه‌و پیاوانه‌ی كه له نوێژی جه‌ماعه‌ت دواده‌كه‌ون، وه فه‌رمان بده‌م كه به باوه‌شه‌دار ماڵه‌كانیان به سه‌ریاندا بسووتێنن (ش/ د/ ت/ ن/). له گێڕانه‌وه‌یه‌كی صه‌حیحی موسلیمدا: پێغه‌مبـه‌ری خـوا هه‌ڕه‌شه‌ی له‌وانه كرد كه له نوێژی هه‌ینی دوا ده‌كه‌ون‌و نایكه‌ن‌و له باره‌یانه‌وه فه‌رمووی: به‌وكه‌سه كه گیانی منی به‌ده‌سه نیازم هه‌بوو كه به پیاوێ بڵێم له جیاتی خۆم پێشنوێژییه‌كه بۆ خه‌ڵكه‌كه بكا، وه خۆشم برۆم بۆ سه‌ر ئه‌و پیاوانه‌ی كه له نوێژی هه‌ینی دواده‌كه‌ون‌و ماڵه‌كانیان به‌سه‌ریاندا بسووتێنم. له گێڕانه‌وه‌یه‌كدا: حه‌زره‌ت {درووده‌ی خوای له‌سه‌ربێ} ده‌فه‌رموێ: ئه‌و كه‌سانه‌ی كه نوێژی هه‌ینی ناكه‌ن، یا ده‌بێ واز بێنن له‌م كاره ناپه‌سه‌نده، یاخود خودا دڵیان مۆر ده‌كا، ئینجا به‌ره‌به‌ره بێ ئاگاو نابه‌ڵه‌د ده‌بن له دین‌و له رێگه‌ی ره‌هبه‌ر دوورده‌كه‌ونه‌وه، ورده‌ورده ئه‌م كاره‌یان سه‌ر ده‌كێشێ بۆ كوفرو بێدینی. (موسلیم‌و كه‌سانی تر) له گێڕانه‌وه‌یه‌كدا: نوێژی هه‌ینی له‌سه‌ر هه‌موو نێرینه‌یه‌كی ره‌سیده فه‌رزو پێویسته. (نه‌سائی به‌ڕشته‌یه‌كی دروست گێڕاویه‌ته‌وه). له حه‌دیسی شه‌ریفدا ده‌فه‌رموێ: ئه‌وه‌ی له‌به‌ر كه‌مته‌رخه‌می سێ نوێژی

هەینی نەکا خودا مۆر دەنێ بەسەر دڵیدا. (ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی گێڕاویانەتەوە. رشتەی نەسائی دروستە، چونکە بەپێی مەرجی موسلیمە. رشتەی ئەبو داوودو تیرمیذیش جوانە).

**ئیبنو لمونزیر دەگێڕێتەوە:** کە یەکگرتن هەیە لەسەر ئەوە کە نوێژی هەینی لەسەر هەموو کەسێ فەرزە، واتە: فەرزی عەینە. ئیبنو عومەریش دەفەرموێ: نوێژی هەینی بە یەکگرتنی نەتەوە فەرزە. واتە: ئیجماعی لەسەرە.

## ٧٩) مەرجەکانی پێویستبوونی:

**مەرجەکانی پێویستبوونی نوێژی هەینی حەوت شتە :-**

**یەکەم ئیسلامە**، وەك لەنامەی نوێژا لە پێشەوە روون کرایەوە.

**دووەمو سێیەمو چوارەمو پێنجەمو شەشەم:** ئازادیو رەسیدەبوونو نێرینەییو هۆش ساغیو لەش ساغی. چونکە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوێژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، ئەم چوار کەسەی لێ دەرچێ: بەندەی زەرخرِیدەو ژنو منداڵو نەخۆش. (ئەبوو داوود گێڕاویەتەوە) جا شێت هەینی لەسەر نیە، چونکە داوا لێکردن (تەکلیف)ی لەسەر نیە، لەبەر ئەوە بە پێوەری نەخۆشی دەپێورێ رووتیو ترس لە ستەمکارو دەستوپێوەندیو سك چوونو رەوانیەکی وا خۆی پێ رانەگیرێ، مەهانەی رەوای نەچوونن بۆ نوێژی هەینی، هەروەها کەسێکیش کە مەترسی ئەوەی هەبوو کە مردووەکە بتەقێ، یا بۆگەن بکا، هەتا ئەو لە هەینی دێتەوە، ئەوە دەبێ

به مەهانه بۆ نەچوونی بۆ ئەو هەنییه، یا دەستوبرد لە تەدارەککردن و ناشتنی ئەو مردووه بکا.

**حەوتەم:** نیشتەجێییە، کەواتە: هەینی لەسەر ڕێبوار پێویست نیە، چونکە نەبیستراوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە سەفەردا نوێژی هەینی کردبێ، دەگێڕنەوە کە گوتراوە: نوێژی هەینی لەسەر ڕێبوار نیە. (بەیهەقی گێڕاویەتەوە، بەڵام بەمەوقووفی لەسەر ئیبنو عومەر).

## ٨٠) مەرجەکانی دامەزراندنی:

سەرەرای ئەو مەرجانەی کە بۆ دامەزراندنی نوێژ دانراوە، وەك لە پێشەوە رابورد، بۆ دامەزراندنی هەینی ئەم سێ شتەیش مەرجە:

**یەکەم:** ئەوەیە ئەو نوێژی هەینییە لەناو سنووری ئەو شوێنەدابێ، کە نیشتەجێ بێ (واتە: مەحەلی ئیقامەبێ) بۆ ئەو ژمارە نیشتەجێیانە کە لەو شوێنەدا ئەو هەنییە دەکەن، خوا ئەو شوێنە شاربێ، یا گوندبێ، یا کەپرو ساباتێکی وابێ کرابێ بە نیشتمان، ئیتر ماڵەکان لە قوڕو بەردبن یا لە دراو شتی وابن چونیەکە، بەڵگەی ئەم بۆچوونەیش ئەوەیە: کە نەبیستراوە لە سەردەمی پێغەمبەرو جێنشینە هەقناساکاندا، کە نوێژی هەینی لە غەیری ئەم جۆرە جێگایانەدا بکرێ.

**دووەم:** ئەوەیە کە بە جەماعەت بکرێ، چونکە نەبیستراوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) یا جێنشینە هەقناسەکان، یا هیچ زاناو پێشەوایەکی تر لە پاش ئەوان، نوێژی هەنییان بە تەنها کردبێ، بەبێ جەماعەت. لە بابەت ژمارەیێ کە جەماعەتی پێ دامەزرێ مەجەماتی

پێ دادەمەزرێ چەند فەرمایشتێ گوتراوە: هەندێ دەڵێن: بە پێشنوێژەوە بە چوار کەس دادەمەزرێ، هەندێ تر دەڵێن: بەسێ کەسیش دادەمەزرێ، هەندێ تر دەڵێن: ژمارەیەکی وا حلێبە، کە ئەو شوێنەی لێی بن ببێ بە گوند، وە بتوانن لەوێ نیشتەجێ بن، وە سەوداو مامەڵەو کڕینو فرۆشتن لە نێوانیاندا هەبێ!.

بەڵام ڕێبازی تەواو ڕاستی ناودار ئەوەیە: دەبێ ژمارەیان بگاتە چل کەس، لەسەر ئەم رایە، چەند فەرمووەدەیێ کراوە بە بەلگە یەکێکیان: فەرمووەدەکەی جابیرە {ڕەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: سوننەت لەسەر ئەوە سەری گرتووە کە هەر کۆمەڵێ، لە شوێنێکا، ژمارەیان بگاتە چل کەس، یا زیاتر، ئیتر نوێژی هەینییان لەسەرە! (بەیهەقی)، فەرمایشتی هاوڕێی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە بفەرموێ: سوننەت لەسەر ئەوە سەری گرتووە، وەك فەرمایشتی پێغەمبەر خۆی وایە. یەکێکی تریشیان: فەرمووەدەکەی کەعبی کوڕی مالیکە، دەفەرموێ: ئەسعەدی کوڕی زورارە یەکەم کەس بوو کە نوێژی هەینیی بۆ دەکردین، لە گوندی هەزمولنەبیت، لە هەواری بەنی بەیاضە، لە نەقیعولخەضیمات، کە ناوی شوێنێکە دەوری میلێ دوورە لە مەدینەوە. ئەورەحمانی کوڕی پێی فەرموو: چەن کەس دەبوون؟ فەرمووی: چل کەس بووین. (ئەم فەرمووەدەیە ئیبنو حەببانو بەیهەقی بە فەرمووەدەیەکی دروستو ساخیان داناوە). یەکێکی تریشیان کە ئەوەیە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە شاری مەدینە نوێژی هەینی دەکرد، نەبیستراوە کە بە چل کەس کەمتر هەینی کردبێ!. مەرجە ئەو چل کەسە نوێژی هەینییان لەسەربێو داوالێکراوبن بەپێی شەرع کە بیکەن.

**سێیەم:** ئەوەیە کە لەوەختی ئەدادا بکرێ، کە بریتییە لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ، چونکە ئەنەس {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: دەستووری پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو ئەو کاتە نوێژی هەینی دەکر، کە خۆر لە ناوەراستی ئاسمان لای دەدا. (بوخاری). موسلیمیش {ڕەحمەتی خوای لێبێ} لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە {ڕەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: جاران لەگەڵ پێغەمبەردا {دروودی خوای لەسەربێ} ئەوکاتە نوێژی هەینیمان دەکرد، کە خۆر لە ناوەراستی ئاسمان لادەدا.

جا ئەگەر کات ئەوەندەی نەمابوو کە نوێژی هەینی تیادا بکەن، نوێژی نیوەڕۆ دەکەن، تەنانەت ئەگەر گومانی ئەوەیان بۆ پەیدابوو، کە کاتەکەی بەسەرچووە دەبێ نوێژی نیوەڕۆ بکەن، چونکە مانیی کاتەکە مەرجی دامەزرانیەتی، لەبەر ئەوە گەرەکە سووربزانێ کە کاتەکەی ماوە، گومانی مانی بەس نیە.

## ٨١) فەرزەکانی نوێژی هەینی:

**هەینی سێ فەرزی هەیە :-**

**یەکەم:** ئەوەیە: کە دوو وتار لە پێشیەوە بخوێنرێتەوە، وتارخوێن لە نێوانیاندا دەبێ دابنیشێ لە صەحیحی موسلیما لە جابیری کوڕی سەموورەوە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەستووری وابوو دوو وتاری دەخوێندەوە، لە نێوانیاندا دادەنیشت، بەپێشەوە وتارەکانی دەخوێندەوە. لە گێڕانەوەیەکا: دەستووری خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو: دوو وتاری دەخوێندەوە، قورئانی دەخوێندو ئامۆژگای خەڵکەکەی دەکرد.

روکـن‌و بنیاتـەکانی ئـەم دوو وتارانـە پێـنجن: حەمـدی خـواو صەڵاواتدان لەسەر حەزرەتی پێغەمبەرو پەنـدو ئامۆژگای خەڵکەکە کە لە خوای گەورە بترسـن، بـەپێی پـەیڕەویی حـەزرەت لـەم بنیاتانـەدا، لـە وتاری دووەمدا دەبێ نزا بـۆ موسوڵمانان بکا، بەلایـەنی کەمـەوە ئایـەتێ کە مەبەسـت بـدا بـە دەسـتەوە بخوێنـێ، کەواتـە (ثـم نظـر) بـەس نیـە، چـونکە مەبەسـتێ ناگەیـەنێ، ئـەم دوو وتـارە ئـەم حـەوت مەرجانـەیان هەیە: کاتی نوێژەکە هاتبێ، نابـێ نوێژەکە لێیـان پـێش بکـەوێ، بـەڵکوو وتارەکان دەخرێنە پێش نوێژەکەوە، ئەگەر دەیتوانی لە کاتی وتارەکانـدا، لەسەرپێ رابوەستێ، لە نێوانیاندا بە ئەندازەی ئارامبوونەوەیێ دابنیشێ، دەسـنوێژی هـەبێ، لەشـی پاکبـێ، پیـسی بـە جەسـتەو جـل‌و جێگەیـەوە نەبێ، بە جلێکی پـاك شـەرمگای داپۆشـرابێ، ئوەنـدەیش دەنـگ بـەرزەوە بکـا کـە بەلایـەنی کەمـەوە چـل کـەس لەوانـەی کـە جومعـەیان پـێ دادەمەزرێ دەنگی ببیستن.

**فـەرزی دووەمـی نوێـژی هـەینی:** ئەوەیـە کـە بـە دوو رکـات بکـرێ، عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لـە دەمـی پێغەمبـەر خـۆیم ژنەوتـەووە دەیفەرموو {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژی هەینی دوو رکاتە، وە نوێـژی جـەژنی رەمـەزان دوو رکاتـە، وە نوێـژی جـەژنی قوربـان دوو رکاتـە، وە نوێـژی سەفەر دوو رکاتە، ئەم نوێژانە کە بە دوو رکات دەکرێن تـەواون، نـەوەك بلێـی کورتـەوەکراون. (نەسائی‌و ئەحمـەدو ئیبنـو ماجـە: بەسـێ رشـتەی دروست).

**فەرزی سێیەمی نوێژی هەینی:** ئەوەیە کە بەکۆمـەڵ (بەجەماعـەت) بکرێ، بەڵگەی ئەمە لە پێشەوە رابورد.

## ٨٢) هەیئەتەکانی نوێژی هەینی:

### سوننەتە بۆ کەسێ کە بیەوێ نوێژی هەینی بکا: چوارشت:

**یەکەم**: خۆشۆردن، چوکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان ویستی بچێ بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشۆرێ. (شەیخان).

**دووەم**: جەستەی پاكو خاوێن بکاتەوە، لە چڵكو نارەقو ئەو شتانەی دەبن بەهۆی پەیدابوونی بۆنی ناخۆش، چونکە مەبەست لە خۆشۆردن ئەمەیە، نەك کردنی ئاو بەسەر جەستەداو بەس. شافیعی {خۆشنوودیی خوای گەورەی لێبێ} دەفەرموێ: کەسێ جلو بەرگی خاوێن رابگرێ، خەمو پەژارەی کەم دەبێ، کەسێکیش بۆنی خۆشبێ ئەقڵی پتر دەبێ!.

**سێیەم**: خۆڕازاندنەوە بە جلی جوانو خۆشەویستی خۆبۆنخۆشکردن: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەوەی رۆژی هەینی خۆی بشۆرێو جلی جوان لەبەر بکاو ئەگەر لە ماڵەوەی بۆنی خۆشی هەبوو لەخۆی بدا، ئینجا بڕوا بۆ نوێژی هەینیو لە مزگەوت هەنگاو هەڵ نەنێ بەسەر سەری کەساو ئەوەندەی خودا لە چارەی نووسیوە نوێژی سوننەت بکا، وەکاتێ پێشنوێژ هاتو دەستی کرد بە وتاری هەینی بێ دەنگ ببێو گوێ رابگرێ تا پێشنوێژ لە نوێژ دەبێتەوە، ئەوەی ئاوا بکا ئەوە دەبێ بە کەفارەتی گوناهی نێوانی ئەم هەینیو هەینییەکەی پێشی. (ئیبنو حەببان لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە، حاکم گێڕاویەتەوە وە دەفەرموێ: بەپێی مەرجی موسلیمە).

بەرگە سپی زۆر پەسەندە، بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: جلی سپیش لەبەر بکەن، چونکە لە باشترین بەرگی ئێوەیە، وە مردووەکانیشتانی تیا کفن بکەن.

**چوارەم**: نینۆککردنو لابردنی موویێ کە لابردنی سوننەتبێ، چونکە شتی وا لە سروشتی باشی مرۆڤە.

## ٨٣) گوێڕاگرتن لە وتارەکەی:

لە بارەی قسەکردنەوە لەکاتی وتاردا راجیایی هەیە، شافیعی بە دەق دەفەرموێ: ئەوە نادروستە، مالیكو ئەحمەدیش هەروا دەفەرموون، گێڕانەوەی دامەزراوی ئەحمەدیش هەروایە، خوای گەورە دەفەرموێ: **{وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ – سورة الأعراف – ٢٠٤/٧}** زوربەی (مفسرین) راڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: ئەم ئایەتە لە بارەی ئەوەوەیە کە گوێ لە وتاری هەینی رابگیرێ، وە لەم ئایەتەدا وتارەکە ناونراوە قورئان، چونکە بەشێ لە وتارەکە قورئانە. لە فەرموودەیشدا خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: رۆژی هەینی لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتار دەخوێنێتەوە ئەگەر بە هاونشینی خۆت بڵێی وسبە، بێدەنگبە، ئەوە خۆشت بێجا دەکەی! **(رواه الجماعة الا ابن ماجه)**.

رێبازی تازەی شافیعی ئەوەیە: قسە نادروست نییەو، گوێڕاگرتن لە وتار سوننەتە، چونکە شەیخان دەگێڕنەوە: کە ئیمامی عوسمان چووە ناو مزگەوتەوە، لەوکاتەدا ئیمامی عومەر وتاری دەخوێندەوە، عومەر

فەرمووی: ئەوە بۆ بازێ پیاو بە زوویی نایەن بەدەنگ بانگەکەوە؟ عوسمانیش فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! هەر کە گوێم لە بانگ بوو ئەوەندە مامەوە هەتا دەستنوێژم گرت. دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} خەریکبوو، وتاری هەینی دەدا، لەوکاتەدا، پیاوێ دێتە ژوورەوەو دەڵێ: کەی قیامەتە؟ خەڵکەکە ئاماژەیان بۆیکرد کە بێ دەنگبێ، بەڵام پیاوەکە بێدەنگ نەبوو، وە قسەکەی دووبارەکردەوە، پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} لە پاش جاری دووەم فەرمووی: هاوار لە تۆ، چیت بۆی ئامادەکردووە؟ پیاوەکە گوتی: خۆشەویستیی خواو پێغەمبەری خوا. حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: دەی مژدەت لێبێ تۆ لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوکەسانە دەبی کە خۆشت دەوێن! (بەیهەقی بە رشتەیەکی دروست گێڕاویەتەوە). ئەم دوو رووداوەیش بەڵگەن لەسەر ئەم بابەتە چونکە ئەوەتا عوسمان قسەی کردووەو وەڵامی عومەری داوەتەوەو پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} رەخنەی لە قسەکردنەکەی پرسیارکەرەکە نەگرتووە، دیارە ئەگەر شتی وا نادروست بوایە پێغەمبەر رێگەی نەدەدا. ئەم راجیاییە بۆ قسەیەکە کە مەبەستێکی گرنگی دەسبەجێی تیادا نەبێ، دەنا نەك هەر نادروست نیە، بەڵکوو پێویستە، وەك ئەوە کوێرێ خەریکە بکەوێتە بیرێکەوە، وریای بکاتەوەو رێگەی پێ نیشانبدا. یا دووپشکێ لە نزیك کەسێکەوەبێ و هۆشیاری بکاتەوە، یا ببینێ واستەمکارێ بە شوێن مرۆڤێکی بێتاوانا دەگەڕێ، ئەویش ئاگاداری بکاتەوە، یا وەك ئەوە فەرمان بە چاکە بکا، یانەیی لە خراپە بکا.

## ٨٤) لەكاتی وتارەكەدا نوێژ دروستە:

ئەگەر پێشنوێژ وتاری دەخوێندەوەو لەو كاتەدا كەسێ هاتە ژوورەوە چی بكا؟ ئایا دووركات نوێژی دیاری مزگەوت بكا یانا؟ لەم بابەتەدا راجیایی هەیە، هەندێ لە زانایان دەفەرموون: با نەیانكات، ئەم رایە دەگێڕنەوە لە ئیبنو عومەرو عوسمانو علییەوە {رەزای خوایان لێبێ} هەروەك فەرمانیش كراوە بە گوێڕاگرتن، ئەو فەرموودانەیش كە لە داستانەكەی سولەیكدا هەن ئاوای تەئویل دەكەن: گوایە سولەیك رووتەڵبووە، بۆیە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێكردووە كە هەڵسێ نوێژبكا، هەتا خەڵكەكە بیبینن، بەڵكوو خێری پێ بكەن.

شافیعیو ئەحمەدو ئیسحاقو شەرعزانەكانی فەرموودە شوناسەكان دەفەرموون: لە پێش ئەوەدا كە دابنیشێ سوننەتە دوو ركاتی سووكەڵەی دیاری مزگەوت بكا، ئەم داستانەی سولەیكیان كردووە بە بەڵگە، كە جابیر دەفەرمویێ: رۆژێكی هەینی لەوكاتەدا كە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وتاری دەدا سولەیكی غەطەفانی هات دانیشت، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: ئەی سولەیك! هەڵسە دوو ركات نوێژی سووكەڵە بكە، ئنجا فەرمووی: رۆژی هەینی ئەگەر یەكێكتان لەوكاتەدا هات بۆ مزگەوت كە پێشنوێژ وتاری دەخوێندەوە با بەگورجی دووركات نوێژی سوكەڵە بكا. (ش /د /ت /ن/) ئەمە بەڵگەی رۆشنی ئەوەیە كە نوێژی دیاری مزگەوت لەم كاتەدا سوننەتە لەبەر ئەوە تەئویلی ئەوانە كە دەفەرموون سولەیك لەبەر ئەوە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێكردووە بە راوەستان تا خێری پێبكرێ، ئەم تەئویلە قوبوڵ نیەو

پووچە، چونکە ئەوەتا خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} ئاشکرا دەفەرموێ: ئەگەر یەکێکتان لەو کاتەدا هات بۆ مزگەوت.. تاد. چونکە ئەمە دەقێکی رۆشنە تەئویل هەڵناگرێ، دروست نیە کار بە پێچەوانەی بکرێ. وەکی تریش ئەمە بۆ ئەوانەیە کە کاتێ دێنەژوورەوە پێشنوێژ وتار دەخوێنێ بەڵام بۆ ئەوانەی کەوان لەناو مزگەوتەکەدا دروست نیە لەوکاتەدا نوێژ دابەستن. تەنانەت ئەگەر خەریکی نوێژ بوو دەبێ گورج بیکا، ماوەردیو ئەبو حامیدی غەزالی وادەفەرموون.

## ٨٥) خوێندنی سوورەتی کەهف:

**سوننەتە**: سوورەتی کەهف لە رۆژ یا شەوی هەینیدا بخوێنێ، بە رۆژ بەپێی ئەم فەرموودەیەی {درودی خوای لەسەربێ}: لە رۆژی هەینیدا هەرکەسێ سوورەتی کەهف بخوێنێ، لە نێوانی هەردوو هەینییەکەدا نووری لێ دەبارێ. (حاکمو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، بەیهەقی لە سونەندا) بە شەویش بەپێی ئەم فەرموودەیەی {درودی خوای لەسەربێ}: هەر کسێ لە شەوی هەینیدا سووەتی کەهف بخوێنێ، لەلای خۆیەوە هەتا بەیتوڵڵا بە نوور رۆشن دەبێتەوە بۆی (بەیهەقی).

پێویستە لەسەر شێوەیێ بیخوێنێ سەرنەشێوێنێ لە خواپەرستی تر لەکاتی خواپەرستیدا، دەنا نادروستە، چونکە حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بێداربن! ئێوە هەمووومان هەر گفتو گۆ لەگەڵ پەروەردگاری خۆتان دەکەن، کەواتە مەبن بە ئازارو ئەرك بۆ یەکتری لەکاتی دەورکردنەوەیشدا دەنگ بە سەردەنگی یەکتردا هەڵ مەبڕن.

باشترین كات بۆ خوێندنی، لە پاش نوێژی بەیانییە، چونكە خێر هەتا پەلەی لێبكەی باشترە. بەڵام ئەوەی كە بڕێ قورئان خوێن لە مزگەوتا دەیكەن، لەسەر شێوەیەكی وا كە دەبێ بەهۆی سەرلێشێوانی نوێژكەرەكان، ئەوە نادروستە، وەك زانا پێشەواكان ساخیان كردۆتەوە. شتی وا بەشێكە لەو بیدعەتكارییە ناشرینەی كە خاوەنی شەریعەت بە دانایی خۆی هۆشیاری كردووینەتەوە لە بارەیەوە. خوا ئێمەو موسوڵمانان لەوە بپارێزێ.

## ٨٦) كاژێری نزاگیرابوون:

سوننەتە لەشەوو ڕۆژی هەینیدا نزاو پاڕانەوە زۆر بخوێنێ، لە ڕۆژەكەیدا بۆیە سوننەتە بەڵكوو ڕێكەوتی كاتی نزاگیرابوون بكا. لە ڕەوضەدا ئەوەوی دەفەرموێ: فەرمایشتی دروست لە بارەی كاتی نزاگیرابوونەوە ئەوەیە كە لە صەحیحی موسلیمدا تۆماركراوە، كە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەوكاژێرە لەو حەلەوەیە كە پێشنوێژ دادەنیشێ لەسەر مینبەر هەتا نوێژتەواو دەبێ. ئەم كاتەیە دەمێكی پیرۆزی زۆركەمە، لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بە دەستی پیشانیدا كە ئەو ماوەیە گەلێ كەمە، لە شەوەكەیشیدا بۆیە سوننەتە چونكە شافیعی {خۆشنوودیی خودای لێبێ} دەفەرموێ: بەمن گەیشتۆتەوە كە لە شەوی هەینیدا نزاگیرا دەبێ.

## ٨٧) سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}:

لە شەوو رۆژی هەینیدا سەڵاواتدانی زۆر لەسەر پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} سوننەتە، چونکە فەرمووده دەفەرموێ: رۆژی هەینی یەکێکە لە رۆژە هەرەباشەکانتان، جا لەم رۆژەدا زۆر سەڵاوات لەسەر من بدەن، چونکە سەڵاواتەکەتان دەگاتەوە پێم، لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ {درووودی خوای لەسەربێ}: لە شەوو رۆژی هەینیدا سەڵاوات زۆر لە دیداری من بدەن، چونکە ئەوەی یەك سەڵاوات لەسەر من بدا، خودا دەجار رەحمەت دەڕێژێ بەسەر ئەودا.

## ٨٨) لە پاش بانگی رۆژی هەینی مامەڵە نادروستە:

بۆ کەسێ نوێژی هەینی لەسەربێ، لەپاش دەستکردن بە بانگ، سەوداو کڕینو فرۆشتن نادروستە، مەبەست ئەو بانگەیە کە وتارخوێن لەسەر دوانگە دادەنیشێ، چونکە یەزدانی مەزن دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ – سورة الجمعة – ٩/٦٢} واتە: ئەی بڕواداریینە! لە رۆژی هەینیدا، کە بانگ درا بۆ نوێژ ئیتر خێرا بڕۆن بۆ لای ذیکری خوا، واز لە کڕینو فرۆشتن بهێنن. ئەوەتا بە دەقی ئایەت نادروستیی کڕینو فرۆشتن چەسپاوە، سەوداو مامەڵەی تریش بە پێوەری ئەو دەپێورێ واتە: قیاس لەو نادروستییە دەکرێ. لەپێش ئەم بانگەیشدا لە پاش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، کە لەوێوە کاتی پێویستبوون دەست پێدەکا، سەوداو مامەڵەو کارو فرمانی دنیایی ناپەسەندە.

## ٨٩) نوێژی هەردوو جەژن:

وشەی جەژن لە عەربیدا ناوی (عید)ە، عیدیش لە وشەی (عەود)ی عەرەبی دروستکراوە، کە بەواتا دووبارەبوونەوەیە، چونکە جەژن لە هەموو ساڵێکا دووبارە دەبێتەوە، یا کە جەژن دێتەوە خۆشیو شادیش لەگەڵیا دێتەوە! یا لەبەر ئەوە وا ناونراوە چونکە بەهرەو نازو نیعمەتی خوا لە جەژندا بۆ بەندەکانی دووبارە دەبێتەوە!.

نوێژی جەژن مەبەستێکی گەورەیە بەپێی قورئانو سوننەتو یەکگرتنی نەتەوە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ – سورة الكوثر – ٢/١٠٨} لەم ئایەتەدا مەبەست لەم نوێژە نوێژی جەژنی قوربانە، چونکە مەبەست لە (نەحر)یش لە ئایەتەکەدا قوربانیکردنە. بەبێ گومان پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خۆیو هاورێکانی لەگەڵداو نەتەوەی ئیسلام لەپاش خۆی هەموویان نوێژی هەردوو جەژنەکەیان دەکرد، کەواتە بووە بە یەکگرتن.

یەکەم نوێژی جەژن کە پێغەمبەر کردی نوێژی جەژنی رەمەزان بوو، لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو، هەر لەم ساڵەیشدا سەرفیترە پێویستکراوە، ئەمە فەرمایشتی ماوەردییە.

بزانە کە نوێژی جەژن سوننەتێکی زۆر گەورەو دامەزراوە بەڵام فەرز نیە، چونکە عەرەبە دەشتەکییەکە کە عەرزی پێغەمبەری کرد: ئایا غەیری ئەم پێنج نوێژە فەرزە نوێژی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر خۆت بە ئارەزووی خۆت نوێژی تری سوننەت بکەی (شەیخان) بۆیەیش زۆر سوننەتێکی گورەیە چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای

لەسەربێ} هەمیشە کردوویەتی‌و قەت نەیچوواندووە، بەڵام دەشگوترێ لە گوایە: فەرزی کیفایەیە، چونکە یەکێکە لە دروشمەکانی ئیسلام، بە نەکردنی دادەنرێ بە کەمتەرخەمی لە ئاییندا، سەرەڕای ئەوەیش کە لە ئایەتدا فەرمانی پێکراوە دەفەرموێ: {فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ – سورة الكوثر – ٢/١٠٨} واتە: دەی نوێژی جەژن بکە، بۆ خودای خۆت، وە قوربانیی بۆ سەرببڕە.

نوێژی جەژن بە جەماعەت دەکرێ، بۆ تەنهاو ڕێبواریش دروستەو ڕەوایە، بۆ کۆیلە – واتە: بەندەی زەرخڕیدە - و ژنیش دروستە، بەڵام بۆ گەورەکچ‌و ئافرەتی بۆشناخ چوون بۆ نوێژی جەژن لەم سەردەمەی ئێمەدا، بەبێ گومان نادروستە، چونکە لەم چەرخەدا بەدرەوشتی پەرەی سەندووە، لە هەموو کاتێکدا چوونی ئەم دوو کەسە بۆ ئەم نوێژە ناباشە (ئەمە فەرمایشتی خاوەنی کیفایەتول نەخیارە کە لە (٨٨٩)ی کۆچیدا مردووە لەسەر قسەی پەراوێزێ کەوا لەسەر فیقهولویەسەرە کە لەم شوێنەدا – وەرگێڕ).

گەرچی فەرموودەکەی ئوممو عەطییە بەڵگەی ئەوەیە کە دەرچوون بۆی لەلایەنی ئەم دوو کەسەیشەوە دروستە، بەبێ ناباشی بەڵام ئەو مەبەستەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا، کە باشترین سەردەم بوو، هەبوو ئێستا ئەو مەبەستە نەماوە، چونکە لەو چەرخەدا موسوڵمانەکان کەم بوون، حەزرەت ڕێگەی بە ژناندا کە بچن بۆ نوێژی جەژن هەتا بەهۆی ئەوانەوە زۆر بنوێنن، ئێستا موسوڵمانان بەبێ ئەوانیش هەر زۆر زۆرن، کەواتە ئەو مەبەستە نەماوە!.

هەر لەبەر هەمان هۆیە کە ڕێگەی دەدا بەژنە بێنوێژەکانیش کە بچن بۆ دیار نوێژی جەژن، خۆ گومان لەوەدا نیە، کە ئەوان نوێژیان لەسەر نیە، سەرەڕای ئەوەیش ئەوچەرخە مەردوم دڵپاك بوون، سەردەمێکی ئارام بوو، ژنان جوانیی خۆیانیان دەرنەدەخست، چاوی خۆیان لە ڕوانینی ناڕەوا دەگرت، هەروا پیاوانیش وابوون، بەڵام لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا دەرچوونیان سوور دەبێ بە مایەی بەدکاریو بەدرەوشتی!!.

لە فەرموودەیەکی دروستدا تۆمارکراوە کە عائیشە لە سەردەمی خۆیدا، لەپاش مەرگی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} بمایە تا ئەمڕۆ، وە ئەم بارو دۆخەی کە ئەمڕۆ ژنان سازاندوویانە، ئەمەی بەچاوی خۆی بدیبایە، ژنانی لە هاتن بۆ مزگەوت قەدەغە دەکرد، هەروەك چۆن قەدەغەیە لەسەر ژنانی جوولەکە کە بچن بۆ کنیشتەی خۆیان، دەی ئەمە فەتوای عائیشەیە، کە دایکی موسوڵمانانە، دەربارەی ژنانی سەردەمی خۆی، کە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دادەنرێ بە باشترین سەردەم، جا دەبێ حاڵی ژنانی ئەمڕۆی ئێمە چیبێ؟ خەڵکێکی زۆریش ئەم قسەیەی عائیشە پەسەند دەکەن: وەك عوروەو قاسمو یەحیای ئەنصاریو مالكو ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف، بەڵام ئەبو حەنیفە جارێ وا دەفەرموێو جارێ دەفەرموێ دەرچوونیان دروستە!.

## ٩٠) کاتی نوێژی دوو جەژنەکان:

بزانن کە کاتی بوونی نوێژی جەژن لە هەڵهاتنی خۆرەوەیە هەتا کاتی نیوەڕۆ، بەڵام سوننەتە ئەوەندە دوابخرێ هەتا خۆر بەقەد رمێ بەرزەوەدەبێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئاوا دەیکرد، لەبەر ئەوەیش هەتا لە راجیایی ئەوانە رزگارمان ببێ کە فەرموویانە: هەتا خۆر بەقەد رمێ بەرز نەبێتەوە نوێژی جەژن نابێ. سوننەتە نوێژی جەژنی قوربان زوو بکرێ، وە نوێژی جەژنی رەمەزان دوا بخرێ، شافیعی حەدیسێکی مورسەل دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نامەیێ دەنووسێ بۆ عەمری کوڕی حەزم (کاتێ لە نەجران دەبێ) فەرمانی پێ دەفەرموێ: کە نوێژی قوربان زوو بکەو نوێژی جەژنی رەمەزان درەنگ. ئیبنو قودامە دەفەرموێ: چونکە لەسەر ئەم شێوەیە لە جەژنی قوربانا کاتی قوربانیکردن گوشاد دەبێ، لە جەژنی رەمەزانیشدا کاتی سەرفیترەدان گوشاد دەبێ!.

## ٩١) ئەندازەی رکاتەکانیان:

ئەندازەی رکاتەکانیان هەر نوێژەی دوو رکاتە، بە ئیجماع، لە رکاتی یەکەمیاندا، بێجگە لە (الله أکبر)ی نوێژ دابەستن حەوت (الله أکبر)ی تر بکا لە رکاتی دووەمیاندا، بێجگە لە (الله أکبر)ی هەڵسانەوە پێنج (الله أکبر)ی تر بکا، ئیمامی تیرمیذی {رەحمەتی خوای لێبێ} لە عەمری کوڕی عەوفی ئەلموزەنییەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خودا {دروودی خوای لەسەربێ} لە هەردوو جەژنەکاندا، لە رکاتی یەکەما، لە پێش خوێندنی

فاتیحاوه حەوت (الله أکبر)ی دەکرد، له رکاتی دووەمدا، لەپێش خوێندنی ئەللاهو ئەکبەرەکانا، ئەوەندەی خوێندنی فاتیحاوه پێنج (الله أکبر)ی دەکرد، سوننەته که نێوانی ئایەتێکی مامناوەندی (معتدل) راوەستێ، وه لەو راوەستانەدا (تەهلیل)و (تەکبیر)و (تەحمدی) بکا، (بەیهەقی له ئیبنو مەسعوودەوه به گوتارو بەکردار ئەمەی گێڕاوەتەوه) جوان وایه بڵێ: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أکبر) چونکه ئەم ویرده شیاوی ئەم شوێنەیه، ئیبنو عەبباس‌و کۆمەڵێ له زاناکان دەفەرموون: (الباقیات الصالحات) ئەم گوته پیرۆزەیه، له پاش فاتیحا له رکاتی یەکەما سوورەتی (ق) به تەواوی بخوێنێ یا (سبح اسم ربك الاعلی) وه له رکاتی دووەما (اقتربت) یا (هل أتاك) به ئاشکرا به دەنگی بەرز بخوێنێ، بۆ پەیرەوییکردنی حەزرەت لەم کارانەدا، چونکه ئەو وای کردووه، ئێمەش چاو لەو دەکەین.

## ٩٢) وتاری پاش نوێژی جەژن:

سوننەته لەدوا نوێژەوه دوو وتار بخوێنیتەوه، بوخاری‌و موسلیم له ئیبنو عومەرەوه دەگێڕنەوه: که پێغەمبەری خودا {دروودی خوای لەسەربێ} و ئەبوبەکرو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} پاسایان وابوو، نوێژی جەژنیان له پێش وتارەکەوه دەکرد. ئەوەیش که وتارەکه دووه به پێوەری هەینی دەپێوین‌و قیاسی لەو دەکەین چونکه نەوەوی دەفەرموێ: لەم بارەیەوه هیچ فەرموودەیەکی ساخ نەچەسپاوە!.

وا سوننەتە کە وتارەکە بە سوپاسی خوای گەورە دەست پێبکا، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} هەمیشە گشت وتارەکانی بە (الحمد لله) دەست پێ دەکرد، لە حەزرەتەوە {دروودی خوای لەسەربێ} تۆمار نەکراوە کە بە (الله أکبر) دەستی کردبێ بە دوو وتارەکانی دوو جەژنەکان، بەڵام ناوبەناو لەناو وتارەکەدا (الله أکبر)ی دەکرد (ئیبنو وماجە لە سوننەنی خۆیدا گێڕاویەتەوە).

## ٩٣) نوێژی جەژن لە سارادا:

سوننەتە کە نوێژی جەژن لە سارا بکرێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: هەمیشە لەوێ کردوویەتی. بەڵام جارێ لەبەر باران لە مزگەوت نوێژی جەژنی بۆ کردن. ئەبو هورەیرە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: جارێ لە ڕۆژی جەژندا باران بوو، لەبەر ئەوە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} لەناو مزگەوتدا نوێژی جەژنی بۆ کردن. (ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو حاکم) هەرکاتێ نوێژەکە لە مەککە ئەنجام ئەدرا، ئەوە لەناو مەسجیدولحەراما بکرێ خێرترە هەتا لەسارادا، گومان لەمەدا نیە.

## ٩٤) ئەڵلاهو ئەکبەرکردن لە جەژندا:

(الله أکبر) کردن سوننەتە، لەکاتی ئاوابوونی خۆری ئێوارەی شەوی جەژنی ڕەمەزانەوە، هەتا پێشنوێژ نوێژی جەژن دادەبەستێ. لەهەر کوێ بێ لەماڵا بێ یا لە ڕێگەو بان، یا لە کووچەو بازاڕ، بە شەو

بێ یا بە ڕۆژ، قەرەباڵغ بێ یانا، ئەگەر کۆمەڵ بوون بۆ یەکتری بسێننەوە باشە ڕێبواریش وەك نیشتەجێو ژنیش وەك پیاو لە گشت ئەم کاتانەدا مافی ئەم (الله أكبر) کردنەی بۆ هەیە، چونکە فەرمایشتەکەی خوا کە فەرمان دەکا بەمە بۆ هەموانە، کە دەفەرموێ: (ولتكبروا الله على ما هداكم)، بوخاریش لە ئوممو عەطییەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: جاران لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیدا {دروودی خوای لەسەربێ} ئێمەی ژنان بە فەرمانی ئەو دەردەچوین بۆ دەرەوەی شار، لەهەر دوو نوێژی جەژنەکاندا، تەنانەت ژنی بێنوێژیش دەردەچوون، لە پشت عەشامەتەکەوە دەبوون کە ئەوان (الله أكبر)یان دەکرد ئەمانیش لەگەڵ ئەواندا دەیانسەندەوە. لە جەژنی قوربانیشدا (الله أكبر)کردن سوننەتە بەپێی فەرمایشتی خودا: {كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ – سورة الحج – ٣٧/٢٢) وە بەپێی فەرمایشتی خودا: {وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ – سورة البقرة – ٢٠٣/٢} واتە: لە چەند ڕۆژێکی ژمێردراودا ذیکرو یادی خودا بە زۆری لەسەر شێوەیەکی دیاری بکەن! ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم چەند ڕۆژانە بریتین لە سێ ڕۆژەکانی پاش جەژن، کە پێیان دەگوترێ (أيام التشريق: شەوە ڕۆژ – ڕووناکەکان). لە عەلیو ئیبنو مەسعودیشەوە دەگێڕنەوە: ئەم ئەڵلاهو ئەکبەرکردنە دەست پێدەکا لە جەژنی قوربانا، لە بەیانی ڕۆژی عەرەفەوە، هەتا عەصری دوا ڕۆژی (أيام منى) کە ڕۆژی سێیەمی پاش ڕۆژی جەژنی قوربانە. (ئەم فەرموودەیە ئیبنولمونذیرو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە).

ئیبنو عومەریش {ڕەزای خوای لێبێ} لە مینا لە هەموو ئەمرۆژانەدا (الله أكبر)ی دەکرد، مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ و ڕەزای خوا لە مەیموونەی هاوسەری بێ} لە ڕۆژی جەژنەوە، کە یەکەم ڕۆژی قوربانییە (الله أكبر)ی دەکرد، ژنانیش لە پشت أبانی کوڕی عوسمانەوەو لە پشت عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە لە شەوەکانی (ایام التشریق)دا لەگەڵ پیاواندا، لە مزگەوت (الله أكبر)یان دەکرد.

**حافیظ دەفەرموێ:** ئەم فەرمایشتانەی کە لەم لایەنەوە هەن ئەویان تیادایە کە لەدوا نوێژە فەرزەکانیشەوە (الله أكبر)یان دەکرد.

## ٩٥) ئەو گوتەیەی کە بەشێوەیە تەکبیر جوانە:

لە بابەت شێوەی گوتەی تەکبیرەوە دروستترین شت ئەوەیە کە عەبدولرەزاق بە ڕشتەیەکی دروست دەیگێڕێتەوە: سەلمان دەفەرموێ: کە (الله أكبر) دەکەن بڵێن: (**الله أكبر الله أكبر الله أكبر كبيرا**) لە عومەرو ئیبنو مەسعوودیشەوە دەفەرموون: ئاوایە: (**الله أكبر الله أكبر الله أكبر، لا اله الا الله والله أكبر الله أكبر ولله الحمد**). سوننەتە پیاو بە دەنگی بەرز تەکبیر بکاو ژن بە دەنگی نزم، بوخاری دەفەرموێ: عومەر لە مینا لەناو چاتۆڵەکەی خۆیدا کە (الله أكبر)ی دەکرد، خەڵکی ناومزگەوتەکە گوێیان لە دەنگی دەبوو، جا ئەوانیش بۆیان دەسەندەوە، ئەوجا خەڵکی بازاڕ هەموو بەیەك دەنگ لەگەڵ ئەواندا تەکبیریان دەکرد، مینا لەبەر تەکبیرکردن دەلەرییەوە.

## ٩٦) نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران:

ئەم دوو نوێژە سوننەتێکی دامەزراون، بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): ئەم خۆرو مانگە دوو نیشانەی گەورەن لە نیشانە گەورەکانی خودا، نە لەبەر مردنی کەسو نەلەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، جا ئەگەر شتێ واتان دی ئەوا لە خودا بپاڕێنەوەو ئەڵلاهو ئەکبەر بکەنو نوێژ بکەنو خێرو خێرات بکەن. (شەیخان) لە گێڕانەوەیەکدا: لە خودا بپاڕێنەوەو نوێژ بکەن هەتا دەرووتان بۆ دەکرێتەوە. لای کەمی ئەم نوێژی خۆرو مانگگیرانە دوو رکاتە، لە هەموو رکاتێکییا دوو راوەستانو وو چەمینەوەی تیادایە، دوو فاتیحا لەو دوو راوەستانەدا لەسەر ئەم شێوەیە دەخوێنێ، نوێژ دادەبەستێو فاتیحا دەخوێنێو دەچێ بۆ چەمینەوەو لە پاشا راست دەبێتەوەو دیسان فاتیحا دەخوێنێتەوەو ئەوجا دەچێتەوە بۆ چەمینەوەی دووەم، ئەوجا سەربەرز دەکاتەوەو کەمێ ئارام دەگرێ، ئەوجا دەچێ بۆ کوڕنووش، ئەمە رکاتی یەکەم تەواو، ئەوجا رکاتی دووەمیش لە سەرهەمان شێوە دەکا.

**هەرە تەواوەکەیشی ئاوایە:** لەپاش نزای سەرەتای نوێژو (أعوذ بالله)کردنو خوێندنی فاتیحە، لە راوەستانی یەکەمی رکاتی یەکەما، سوورەتی بەقەرە بخوێنێ، لە راوەستانی سێیەمدا، یەکەمی رکاتی یەکەما، سوورەتی بەقەرە بخوێنێ، لە راوەستانی دووەمی یەکەمدا لەپاش خوێندنی فاتیحا بەقەد دوو سەد ئایەت لە ئایەتەکانی سوورەتی بەقەرە بخوێنێ لە راوەستانی کە یەکەمی رکاتی دووەمە، بەقەد سەدو پەنجا ئایەت بخوێنێ، لە راوەستانی چوارەما، کە راوەستانی دووەمە لە

رکاتی دووم، لەپاش فاتیحە بەقەد سەد ئایەت بخوێنێ. (شەیخان لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە).

وا سوننەتە کە لەناو چەمینەوەی یەکەما بەقەد سەد ئایەت تەسبیحات بکا، لەو تەسبیحاتانەی کە لەناو چەمینەوەدا دەخوێنرێن،لە دووەما بەقەد هەشتا ئایەتە، لە سێیەمدا بەقەد حەفتا ئایەت، لە چوارەما بەقەد پەنجا ئایەت، چونکە لە فەرموودەدا شتی وا تۆمار کراوە، بەلام لەسەر فەرمایشتی دروست نە کوڕنووش و نە راستبوونەوەو نە چەمینەوە درێژناکاتەوە، رافیعی ئەمەی گوتووە، گەرچی نەوەوی درێژکردنەوە بە دروست دادەنێ، چونکە دەفەرموێ: ئەمە لە صەحیحدا تۆمارکراوەو لە (البویطی)دا شافیعی بە دەق دەیفەرموێ:و فاتیحا دەخوێنێو دەچێ بۆ چەمینەوەو لەپاشا راست دەبێتەوەو جا کوڕنووشی یەکەم لە هەموو رکاتێکا بەقەد چەمینەوەی یەکەمە کوڕنووشی دووەمیش بەقەد چەمینەوەی دووەمە. سەر بەلگەی ئەم باسە فەرموودەکەی شەیخەینە، کە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە، کە دەفەرموێ: لە سەردەمی حەزرەتدا {درووودی خوای لەسەربێ} رۆژگیرا، پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} هەڵسا نوێژی خۆر گیرانی بۆ موسوڵمانەکان کرد، ماوەیەکی دوورو درێژ لەناو نوێژەکەدا بە راوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند، بگرە بەقەد سوورەتی بەقەرەی خوێند، ئینجا چەمییەوەو روکووعی بردو درێژەیدا بە چەمینەوەکەیشی، ئینجا لە چەمینەوە هەڵسایەوەو گەلێ بە پێوە راوەستایەوە بەلام لە راوەستانی یەکەمی کەمتر، ئینجا دووبارە روکووعێکی دوورو درێژی تریشی بردەوە بەلام لە روکووعی یەکەمی کورتتر، ئینجا کوڕنووشی برد، ئینجا هەڵسایەوەو بە

دوورو درێژی ڕاوەستاو قورئانی تیاخوێند، بەڵام لە ڕاوەستانی یەکەمی کەمتر، ئینجا چەمییەوەو درێژەیدا بە چەمینەوەکەی، بەڵام لە چەمینەوەی یەکەمی کەمتر، ئینجا هەڵسایەوەو بە دوورو درێژی ڕاوەستاو قورئانی تیا خوێند، بەڵام لە ڕاوەستانی پێش خۆی کەمتر، ئینجا چەمییەوەو درێژەیدا بە چەمینەوەکەی، بەڵام لە چەمینەوەی پێش خۆی کەمتر، ئینجا کورنووشی برد، ئەوجا لە نوێژ بۆوەو خۆریش بەربوو بوو.

## ٩٧) سوننەتە بە کۆمەڵی بکرێ:

سوننەتە بە جەماعەت بکرێ، بۆ پەیڕەویی پێغەمبەری خۆی وەك لە صەحیحەیندا تۆمارە، ئەگەر پاشنوێژ لەم نوێژەدا فەریای چەمینەوەی یەکەمی ڕکاتی یەکەم بکەوێ، ئەوە فریای ئەو ڕکاتە دەکەوێ، هەروا ئەگەر فریای چەمینەوەی یەکەمی ڕکاتی دووەم بکەوێ ئەوە فریای ڕکاتی دووەمیش دەکەوێ بەڵام ئەگەر لە چەمینەوەی دووەمدا فریای هەریەك لەم دوو ڕکاتە بکەوێ، ئەوە فریای ئەو ڕکاتە نەکەوتووە، چونکە چەمینەوەی دووەم ئەصڵ نیە، پاشکۆیە. سوننەتە نوێژی مانگ گیران بە دەنگی بەرزو نوێژی خۆرگیران بە دەنگی نزم بکرێ، لە صەحیحەیندا مەسەلەی دەنگ بەرزەوەکردن هەیە، لە تیرمیذیشدا دەنگ نزم کردنەوە هەیە. تیرمیذی دەربارەی ئەم فەرموودەیەی کە لە بابەت دەنگ نزم کردنەوەوە گێڕاویەتەوە دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی دروستە (حسن صحیح).

## ٩٨) وتار لەم دوو نوێژانەدا:

سوننەتە لە دوا نوێژەکە دوو وتار بخوێنێ، وەك هەردوو وتارەکەی هەینی، چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} وای کردووە (موسلیم گێڕاویەتەوە) لەو فەرموودەیەدا کە موسلیم لەم بارەیەوە دەیگێڕێتەوە ئەمەی تیادایە: هەڵسایە سەرپاو وەسپێکی جوانی خودای گەورەی کرد.. هەتا ئەوێ کە حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەی گەلی موحەممەد! سویندم بەخودا کەس وەك خودا بە تەنگ نامووسەوە نیەو غیرەتی ناجۆشێ، کە تەماشا بکا کەوایەکێ لە بەندەکانی خەویکی شەرواڵپیسییە، یا یەکێ لە کەنیزەکەکانی خەریکی داوێنپیسییە، ئەی گەلی موحەممەد! سوێندم بەخودا، ئەوەی کە من دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن زۆر کەم پێ دەکەنین‌و گەلێ زۆر دەگریان. کۆمەڵێ لە هاوڕێیان باسی ئەوەیان کردووە کە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: لەدوا ئەم نوێژانە وتاری دەخوێندەوە، لە صەحیحدا ئەوە چەسپاوە. سوننەتە کە پێشنوێژ هانیانبدا لەسەر بەندە ئازادکردن‌و خێرو خێراتکردن‌و هەڕەشەیان لێبکا، کەبێ ئاگا نەبن لە قاری خواو ژیانی پێنج‌و دوو ڕۆژەی جیهان بە زەرقی‌و بەرقی خۆی دەستەشکێنیان نەکا. لە صەحیحی بوخاریدا هەیە دەفەرموێ: لە خۆرگیرانەکەدا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمانیکرد بە بەندە ئازادکردن، تاخودا دەرووی رەحمەتیان لێ بکاتەوە. لە هەمان کاتا بۆ هەموو کەسێ سوننەتە کە لەکاتی سەختی‌و سەخڵەتی‌و تەنگانەدا زۆر بە کوڵ‌و بەدڵ لە خودا بپاڕێتەوەو دووعاو نزا بکا، وەك کاتی بوومە لەرزەو هەورەتریشقەو رەشەبای سەخت‌و گەردەلوول‌و رۆچوون‌و کارەساتی تری لەم بابەتانە. یەزدانی پاك دەفەرموێ: {فَلَوْلا إِذْ جَاءَهُمْ

بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ - سورة الأنعام - ٦/٤٣) واتە: ئەوە بۆ عاریان نەگرت بەو هەمکە پەندەی ئێمە بەسەر ئەوانمان هێنا، تووشی ئەو هەمکەئێش پێگەیانندنمانکردن، هەتا عاربنێنو ملکەچببنو، لەلای پەروەردگاری خۆیان سکالای حاڵی شرِی خۆیان بکەن کەچی ئەوان وەك نەبایان دیبیو نە بۆران، هەر بەقەرەی ئەوەیش دانەچوون؟!.

هەروا سوننەتە بۆ موسوڵمان لەم حالانەدا لە ماڵەوەیش نوێژی سوننەت بکاو بپارێتەوەو نزای تایبەتی بخوێنی، پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} دەستووری وا بوو کاتێ بای سەخت هەڵی دەکرد دەیفەرموو: **(اللهم انی أسألك خيرها وخير ما فيها وخير ما أرسلت به، وأعوذ بك من شرها وشر ما فيها وشر ما أرسلت به. اللهم اجعلها رياحا ولا تجعلها ريحا)**: ئەی خودایە! داوای خێری ئەم بایەت لێدەکەم، کە بێ بەشم نەکەی لە خێری، وە لەو خێرەی کە بۆی رەوانەکراوە بەشی باشم بدەرێ، هەروا پەنا دەگرم بە پەنای تۆ لە شەرِی ئەم بایە، کە لەو شەرِەی لەناو ئەم بایەدایە بە دووربم، بەشم لەو شەرِەدا نەبێ کە ئەم بایە رەوانەکراوە بۆ بەرپاکردنی. ئەی خودایە! ئەم بایە بگێرِە بە بای رەحمەت، کە لە قورئاندا بە (الرياح) ناوبراون، مەیکە بەبای غەزەب کە لە قورئاندا بە (الريح) ناوبراوە. خوایە! بای خێرو خۆشی بێ، بای شەرِو ناخۆشی نەبێ.

## ٩٩) نوێژه بارانه:

نوێژەبارانه سوننەتێکی گەورەی دامەزراوە، لەکاتی بێ بارانیدا، موسوڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەرەوە دەیکەن، ئیمامی موسلیم (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رۆیشتە دەرەوە بۆ ئەو دەشتە بۆ نوێژەبارانە، لەکاتی وتارخوێندنەوەکەدا رووی کردە قیبلەو پشتی کردە خەڵکەکەو بەرماڵەکەی راستو چەپکرد، بوخاری ئەم بڕگەیەشی لەم فەرموودەیە پتر کردووە: لەپاشا پۆشاکەکەی هەڵسووڕاند، واتە: راستو چەپیکرد، ئینجا دوو رکات نوێژی نوێژە بارانەی بە جەماعەت بۆ کردین، لەناو هەردوو رکاتەکاندا بە دەنگی بەرز قورئانی بۆمان خوێند فەرموودەی تر لەم بابەتە زۆرن. داواکردنی باران سێ جۆری هەیە بە پێی شەرع:

**یەکەم**: کەلای کەمیەتی، ئەوەیە: بە پاڕانەوەو نزا، بەبێ نوێژ، بە تەنها، یا لەگەڵ کۆمەڵدا، داوای بارینی باران لەخوا بکرێ.

**دووەم**: نزاکردنە لەپاش نوێژە فەرزەکانەوەو لەپاش هەر نوێژێکی سوننەتەوە کە وتار لەناویدا سوننەتبێ.

**سێیەم**: کە باشترینیانە: ئەوە: داوای باران بەهۆی نوێژە بارانەوەبێو وتاری تیابێو پێشەوای موسوڵمانان خۆی یافەرمانداریان یاپێشنوێژ پەندو ئامۆژگارییان دابداتو لە سزای سەختی خودا بیانترسێنێو هەڕەشەی نافەرمانی خوایان لێبکاو فەرمانیان پێبکا بە چاکەو خێرکردنو هەموو جۆرە چاکەیێ، وە داوایان لێبکا، ئەگەر حەقی هەرکەسێکیان لەسەرە، یان بیدەنەوە، یا بڕیار بدەن کە بیدەنەوە،

یاخود گەردنی خۆیانی پێئازاد بکەنو تەوبە بکەن، چونکە ئەم جۆرە کارانە دەبن بەهۆی بێبارانیو وشکبوونی چەمو روبارەکانو بەهۆی وشکبوونی کانیاوەکانو بێ بەشبوون لەرزقو رۆزیو هەروا دەبن بەمایەی غەزەب ورقی خواو بەهۆی هاتنی تۆڵەو سزای سەختو پەیدابوونی ترسو برسێتیو کەمبوونەوەیماڵو منداڵو بێپیتو بەرەکەتیی دانەوێڵەو سەوزەو میوەهات، هەروا دەبن بەمایەی کاولبوونو وێرانبوونی شارو دێهاتو وڵاتێ کە دانیشتووەکانیان ستەمکاربن. وەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا - سورة الإسراء - ١٦/١٧} واتە: هەرکاتێ ویستمان وڵاتێ وێران بکەین، فەرمان دەدەین بەگەورە پیاوانو ئاغاو بەگەکانی ئەو وڵاتە، کە خوویان گرتووە بە رابواردنی خۆشەوەو هەمیشە خەریکی عەیشو نۆشن، کە واز لە هەوەسپەرستیو ئارەزوو بازی بهێننو لە رێی شەرعی خودا دەرنەچن، بەڵام ئەوان زیاتر لەیاسا لادەدەنو لەرێ دەردەچن، ئیتر لەسەر فەرموودەی خودا سزا دەروا بۆ سەریانو وڵاتیان وێران دەبێو خاکیان بەتورەکە دەبێژرێ، وا سوننەتە کەپێشنوێژ فەرمانیان پێبکا بە تەوبەو بەوەیش لەپێشا سێ رۆژ لەسەر یەك بەرۆژوو بنو لە رۆژی چوارەما بەزمانی بەرۆژووەوە، بەجلو بەرگێکی پەڕ پووتەوە لە ئاوەدانی دەربچن، تا لەسەر شێوەی سواڵکەربن، بەسەلاریو سەرکزی بەرێدا برۆنو، لەقسەو گوفتوگۆدا هێمن بنو بەسەنگینی دابنیشن. ئەبو داوود دەگێرێتەوە: حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) بە پەرپووتیو بەکزۆڵەییو بەملکەچی لەشار دەرچوو، لەرێ هەر دەمپاڕایەوەو دەڵالایەوە تا گەیشتە نوێژگاکە. بەڵام خۆیان بۆن نەخۆش نەکەن، چونکە خۆبۆن خۆشکردن

بەشێکە لەخۆشیو شادی. گەرەکە ئەم جۆرە کەسانەیش لەگەڵ خۆیان بەرنو بەخاتری ئەوان لەخوا داوای باران بکەن: پیری ئیختیاری کەفتەکارو خاوو خێزانو مناڵو دەسەوسانو ئافرەتە خەمبارەکان.

چونکە نزای ئەم جۆرە کەسانە نزیکترە لە گیرابوون، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: بزانن کە لەبەر خاتری بێنەواو زەبوونەکانتان خودا رزقو رۆزیتان دەداو سەرتان دەخا بەسەر دوژمنتاندا، (بوخاری) لە هەمان کاتدا دەبێ خۆ لەوە بپارێزن کە بەهۆی ستەمکارو بەدکارەکانەوە داوای باران بکەن، چونکە هاوبەشیکردنی ئەو جۆرە کەسانە لەم کارە پیرۆزەدا وەك گاڵتە پێکردن وایە، لەبەر ئەوە دوور نیە کەببێ بەهۆی پتربوونی رقو قاری خودا لەو ناوچەیەدا. جا کاتێ گەیشتە نوێژگاکە پێشەوا یا پێشنوێژ بەجەماعەت دووركات نوێژی داوای بارانیان بۆ بکا، لەسەر شێوەی نوێژی جەژن، بە دەنگی بەرز فاتیحەو سوورەت بخوێنێ لە هەردوو رکاتەکەدا، چونکە لە فەرموودەدا وادەفەرموێ، شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەو سوورەتانەیان تیادا بخوێنێ کە لە نوێژی جەژندا دەخوێنرێن.

کاتەکەی کاتی نوێژی جەژنە، گوتراویشە: کاتی تایبەتی بۆ نیە. ئەوەوی وا دەفەرموێ، شافیعیش دەقی بەسەر داناوە، زانا لێکۆڵەرەوەکانیش ئەمە بە دروست دادەنێن. جا کاتێ لە نوێژەکە بوونەوە پێشنوێژ دوو وتار بخوێنێتەوە لەسەر بەرزیی یەك، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە نوێژە بارانەدا لەسەر دوانگە وتاری خوێندەوە، ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: رۆژێ خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} لەشار دەرچوو، رۆیشت بۆ نوێژە بارانە، لەپێشا بەبێ بانگو قامەت دوو

رکات نوێژە بارانەی بەجەماعەت بۆمانکرد، ئینجا وتاری خوێندەوە بۆمانو لەخوا پاڕایەوەو رووی کردە رووگەو هەردوو دەستی بەرزەوە کرد، ئەوجا بەرماڵەکەی کە کردبوویە ناوشانی هەڵی سووران راستو چەپیکرد. (ئەحمەدو ئیبنو ماجەو بەیهەقی). لە وتاری یەکەما (استغفار)ێکی زۆربکا هەروا لە وتاری دووەما، چونکە (استغفار) بۆ ئەم شوێنە زۆر لەبارە، ئەوپەڕی سڵ لەوە بکا کە بەزمان بپاڕێتەوەو داوای لێخۆش بوون لەخوا بکاو دڵیشی لای تاوانو گوناهبێ، یا نیازی وابێ کە دەست لە ستەمکاریو ناهەقی هەڵنەگرێو حەددی شەرعی جێبەجێ نەکاو بەردەوام بێ لەسەر ناپاکیکردن لەگەڵ میلەتەکەیدا، کەوان لەچاو دێری ئەودا، دیارە کە لە بارودۆخی ئاوادا بەکۆڵێ قینو قاری خوداوە دەگەڕێتەوە، وەکی تریش ئەوەی بەزار تەوبە بکاو بەکردار بەردەوام بێ لەسەر تاوانەکەی وەك گاڵتە بەخوا بکا وایە، خوا ناخەڵەتێ، چۆن نزای نزاکەری ئاوا گیرا دەبێ؟

**دەگێڕنەوە:** جارێ ئیمامی عومەر {رەزای خوای لێبێ} داوای بارانی لەخودا کرد بەڵام هەر ئیستیغفاری کردو بەس، عەرزیانکرد، قوربان! ئەی گەورەی موسڵمانان! نەماندیت کە داوای باران بکەی؟ تۆ بەس ئیستغفارت کرد، ئەوە بۆ؟ فەرمووی: با من لەخودا داوای بارانم کرد بەهۆی ئیستغفارەوە، کە بەڕاستی ئیستغفار بورجی بارانبارینی ئاسمانە، نەك ئەو کۆمەڵە ئەستێرەیەی کە ناویان ناون. مەجادیحی سەماء: بورجەکانی باران لەئاسمان. ئەوجا بۆ سەلماندنی فەرموودەکەی خۆی ئەم ئایەتەی خوێندەوە، کەحەزرەتی نووح بەگەلەکەی خۆی فەرموو: {اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ، يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا} لە

پەروەردگاری خۆتان داوای لێخۆشبوون لە تاوانەکانتان بکەن، بە راستی ئەو خوایەکی تاوانپۆشە ئەگەر ئێوە بەراستی تەوبە بکەن‌و داوای لێبوردنی لێ بکەن هەم تەوبەکەتان قوبوڵ دەکا، هەم تاوانەکانتان بۆ دەپۆشێ هەم دەرووی رەحمەتتان لێ دەکاتەوەو لە ئاسمانەوە بارانی فریارەسی خوڕ زمتان بۆ دەبارێنێ‌و لەم قاتو قڕی‌و بێ رانییەش رزگارتان دەکا). جا لە پاش سەرەتای وتاری دووەمەوە رووبکاتە رووگەو زۆر بەکوڵ‌و زۆر بەدڵ نزایەکی زۆر بکاو بەنهێنی‌و بە ئاشکرا بپاڕێتەوە، بلاڵتەوە، لەو کاتەدا کەروو دەکاتە رووگە ئەو بەرماڵە، یا ئەو جلە کەراست‌و چەپ کردوویەتە ناوشانی هەڵی بسووڕێنێ، لای راستی بخاتە لای چەپ‌و لای چەپی بخاتە لای راست، خەڵکەکەیش وەك ئەو بەرماڵەکەیان وەچەرخێنن، بەپێی فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە کە لە پێشەوە رابورد، ئەوەیش ئاماژەیە بۆ ئەوە خوا یاربێ ئاوا حاڵ لە ناخۆشییەوە دەگۆڕێ بۆ خۆشی‌و لەگرانییەوە بۆ هەرزانی‌و لە تورەبوونەوە بۆ لێڕازیبوون. وە هەردوو دەستی بەرز بکاتەوەو ئەو نزایەی کە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} خوێندوویەتی ئەوە بخوێنێ‌و دوا ئەوەیش هەتا دەتوانێ بە نهێنی‌و بەئاشکرا نزایەکی زۆر بخوێنێ، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: {ادْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً - سورة الأعراف - ٥٥/٧} واتە: ئەی بەندەکانی من! بەکوڵی دڵ، بەزمانێکی پاك داوای نیازی خۆتان لە پەروەردگاری خۆتان بکەن، ئەوەی پێویستبێ بۆ گیرابوونی نیازتان‌و بۆ بەدیهێنانی مرازتان بەجێی بهێنن، کەواتە: بەدلگەرمی‌و بەملکەچی‌و بە کەساسی‌و بەنهێنی‌و بەبێ هات‌و هاوار لەخودا بپاڕێنەوە). جا کاتێ پێشنوێژ بەپەنامەکی نزا دەخوێنی، خەڵکەکەیش نزای خۆیان بخوێنن، بەڵام کاتێ ئەو دەنگی لە نزاکردن

بەرزەوە کرد ئەوان ئامین بکەن. ئەمەیش نزاکەی پێغەمبەرە: **(اللهم سقيا رحمة لاسقيا عذاب ولا محق ولا بلاء ولا هدم، اللهم على الظراب والآكام، ومنابت الشجر وبطون الاودية، اللهم حوالينا ولا عليما، اللهم اسقنا غيثا مغيثا هنيئا مريئا غدقا مجللا سحا طبقا دائما اللهم اسقنا الغيث ولا تجعلنا من القانطين، اللهم ان بالعباد والبلاد من الجهد والجوع والضنك مالا نشكو الا اليك، اللهم انبت لنا الزرع وادرّ لنا الضرع وانزل علينا بركات السماء، وانبت لنا من بركات الأرض واكشف عنا من البلاء مالا يكشفه غيرك، اللهم إنا نستغفرك انك كنت بنا غفارا فارسل السماء، علينا مدرارا) ( رواه الشافعي عن سالم بن عبدالله)** واتە: ئەی خودایە! بارانێکی ڕەحمەتمان بۆ بڕەخسێنە، لامانده لە باراناوی سزاو لافاوی بێ پیتی زیانبەخش، بەدووربین لە بارانی تاقیکردنەوە کە ببێ بەهۆی وڵات کاول بوون خودایە! بەسەر سەری کێوو پاڵو ناو شیوو دۆڵو لەوەڕگاکانا بیبارێنە، ئەی خوایە! لە دەورو بەرمان بیبارێنەو بەسەر سەرمانا نا، خودایە! بارانێکی ڕەحمەتمان فریاخە، کەببێ بەمایەی عەیشو نۆشو ئاوی چەمو کانیاوی پێ بزێ، ڕووی زەوی بەرووەك داپۆشێ! بەخوڕزم ببارێ، سەرو مڕو سەقامگیرو داگربێ، خودایە! بارانمان فریاخە، لەوانە نەبین کە لە ڕەحمەتی تۆ ناهومێد بوون، خودایە! بەندەکانو وڵاتەکان لە تەنگانەدان، تووشی برسێتیو گرانیو تەنگانە بوون، کەسی تر نیە سکاڵای بەرینە بەر لەم لایەنەوە خۆت نەبێ، خودایە! ڕوەکمان بۆ بڕوێنە، ئاژەڵمان بۆ بهێنە شیر، پیتو فەڕ لە ئاسمانەوە ببارێنە بەسەر سەرمانا، لەپیتو فەڕی زەویمان بۆ بڕوێنە، دەردو بەڵامان لەسەر لادە، چونکە بەتۆ نەبێ بەکەسی تر ناڕەوێتەوە. خودایە! ئێمە بەکوڵ داوای

تاوانپۆشی لە تۆ دەکەین، بەڕاستی تۆ هەمیشە چاوپۆشیکەر بووی لە ئێمە، جا کەوایە بە رەحمەتی خۆت بەخوڕزم لە ئاسمانەوە بارانێکی رەحمەتمان بۆ برەخسێنە. (شافیعی – لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە - گێڕاویەتەوە) سوننەتە مرۆڤ خۆی بشۆرێ یادەس نوێژ بگرێ بەلافاوێ کەلەو بارانە هەڵسابێ، باشتر وایە هەردوو لا بکات، لە مەجمووعا وا دەفەرموێ: کاتێ دەنگی هەورە تریشقە دەژنەوێ بڵێ: (**سبحان من يسبح الرعد بحمده والملائكة من خيفته**). (ئیمامی مالیك گێڕاویەتەوە) بروسکەیش بەم پێوەرە دەپێورێو لەکاتی دیتنی بروسکەدا ئەم تەسبیحاتە زۆر لەبارە: (**سبحان من يريكم البرق خوفا وطعما**) سوننەتە کەچاو نەبڕێتە چەخماخەو برووسکە، چونکە پێشینانە باشەکان ئەوەیان بەناباش داناوە لەکاتی دیتنیدا دەیانفەرموو: (**لا الله الا الله وحده لاشريك له . سبوح قدوس**). ماوەردی دەفەرموێ: واپەسەندە کە لەمەدا بکرێن بەسەر مەشق، سوننەتە لەکاتی داباریني باراندا بڵێ: (**اللهم صَيِّباً**): خودایە! بارانێکی خوڕزمی بەسوود (بوخاری). وە بەئارەزووی خۆی نزابکا، چونکە بەیهەمقی {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: کەنزا لەم چوار شوێنەدا گیرا دەبێ: کاتێ لەریزی شەڕدا بەرەنگاری یەکتر دەبەن، کاتێ باران دادەکا، کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێ، کاتی دیتنی کەعبە وە لەو پاش بارانەکە بڵێ: (**مطرنا بفضل الله علينا ورحمته لنا**) لە سایەی خواوە لە رەحمەتی خواوە بارانمان بۆ باری!). جنێودان بە بازۆر خراپە، بەڵام لەکاتی هەڵکردنی بادا سوننەتە نزابکا، لەحەیثدا دەفەرموێ: با بەشێکە لەرەحمەتی خوا، جاری واهەیە رەحمەت دەهێنێ، جاری وایش هەیە زەحمەت دەهێنێ، جا کاتێ دیتان وا

با هەڵیکرد جنیوی پێ مەدەن، بەڵکوو لەخوا داوا بکەن کە لەخێری ئەو بایە بەشتانیدا، وە پەنا بگرن بەخوا لە شەڕی ئەو بایە. بەیهەقی {رەحمەتی خوای لێبێ} لە کتێبی شیعەبول ئیمانا لە موحەممەدی کوڕی حاتەمەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ. بە ئەبو بەکری ئەل – وە راقم گوت : شتێکی وام فێر بکە کەلە خودا نزیکم بکاتەوە لەمەردوم دوورم بکاتەوە؟ فەرمووی: ئەوەی کە نزیکت دەکاتەوەو لەخواوە ئەوەیە کەداوای بەخشیشی لێ بکەی، ئەوەیشی کەلەو خەڵکە دوورت دەخاتەوە ئەوەیە کەداوای هیچیان لێ نەکەی، چاوت لە دەستیان نەبێ، ئینجا ئەبو هورەیرەوە گێڕایەوە کە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەرفەرموێ: هەرکەسێ داوا لەخوا نەکا خوا رقی لێ دەگری ! ئینجا ئەم شیعرانەی خوێندەوە:

لاتسألن بنی آدم حاجة
وسل الذی أبوابه لاتحجب
الله یغضب ان ترکت سؤاله
وبنی ادم حین یسأل یغضب!

**واتە:**

داوای هیچ مەکە لە ئادەمیزاد
لەخواداواکە: مرازو مراد
خوا پێی ناخۆشە داوای لێ نەکەی
مرۆڤ پێی خۆشە داوای لێ نەکەی

## ١٠٠) باسی نوێژی ترس:

نوێژی تـرس بـەقورئانو سـوننەتو یـەکگرتنی نەتـەوە دامـەزراوە، خوای مەزن دەفەرموێ: {وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ – سورة النساء – ١٠٢/٤) تاکۆتـایی ئایـەت. خۆشەویـستیش (درودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: چـۆن دەبینن من نوێژ دەکەم ئێوەیش رێك ئـاوا نوێـژ بکەن، دەی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەم نوێژەی کردووە، لەپاش وەفاتی خۆی هاورێکانیـشی ئەم نوێژەیان کردووە، (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە یارانی)، جا لەبەر ئەوە بووە بەیەکگرتن، وەکی تریش هۆی رەوا دیتنی هەرماوە، کەواتە ئـەویش وەك نوێژ کورتکردنەوە هەردەمێنێ. لە ماڵەوەو لە سـەفەردا ئـەم نوێـژە دروستە. ئەم نوێژە سێ جۆری هەیە:

**جۆری یەکەم:** ئەوەیە کە دوژمن لە غـەیری لای رووگـەوە بـێ، لـەم کاتەدا ئیمام خەڵکەکە بکا بەدوو بەشەوە، بەشێکیان رووبـەرووی دوژمـن رادەوەستنو، بەشەکەی تـریش لەگـەڵ ئیمامـا سـەرەتای نوێـژ دەسـت پـێ دەکەن ئیمام رکاتێکیان پێ بکا، جا ئـەم بەشـە، کاتـێ ئیمـام هەڵسایەوە، ئەوان نێتیجیایی لە ئیمام بێنو بۆ خۆیـان رکـاتی دووەم تـەواو بکـەنو سڵاو بدەنـەوەو بـڕۆن بـۆ بەرابـەر دوژمـنو بەشـی دووەم بـێن، کـە هـەتا ئێـستا بەرابـەر دوژمـن بـوون، بـێن لـە پـشتی ئیمامـەوە نوێـژ دابەسـتن، وەئیمـام رکـاتی دووەم لەگـەڵ ئـەمانا بخوێنـێ، کاتـێ ئیمـام دانیـشت بـۆ تەحیات ئەمانیش راست ببنەوەو رکاتی دووەم تەواو بکەن، وەئیمام هـەر لەنوێـژدا بمێنێتـەوە، چاوەڕوانیی ئەمانـە بکـا، لـە تـەحیاتا، هـەتا ئـەوان

پێی دەگەنەوەو سلاوی نوێژەکەیان لەگەڵدا دەداتەوە، ئەمەیش لەسەر ئەم شێوەیە وێنەی نوێژی پێغەمبەرە {درودی خوای لەسەربێ} لە غەزای (زاتو لریقاع)دا، لەسەر ئەم شێوەیە شەیخان لە سوهەیلەوە گێڕاویانەتەوە. زاتو ریقاع جێگەیەکە لە ولاتی نەجد، ئەم غەزایە ئەم ناوەی لێنرا بە ناوی درەختێکەوە کەلەو جێگەیەدا بوو بەم ناوە، دەگوترێ: ئەم غەزایە بۆیە واناونراوە چونکە بەهۆی رۆیشتنی زۆرەوە پێیان شەقار شەقار بووبوو، لەبەر ئەوە قاچیان بەپەڕۆو پاڵ پێچابوو، لە عەرەبیشدا بە پەڕۆو پاڵ دەگوترێ: ریقاع، کەواتە غەزای زاتوریقاع، بەکوردی پێی دەگوترێ: غەزا پەڕۆینە[1].

**جۆری دووەم:** ئەوەیە کە دوژمن لەتەرەفی قیبلەوە بێ، جائیمام خەڵکەکە بکا بەدوو بەشەوە، هەربەشەی بکا بەریزێ، جا نوێژ دابەستێ لەگەڵ هەموویان، جا کاتێ گەیشتن بەکوڕنووشی یەکەمی رکاتی یەکەم رێزێکیان لەگەڵ پێشنوێژ کوڕنووش بەرن و ریزەکەی تریان پاسی ئەمانە بکەن. کە پێشنوێژو ریزەکەی لە گەڵیدا کوڕنووشیان بردو راست بوونەوە بۆ رکاتی دووەم، ریزی پاسەوان سوژ دەببەن و راست ببنەوەو

---

[1] لە کوردی خۆماندا دەڵێن: شەخصە پەڕۆینە. لێرەدا فیقهولویەسەرەکە ئاوابوو: (وذات الرقاع موضع بنجد سميت! بذالك لانهم لفوا على بواطن اقدامهم الخرق... الخ) بەپێی (کفاية الاخيار)ەکە ساخم کردەوە وەك لە سەرەوە وەرم گێڕان چونکە شوێنەکە ئەگەر خۆی لە پێشدا ناوی ژاتوریقاع بێ ئیتر چۆن ناو دەنرێتەوە شوێنە پەڕۆینە! ئەمە هۆی ناوی قەزاکەیە نەك جێگەکە.

- وەرگێڕ -

بگەنەوە بە ئیمامو رکاتی دووەم بخوێنن، کاتێ گەیشتن بەسوژدەی رکاتی دووەم ریزی پاسەوانی پێشوو لەگەڵ ئیمامدا سوژدە ببەنو ریزەکەی تر پاسەوانی بکەن، هەتا ئەمان لە کورنووش سەربەرز دەکەنەوە. جا ئەوانیش کورنووش ببەنو لەگەڵ ئیمامو ریزەکەیدا تەحیات بخوێنن وەپێشنوێژ سلاوی نوێژیان پێ بداتەوە. ئەمە وێنەی نوێژی حەزرەتی پێغەمبەرە {درودو سلاوی خوای گەورەی لەسەربێ} لە غەزای عەسفاندا ، ئەبو داوودو کەسانی تر ئەمەیان گێڕاوەتەوە. ئەم شێوەیە ئەم سێ مەرجەی هەیە:

**جۆری یەکەم**: ئەوەیە کە دوژمن لەلای رووگەوەبێ.

**جۆری دووەم**: ئەوەیە کە دوژمن لەسەر کێوێ، یا لەسەر راستاییەکی وابێ، کە لەبەر چاوی موسوڵمانەکان ون نەبن.

**جۆری سێیەم** : ئەوەیە کە موسوڵمانان ئەوەندە زۆر بن، کەبکرێن بە دوو بەشەوە، کە بەشێکیان کورنووش بباو، ئەو بەشەی تریان ببن بە پاسەوان.

**جۆری سێیەم**: ئەوەیە کەشەڕ گەرم بێو ترس زۆر بێو، بڕژێنە ناو یەکەوەو مەودای ئەوە نەبێ کەببن بەدوو بەشەوە لەم حاڵەدا بەهەر جۆرێ بۆیان رێك بکەوێ نوێژ بکەن دروستە بە سواری پێ یا بەپیادە، باڕووشیان لەرووگە نەبێ، چونکە یەزدانی مەزن دەفەرموێ: (**فان خفتم فرجالا او رکبانا**) (تەماشای باسی - ٥٥ بکە - وەرگێڕ). جا لەم کاتەدا ئەگەر چەمینەوەو کورنووشی تەواوی بۆ نەدەکرا بابە ئاماژە بیانکا، لەبەر ناچاری، وەبۆ کورنووش کەمێ زیاتر لارببێتەوە. ئەگەر ئەمەیشی بۆ نەکرا، چۆن بۆی دەلوێ ئاوا نوێژ بکا دەبێ.

## ۱۰۱) بەکارهێنانی ئاوریشمو زێڕ:

بۆ پیاوان پۆشینو لەبەرکردنی ئاوریشم نادروستە، هەروا خۆپێ پۆشینو پاڵ پێوەدانیو لەسەر دانیشتنیو بەخۆوە پێچانی، هەرواکردنی بەبەری جلو بەرگو کردنی بەچەرچەفو رووپۆش بۆ لێفەو دۆشەكو کردنی بەپەردە. وە هەموو جۆرە بەکار هێنانێکی تری نادروستە، بەلگەی ئەمەیش نەیی پێغەمبەرە لەمە، لە گێڕانەوەی بوخاریدا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {درودو سڵاوی خوای لێبێ} رێگەی نەداوین ئاوریشمو دیباج لەبەرکەین، یا لە سەریان دابنیشین. هۆی ئەم نەیی لێکردنە ئەوەیە: ئاوریشم ئەم دووشتەی تیادایە: دەعیەو فیزو هەوا بە مرۆڤ پەیدا دەکاو لە هەمان کاتدا ژنانەیە، لەبەر ئەوە بۆ پیاوی مەرد ناشێو کەمییە بۆ شانو شەوکەتی، ئەوەتا کەسانێ لە بەری دەکەن کە خوێریو سەر ژنانینو لاسایی ژنان دەکەنەوە، لە ئیسلامیشدا پیاو پیاوەو ژن ژنە، لەبەر ئەوە لاسایی کردنەوەی ژنان نادروستە، بۆ لەبەرکردنو بەکار هێنانی ئاوریشم نێرەمووك حوکمی پیاوی هەیە، چونکە دووربینی ئەوە دەکرێ کە نێرینە بێ. بەلام پۆشینی بۆ ژنان دروستە چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: زێڕو ئاوریشم بۆ مێیینەی ئومەتم حەلالە، بەلام بۆ نێرینەیان حەرامە.(ئیمام ئەحمەد لە موسنەدی خۆیا گێڕاویەتەوە). تیرمذیش لە بارەیەوە فەرموویەتی: جوانو دروستە (حسن صحيح) حیکمەتێکی ناسکی شەرعی تیایە کە ئەوەیە پۆشینی ئاوریشم لەلایەن ژنەوە هەوەسی پیاو هەڵ دەسێنێو لەگەڵ زۆر دروست دەبێو، ئەوەیش دەبێ بەهۆی زۆربوونی نەتەوە، شتی وایش پێغەمبەری خوا، کە گەورەو سەروەری پێشینانو پاشینانە،

لەگەڵی ئیسلامی داواکردووە. بۆ نادروستی کەم‌و زۆر جیایی نیە، چونکە حەزرەت بەبێ مەرج دەفەرموێ: ئێوەی پیاوان ئاوریشم‌و دێباج مەپۆشن، لە حاجەتی زێڕو زیودا شت مەخۆنەوە، ئەمانە لە جیهانا بۆ ئەوانن‌و لە بەهەشتا بۆ خۆمانن!. (شەیخان). لە نادروستیدا شتی رەنگ کراو بەزەعفەران، جا هەمووی رەنگ کرابێ، یا هەندێکی، بڕیاری ئاوریشمی بۆ هەیە. بەڵام ئەگەر چنراوەکە تێکەڵ بوو لە ئاوریشم‌و شتێ تر وەك کەتان‌و لۆکە، ئەوە سەرنج دەدەین: ئەگەر زۆربەی ئاوریشم بوو نادروستە، ئەگەر زۆربەی ئاوریشم نەبوو دروستە، کام لایەیان زۆر بێ حوکمەکەی ئەو زاڵ دەبێ هەتا ئەگەر لەپارچە یەکا هەردوولایان یەکسان بوون، رای راستتر ئەوەیە کە دروستە، چونکە پێی ناگوترێ ئاوریشم، بنەڕەتیش لە بەهرەدارەکاندا رەوابوونە. گوتراویشە: لەم کاتەدا نادروستە لای نادروستی زاڵ دەکرێ بەسەر لای دروستیدا، چونکە یاسا وایە: کاتێ حەلاڵ‌و حەرام کۆبوونەوە لە شتێکا، ئەو شتە حەرامە، لەکاتی ناچاریدا پۆشینی ئاوریشم دروستە، وەك شەڕێکی کوتوپڕی، کە پیاو فریا نەکەوێ جلی تر پەیدا بکا، یا لەبەر پێداویستی، وەك بۆ چاری گەرماو سەرماو خۆروو ئاڵشت‌و ئەسپێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەبەر شتی وا ڕێگەی عەبدورەحمانی کوڕی عەوفی دا کەلەبەری بکا، هەروا بۆ پۆشینی شەرمگا لەناو نوێژا، ئەگەر شتی تری دەست نەکەوت.

چاو پۆشی دەکرێ لە پۆشینی جلێ کەقەراخی چاك‌و یەخەو گیرفان‌و سەردەست‌و داوێن‌و دەرەلنگی گیرابێتە ئاوریشم، خوا دیوی دەرەوەیان، خوا دیوی ناوەیان. سەر بەلگەی ئەم بڕیارەش چەن

فەرموودەیەکە، یەکێکیان ئەوەیە کە موسلیم لە عومەرەوە {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ڕێگەی نەداوە کە ئاوریشم لەبەر بکرێ، مەگەر بۆ نەخش، ئەویش بەقەد جێگەی دووسێ پەنجە،یاسێ چوار پەنجەبێ.

## ١٠٢) ئەوەی بۆ مردوو پێویستە:

بۆ مردووی موسڵمان ئەم چوارشتە پێویستن: شۆردنی‌و کفن کردنی‌و نوێژ لەسەر کردنی‌و ناشتنی.

١) **شۆردن:** لای کەمی شۆردن ئەویە: لەپاش لابردنی هەر پیسییەك کە بە لەشیەوە، یا لابردنی هەر شتێ کە نەهێڵێ ئاوەکە بگاتە سەر پێستی، هەموو گیانی مردووەکە بە ئاوێکی پاك‌و پاکەوەکەربشۆرن. چونکە ئەم ئەندازەیە پێویستە لەسەر زیندوو لەکاتی لەشپیسی دەرکردندا. نێت مەرج نیە، لە لایەن ئەو کەسەوە کە دەیشوا، گریمان ئەگەر کافریش بیشوا بری دەکەوێ! هەر لەسەر ئەم بنیاتە خنکاو لە ئاوا ناشۆرێ، چونکە پاك بۆتەوە. هەیشە دەڵێ دەبێ خنکاو لەئاوا بشۆرێ چونکە ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە بیشۆرین، دەی ئەرکی سەرشانمان جێبەجێ ناکرێ هەتا بە کردەوە نەیکەین، ئەگەر مردوو لەبەر سووتان‌و شتی وا دارزابوو، بە جۆرێکی وا ئەگەر بشۆررێ لێی هەڵدەوەرێ‌و گۆشتەکەی دادەوەشا ئەوە ناشۆرێ، بەڵکوو تەیەمومی بۆ دەکرێ، ئەگەر بۆ مردووی پیاویش بەس ژنی بیانی هەبوو کە بیشوا، یا

بۆ مردووی ژن بەس پیاوی بێگانە هەبوو کە بیشوا، ئەوە لەم دووحاڵەتەدا، بە دەسکێشەوە تەیەموم بۆ مردوەکە دەکرێ!.

بەلام منداڵێ کە نەگەیشتبێتە رادەی ئارەزوو جووڵاندن، پیاوو ژن بۆی هەیە کەبیشوا، نێرو مێی گەورەیش حوکمی ئەم منداڵەی هەیە، کافرێ کە ئەهلی ذیممە نەبێ، شۆردنو کفنکرن واناشتنی دروستە، بەلام دروست نیە نوێژی لەسەر بکرێ. بەلام کافری خاوەن پەیمان کە پێی دەگوترێ ذیممی، پێویستە کە بشۆرێو کفن بکرێو بەخاك بسپێررێ، لەبەر جێبەجێکردنی مافی پەیمانەکەی، هەروا کافرێ کە موعاهەدبێ، بەلام کافری لە ئیسلام هەلگەڕاوەو بێبڕوای جەنگی ئەم دووە نەشۆردنو کفنو نە ناشتنیان پێویست نین، بەلکوو دروستە کە کەلاکەکەیان فڕەبدرێتە بەرسەگ، چونکە ئەم دووە لە شەرعا رێزیان بۆ دانەنراوە. ئەوەندە هەیە ئەگەر خەلك بە بۆگەنیان زیانەومەند دەبوون پێویستە کەلاکەکەیان بکرێ بەژێر خۆڵەوە. مردوو سوننەت ناگرێ بە بیانووی ئەوەوە کەژێرچەرمی سەری چووکی بشۆررێ!

٢ ) **کفنکردن**: لای کەمی، لۆیەکفنە چ بۆژن، چ بۆ پیاو چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمانی فەرموو: کە موصعەبی کوڕی عومەیر لە بالاپۆشەکەی خۆیدا کفن بکرێ، کە تەنیا ئەو لۆجلەی هەبوو کە مرد (شەیخان).

راجیایی هەیە لە ئەندازەکەیدا. هەندێ دەفەرموون: بریتییە لەو ئەندازەیە کە شەرمگای پیاو، یا ژن، داپۆشێ. هەندێ تر دەفەرموون: ئەوەیە کە هاودامان بێ هەموو لەشی مردووەکە داپۆشێ، تەنیا سەری

پیاوو ژنی لێدەرچێ کە لە ئیحرامی حەج و عەمرەدا مردوون. ئەوەوی فەرمایشتی دووەم بە دروست دادەنێ، ئیبنولقری، وەك ئە ذروعی، ئەم رای دووەمە پەسەند دەکات، لەمەدا جەماوەری زاناکانی خۆراسان سەرمەشقیانە.

٣) **نوێژکردن لەسەری:**، کە بڕیارەکەی لەمەولا دێ.

٤) **ناشتن:** لای کەمی چاڵێکی وایە نەهێڵێ بۆنی مردووەکە بێتەدەرەوە، رێگەی دڕندە نەدا کە مردووەکە دەرکێشێتە دەرەوە.

## دووکەس نەدۆشۆرێن و نە نوێژیان لەسەر دەکرێ:-

**یەکەمیان:** شەهیدە. گەرچی کوژراوی بەناهەق و خنکاو لە ئاواو کەسێ بەژێرەوە بووبێ و کەسێ بەدەردی سك بمرێ و مەرگی کوتوپڕو کەسێ لە کافرسانی بمرێ و ژنی زەیستان، ئەمانە هەموو شەهیدی قیامەتن، بەڵام ئەمانە هەم دەشۆرێن و هەم نوێژیان لەسەر دەکرێ، بەڵام مەبەست لەو شەهیدەی کە ناشۆرێ و نوێژی لەسەر ناکرێ ئەم شەهیدانەیە: کەسێ لە شەڕی کافرانا بەهۆی شەڕەوە کوژرابێ، وەك ئەوە کافرێ کوشتبێتی، یا موسوڵمانێ بە هەڵە کوشتبێتی یا چەکەکەی خۆی بۆیگەڕابێتەوە، یا لە ماینەکەی گلابێ، یا وڵاخەکەی لەقەو جووتەی لێدابێ، یا کەوتبێتە ناو هەڵدیرێکەوەو مردبێ، یا لە شەکەی لە پاش تەواوبوونی شەڕەکە بە کوژراوی بدۆزنەوەو هۆی مردنەکەی نەزانرێ، بۆ ئەمەش رەسیدەو منداڵ یەکسانن، هەروا ئازادو بەندەو پیاوو ژن لە مەدا چون یەکن. بوخاری لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} شەهیدەکانی ئوحودی نەشۆرد، وە نوێژیشی لەسەر نەکردن.

لـەم بڕیـارەدا لەشپاكو لەشپیس چونیەكن، چونكە حـەنظـە لـە {ڕەزای خوای لێبێ} لەشـی پیـسبوو كـە لـە غـەزای ڕۆژی ئوحـوددا شـەهیدكرا، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فـەرمانی نـەكرد بـە شـۆردنی، فەرمووی: دیم كە فریـشتەكان دەیـان شـۆرد. ئـەو شـەهیدەی لەسـەر ئـەم شێوەیە بكوژرێ ئەوە شەهیدی دنیاو قیامەتـە، لـەو دەسـتەیەیە كـە خـوا لەوەسـپی جوانیـان {عِنـدَ رَبِّهِـمْ يُرْزَقُـونَ فَـرِحِينَ بِمَـا آتَـاهُمُ اللَّـهُ مِـن فَضْلِه – سورة آل عمران – ٣/١٦٩ – ١٧٠}.

بـەلام ئـەوەی كەلـەم حاڵەتانـەدا لەسـەر شـێوەیێ كـە مایـەی ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە نـەبێ، كوژرابـێ، ئـەوە بـە شـەهیدی قیامـەت دانانرێ، بەڵام لە دنیادا بە شەهید دادەنرێ لەبەر ئـەوە نەدەشـۆرێو نـە نوێـژی لەسـەر دەكـرێ، ئەمانـەیش وەك: كەسـێ لـە شـەڕی بـێ بڕوایانـا پشتی لە كافر هەلكردبێو لە هەمان كاتـدا خـۆی نەگەیاندبێتـەوە كـۆڕی شەڕ لە لایەكی ترەوە واتە: هەڵهاتبێ لەبەر كافرو كوژرابێ، یا چووبێ بۆ لای دەستـەیەكی بێهێز، یا بۆ ڕیابازی جەنـگ بكـا. ئـەم جـۆرە كەسـانە لـە قیامەتدا لە خەلاتی شەهیدانا بەشدار نین.

**دووەم**: لەوانـەی كـە نەدەشـۆرێنو نـە نوێـژیان لەسـەر دەكـرێ: منداڵی لەبارچووە. منالی لەبارچوو دوو حاڵەتی هەیە:-

حاڵەتی یەكەم: ئەگـەر نیـشانەی ژیـانی پیوەبـوو، وەكـووو جووڵـەو دەنگو گریانو ڕوانینو شیرخواردن، ئەوە هەم دەشـۆردرێو هـەم نوێـژی مردووی لەسەر دەكرێ، چونكە سوور دەزانین كە ئەو خاوەن ژیـان بـووە، بەپێی فەرموودەی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} كـە دەفـەرموێ: هـەر كاتـێ

منـــاڵ نیـــشانەی ژیـــانی پێوەبـــوو، وەکـــوو قیـــژەی گریـــان، ئـــەوە هـــەم بەشـــەمیراتی بـــۆ دادەنـــرێ، هـــەم نوێـــژی لەســـەر دەکـــرێ (نەســـائی گێڕاویەتـــەوە، ئیبنـــو حـــەببان و حـــاکم بـــە درووســـتیان دانـــاوە) وە دەفەرموێ: بەپێی مەرجی شەیخەینە، کە دایان ناوە بۆ ساخی و دروستی فەرمووده.

**حاڵـەتی دووەم:** ئەوەیـە کـە بـە دروسـتی نـەزانرێ کـە ئایا گیـانی کـراوە بەبـەرا یانـا، چـونکە نیـشانەی ژیـانی پێـوە نیـە، جا ئەگـەر چوار مانگانە دەبوو کە منداڵ لە ناوسکی دایکیدا لەم تەمەنەدا ڕۆح دەکرێ بە بەریدا، یاخود لە چوار مـانگ زیـاتر بـوو، ئـەوە نەشۆردنی لەسـەرەو نـە نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام پێویستە کفـن و دەفـن بکـرێ.ەلێ منـداڵێ کـە سـەرو شـێوەی ئـادەمی تیـا دەرنـەکەوتبوو، وەکوو پارچـە گۆشـتێ وابـوو، ئـەوە شـۆردن و نوێـژو کفنـی نـاوێ، بـەڵام سـونەتە پەڕۆیـەکی پێـوە بپێچرێ و بشاردریتەوە لەناو خاکا.

## ١٠٣) سوننەتەکانی شۆردنی مردوو:

لەپێشەوە لای کەمیی شۆردنی مردوو باسـکرا. بـەڵام باشـترینەکەی ئاوایـە: لـە پەناگایـەکا بیـشۆرێ، کـەس نەچـێتە دیـاری، جگـە لـە مردووشـۆرەکەو ئەوانـەی کـە یاریـدەی دەدەن، وا باشـە ئـەو شـوێنە سەرداپۆشرابێ، وە لەسەر تەختەیەکی بەرز یا شـتێکی بـەرز دایبنـێ، بـە ئاوێکی سارد بیشۆرێ، چونکە ئاوی سارد لەش پنردەکاتەوەو توندو تـۆڵی دەکا، مەگـەر لەبـەر پێداویـستی ئـاوی گـەرمی شـلەتێن بـەکار بێنـی بـۆ

شۆردنی، وەك چلكنیو شتی وا، واباشە كە مردوو شۆرەكە مردووەكە لەسەر تاتە شۆرێكی بەرز دابنیشێنێ، بە شێنەیی، بە چەشنێ كە كەمێ لاربێتەوە بۆ لای پشتەوە، وە پشتی بدا بە ئەژنۆی راستی خۆیەوە، دەستی بهێنێ بەسەر سكیدا هێز بخاتە سەر دەستی، بۆ ئەوەی ئەگەر پوخڵییەكی تیابێ دەربچێ، ئەمجار بەسەر پشتا لەسەر پشت رای بكێشێ، بە دەستی چەپی، بە دەسپێچێكەوە، شەرمگای بەرو دوای بشۆرێ، پاشان ئەوە فڕەداو دەسپێچێكی تر بكاتە دەستی پەنجە بكا بە دەمیا، بیهێنێ بە سەردانەكانیدا، وە هەرچی لە كونەلووتەكانیا هەبوو پاكی بكاتەوە. واباشە لە دوا ئەمە كە مردوو شۆرەكە، دەسنوێژێكی تەواوی وەكوو هی زیندووی بۆ بگرێ، ئەوجا بەشتێكی بۆنخۆش وەك موردو گیا هێرۆوە بەماددەیەك كە شت پاك بكاتەوە وەك سابون سەری بشۆرێ ئەوجا ئاوێكی تێرو تەسەل بكا بەسەر سەریا، ئەوجا لای راستی بشۆرێ، ئەوجا لای چەپی بشۆرێ، وە لە هەموو ئەم شۆرینەدا شتێكی بۆنۆش، وەك مۆرد ئامێتەی ئاوەكە بكا، سوننەتە بۆ جاری دووەمیش وەك جاری یەكەم بیشواتەوە، وە بۆ جاری سێیەم هەموو لەشی، بە ئاوێكی رووت، وەك جارەكانی تر بشوا.

بوخاری {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: ئوممو عطییە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەری خوا {دروودو سڵاوو رەحمەتی خوای گەورەی لەسەربێ} تەشریفی هاتە ژوورەوە بۆلامان، ئێمە خەریكبووین تەرمی زەینەبی كچیمان دەشۆرد، فەرمووی: بە ئاوو مۆرد سێ جار بیشۆرن، یا پێنج جار، یا زیاتریش، ئەگەر زیاترتان بە پێویست زانی، لە دوا دەستدا كافووریشی تێبكەن، لە ئەندامە راستەكانیەوەو لە ئەندامەكانی دەسنوێژیەوە دەست پێبكەن بە

شۆردنی. ئوممو عەتییە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: جا قژەکەیمان کرد بە سێ بەشی یەکسانەوەو شانەمان کردو کردمان بە سێ پەلکەو بە پشتیا شۆڕمان کردەوە. سوننەتە کە سەرو ریشی (ئەگەر موویان پێوەبوو) بە شانەیەکی ددان شاش دابهێنێ، بەڵام بە شێنەیی، نەبادا موویان لێ هەڵوەرێ، ئەگەر شتێکی لێ هەڵوەری بیشۆرێو لە دواییدا لە پاڵیا، لەناو کفنەکەیدا دایبنێ، چونکە دەبێ رێز لە هەموو بەشێکی لەشی مرۆڤ بگیرێ بەپێی قورئان کە دەفەرموێ: {وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ – سورة الإسراء – ١٧/٧٠}.

جا لەپاش شۆردنی ئەگەر شتێکی لێدەرچوو، پێویستە کە لاببرێ، بەڵام شۆردنەوەی دوبارە کرێتەوە.

سوننەتە مردوو شۆر تەماشای هیچ شوێنێکی نەکا بەپێی پێداویست نەبێ، بەڵام نادروستە کە تەماشای شەرمگای بکا، یا بەبێ دەسپێچ دەست لە شەرمگای بدا، دەبێ ئەو کەسەی کە مردووە کە دەشوا سرپۆشبێ، ئەگەر شتێکی باشی بینی بیگێڕێتەوە. ئەگەر شتێکی ناباشی چاوپێکەوت حەرامە باسی بکا. باشتر ئەوەیە کە پیاو پیاو بیشۆرێو ژن ژن بیشۆرێ. بەڵام دروستیشە پیاو ژنی حەڵاڵی خۆی بشۆرێ، وەك هاوسەرو کەنیزەك، یا ژنەکەیشی کتابییەبێ وە ژن مێردی خۆی بشۆرێ، بەڵام ژنێ کە لە عیددەی تەڵاقی ریجعیدابێ، نە مێردەکەی بۆی هەیە ئەو بشوا، نە ئەو بۆی هەیە مێردە پێشووەکەی بشوا، ئەگەر بۆ شۆردنی ژن هەر پیاوێکی ناخۆیی (نامەحرەم) هەبوو، وە بۆ شۆردنی پیاو هەر ژنێکی ناخۆیی هەبوو، ئەوە دروست نیە مردووەکە بشۆرێ، بەڵکوو پێویستە تەیەمومی بۆ بکرێ.

## ١٠٤) ئەوەی لە کفندا سوننەتە:

لە پێشەوە کەمترینی کفن نووسرا. کفنی هەرە تەواو بۆ پیاو ئەوەیە سێ لۆبێ، کفنی زۆر باش ئەوەیە ڕەنگی سپی بێ، چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: جلی سپیش لەبەر بکەن، جلی سپی باشترین پۆشاکە بۆ ئێوە، وە بیکەن بە کفنیش بۆ مردووەکانتان! (ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبن ماجەو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە، تیرمیذی بە دروستی داناوە). لە ناو ئەم سێ لۆیەدا کراس و میزەریان تیادا نییە. بەڵکوو پەشتە ماڵێك و دوو لۆکفنی سەرتاپایی بەسە، پەشتە ماڵەکە بۆ نێوانی ئەژنۆو ناوکی،

**دووەم**: لە گەردنیەوە هەتا قولاپەی پێی بگرێتەوە.

**سێیەم**: باڵا پێچێکی وابێ هەمو جەستەی بە تەواوی داپۆشێ. ئەمەیش پەیڕەوی کفنی پێغەمبەر خۆیەتی {دروودی خوای لەسەربێ} لە صەحیحەیندا عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەسێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا، نەکراس و نەمێزەریان تیا نەبوو.

کفنی ژن سوننەتە پێنج لۆ بێ لەسەر ئەم شێوەیە: پەشتەماڵ و سەرپۆش و کراس و دوو باڵا پێچ: ئیزارو خیمارو قەمیص و لەفقافەتان ئەم شتانە هەموو لە سوننەتدا چەسپاون لە فەرموودەکەی لەیلای کچی قانیفی ثەقەفییەدا دەفەرموێ: ئوممو کولثومی کچی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە کۆچی دوایی کرد، خۆم یەکێك بووم لەو ژنانەی کە دەیان شۆرد، پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} لە لای دەرگاکە تەشریفی

دانیشتبوو، کفنەکەی ئەمو کەلپوومی پێ بوو، یارچە پارچە دەیدایە دەستمان: لە پێش پێشدا کراسەکەی دایە دەستمان، ئینجا سەرکراس، ئینجا سەرپۆش، ئینجا سەردەریی، لە پاش ئەمانە هەموو چەرچەفێکی ئاودامانیان تێوە پێچا.

(ئەحمەد/ ئەبو داوود). بزانن مردوو لە ژیانیدا هەرچی بۆ دروستبێ کە لەبەری بکا ئەوە بۆ کفنیشی دەست دەدا، کەواتە دروستە کفنی ژن لە ئاوریشم بێ، بەلاّم شتی وا ناباشە، چونکە ئیسراف و زادەڕۆوییە، بەلاّم بۆ پیاو دروست نیە، بەلاّم شتی بە زافەران و عەصفەران رەنگ کرابێ بۆ کفن باش نیە. پێلێ هەڵبڕین لە کفنا ناباشە. کفن دەبێ سفت بی، تەنك و شاش نەبێ، چونکە مەبەست خۆ گرتنی کفنەکەیە بە لەشەوە، نەوەك رازاوە.

## ١٠٥) نوێژی مردوو:

وەك لە پێشەوە زانیت نوێژی مردوو فەرزی کیفایەیە، مەرجە ئەو مردووەی نوێژی لەسەر دەکرێ: موسوڵمان بێ، شەهید نەبێ، منالێکی وا نەبێ کە نیشانەی ژیانی پێوە نەبووبێ، هەموو مەرجەکانی نوێژەکانی تر مەرجن لە دامەزراندنی نوێژی مردودا، سەرەڕای ئەوانەیش دەبێ مردووەکە، لەپێش نوێژەکەیدا شۆرابێ یا تەیەمومی بۆ کرابێ، ئەگەر شۆردنی لە توانادا نەبوو، بەلاّم مەرج نیە بە جەماعەت بکرێ، بەلکو جەماعەت لە نوێژی مردودا سوننەتە. بەپێی فەرمووده‌کەی موسلیم: هەر پیاوێ لە موسوڵمانان، کە دەمرێ، چل پیاو

(كه هیچ هاوەڵ بۆ خوا پەیدا نەكەن) نوێژ لەسەر تەرمەكەی بكەن، بێگومان كه خوا تكیان لیٚ گیرا دەكا بۆی. فەرزەكەی به ئەوەنده له كۆڵ دەكەویٚ كه نێرینەییٚ، یا مندالٚێكی فامیدەیش بیٚ، نوێژی لەسەر بكا، چونكه مەبەستەكه به ئەوەنده دێته دی، وەكی تریش هەموو كاتیٚ مندالٚی فامیده دروسته ببیٚ به پێشنوێژ بۆ پیاوان، سوننەته نوێژكەرەكان بكرێن به سیٚ ریزەوه، یا به زیاتر، بەپێی فەرموودەكەی كه دەفەرمویٚ: هەر بەندەیەكی موسولٚمان بمریٚو سیٚ ریز یا زیاتر، لەسەر تەرمەكەی نوێژ بكەن مسۆگەر خوا لێی خۆش دەبیٚ.

له پێشترین كەس به نوێژكردن لەسەر مردوو باوكه، ئەوجا باپیر ئەوجا باپیره گەوره، هەتا بڕوا بەرەوژوور، كوڕ، كوڕەزا، بەرەو خوارتریش، ئەوجا باوانو عەصەبه، لەسەر شێوەی ریزی میراتگران هەتا دەڕوا.

## ١٠٦) بنیاتەكانی نوێژی مردوو (ئەم حەوتەن):

**یەكەم**: نیەت. ئەگەر مردووەكه یەك كەس بوو نیەتی ئەو كەسەی لێدێنیٚ، ئەگەر چەن كەسیٚ بوون نیەتی ئەوانی لێدێنیٚ، دیاریكردنی مەرج نیه.

**دووەم**: بۆ كەسیٚ بتوانیٚ دەبیٚ راوەستیٚ.

**سێیەم**: چوار (الله أكبر)ه، ئەگەر پێنج (الله أكبر)یش بكا، نوێژەكەی پووچ نابێتەوه، چونكه شتیوا له صەحیحی موسلیمدا هەیه، سەرەرای ئەوەیش تەكبیركردن ذیكره نوێژیش به كردنی هیچ ذیكرێكی خوا پووچ نابێتەوه.

**چـوارەم**: خوێنـدنی فاتیحەیـە، لـە پـاش (الله أكـبر)ی یەكـەم لـە سـەهلەوە دەفـەرموێ: سـوننەتە كە لـە نوێـژی مـردوودا لـەپاش ئـەڵلاهو ئەكبەری نوێژدابەستن، بە پەیانامەكی سوورەتی فاتیحە بخوێنێ!

**پێنجەم**: سەلاواتدانە لەسەر پێغەمبـەر {درووده سڵاوو رەحمەتی خوای لەسەربێ} لەپاش (الله أكبر)ی دوهەم چونكە ئـەوە لـە حـەدیثی صـەحیحدا هەیـە: لای كەمی ئەمەیە: (**اللهم صل على محمد**)، لای هەرە تەواوی ئەمەیە: (**اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميد مجيد**.

**شەشـەم**: شـافیعی لـە موسـنەدەكەیدا لـە ئـەبو ئومامـەی كـوڕی سـەهلەوە دەگێڕێتـەوە: كـە پیـاوێ لـە هاوڕێیـانی پێغەمبـەر {درووده خوایان لەسەربێ} هـەواڵی داوە پـێم: كـە لـە نوێـژی مـردوودا سـوننەتە پێـشنوێژ لـە پاش (الله أكبر)ی نوێژدابەستن كە (الله أكبر)ی یەكەمە بە نهێنی لـە دڵـی خۆیــەوە فاتیحـە بخوێنـێ، ئینجـا سـەلاوات لەسـەر پێغەمبــەر {درووده خوای لەسەربێ} بدا، ئەوجا بە كوڵو بە دڵو بە دڵسۆزی نـزای بـاش بـۆ تـەرمەكە بكا، لە نێوانی (الله أكبر)ەكانا، بەڵام لە هیچیانا قورئان نـەخوێنێ، ئینجا بە پەنامەكی لە دڵەوە سڵاو بداتەوە. لە (الفتح)دا دەفەرموێ: ڕشـتەكەی دروسـتە، عەبـدورەزاقو نەسـایش گێڕاویانەتـەوە، بـەڵام بـەبێ ئـەم دوو گوتەیــە: (لــەپاش (الله أكـبر)ی نوێژدابەســتن كــە ئــەڵلاهو ئەكبــەری یەكەمەو ئینجا بە پەنامەكی لە دڵەوە سڵاو بداتەوە!).

ئەوەی کە فەرزە نزایە، ئیتر هەرچۆنبێ دەبێ، بەڵام نزا هەرە تەواوەکان زۆرن‌و بە راستی نزای داگرن، جوانترینیان ئەوەیە کە موسلیم لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەیگێڕێتەوە: دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد، ئەمەم لە نزاکەی لە بەرکرد: (**اللهم اغفر له وارحمه وعافه واعف عنه، وأكرم نزله ووسع مدخله، واغسله بالماء والثلج والبرد، ونقه من الخطايا كما نقيت الثوب الابيض من الدنس، وأبدله دارا خيرا من دارة وأهلا خيرا من أهله، وزوجا خَيراً من داره وأهلا خيرا من أهله، وزوجا خيرا من زوجه، وأخله الجنة، وأعذه من عذاب القبر، أو من عذاب النار**): خودایە! پەروەردگارا! لێی خۆشبەو رەحمی پێبکەو سەر ئاسوودەی هەردوو جیهانی کەو لێی ببورەو میوانەو رێزی بگرەو گۆڕی گوشادکەو بە ئاوو بەفرو تەرزە بیشۆرەو لە گوناه پاك پاکی بکەرەوە، وەك چۆن جلێکی سپی پاك رابگری‌و لە چڵك دووری بگری ئاوا، وە ماڵێ لە ماڵەکەی خۆی باشترو خێزانێ لە خێزانەکەی خۆی باشترو هاوسەرێ لە هاوسەرەکەی خۆی باشتری پێبدە، بیبەرە بەهەشت‌و پەنای بدە لە سزای گۆڕو لە سزای ئاگری دۆزەخ. عەوف فەرمووی تەنانەت ئەم نزایەم ئەوەندە بە دڵ بوو خۆزگەم خواست کە ئەو مردووە من بوومایە. نوێژ گەر لەسەر منداڵی مردوو لە نزا بۆیدا ئاوا بڵێ: (**اللهم اجعله فرطا لابويه وسلفا وذخرا وعظة واعتباراً وشفيعا وثقل به موازينهما وأفرغ الصبر الجميل على قلوبهما**) خودایە ئەم منداڵە مردووە بکە بە پێشرەوو پێشەنگ بۆ باوك‌و دایکی گیرا بفەرموو، بە هۆیەوە تای تەرازووی خێریان لە کاتێ کێشانی کرداریاندا قورس بفەرموو، دڵێشیان

سەبووری بدە. هەروا سوننەتە لەو نزایەدا بیشڵێ: (**ولا تفتنهما بعده ولا تحرمهما أجره**): لە پاش مردنی ئەم منداڵە باوك‌و دایکی تووشی ئاژاوە مەکەو مردنی ئەم منداڵە نەبێ بە مایەی ئاشووب بۆیان، وە لە پاداشی باشی بێبەشیان مەفەرموو. (ئەمە فەرموودەی نەوەوییە).

سوننەتە لە پاش (الله أكبر)ی چوارەم بڵێ: (**اللهم لا تحرمنا أجره ولا تفتنا بعد واغفر لنا وله**). (ئەمەیش فەرمایشتی شافیعییە).

سوننەتە پێشنوێژی (یا ئەو کەسەی کە خۆی بە تەنیا نوێژ لەسەر مردوو دەکا) لە ئاستی سەری پیاوو لە راستی سێبەندەی ژندا راوەستێ، بەپێی فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی ملیك: ئەبو غالیب {خوای لێ ڕازی بێ} فەرمووی: لە پشتی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە لەسەر تەرمی پیاوێ نوێژم کرد، ئەنەس لە ئاستی سەری راوەستابوو، لە پاشا تەرمی ژنێکی قورەیشییان هێنا، گوتیان بە ئەنەس: ئەی ئەبو حەمزە! نوێژی لەسەر بکە، ئەمجارە ئەنەس لە ئاستی ناوەڕاستی دارەتەرمەکە راوەستاو نوێژی لەسەر کرد عەلائی کوڕی زیادیش پێی گوت: دیارە بۆ خۆت پێغەمبەرت دیوە کە لەسەر تەرمی ژن لە نوێژدا لە ئاستی ناوەڕاستی‌و لەسەر تەرمی پیاو لە نوێژا لە ئاستی سەری بوەستێ، وەك ئەم راوەستانەی تۆ؟ فەرمووی: ئا.کاتێ لێبۆوە فەرمووی: ئاگاداری ئەم یاسایە بکەن‌و کاری پێبکەن. (ئەحمەد – ئەبو داوود) ترمیذی بە فەرموودەیەکی جوانی داناوە.

بزانن پاشنوێژی بە جێماو (مەسبووق) نییەتی جەماعەت دەهێنێ‌و فاتیحا دەخوێنێ‌و بەریز (الله أكبر)ەکان دەکا، وەك بە تەنها خۆی نوێژی لەسەر بکا ئاوا، ئیتر پێشنوێژ گەیشتبووە هەر کوێ قەیناکا،

بەڵام هەر کاتێ پێشنوێژ (الله أکبر)ی تازەی کرد، دەبێ ئەویش لەگەڵیدا (الله أکبر) بکا، ئیتر رێك پەیرەوی ئەو بکاو واز لە فاتیحاو شتی وا بهێنێ، چونکە ئەوەی لە کۆڵ دەکەوێ، هەر وەك چۆن ئەگەر ئیمام چوو بۆ روکوع مەئموومی مەسبووق فاتیحەی لە کۆڵ دەکەوێ ئەمیش ئاوا، جاکاتێ پێوشنوێژ سلاوی دایەوە هەرچی لە سەرماوە لە خوێندنی فاتیحەی پاش (الله أکبر)ی یەکەمو (الله أکبر)ەکانی تر بە خۆیانو ذیکرکردنیانەوە، هەموویان بخوێنێ، واباشە تەرمەکە هەڵ نەگرێو نەبرێ هەتا ئەو پاشنوێژە بە جێماوانەیش نوێژەکەیان لەسەری تەواو دەکەن، ئەگەر تەرمەکە بیشبرێ، پێش ئەوەی ئەوان نوێژەکەیان تەواو بکەن زیانی نیە. دروستەنوێژ لەسەر مردووی نادیار بکرێ، بە مەرجێ لە دەرەوەی شاربێ، بەڵام هەر مردوویێ لەناو شورای شاردا بێ بەحازر دادەنرێ، چونکە پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} کاتێ نەجاشی لە حەبەشە مرد، لە مەدینە نوێژی لەسەریکرد، وەك شەیخان گێڕاویانەتەوە. دروستە نوێژی مردوو لەسەر مردووی ناو گۆڕ بکرێ، چونکە جارێ پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} نوێژی لەسەر مردوویێ کرد کە مانگی بوو لە قەبرادا بوو. (شەیخانو دارە قوطنی ئەم مەسەلەیان گێڕاوەتەوە).

**حەوتەم**: سلاودانەوەیە لەپاش (الله أکبر)ی چوارەم، سوننەتە لە پێش سلاودانەوەدا بڵێ: (**اللهم لا تحرمنا أجره ولا تفتنا بعده واغفر لنا وله**): خودایە! لە پاداشتی باشی ئەو بێبەشمان مەفەرموو، وە لە لەپاش ئەو گیرۆدەو دووچارمان مەکەو سەرمان لێ مەشێوێنەو لە ئێمەیشو لە ئەویش خۆشبە.

## ۱۰۷) چی سوننەتە بۆ ناشتن:

وەك لە پێشەوە گوترا: لای کەمی گۆڕ چاڵێکە نەهێڵێ بۆنەکەی دەرچێ‌و دڕندە نەتوانێ هەڵی بداتەوە، لای تەواوی گۆڕیش ئەوەیە کە بەلادڕ (لەحد)بێ، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص {خۆشنوودیی خودای لێبێ} لەکاتی سەرەمەرگدا، فەرمووی: لادڕم بۆ لێ دەن‌و بەخشتی کاڵ لای پشتم بگرن، پێغەمبەریان چۆن لێکرد منیش ئاوا لێبکەن. (موسلیم {رەزای خوای لێبێ} گێڕاویەتەوە). ئەمە کاتێ وایە کە زەویەکە رەقەن بێ، بەڵام ئەگەر خاکەکەی فشەڵ‌و بۆش بوو، دەبێ گۆڕیچەی بۆ دروست بێ، بکەن، لادڕ ئەوەیە کە لەبن گۆڕەکەوە لە رووی رووگەوە، لەژێر دیواری لای رووگەوە، قوموشێکی درێژی وا هەڵ بکەنرێ، کە بەفەرەحی جێی مردووەکەی تیادا ببێتەوە. گۆڕیچە (شق)یش ئەوەیە کە لە ناوەراستی تەختی بنی گۆڕەکەدا چاڵێ وەك جۆگەلە هەڵبکەنرێ‌و ئەم بەرەو بەرەکەی دروست بکرێ‌و ئەوجا مردووەکەی تیادا دابنرێ‌و سەری بەخشتی کاڵ، یا بە تەلەبەرد، یا بە تەختەدار قایم بکرێ. پێویستە کە مردوو رووەو رووگە بنێژرێ، هەتا ئەگەر پشتی لە رووگە بوو یا لە سەپشت نێژرا بوو، وە هێشتا هەتا ئەگەر لەشی تێك نەچووبوو، دەبێ گۆڕەکەی هەڵ بدرێتەوەو رووی بکرێتە رووگە. سوننەتە کە گۆڕ ئەوەندە فەرەح بێ بەئاسانی جێگەی تەرمەکەی تیابێتەوە، وە ئەوەندەیش قووڵ بێ بەقەد باڵای مرۆڤێکی نەکورت نەدرێژ کە لە ناویدا راوەستێ‌و هەردوو دەستی هەڵبڕێ ئەوجا بگاتە لێوارەکەی، چونکە عومەر {رەزای خوای لێبێ} ئەمە ئامۆژگاری بوو، ئەمەیش رێك دەکاتە سێ باسك‌و نیو بە باسکی ئادەمیزاد لەسەر فەرمایشتی رافیعی. سوننەتە

گۆڕ ئەوەندەی بستێ لە زەوی دەوری بەرزبکرێتەوە، بەڵام وەك سەربان تەخت بێ نەوەك وەك ماسوولکەی خەرمان لە بنەوە پانو لە بانەوە باریكو کوورِ بێ، وەك دووگی وشتر، هەتا بناسرێتەوەو دێنیی بکرێو ڕێزی لێ بگیرێ. ئیبنو حیببان دەیگێڕێتەوە: کە گۆڕی پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} ئاوا بووە. بڕیاری باشتری گۆڕی، سەربان تەخت لە گۆڕی شێوە ماسوولکەیی بەپێی ئەم فەرموودەیەیە: ئەبو داوودو حالم بە رشتەیەکی دروست دەگێڕنەوە: گۆڕی پێغەمبەر خۆی {درووودی خوای لەسەربێ}و ئەبو بەکرو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} ئاوابووە، بەڵام ئەوەی کە بوخاری لە سوفیانی نەمارەوە دەیگێڕێتەوە کە بەچاوی خۆی گۆڕی پێغەمبەری دیوە، لەسەر شێوەی ماسوولەکەی سووری خەرمان بووە، ئەوە ئەمە وەڵامەکەیەتی (وەك بەیهەقی فەرموویەتی): لە سەرەتاوە وەك سەربان لەسەرەوە تەخت بووە، هەتا کاتێ لە سەردەمی وەلیددا، هەندێ دەڵێن: لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا، دیوارەکەی رووخا، لەسەر شێوەی ماسوولکەیی دروست کرایەوە. سوننەتە هەر ئەو خۆڵە بکرێتەوە ناو گۆڕەکە کە لێی دەرهێنراوە، گەچکاریی کردنی ناپەسەندە، نووسین لەسەری ناباشە. جابیر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لە گەچکاریکردنی گۆڕو لە دانیشتن لەسەریو لە دروستکردنی خانوو لەسەری (م/ د/ ت/ ن) گفتەی تیرمیذی: پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} جڵەو گیری دەکا لە گەچکاریکردنی گۆڕو لە نووسین لەسەریو لە دروستکردنی گومەزو خانوو لەسەریو لە شێلانو پێلێنانی. ئەگەر گۆڕستانەکە خێرابوو (واتە: وەقف بوو) دروست نیە گۆڕی ناوی شوورەی بۆ بکرێ، یا خانوو گومەزو شتی وای بە سەرەوە

بکرێ، ئەگەر لەسەری بکرێ دەبێ بروو خێنرێ، بگرە گومەزو قەفەزو شتی وا لەسەر گۆڕ، ئەگەر لە موڵکی خۆشیدابێ، دەبێ برووخێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چڵەو گیری لەشتی وا دەکر. موسلیم لە جابیرو کەسانی ترەوە، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەهی کردووە لە بیاناکردن لەسەر گۆڕ. ئیمامی عەلی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} منی نارد بۆ ئەمە: کە هەرچی پەیکەرێ ببینم کوێری بکەمەوە، وە هەرچی گۆڕێکیو قیتم بینی تەختو متی بکەم بەزەوییەوە، سوننەتە سەری قەبرەکە ئاورشێن بکرێو دابکوترێتەوەو حەوت بەردی ورد بەریز لەسەر گۆڕەکە دابنرێو، لای سەریەوە کێلە بەردێ، یا شتێکی وای بۆ داکوتن. بەیهەقی لە جەعفەری کوڕی، موحەمەدەوە لە باوکیەوە حەدیسێ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} گۆڕی ئیبراهیمی کوڕی ئاورشێن کردو هەندێ بەردە وردەی لەسەری داناو، بەقەد بستێ لە زەوی بەرزی کردەوە!. نادروستە دانیشتن لەسەر گۆڕو پێلێنانیو پاڵ پێوەدانیو نوێژکردنی ئاسایی لە سەری. پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لەسەر گۆڕ دامەنیشنو، نوێژی لەسەر مەکەن. (موسلیم لە صەحیحی موسلیمدا گێڕاویەتەوە) لە تیرمیذیدا دەفەرموێ: نەهی کردووە لە پێلێنانی. عەمری کوڕی حەزمیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لەسەر گۆڕێ شانم دادابوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بینیمی فەرمووی: ئازاری خاوەنی ئەم گۆڕە مەدە! (ئەحمەد بە رشتەیەکی دروست گێڕاویەتەوە).

## ١٠٨) دووكەس لە ناویەك گۆڕدا نانێژرێن مەگەر بۆ ناچاری:

دووكەس پێكەوە لەیەك گۆڕدا نانێژرێن، لەكاتی فەرەحیدا مەگەر لەبەر ناچاریو پێداویستی، وەك كەمبوونی زەویو زۆربوونی مردوو، بەشێوەیەكی وا كە زەحمەتبێ گشت مردوویێ بە تەنیا گۆڕێكی پێ ببرێ، جا لەكاتی وادا دوو دوو یا سێ سێ، یا زیاتر، پێكەوە لەیەك گۆڕدا، بەپێی ناچاری، دەنێژرێن. هەروا ئەگەر كفنیش هاتە كزی، لەیەك كفنا چەند مردوویێ كۆ دەكرێنەوە، بۆ پەیڕەوی كردن لە شەهیدەكانی غەزای ئوحود.

لەكاتی وادا كێ باشتربێ ئەوە دادەنرێ لەلای رووگەوە، چونكە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ شەهیدەكانی غەزای ئوحود دەیپرسی: كە كامەیان زیاتر قورئانی لەبەرە هەتا ئەوەیان پێش بخرێ لە گۆڕێچكەدا. سوننەتە هەردوو مردوویێ بە تیخەیەكی خۆڵ لەیەك جوێ بكرێنەوە. دروست نیە ئێسكی مردوو كۆبكرێتەوە بۆ ئەوەی كەسێكی تری تیا بنێژرێ، هەروەها دروست نیە مردووی تر لەسەر ئەو ئێسكانەوە لەناو هەمان گۆڕدا بنێژرێ، چونكە شتی وا ئەتك كردنە بە رێزی مردووەكە.

بزانن ئەگەر مردوویێ ماڵی كەسێكی تری قووت دابوو، لەپاش بەخاك سپاردنی، خاوەنەكەی داوای كردەوە، گۆڕەكە هەڵدەدرێتەوەو سكی مردووەكە هەڵدەدڕێو ماڵەكەی لێدەردەهێنرێ، بەڵام ئەگەر ماڵكە هی خۆی بوو، نە گۆڕەكە هەڵدەدرێتەوەو نە سكی شەق دەكرێ بۆ دەرهێنانی!.

هەروا بزانن گۆڕەوشار هەقە، وەشتێکی گشتییەو بۆ هەموو مردوویێ هەیە، با ئەو مردووە بەپێی ئیسلامیش تەکلیفی لەسەر نەبێ، وەکەس لە گوڕەوشار رزگاری نابێ مەگەر پێغەمبەرەکان، فاطیمەی کچی ئەسەدیش لێی رزگاری بووە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەناو گۆڕەکەیدا راکشاوەو تەپاوتلی تیا کردووە، هەروا ئەو کەسەیش لە دەست گۆڕەوشار رزگاری دەبێ کە لە نەخۆشیی سەرەمەرگا (سوورەتی: قل هو الله) بخوێنێ.

سوننەتە بۆ دەرو دراوسێی کەسوکاری مردووەکە ئەوەندە نانیان بۆ دروست بکەن کە بەشی رۆژو شەوێکیان بکا، چونکە لەم کاتەدا خۆیان خەمبارن، پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} فەرموویەتی: بۆ خێزانەی جەعفەر نان دروست بکەن، چونکە بەهۆی شەهیدبوونی جەعفەرەوە دەستیان ناپەرژێ (ئەحمەد لە موسنەدەکەیداو تیرمیذی و ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو حاکم گێڕاویانەتەوە).

## ١٠٩) گریان بۆ مردوو:

گریان بۆ مردوو لە پێش مردنیو لەپاش مردنی دروستە، لە پێش مردنی چونکە ئەنەس {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لەپاش چووینەوە بۆ ماڵیان، ئەم جارە کە چوین ئیبراهیم {دروودی خوای لەسەربێ} گیانی دەدا، جا چاوەکانی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هۆن هۆن فرمێسکیان پیا ئەهاتە خوارەوە! (شەیخان گێڕاویانەتەوە) لەپاش مردنی بەپێی ئەوەی ئەنەس دیسان دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: بە دیارەوە بووم کە کچەکەی

پێغەمبەریان دەناشت، بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی لەسەر لێواری گۆڕەکە دانیشتبوو، هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە. (شەیخان گێڕاویانەتەوە). موسلیمسش {رەزای خوای لێبێ} لە ئەبو هورەیرەوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} رۆیشت بۆ دێنی گۆڕی دایکی لەسەری دەستی کرد بە گریان، ئەو کەسانەیشی لە دەوری بوون هێنانیە گیان. بەڵام لەدوا مردن باشتر ئەوەیە کە نەگری، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ مردوو گیانی دەرچوو بائیتر شێوەنکەر بۆی نەگری، رشتەکەی دروستە.

## ۱۱۰) شینو زاری لەسەر مردوو:

شینو شەپۆڕ لەسەر مردوو دروست نیە. خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: سەردۆلکەبێژ (ئەگەر لە پێش مردنیا) تەوبە نەکاو پەشیمان نەبێتەوە، لە رۆژی قیامەتا کە زیندوو دەبێتەوە کرسی قەترانو دیزداشەی گەڕیی لەبەردا دەبێ (موسلیم) شینو زاری وەك ئەوە دەنگ لە لاواندنەوە هەڵ ببڕێو شیوەنکەر بڵێ: پشتیوانم رۆ، هێزی ئەژنۆم رۆ، مایەی سەربەرزیم رۆ، مەردە رەفتارە نازدارەکەم رۆ، یاشتی تری وابڵێ، خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاتێ کەسێ دەمرێ، ئەگەر یەکێ لەوە دوا هەڵسێتەوەو بە گریانەوە بیلاوێنێتەوەو بڵێ: کێوم رۆ، پشتیوانم رۆ، کۆڵەکەیماڵەکەم رۆ، یاشتی تری وا بڵێ بێگومان کە ئەو مردووە دەدەنە دەست دوو فریشتە، خۆش خۆش سیخورمە دەدەن لەسەر سینگیو بە تەوسەوە پێی دەڵێن: جا ئایا تۆ

وەك ئەمە دەڵێ ئاوا بووی؟. (ت/ ئەحمەد/ بەڕشتەیەکی جوان): رشتەی جوان: واتە: سند حسن.

هەروا یەخە دادڕینو سینگ کوتانو ڕوومەت ڕنینەوەو قژڕنینەوەو قژبڕین حەرامن، هەروا نزای خراپوشتی وا نادروستە هەروا پۆشینی هەرشتێ کە بەهۆی ئەم بۆنەیەوە بێ، وەك ڕەشپۆشیو گۆڕینی جلو بەرگی ئاساییو پۆشینی شتی تری وا، یاسای داگر بۆ ئەمە ئاوایە: هەر کارێ ناشوکری بگەیەنێو نیشانەی بێ ورەییو بێ دژی خۆدانە دەست فەرمانی خودابێو دژی ڕازیبوون بە چارەنووسی خوایی بێ نادروستە، چونکە ئەوە ڕەوشتی سەردەمی نەزانییە، لەسەر زاری پیرۆزی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەهی لێکراوە، وەك ئەوە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەوەی ڕوومەت بڕنێتەوەو یەخەدابدڕێو بانگەوازی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام هەڵ بدات لە ئێمە نیە. (شەیخان) لە صەحیحەینشدا دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بێزاروو بەرییە لەو ژنەی کە شینو شەپۆڕ ەکاو سەری خۆی دەتاشێو یەخەی خۆی دادەدڕێ لەکاتی ڕوودانی کارەساتو وەێیکا. چونکە کاری وا واتەی وایە کە خاوەنەکەی دادو بێ دادیەتی لە دەست کەسێ کەستەمی لێکردبی، بۆ ئەوەی خەڵك بچن بە هاواریەوە. بەڵام لە ڕاسیدتدا مردن لە خوداوەیەو هەقەو دادو عەدڵە، زۆرو ستەم نیە، خودا داناو زاناو باڵادەستو کار دروستە. کەواتە ئەرکە لەسەر موسوڵمان کە لەکردنی شتی وا کە نیشانەی ناڕازیبوونە بە چارەنووسی خوا، بێزاریو نارەزایی دەربڕێو کەسوکاری خۆی لە سەرەنجامی بەدی کاری وا بەد، هۆشیار بکاتەوە، چونکە شتی وا ڕەوشتی سەردەمی نەزانییە. بزانن کە مردوو لەسەر

کردنی ئەم کارانە لە لایەنی کەسانی ترەوە، بە مەرجێ خۆی راسپێری نەکردبێ کە ئەوەی بۆ بکرێ، سزا نادرێ. خوای گەورە دەفەرمووێ: {وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – سورة فاطر – ١٨/٣٥} واتە: هەمو کەسێ بەرپرسیارە لە تاوانی خۆیو بەس! بەڵام ئەگەر خۆی رایسپاردبوو کە ئەو بێ شەرعییەی لە دوا مردنی بۆ بکەن، ئەوە بەرپرسیارە، وەك گوتە ئەم گوتیارە کە لەم شیعرانەیا راسپیری دەکا، کە بانگەوازی بۆ هەڵبدەنو بۆی بگرینو یەخەی خۆیانی بۆ دابڕن وەك خۆی دەڵێ:

**(اذا مت فانعيني بما أنا أهله**

**وشقي على الجيب يا بنت معبد)**

**واتە:**

**کچکە! کە مردم شیوەن گەرمکە**

**یەخەت دادڕەو شین لەسەرم کە**

دیارە کە ئەمە سزای دەدرێ، چونکە راسپیری کردووە کە شتێکی وای بۆ بکرێ، کە پێغەمبەری خوانەیی لێکردووەو فەرمانی کردووە بە مراندنی رەفتاری وابەد. جەماوەری زانایانی ئیسلام ئەو فەرمایشتانەی کە قسە لەوە دەکەن مردوو لەسەر شتی وا سزا دەدرێ، ئاوا لەسەر ئەم شێوەیەی گوترا تەئویلیان دەکەن سوننەتە کە بە زوویی سەر مردووەکە بدرێتەوە بە خاوەنی، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: گیانی موسوڵمان لەپاش مردنی پێوەندی ئەو قەرزەیە کە لەسەریەتی، پایەی بەرێزی خۆیی لێ قەدەغەیە، هەتا قەرزەکەی سەری بۆ ەدرێتەوە

(تیرمیـــذی دەفــەرموێ: فەرموودەیــەکی جوانــە) بــەڵام ئەگــەر خــاوەن قەرزەکە داوای کردەوە ئەوە پێویستە بە زوویی قەرزەکەی بدرێتەوە.

مــەرگ بــە ئــاوات خواســتن ناپەســەندە، ئەگــەر بــەهۆی زیــانی جەستەیی یا سامانییەوە بوو، بـەڵام ئەگەر بـەهۆی ئـاژاوەی ئایینییـەوە بوو قەیناکا. یا لەبەر مەبەستێکی رەوای قیامەتی بوو، وەك ئاواتخواسـتن بۆ شەهیدبوون لە رێگەی خوادا، ئەوە شتێکی زۆر باشە، سوننەتە کە بـە زۆری یادی مردن بکاتەوە، چونکە لـە فـەرموودەدا دەفـەرموێ: زۆر یـادی مەرگ بکەنەوە، کە لەراستیدا مەرگ تێکدەری گشت خۆشییەکە، خۆشی دنیا زۆر زۆریش بێ، کە بیری مردنت کردەوە کـەمی دەکاتــەوەو بایـەخی ناهێڵێ، کردەوەی باشیش ئەگەر کەمیش بێ کە بـیر لـە مـردن بکەیتــەوە زۆری دەکاو دەبێ بەهۆی ئەوە کە لێی زیاد بکەی.

پێویستە مرۆڤ خۆی بۆ مردن ئامادە بکا، تۆبەیەکی بەراسـتی بکا، واز لە خراپەکاریو نافەرمانییەکان بهێنێو بەدڵ روو بکاتە خـوا، نـەبادا لە پرێکا مەرگ پڕی پیابکاو فریای تۆبە نەکەوێ[1].

---

[1] مەولەوی (رەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموێ:

ئەم تەفرەی تەوبەی حەقیقی تاکەی؟

عەمر سۆزی کوا؟ ئەسۆزی دەخەی

- وەرگێڕ -

## ١١١) ئەوەی لە پرسەدا سوننەتە:

سوننەتە سەرەخۆشی لە گشت کەسوکاری مردووەکە، بە گەورەو بچوك‌و نێرو مێیانەوە بکرێ، بەڵام دەبێ هەر ژنان ، یا کەسوکاری خۆیی ژنان، سەرەخرشی لە ژنان بکەن‌و بەس. لە پێش ناشتنیشدا نەوازش‌و سەرکێشی سوننەتە، چونکە ئەوە کاتی گەرمەی خەم‌و خەفەت‌و ورەبەردانە، بەڵام لە دوا ناشتن باشترە، چونکە لەوەپێش سەرگەرمی بەڕێکردنی مردووەکە بوون، جاری وا هەیە زۆر پەۆشن بۆی، ئەوە لەکاتی وادا سەرکێشی پێش بخرێ چاکترە، بەڵکوو ببێ بەهۆی ئارامبوونەوەیان. سوننەتە پرسە لێکردن لەو کەسایانەوە دەستی پێبکرێ کە لە هەموویان زیاتر ورەی بەرداوەو بەرگەی قۆرتەکە ناگرێ. کاتێ سەرەخۆشی موسوڵمان لە موسوڵمان دەکرێ دەگوترێ: (**أعظم الله أجرك وأحسن عزاءك وغفر لميتك**) خوادا پاداشتی گەورەت لەسەر ئەك کۆستە بداتەوەو سەبووریت بداو لە مردووەکەت خۆش بێ، یا بڵێ (**أخلف الله عليك**) خودا شوێنیت بۆ پڕبکاتەوە. یا شتێ لەم بابەتە بڵێ. کاتێ سەرەخۆشی کافر لە موسوڵمان دەکرێ دەگوترێ:- (**أعظم الله أجرك وأخلف عليك**) خودا لەسەر ئەم قۆرتە پاداشتی گەورەت بداتەوەو صەبرو ئارامت پێبداو شوێنی پڕبکاتەوە بۆت. یا شتێکی ئاوا بڵێ، نابێ بڵێ: (**غفر الله لميتك**) خوا لە مردووەکەت خۆش بێ چونکە ئەوە بە پێچەوانەی بڕیاری خواوەیە، خوای گەورە

دهفـهرموێ: {إِنَّ اللّـهَ لاَ يَغْفِـرُ أَن يُـشْرَكَ بِـهِ – سـورة النـساء – ٤٨/٤} واته: فهرمانی خوا لهسهر ئهوهیه که قـهت لـه کـافر، بهتایبـهتی له فرهخوایی، خۆش نابێ. سهرکێشیش له کافر لـه کـاتی کۆسـتی مردنـی خزمی موسوڵمانیدا ئاوا باشه: (غفر الله لميتك. يا: أخلف الله عليك. – يا شتێکی لهسهر خۆشی کافریش له کافر دهگوترێ: أخلف الله عليك ئاوا ولا نقص عددك) خوا شوێنی پڕ بکاتـهوهو بـێ ئـهویتان پێـوه دیـار نهبێ!. ئهوهنده ههیه سهرهخۆشی کـردن لـه بێبڕوا سوننهت نیـه، بـهڵام دروسته، ئهگهر ئومێدی ئهوهی لێ کرا که موسوڵمان ببێ سوننهته.

مـاوهی پرسـهو سهرهخۆشـی سـێ رۆژه، چـونکه جهنگـهی خـهم و پـهژاره بـه زۆری لـه سـێ رۆژ تـێ ناپـهڕێ، لـهوهداو بـهره بـهره خـاو دهبێتـهوهن لـه پـاش سـێ رۆژ سهرهخۆشـی لێکـردن ناپهسـهنده چـونکه زامیان دهکولێنێتـهوهو خـهم نـوێ دهکاتـهوه. پێغهمبـهر {درووودی خوای لهسهربێ} دایناوه که کۆتایی خهم سێ رۆژ بێ. لـه صـهحیحهیندا دهفـهرموێ: ئـهو ژنهی باوهڕی به خوداو به رۆژی دوایی ههیه دروست نیه بۆی که له سێ رۆژ زیاتر ماتهم بۆ مردوو بگرێ، مهگهر بۆ مێـردی، کـه دهبـێ بـۆ مێـرد چوارمانگ و دهشهو تازێباربێ. بهڵام لهم یاسایه ئـهم دوو حاڵهتـه چـهرت (استثناء) دهکرێ: کاتێ سهر خۆشیکار، یا سهرخۆشـی لێ کـراو نادیاربـێ، ئهوه ماوهی سهرخۆشی درێژ دهبێتهوه تا نادیار دێتهوه.

## ١١٢) پرســـه، سەركێـــشی، سەرەخۆشـــی، نەوازش:

پرسەو سەرەخۆشی لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ تـەعزێ، تـەعزێش لە عەرەبیدا واتە: نەوازش‌و دڵدانەوە، لە شەرعیشا واتـە: سـەبرگرتن بـە كەسێ كە مردوویەكی مردبـێ، یادی بخەیتـەوە كـەخوا بـەڵێنی داوە بـەو كەسـانە كـە لـەكاتی وادا هێورببنـەوە پاداشـی باشـیان پێبـدا، هەڕەشـەی ئەوەیشییان لێبكا كە بێ ئۆقرەیی پاداش پووچ دەكاتەوە دەبێ بـە مایـەی گوناه، لە هەمان كاتا نزای باش بۆ مردووەكە بكاو داوای لێخۆشبوونی بـۆ بكاو، لە خودایش داوا بكا كە جێگەی مردووەكە بۆ خاوەن مردووەكە پـڕ بكاتەوە. سەرەخۆشی بەپێی ئـەم فەرموودەیـە سوننەتە كـە دەفـەرموێ: هـەر موسـوڵمانێ سەرەخۆشـی لـە برایـەكی ئـایینی خـۆی بكـا، بـەهۆی لێقەومانێكەوە، مسۆگەر خودا قاتی سەربەرزی لەبەر دەكا، هەروا بـەپێی ئەم فەرموودەیەش: كچێكی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نـاردی بـە شـوێنی باوكیا: كەوا كوڕەكەم گیان دەدا، تەشریفت بێنە بۆ لامـان. پێغەمبـەریش {دروودی خوای لەسەربێ} بەرابەرەكـەدا سلاوی بـۆ نـاردوو فـەرمووی: پێـی بڵـێ: ئەوەی خودا دەیدا بـە بەنـەی خـۆی تاماوەیـەك‌و لـە پاشـا دەیباتـەوە بـۆ خەزینەی خۆی، هی خۆیەتی، وە هـەروەها ئـەوەی كـە خـودا دەیبەخـشێ بە بەندەی خۆی تاسەر ئەوەیش هەر هی خۆیـەتی، وە هـەموو شـتێكیش لـەلای خـودا ماوەیـەكی دیـاری كـراوی هەیـەو كـە ئاكـامی هـات ئـیتر بـە هەناسە پاش‌و پیشی نیـەو مـاوەی بـە سەردەچێ! كـەوابوو پێـی بڵـێ: بـا سەبرو ئارام بگرێ ساخ لەبەر ڕەزای خوا. (شـەیخان). لـەم فەرموودەیـەدا

دوو بەهرەی گەورە هەیە، هەر کەسێ بە باوەڕی تەواوەوە وەریان بگرێ، چێژی شیرینی باوەڕ دەکا، چونکە هەرکەسێ بە دڵ ئەوە وەربگرێ کە هەموو شتێ لە بنەڕەتدا هی خوا خۆیەتی، چی ئەوەی دەیدا بەبەندەو چی ئەوەی کە لێی وەرەگرێتەوە، ئیتر ئەوەندە پەرۆش نابێ لەسەر موسیبەت، چونکە هەق دەزانێ کە خاوەنداری بەس بۆ خوایەو هەر خۆی لە راستیدا خاوەنی هەمووشتێکە، کەواتە جێگەی خۆیەتی کە بە ئارەزووی خۆی چی لە موڵکی خۆی دەکا بیکا. گریمان ئەگەر نەگەیشتە ئەم پلەیەیش‌و هاندەری سروشتی ناودەروون زۆری بۆ هێنا، هاندەری شەرعی رایدەکێشێ بەرەو ئارامی‌و صەبرگرتن لە بەر رەزای خوا. جا خوانەخواستە ئەگەر ئەمەی لەکیس بچێ موسیبەتەکەی پەرەدەستێنێ، شتی وا بەهۆی بێئاگایی دڵەوە لە خوای گەورە پەیدا دەێ، بە پێچەوانەی کەسێ دڵی بە نووری خوا ئاوابێ، چونکە بەلای ئەمەوە ماڵ‌و منال دەبێ بە مایەی ئاژاوەو بەندە لە خودای گەورە دادەبڕێ‌ولە ئامانج دووری دەخاتەوە. دەگێڕنەوە: برادەرانی ئیبنو مەسعوود {رەزای خوای لێبێ} سەرسامبوون لە جوانی منداڵەکانی، ئەویش پێیان دەفەرموێ: وا دیارە کە ئێوە سەرتان سوڕ دەمێێ لە جوانی منداڵەکانی من، دەی سا بەخوا ئەوەم پێخۆشترە کە دەستم لە پەروەرەکردنیان بێتەوە، هەتا ئەوەی کە بمێنن! ئیبنو مەسعوود {رەزای خوای لێبێ} زانیویەتی کە منداڵ زۆرجار دەبێ بەهۆی دابڕان لە تاعەتی جوانی خودا، لەبەر ئەوە وا دەڵێ، مەبادا مانی منداڵەکانی بۆی ببن بەهۆی دوورکەوتنەوە لە پایەی درەخشانی نزیکبوونەوە لە رەزامەندیی خوای پاك‌و پیرۆزا.

جارێ پێشەوا شافیعی (ڕەزای خوای لێبێ) پرسەنامەیێ دەنێرێ بۆ دۆستێکی، کە کوڕێکی مردبوو، بەم شێوەیە سەرەخۆشی لێدەکا:

**انی معزیك لا أنی علی ثقة**
**من الخلود ولكن سنة الدين**
**فما المعزی بباق بعد ميته**
**ولا المعزی، ولو عاشا الی حين!**
**پرسەتە لیٚ دەکەم، پرسە سوننەتە**
**سوننەتی دینە مایەی رەحمەتە**
**بەلاٚم دلٚنیام:دنیا هەتا سەر،**
**بۆ کەس نامێنیٚ، ها کابیٚ خەبەر:**
**پرسەکاریش وەك پرسە لیٚکراو**
**مردن کردنی بە پۆڕی خوراو!**

## ١١٣) باسی زەکات:

زەکات لە زمانی عەرەبدا برێتییە لە گەشەکردنو پیتو فەڕ تێکەوتن، دەگوترێ: (زکا الزرع: واتە: کشتوکاڵەکە نەشونمای کردووە) دەگوترێ: (زکا المال: واتە: ماڵەکە پیتو فەڕی تێکەتووە) دەگوترێ: (زکا فلان: واتە: فیسار خێری داوەتەوە) زەکات لە عەرەبیدا بە پاککردنەوەیش دەگوترێ، خوای گەورە دەفەرموێ: {قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا} - سورة الشمس- ٩/٧١) واتە: بەراستی کەسێ دەروونی

خۆی پاك رابگرێو خۆی رابهێنێ لەسەر رەوشتی بەرزو کرداری باشو گوتاری جوانو رەفتاری شیرین ئەوە رزگارو سەربەرزی هەردوو جیهان خۆیەتی! هەروا بەمەتحکردنیش دەگوترێ. خوای مەزن دەفەرموێ: {فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ - سورة النجم - ٣٢/٥٣} واتە: مەتحی خۆتان مەکەن. لە شەرعیشدا زەکات ناوە بۆ ئەو ئەندازەیە لەماڵ، کە دەدرێ بەزەکاتا، کە لەسەر شێوەیەکی تایبەتی، بەچەند مەرجێکی تایبەتی دەدرێ بە چەند تاقمێکی تایبەتی. لەبەر ئەوەیش ئاوا ناو دەنرێ چونکە سەرمایەکە بەهۆی دەرکردنی زەکاتەوە لێیو بەهۆی نزای زەکات وەرگرەکەوە گەشەو نەشە دەکاو پیتو فەڕی تێدەکەوێ. یەزدانی پاك فەرموویەتی: {وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ - سورة الروم - ٣٩/٣٠} واتە: ئەوەی کەساخ بۆ رەزای خودا دەیدەن بە زەکاتا ئەوە دەبێ بە مایەی چەندین پاداشتی باش!.

## ١١٤) بڕیاری زەکات (حوکمەکەی):

زەکات یەکێکە لە پێنج بنیاتەی ئیسلام، فەرزی عەینە، بە قورئانو سوننەتو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلام پێویست کراوە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَآتُواْ الزَّكَاةَ - سورة البقرة - ٢/١١٠} واتە: زەکاتەکەی دەربکەنو بیدەن بە شایستەکانی زەکات، دیسان خوای گەورە دەفەرموێ: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً - سورة التوبة - ٩/١٠٣} واتە: زەکاتی ماڵەکانیان لێ وەربگرە. خۆشەویستیش (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئیسلام لەسەر پێنج بنیات دامەزراوە کە یەکێك لەو پێنجە

زەکاتە، جا بۆیە ئەوەی باوەڕی بە زەکات نەبێ بەکافر دادەنرێ، مەگەر نۆ موسوڵمان بێ، یا سارانشین بێ! ئەگەر کەسێ بەخۆشی خۆی زەکاتەکەی نەدا، بە زۆر لێی دەستێنرێ.

چونکە ئەبو بەکری صەدیق {ڕەزای خوای لێبێ} بە زۆر زەکاتی سەند لە زەکاتنە دەرەکانی سەردەمی خۆی، ئەوەبوو فەرمووی: سوێندم بە خودا ئەگەر پێوەندی وشترێکیان کاتی خۆی دابێ بە پێغەمبەرو ئێستا بیانەوێ نەیدەن بە من لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکەم!.

## ١١٥) جۆرەکانی زەکات:

زەکات دوو جۆری هەیە:یەکێکیان پەیوەندی بە جەستەوە هەیە کە برێتییە لە زەکاتی سەرفترە. ئەوی تریان پەیوەندی بە سامانەوە هەیە، کە بریتییە لە ئاژەڵو پارەو کشتوکاڵو دانەوێڵەو بەرو بوومو سامانی بازرگانی.

## ١١٦) ئاژەڵ:

زەکاتی ئاژەڵ. لە وشترو ڕەشە ولاخ مەڕو بزن بە ئیجماع (یەکگرتن) زەکات دەکەوێ. حیکمەتی هەڵبژاردنی ئەمانە بۆ زەکات لێدان ئەمەیە: ئەم ئاژەڵانە هەم ژمارەیان زۆرە، هەم زۆر نەشو نما دەکەن، هەم سوودیان زۆرە، لەهەمانکاتا گۆشتیان دەخورێ، لەبەر ئەوە جێگەی خۆیەتی کە ببن بە مایەی دڵدانەوەو نەوازش، شتیش بەبێ

بەلگە بڕیاری بۆ دەرناکرێ، غەیری ئەم چوارەیش بەلگە نیە لەسەری کە زەکاتی لێدەکەوێ، کەواتە لەسەر بنەڕەت (ئەصلّ) دەمێنێتەوە بنەڕەتیش نەبوونی زەکاتە لە هەموو شتێکا، هەتا بەلگەی تایبەت پەیدا دەبێ!.

## ۱۱۷) مەرجی پێویستبوونی زەکاتی ئاژەلّ:

مەرجی پێویستبوونی زەکاتەکەی شەش شتە: ئیسلامو ئازادیو مولکایەتی تەواوو، راددەی گەیشتن بە ئەندازەی زەکاتو سالّ بەسەر داهاتنەوەو بەلەوەڕ بەبێ ئالّفو ئالیك بژی، یەکگرتن لەسەر ئەمە دامەزراوە، کەواتە: زەکات لەسەر بێبڕوای ئەصلّی نیە، چونکە ئەبو بەکری صەدیق لە نامەکەیدا کە نووسی بۆ ئەنەس، کە کردی بە سەرکاری سەرزەکاتی ولاتی بەحرین، لەو نامەیەدا فەرموویەتی: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهەبان. ئەمە دەستووری دانی زەکاتی فەرزە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە فەرمانی خودا لەسەر موسولّمانان داینـاوە. لەبەر ئەوەیش کە بێبڕوا لە حالّی بێبڕواییدا داوای زەکاتی لێناکرێ. بەلاّم وەگەڕاو ئەوەی بەهۆی ئیسلامەوە لەسەری پێویست بووە بەهۆی هەلگەڕانەوەوە لە ئایین لە کۆلّی ناکەوێ. کۆیلەیش بۆیە زەکاتی لەسەر نیە چونکە بەندەی زەڕخڕیدە خۆی مولکی نیە، بەپێی فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿عَبْدًا مَّمْلُوكًا لاَّ يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ - سورة النحل - ۱٦/۷٥﴾ کەواتە: کۆیلە خۆیو ئەوەی هەیەتی هی ئاغایەکەیەتی، خاوەن خاوەنێتیی ناتەواویش، وەك مالّی دزراوو زەوتکراوو مالّی

سپاردەبێ لەلای کەسێ حاشای لێبکا، زەکاتی لەسەر نیە، چونکە بەهۆی دزین و زەوتکردن و حاشالێکردنەکەوە دەستی ناڕوا بەسەریدا، ئیتر چۆن زەکاتی لێبدا، بەڵێ هەرکاتێ دەستی کەوتەوە پێویستە زەکاتەکەی بدا، جا ئەگەرماڵەکە پێش ئەوەی دەست خاوەنەکەی بکەوێتەوە فەوتا ئیتر زەکاتەکەی لە کۆڵ دەکەوێ، قەرزێکیش ساخ بووبێتەوە لەسەر کەسێ هەمان بڕیاری بۆ هەیە، کەی دەستی کەوتەوە زەکاتەکەی دەدا.

ماڵی دۆزراوەیش ئەگەر ناونیشانی هەڵ نەدراو ساڵی بە سەرداهاتەوەو دەست خاوەنەکەی کەوتەوە زەکاتەکەی لە سەرخاوەنەکەیەتی، هەرکاتێ وەری گرتەوە دەبێ زەکاتەکەی بدا، بەڵام ئەگەر ناونیشانی هەڵدراو خاوەنەکەی دیار نەبوو وەساڵێ بە سەردا تێپەڕبوو، وە کابرای کە دۆزیویەتەوە کردی بەهی خۆی، ئەوە زەکاتەکەی لەسەر خاوەنی تازەیەتی و بەس، ماڵێکیش نەگاتە ئەندازەی زەکات لێدان زەکاتی لێناکەوێ، چونکە رادده (نیصاب) مەرجی پێویستبوونی زەکاتە، وەك لەمەودوا باس دەکرێ. هەروا ئەوماڵەی بگاتە راددەی زەکات و ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبووبێ زەکاتی لێناکەوێ، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هیچ ماڵێ زەکاتی لێناکەوێ هەتا ساڵ بەسەریدا تێپەڕ نەکا (ئەبو داوود) ئاژەڵی ئالیکخۆریش زەکاتی لێناکەوێ، بەڵگەی ئەمەیش ئەم بڕگەیە کە لە زەکاتنامەکەی ئەبو بەکردا تۆمارکراوە: زەکاتی مەڕو بزنیش، کە بەدەمی خۆی بلەوەڕێ و بۆ دەرەوە ببرێ و بە لەوەڕی کەژ بژی و بە ئالیك و ئالفی ماڵەوە نەژی – ئاوایە: کە بوون بە چل سەر تا دەبن بە سەدو بیست سەر، مەڕێ یا بزانێ زەکاتیان لێدەکەوێ. (بوخاری). بەس ئەم چوارە کەی وشترو رەشە

ولاخو مەڕو بزنن زەکاتیان لێدەکەوێ، چونکە دەق لەسەر ئەمانە هەیە، غەیری ئەمانە لەسەر بنەڕت (ئەصڵ) دەمێننەوە، کە پێویست نەبوونی زەکاتە تیادا. بەپێی ئەم فەرموودەیەی (صەحیحەین)یش: بەندەو ئەسپو مایني پیاوی موسوڵمان زەکاتیان لێناکەوێ بەو مەرجەی کە هی بازرگانی نەبن.

## ١١٨) زەکاتی پارە کە بریتییە لەم دوو شتە (زێڕو زیو):

زێڕو زیو، سکەیان لێدرابێ یانا، بگەنە رادەی زەکات زەکاتیان لێدەکەوێ، سەر بەڵگەی پێویستبوونی زەکات لەم دووەدا، لەپێش یەککگرتندا، فەرموودەی خوای گەورەیە: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ – سورة التوبة – ٩/٣٤} کەنز (لەم ئایەتەدا) ئەو ماڵەیە کە زەکاتی لێدەرنەکرێ مەرجی پێویستبوونی زەکات لەم دووەدا ئەم پێنج شتەیە ئیسلامو ئازادیو خاوەنێتیی تەواوو رادەی زەکاتو ساڵ بەسەردا تێپەڕبوون. جا هەر کەسێ ئەوەندەی زێڕو زیو هەبێ کە بگاتە رادەی زەکات، وە ئەوەندە لەلای بمێنێتەوە تا ساڵی بەسەردا دێتەوە، وە ئەوکەسە ئەم مەرجانەی تیادا هەبی، ئیتر زەکاتی دەکەوێتە سەر، بەلاّم ئەگەر لە نێوان ساڵەکەدا ئەو ماڵە لە موڵکی ئەو دەرچوو، وە ئەوەی مابوو نەدەگەیشتە رادەی زەکات، وەك ئەوە فرۆشتی، ئەوە ساڵەکەی دەپچڕێ، ئەگەر ماڵەکە بووەوە بەهی ئەو، وەك ئەوە کڕی یەوە ئەوە دەبێ سەر لەنوێ ساڵ بەسەرا گەڕانەوەی نوێ حسێب بکا.

# ١١٩) زەكاتی كشتوكاڵو دانەوێڵە:

دانەوێڵە كە زەكاتی لێدەكەوێ ئەو دانەوێڵەیە كە مرۆڤی پیدەژی، وەك گەنمو جۆو چەڵتووكو هەرزنو نیسكو نۆكو پاقلەو فاصۆلیاو لۆبیاو گاگۆزو ماش، چونكە دەق (نەص) لەسەر هەندێكیان هەیە، ئەوانی تریش دەگرێن بە پاشكۆی ئەوان. سەر بەڵگە لە پێویستبوونیدا فەرمایشتی خوای گەورەیە: {وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ – سورة الأنعام – ١٤١/٧}.

**لە دانەوێڵەدا زەكات بەم سێ مەرجە پێویست دەبێ:**

**مەرجی یەكەم:** دەبێ لە توخمی ئەو دانەوێڵانەبێ كە مرۆڤ دایدەچێنێ، وەك ئەو دانەوێڵانەی ناومان هێنان، بەڵام ئەگەر لە خۆیەوە روابوو، وەك ئەوە بابردبووی بۆ ئەو شوێنە، ئەگەر لە زەویەكی بێ خاوەندا روابوو، ئەوە زەكاتی لێناكەوێ، وەك ئەو خورماو میوانەی لە سارا دەڕوێن، چونكە خاوەنی تایبەتیان نیە. بەڵام ئەگەر زەویەكە خاوەنی دیاری هەبوو ئەوە زەكاتی لێدەكەوێ، دەبێ خاوەنی زەوییەكە زەكاتەكەی بدا.

**مەرجی دووەم:** دەبێ لەو دانەوێڵانە بێ كە مرۆڤ پێیان دەژی، لە حاڵی اختیاردا واتە: بە ئارەزوو پێی بژی، پێبژێو – واتە: قووت – ئەو خۆراكەیە كە لە گەدەدا دەنووسێ بەیەكەوە، بۆیە بەتایبەتی زەكات لە پێبژێو دەكەوێ چونكە ژیان بەبێ ئەو ئەستەمە، بە پێچەوانەی خۆراكی ترەوە كە پێبژێو نەبن، چونكە خواردنیان تەواوكەرە، پێویستی

سەرەکی نین، وەك زیرەو (کراویا)و سەوزەواتو خەیارو ترۆزیو کاڵەکو شووتیو شتی وا.

**مەرجی سێیەم:** بگاتە رادەی زەکات، وەك لەدواوە دێ. زەکاتی دانەوێڵە لەسەر کێیە: بڕێ لە زاناکان دەفەرموون: زەکاتەکە لەسەر خاوەن زەوییەکەیە، بڕێ تر دەفەرموون: لەسەر کشتیارەکەیە، کە دانەوێڵەکە هی خۆیەتی، ئەم دوورایەیش هەر یەکەیان بەشی خۆی بایەخو دەگەری هەیە.

## ۱۲۰) زەکاتی میوەهات:

مەبەست لە میوە خورماو مێوژە، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی داوە کە رەزیش وەك باخی خورما خەمڵ بکرێ، وە زەکاتەکەشی بە مێووژیی وەربگیرێ، وەك چۆن زەکاتی باخە خورما بە خورمایی وەردەگیرێ بەری رەزش ئاوا!. (تیرمیذی گێڕاویەتەوەو بە فەرموودەیەکی جوانی داناوەو ئیبنو حەببان بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە).

**مەرجی پێویستبوونی: چوارشتە:** ئیسلامو ئازادیو رادەو خاوەنداریی تەواو. باسی رادەی (ئەندازە: نیصاب) لە داواوە بە روونی دێ، حیکمەتی ئەوە کە ئەم دوو مێوەیە بە تایبەتی زەکاتیان لێدەکەوێ ئەمەیە: کە ئەم دووە پێبژیوینو مرۆڤ پێیان دەژی، کەواتە وەك دانەوێڵە وان، بە پێچەوانەی میوەی ترەوە، چونکە خواردنی ئەوان بۆ خۆشیو رابواردنە، یا دەکرێن بە پێخۆ، خواردنیان پێویستی سەرەکی

نیه، وەکوو هەرمێو هەنارو قۆخو بەهێو هەنجیر، هەندێ دەفەرموێ: هەنجیر زەکاتی لێدەکەوێ، چونکە لە ریزەی مێوژدایە، بەڵکوو لە مێوژ لەبەرترە، چونکە زۆرتر هەنجیر بۆ پێبژێوی بەکار دەهێنرێ، کەمتر لە باتی میوەی رووت دەخورێ!.

## ١٢١) زەکاتی سامانی بازرگانی:

سامانی بازرگانی ئەو چەشنە ماڵانەیە کە بەرابەر پارەو پوول ئاڵو گۆڕی پێدەکرێو بازرگانی پێوە دەکرێ.

مەرجی زەکاتەکەی دەق وەك مەرجی زەکاتی میوەهات وایە، لە هەمان کاتا دەبێ ماڵەکە سامانی بازرگانی بێو بە نیازی بازرگانی پێوەکردن ئاڵو وێڵی پێوە بکا، هەتا لەو ماڵە جیا ببێتەوە کە بەهۆیەکی ترەوە دەبێ بەماڵیو بۆ پێویستی ماڵ رای دەگرێ، ئەوە زەکاتی لێناکەوێ، هەروا دەبێ بەهۆی ئاڵووێڵەوە یا لە تۆڵەی شتێکا وەرگیرابێ، واتە هەر ماڵێ بەبێ ئاڵشت ببێ بەماڵی کەسێ زەکاتی لێناکەوێ، وەك بەخشینو کەلەپوورو راسپێری، چونکە لە وەرگرتنی ئەم جۆرە ماڵانەدا ئاڵشت نیەو هیچیش لە تۆڵەیاندا وەرناگیرێ، بەلگەی پێویستبوونی زەکاتەکەی فەرمایشتی خوای گەورەیە {أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ – سورة البقرة – ٢٦٧/٢} لە هەموو ماڵێ کەبە کاسپی حەلاڵ بە دەستی دەهێنن زەکاتی لێبدەن. موجاهید {رەزای خوای لێبێ} لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەمە سەبارەت بە زەکاتی ماڵی بازرگانی هاتووە، چونکە لە فەرموودەدا دەڵێ: وشترو مەڕو بزنو رەشەوڵاخو کووتاڵ،

هەرشتەی بەپێی خۆی زەکاتی لێدەکەوێ. (دارە قوطنی – حاکم – حاکم دەفەرموێ: بەپێی مەرجی شەیخەینە). مەبەست لە کووتاڵ ئەو جلو بەرگو کالاّیەیە کە لەلای کووتاڵ فرۆش ئامادە دەکرێن بۆ فرۆشتن. لەبەر ئەوەی زەکات پەیوەندی نیە بە خودی جلو بەرگەوە بە ناچاری دەبڕرێ بەسەر زەکاتی سامانی بازرگانیدا. جارێ عومەر {رەزای خوای لێبێ} لەلای چەرم فرۆشێکەوە تێپەڕی، پێی فەرموو: ئەی کەوڵ فرۆش! زەکاتی ماڵەکەت بدە. ئەویش گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسڵمانان! خۆ ئەمە چەرمە؟ فەرمووی: بیشکێنەروە بە پارەو ئەوسا بە پێی نرخەکەی زەکاتەکەی دەرکە. (شافیعیو ئەحمەدو دارە قوطنیو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە).

## ١٢٢) رادەی زەکاتی وشتر:

لای کەمی ژمارەی وشتر کە زەکاتی تیادا پێویستبێ پێنج سەرە، کە گەیشتە پێنج سەر کاوڕێ دەدرێ لە زەکاتیا، یا چتیرێ دەدرێ، کە گەیشتە دەسەر دوو کاوڕ یا دوو چتیر دەدرێ کە گەیشتە پازدە سەری سێ کاوڕ، یا سێ چتیر دەدرێ، لە بیست سەرا چوار کاوڕ، یا چوار چتیر بزن، لە بیستو پێنج سەردا وشترێکی مێی یەك ساڵە دەدرێ، لە سییو شەش سەردا وشترێکی مێی دووساڵەو لە چلو شەش سەردا وشترێکی مێی سێ ساڵە دەدرێ. کە گەیشتە شەستو یەك سەرو وشترێکی مێی چوار ساڵەو کە گەیشتە حەفتاو شەش سەر دوو وشتری مێیی دوو ساڵە دەدرێ، وە لە نەوەدو یەکا دوو وشتری مێی سێساڵەو لە سەدو بیستو یەك سەردا سێ وشتری مێی دوو ساڵە دەدرێ، کە لەم ئەندازەیە تێپەڕی

یا چلچل حسێب دەكرێ‌و لە هەر چل سەرێكا پارێنە وشترێكی مێنگەی دوو ساڵەیان زەكات لێدەكەوێ، یا پەنجا پەنجا حسێب دەكرێ‌و، لە هەموو پەنجا سەرێكا نێونە وشترێكی سێساڵەیان زەكات لێدەكەوێ. بەڵگەیش لەسەر ئەوە كە رادەی زەكاتی وشتر پێنج سەرە، ئەم فەرمایشتەی حەزرەتە {دروودی خوای لەسەربێ} كە دەفەرموێ: وە هەر كەسێ تەنیا چوار وشتری هەبوو زەكاتیان لێناكەوێ. (شەیخان).

زەكاتی وشتر كە هەتا بیست سەر بە ئاژەڵی وردە دەدرێ لەبەر خاتری هەردوو لایە، چونكە پێویستكردنی وشترێ لە پێنج وشتر زیان دەدا لە خاوەنەكەیان، پێویستكردنیپێنجیەكی وشترێكیش بە هۆی هاوبەشییەوە لەیەك وشتردا، هەم زیان دەدا لە خاوەنەكەی‌و هەم زیان دەدا لە هەژاران. سەر بەڵگەی ئەم كارەیش زەكاتنامەی ئەبو بەكرە كە بە ئەنەسا ناردی بۆ خەڵكی بەحرین كە لە سەرەتاكەیەوە دەفەرموێ: بە ناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان. ئەمە دەستوری دانی زەكاتی فەرزە كە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بە فەرمانی خودا دایناوە لەسەر موسڵمانان، جاهەر موسڵمانێ لەسەر ئەم شێوە رێك‌و پێكە داوای لێكرا. ئەوا با بیدات، وە هەر كەسێ داوای زیاتری لەمە لێكرا ئەوا با زیادەكە نەدا هەتا كۆتایی ئەم فەرموودەیە كە بوخاری بە درێژی گێڕاویەتەوە).

بۆ زیادە بەهرە ئەم چەند وشە عەرەبییانە شیی دەكەینەوە: ئەو (شاتە)ی كە دەدرێ بە زەكاتی وشتردا هەتا دەگاتە بیست سەر، یا كاوڕێكە، كە برتییە لە كاوڕە مەڕێ ساڵێكی تەواو كردبێ‌و پێی نابێتە ساڵی دووەم، یا چتیربزنێكە كە دووساڵەبێ، چونكە (شاة) لە عەرەبیدا بە مەڕو بزن دەگوترێ. (بنت مخاض)یش وشترە مێگەی یەك ساڵە كە

پێی نابێتە ساڵی دووەم، لە بەر ئەوەیش وا ناونراوە، چونکە وەختی ئەوە هاتووە کە دایکەکەی ئاوس ببێتەوەو سەر لەنوێ لەکاتی زاییندا ژان بیگرێ، چونکە لە عەرەبیدا (مە خاض) بەژانی کاتی زایین دەگوترێ:

## ١٢٣) رادەی زەکاتی رەشە ولاخ:

زەکات لە رەشە ولاخ ناکەوێ تا دەگاتە سیی سەر، کە گەیشتە سیی سەر گوێرەکە نێرێکی یەك ساڵەبدا بە زەکاتا، کە لەم رادەیە تێپەڕی بۆ هەر سیی سەرێ گوێرەکە نێرێکی یەك. ساڵە، یا بۆ هەرچل سەرێ نێون مانگایەکی دوو ساڵە بدا. بەپێی ئەم فەرموودەیە: پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} کە موعاذی نارد بۆیە مەن فەرمانی پێکرد: کە لە هەموو سیی سەرە رەشە ولاخێ گوێرەکە نێرەیەك یا گوێرەکە مێنگەیەك زەکات وەربگرێ، وە لە هەموو چل سەرێ نێونێ زەکات وەربگرێ. (ترمیذی گێڕایەتەوەو فەرموویەتی: پلەکەی جوانە، حاکمیش فەرموویەتی: بەپێی مەرجی شەیخەینە. رەویانیش فەرموویەتی: ئەمە یەکگرتنی لەسەرە). گوێرەکە واتە: (تەبیع) کە ئەوەیە ساڵێکی تەواو کردبێو پێی نابێتە دوو، بۆیە پێی دەگوترێ (تەبیع: واتە: شوێنکەوتە) چونکە لەو تەمەنەدا بۆ لەوەڕ شوێنی دایکی دەکەوێ بۆ لەوەڕگا. نێونیش واتە: (موسیننە) کە ئەوەیە دوو ساڵی تەواو کردبێ، بۆیە وایی پێ دەگوترێ چونکە ددانی تەواوی دەرم کردووە، ددان بە عەرەبی پێی دەگوترێ (سینن).

## ١٢٤) ڕادەی زەکاتی مەڕو بزن:

لای کەمی ڕادەی زەکاتی وردە ئاژەڵ چل سەرە، کە گەیشتە چل سەر، ئەوسا کاوڕە مەڕێکی یەك ساڵە، یا چتیر بزنێکی دووساڵە بدا، کە گەیشتە سەدو بیستو یەك سەر دوو سەر بدا، کە گەیشتیشە دوو سەدو یەك سەر سێ سەر بدا، کە لەم ئەندازەیەش سەرکەوت لەهەر سەد سەرێکا سەرێ پێویستە. دیاریکردنی کاوڕو چتیر بەپێی ئەم فەرمایشتەی عومەرە {خوای لێ ڕازی بێ}: دابەستەو دەستەمۆی بەران‌و سابرێن لە باتی زەکات وەرمەگرە، بەڵکو کاوڕو چتیر بزن وەربگرە. (مالیك گێڕاویەتەوە). ئاژەڵەکەی ئەگەر تێکەڵ بوو لە ساخ‌و نەخۆش، نەخۆشەکان بە کەڵکی زەکات نایەن، عەیبداریش هەروەها، چونکە خوای گەورە بۆ خۆی دەفەرموێ: {وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ – سورة البقرة – ٢/٢٦٧} واتە: لە کەسپی پاکی خۆتان، لە ماڵی حەلاڵی ساغی خۆتان، بەپێی حاڵ، خێرو خێراتی لێبکەن‌و ڕەزیلی لێمەکەن وەك ئەوە بچن لە ئایەخی ماڵەکەتان خێرو پیاوەتی بکەن، لە فەرموودەدا دەفەرموێ: پیری ددان لە دەما نەماوو ئاژەڵی عیبدار نادرێن بە زەکات، هەروا سەبرێن‌و بەرانیش مەگەر بۆ ئەم دوانەیان بە ئارەزووی زەکاتدەر خۆی. (بوخاری‌و تیرمیذی) تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە، بەڵام ئەگەر ڕانەکەی هەموو عەیبداربوو، ئەوە زەکات لەوە دەدات، چونکە خوا دەفەرموێ: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً – سورة التوبة – ٩/١٠٣} واتە: لەو ماڵەی کە هەیانە زەکات وەربگرە. دەی لەم حاڵەیش ماڵەکەی برێتییە لەو نەخۆشانە، لەبەر

ئـــەوەیش هـــەژاران کـــە بەشـــیان هەیـــە لـــە ماڵـــدا حاڵیـــان وەك حـــاڵی هاوبەشـانی ترەوایـە، بەشـەکە لـە ماڵـەهاو بەشـەکە جیـا دەکرێتـەوە، لـە هەمان کاتا ئەگەر لە خاوەن ماڵەکە داوای ئەوە بکەین کە لـەماڵی زەکـات بـدا کـە لـەلای خـۆی دەسـت نەکـەوێ ئـەوە ناهـەقی لێدەکـەین، ئەگـەر هەمووشـیان نێربـوون هـەروا، ئەگـەر هەمووشـیان بیـچم گـچکە بـوون هەروا، بە پێی فەرموودەکەی ئەبو بەکر کـە دەفـەرموێ: بـەخودا ئەگـەر گێـسکێکیان کـاتی خـۆی دابـێ بـە پێغەمبـەر {درووودی خـوای لەسەربێ} و ئێـستا بیانەوێ نەیدەن بە من لەسەر ئەوە دەچم بەگژیانا. دابەستەو دەستەمۆ نـادرێن بـە زەکاتـدا، چـونکە لـە نایـابی مـاڵن، ئاوسـیش نـادرێ، چـونکە پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لەوە. تەنانەت ئەگەر ئاژەڵەکەی هەموو ئاوسبوو، لەباتی زەکات داوای ئاوسی لێ ناکرێ، چونکە چل سـەر مەڕ، مەڕێکی. لێدەکـەوێ، بـەڵام ئـاوس دووسـەرە بـەڵێ ئەگـەر زەکاتـدەر بەرەزای خۆی دابەستە پائاوسیدا، یا دەستەمۆیدا دروستە.

## ١٢٥) زەکاتی سامانی هاوبەش:

**هاوبەشی دووجۆرە:**

**یەکـەم ئەوەیـە:** کـە بەشـەکان دیـاری نـەبن، وەك ئەوەیـە: چـەند کەسێ سەد سەر ئاژەڵیان بەکەلەپور بۆ هاتبێتەوە.

**دووەم ئەوەیە:** کە بەشـەکان دیـاری بـن، بـەڵام تـەواو تێکـەڵ بـن، وەك یـەك مـاڵ وابـن، لـەم دوو حاڵـەدا یاسـایەکی تایبـەتی هەیـەبۆ زەکاتدانی ئەو سامانە هاوبەشە، پاڵفتەکەی ئەمەیە: سامانە هاوبەشەکە

بەیەك ماڵ دادەنرێ، هاوبەشەکانیش بەپێی بەشەکەی خۆیان پشکی زەکاتەکەیان لێوەر دەگرێ. سەر بەڵگەی ئەم مەسەلەیە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): نەماڵی جیا کۆ دەکرێتەوەو نەماڵی کۆش جیادەکرێتەو لە ترسی زەکات، وە هاوبەشانیش لەناو خۆیانا بەرێکوپێکی کەمو زیاد بەپێی ئەندازەی زۆرو کەمیی بەشەکەیان دەگرێنەوە بۆ یەکتری (بوخاری)جا ئەگەر هاوبەشی سێ سەر مەڕی هەبوو، ئەوی تریان دە سەر مەڕی هەبوو، بە هەردوکیان مەڕێ دەدەن بە زەکاتا، ئەگەر مەڕەکە بایی چل دینار بێ دەبێ خاوەنی سیی سەرەکە سیی دیناری بداتو خاوەنی دە سەرەکەیش دە دیناری بدات، چونکە زەکاتی دەیەکە کەمترە لە زەکاتی سییەکە.

## زەکاتی سامانی هاوبەش:

**تۆ مەرجی هەیە.**

**یەکەم:** دەبێ پەچەو مۆڵەڕانو مۆڵەگایەلو جێگەی شەویان یەکبێ.

**دووەم:** لەوەڕگایان یەکبێ.

**سێیەم:** شوانیان یەکبێ، چەند شوانێکیش بن قەیناکا بەلاّم نابێ هەر شوانەی هی هاوبەشیبێ.

**چوارەم:** کەڵیان یەبێ، نەك هەر کەسێ کەڵی تایبەتی خۆی هەبێ.

**پێنجەم**: جێگەی ئاوخواردنەوەیان یەك بێ. وەك ئەوە رانەكەیان لە یەك چەم یا لەیەك كانی، یا لەیەك بیر ئاو بخۆنەوە، نەك هەر كەسەیان (ئاو گۆزگە – مەورید)ی خۆی هەبێ.

**شەشەم**: جێگەی دۆشینو بێریان یەكبێ، بەلاّم مەرج نیە دۆشەریان یەكبێ، چونكە دروستە هەر خاوەن بەشێ شیری ئاژەڵەكەی خۆی بە جیا بدۆشێو لە ماڵی خۆیا بەرهەمی بهێنێ.

**حەوتەم**: دەبێ كۆی بەشەكان لە هەردوو جۆرەكەدا لەلای كەمی رادەی زەكات پێویست بوون كەمتر نەبێ، دەی ئەگەر چەن هاوبەشێ بە هەموویان چل سەر مەڕیان هەبوو، ئەوە مەڕێ زەكاتیان لێ دەكەوێ، بەلاّم ئەگەر بە هەموویان لە چل سەر كەمتریان هەبوو ئەوە زەكاتیان لەسەر نیە.

**هەشتەم**: دەبێ هەموو هاوبەشەكان ئەهلی زەكات بن. كەواتە ئەگەر یەكێكیان ئەهلی ذیممە، یا كۆرپەلەیێ بوو لە سكی دایكیا، ئەوە بایەخی نیە.

**نۆیەم**: دەبێ ماوەی هاوبەشییەكەیان لە سال كەمتر نەبێ. واتە: لە هەر ماڵێكا كە پێویست بێ كە ساڵی بەسەرا بێتەوە.

**بزانن**: هاوبەشی، لەسەر فەرمایشتی هەرە دروست، وەك لە ئاژەڵدا كاریگەری هەیە بۆ زەكات، لە هەموو سامانێكی تری زەكاتی (ماڵی زەكەوییی)دا، دەورو رۆڵ دەبینێ، وەك دانەوێڵەو میوەو زێڕو زیوو سامانی بازرگانی، چونكە هەروەك بەهۆی ئاژەڵەوە گوزەران دەچێ بەرێوە بەهۆی ئەوانەیشەوە دەچێبەرێوە، سەرەڕای ئەم بەلگەیەش ئەم

فەرموودەیە گشتایەتیو تێکراییی دەگەیەنێ کە دەفەرموێ: نەماڵی جیا کۆ دەکرێتەوەو نە ماڵی کۆش جیا دەکرێتەوە لە ترسی زەکات تا کۆتایی فەرموودەکە، وەك لەم زنجیرەیەدا لە پێشەوە رۆیشت، جا لە دانەوێڵەو کشتوکاڵ دەبێ لە سەرەتای ساڵی کشتوکاڵەوە تا دوایی هاوبەش بنو پاسەوان و باخەوان و رەنجبەرو سەپانو کرێکارو موتوربەکارو هێشوو کەرو گوڵەوەچێنو جۆگەو شوێن خەرمانو شوێن شارایان یەکبێ، بەڵام لە میوەدا ئەوەندە بەسە کە لە سەرەتای پێگەیشتنی میوەکەدا هاوبەش بن. بۆ ئاژەڵیش پێویستە لە یەك جۆر بن، یا لە دوو جۆری وابن کە بدرێتە دەمیەك وەك مەرو بزن. لە غەیری دانەوێڵەو مێوەو ئاژەڵیشدا ئەمانە مەرجن: دووکانو پاسەوانو حەسحەسو تەرازوو قەپانو قەپانچیو تەرازوو بە دەستو ئاڵوگۆڕکارو جارچیو قاسەو پارە وەرگریان یەکبێ، لە سامانی بازرگانیدا عەمارو کۆگایان یەکبێ، بە کوردی پەتیو بە کورتیو پوختی: دەبێ ئەو دوو ماڵە وا تێکەڵ بن، وەك یەك ماڵ وابن، بە هیچ لە یەك جوێ نەبن، ئەم حاڵە بەپێی سوننەت بۆ ئاژەڵ چەسپاوە.

## ١٢٦) رادەی زەکاتی زێڕوزیو:

سەرەتای رادەی زێر بیست مسقاڵە، کە گەیشت بەم ئەندازەیە چواریەکی دەیەکی لێدەکەوێ، واتە: چل یەك. ئەگەر لەوەیش پتر بوو لەسەر ئەم رێژەیەو دەق بەم پێیە زەکاتەکەی دەدرێ. سەرەتای رادەی زەکاتی زیویش دوو سەد درەمە، کە دەکاتە سەدو چل مسقاڵ، لەمیشدا چل یەك دەکەوێ، کە دەکاتە پێنج دەرەم، لە پتریشدا بە هەمان رێژە

لەسەر ئەم پێوەدانە زەکاتی لێ دەکەوێ. بەپێی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) زێڕو زیو زەکاتیان لێ دەکەوێ، هەروا بەپێی یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلام. خوای گەورە دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ – سورة التوبة – ٩/٣٤} واتە: مژدەی سزایەکی بەسوێ بدە بەوانە کەهەر زێڕو زیو کەڵەکە دەکەن و لە ڕێگەی خودادا خەرجی ناکەن. لەم ئایەتەدا مەبەست لە (کنز) ئەو سامانەیە کە زەکاتی لێ نەدرێ. لە صەحیحی موسلیما دەفەرموێ: ئەو کەسەی خاوەنی زێڕو زیو بێ و زەکاتی لێدەر نەکا، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو زێڕو زیوە سوور دەکرێتەوە لە ناو ئاگری دۆزەخا تا دەبێ بەیەك پارچە ئاگری سوور، ئەوجا تەنیشتی و ناوچەوانی و پشتی و هەموو لەشی تری پێی داخ دەکرێ، هەموو جارێ کە سارد دەبێتەوە، سەر لەنوێ سوور سووری دەکەنەوە بۆی و دیسان وای لێدەکەنەوە. یەکگرتن لەسەر ئەم سێ شتە دامەزراوە: ڕادەی زەکاتی زیو دووسەد درەمەو ڕادەی زەکاتی زێڕ بیست مسقاڵەو زەکاتەکەیان لە چلدا یەکە.

## ١٢٧) مەرجی زەکاتەکەیان:

### لە پێویست بوونی زەکاتی زێڕو زیودا ئەم سێ شتە مەرجە:

**یەکەم**: گەیشتن بە ڕادەی زەکات کە لە زێڕدا بیست مسقاڵەو لە زیودا دوو سەد درەمە، بەپێی فەرمایشتی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) زێڕ ئەگەر لە بیست دیناری زێڕ کەمتر بوو زەکاتی ناکەوێ، لە بیست دینار نیو دینار زەکاتی لێدەکەوێ. (ئەبوو داوودو کەسانی تر بە

رشتەیەکی دروست گێڕاویانەتەوە). بەپێی ئەم فەرمایشتەی تریش: زیـو لە پێنج ئۆقیە کەمتر بێ زەکاتی لێناکەوێ (شەیخان) ئۆقیە چل درەمـە، پێنج ئۆقیە دەکاتـە دوو سـەد درەم. لـە بوخـاری شـەریفا دەفـەرموێ: لـە زیوو لە زێڕ چل یەك دەکەوێ.

**دووەم**: دەبـێ لـە مـولکی خاوەنەکـەیانا سـاڵیان بەسـەردا بێتـەوە، بـەپێی فـەرموودەی پێغەمبـەر {درووودی خوای لەسەربێ}: مـاڵ زەکـاتی لێناکـەوێ هـەتا سـاڵی بەسـەردا دێتـەوە (ئەحمـەدو ئـەبو داوودو بەیهـەقی گێڕاویانەتەوە، بوخاری بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە).

**سێیەم**: دەبێ زێڕو زیوەکە پاڵفتـەبن، بـەلام ئەگـەر تێکـەڵ بـوون لەگەڵ کانزایەکی تر، زەکاتیان لێناکـەوێ، هـەتا زیـوە سافەکەی، یـا زێـڕە سافەکەی، نەگاتە رادەی زەکاتی خۆی، ئەوە ئەوکاتە زەکاتیان لێدەکـەوێ، ئـەوەی لـەم ئەندازەیـە زیـاتر بـێ بـەم پێودانـە بەهـەمان رێـژە زەکـاتی دەکەوێ، لـە عەلییـەوە {رەزای خوای لێبێ} لـە پێغەمبـەرەوە {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەگەر زێڕت هەبوو زەکاتی ناکەوێ هەتا نەگاتە بیست لـیرەی زێڕو ساڵی بەسەرا نەیەتـەوە، لـەم حاڵـەدا لـە بیـست لـیرەی زێـڕ نیـولیرە زەکاتی لێدەکەوێ، ئەویشی لەمە زیـاتر بـێ بەهـەمان رێـژە بـەم پێودانـە زەکاتی دەکەوێ. (ئەبو داوودو ئەحمەد گێڕاویانەتەوە).

**کاغەزی بانقەنەوت:**

ئـەم کاغەزانـە، کـە ناسـراون بـە بانقەنـەوت قەواڵـەی قـەرزی دسـتەبەرکراون، حـسێبی زیویـان بـۆ دەکـرێ، جـا هـەر کاتـێ ئـەم پـارە کاغەزییانە بەهاکـەیان گەیـشت بـە بـەهای دوو سـەد دەرەم یـا پـتر، ئـەوە زەکاتیان لێ پێویست دەبێ، لە چلیەك.

## ١٢٨) زەكاتی خشڵ:

سەبارەت بە خشڵی ڕەوا دوو فەرمایشتی جیا هەیە: یەكێكیان. دەفەرموێ: پێویستە زەكاتی دەربكرێ، چونكە ژنێ خۆیو كچەكەی هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} كچەكەی دوو بازنی زێڕی قەوی قوی لە دەستیا بوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: ئایا زەكاتی ئەم بازنگانە دەدەی؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەی پێت خۆشە كە لە قیامەتا خودا لە باتی ئەم دەوو بازنە دوو بازنی ئاگرینت بۆ بكا؟ ئەویش هەردوو بازنەكەی داكەندوو هڵیدان بۆ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} و گوتی: ئەوا هەردووكیانم بەخشی بە خوداو پێغەبەری خودا. (ئەبو داوود بەرشتەیەكی دروست گێڕاویەتەوە).

**فەرمایشتی دووەم:** (كە لە بەرچاوترە، واتە: ئەظهەرە) دەفەرموێ: زەكاتی خشڵ پێویست نیە، چونكە ئامادەكراوە بۆ بەكارهێنانێكی ڕەوا، كەواتە لە ئاژەڵێ ژێركار دەچێ، دەق وەك وشترو ڕەشەوڵاخی ئیشكەر. كە باریان پێدەكێشن، یا جووتیان پێدەكەن. ئیمامی مالیك لە مووطادا لە (ص ١٧٠)دا بە رشتەیەكی دروست ئەم رایە لە ئیبنو عومەرو لە عائیشەوە دەگێڕێتەوزە، عەبدورەحمانی كوڕی قاسمەوە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: عائیشە هاوسەری پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چەند برازایەكی هەتیوی هەبوو، كچ بوون، خۆی سەرپەرشتی دەكردنو لەژێر باڵی خۆیدا بوون خشڵیان هەبوو، عائیشە لە خشڵی ئەم برازایانەی زەكاتی دەرنەدەكردا.

هەروا دەگێڕنەوە: نافع دەفەرموێ: ئیبنو عومەریش لە خشڵی کچو کەنیزەکانی زەکاتی دەرنەدەکرد[1]، ئەحمەدیش دەفەرموێ: ئەم پێنج کەسە لە هاوڕێیانی پێغەمبەر {درووده خودا له پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یارانی} رایان وابوو کە خشڵ زەکاتی ناکەوی واتە: ئەنەسی کوڕی مالیكو جابیرو ئیبنو عومەرو عائیشەو ئەسماء. جابینا لەسەر ئەمە ئەقڵ نایگرێ کە ئەمانە لە خۆیانەوە بەبێ بەلگە کاری واتە: بکەن چونکە ئەم زاتانە لە زۆر کەس باشتر ئاگایان لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر هەیەو زۆر چاك لێیان حاڵی دەبنو دەزانن کە مەبەست لە فەرمایشتەکانی چییەو کوێ دەگرنەوەو کوێ ناگرنەوە، جا لەبەر ئەم فەرموودەیەو لەبەر ڕۆشنایی ئەم شیکردنەوەیە، زاناکان هاتوون ئەم فەرموودەیەو فەرمایشتەکانی ئەم سەحابانەیان ئاوا لەسەر ئەم شێوەی دواوە کۆ کردۆتەوەو کاریان بەهەر دوو لایان کردووەو دەفەرموون: مەبەست لە فەرموودەکەی پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} ئەو خشڵەیە کە لە رادەبەدەر زیادەڕەوی تیاکرابێ، جا خشڵی وا زەکاتی لێدەکەوێ، یا مەبەست خشڵێکە کە لەبەرنەکرێو بۆ فێڵبێ جا هەر کاتێ خشل زیادەڕەوی تیانەبوو، وە بۆ لەبەرکردن بوو، وە بۆ فێڵ نەبوو، ئەوە بەپێی ئەم فەرموودەیە، وەك ئەم سەحابانە دەفەرموون، زەکاتی لێناکەوێ، بۆ پشتیوانی ئەم وەڵامە دەفەرموون: لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} بڕیاری نەداوە کە لە تێکڕای خشڵدا زەکات دەکەوێ، بەڵکوو بڕیاری داوە کە لە جۆرێکیا زەکات پێویستە، کە ئەوەیە زیادەڕەوی تیابێ، وەك پێغەمبەر {درووده خوای

[1] بەپێی کفایە الاخیار ئەم شوێنە راست کراوەتەوە.

- وەرگێڕ -

{لەسەربێ} لە فەرموودەکەیدا بەوشەی (ئەم بازنگانە) ئاماژەی بۆ دەکا، چونکە لە راستیدا بازنگەکان زیادەڕەوییان تیابوو، بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ: دوو بازنی زێڕی قەوی قەوی لە دەستبوو.

خشڵی ناڕەوا زەکاتی دەکەوێ، خشڵی ناڕەوا جۆری زۆرە وەك ئەوە ژن خشڵی پیاوان بۆ خۆی بکا، وەك شمشێری زێڕ، یا خشڵەکەی لە رادەبەدەر بێو پتر لە خشڵی ژنانی وێنەی خۆی بێ، خشڵی وا بەبێ گومان زەکاتی پێویستە، هەروا هەموو خشڵێکی پیاو، زێڕبێ یا زیو، جگە لە ئەنگوستیلەیێ، زەکاتی پێویستە، هەروا زەکات پێویستە لە هەموو قاپو قاچاخێکی زێڕو زیودا، بۆ بەکارهێنانی پیاوبێ یا هی ژن گەوهەرو جەواهیراتی گرانبەهای وەك دوڕو مرواریو یاقوتو ئەڵماسو پیرۆزەو شتی تری وا زەکاتیان لێناکەوێ، مەگەر لەیەك باردا، کە ئەوەیە بازرگانیان پێوەبکرێ، جا لەم کاتەدا دەق وەك سامانی بازرگانی زەکاتیان لێ دەردەکرێ، بە مەرجێ بگەنە رادەی زەکات. بەڵگەی ئەوە کە زەکاتیان لێناکەوێ ئەمەیە: لە شەریعەتدا بەڵگەی نەقڵی لەسەر پێویستبوونی زەکات لە جەواهیراتدا نیە، لەکاتی وایشدا بڕیار بە پێی ئازادی گەردنە لەبەر پرسیاری: (الحكم على البراءة الاصلية).

## ١٢٩) رادەی زەکاتی دانەوێڵەو میوە:

رادەی زەکاتی دەغڵو دانو خەڵەو میوە پێنج ویسقە (کە بەپێوانەی کوردەواری خۆمان، لەسەر فەرمایشتی شەریعەتی ئیسلام، دانراوی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس {رەحمەتی خوای لێبێ} دەکاتە

نزیکەی چل و پێنج تەنەکە وە بە کێشانەی کوردەواری دەکاتە دوو سەدو بیست و پێنج تەورێزی) وەرگێڕ[1].

---

[1] لە مەدحی بەحەقی مامۆستا عبدولکەرما بەندە گوتوومە لە چامەیەکا:

**علمــاء امــة الهــدى – أرواحنــا**
**لهـم الفـدا – سـور لـدينك خـافرا!**
**ألقــت مــواكبهم بكوكبــة مــن**
**الكــرد الهـداة، بهــم تقـر نـواظرا!**
**في عــصرنا عبــدالكريم شــيخنا**
**تخرجــت علــى يديــه مــشاهير**
**بوركت يا أبن الكرد سوف تفـاخر**
**أمــم بكــم، وبعلمكــم ســتناظر،،**
**لخوالــد الكتــب العظــام نــوادر**
**ومؤلفــــاتكمو لتلــــك بــــوادرا!**
**صــارت خــزائن الكنــوز فانهــا**
**لخـير مجمــع العلــوم مــصادر،،**
**تفنــى الجبــال والكتــاب سـيخلد**
**ففــي الجنــان للهــدة منــابرا!!**
**بــالنور مكتــوب علــى جبينــه**
**ســيماه في هــذا الــشعار ظــاهر:**
**نور الوقار علـى الجـبين اذا سـنا**
**يعنــي: هنــا روح الديانــة حاضــر**

له صەحیحەیندا دەفەرموێ: دانەوێڵە لە پێنج ویسق کەمتربێ. زەکاتی لێناکەوێ لە گێڕانەوەیەکی موسلیما: دانەوێڵەو میوە تا نەگەنە پێنج ویسق زەکاتیان لێ ناکەوێ ئیبنو حەببان لە صەحیحەکەی خۆیدا ئەم بڕگەیەی لەم فەرموودەیە پتر کردووە کە دەفەرموێ: ویسقیش شەست مەنە، مەن: واتە صاع. ئیبنو لمونذیر یەکگرتنی لەسەر ئەم قسەیە: کە وەسق شەست مەنە گێڕاوەتەوە. بایەخو ئیعتیبار بە عەیارەی مەدینەیە چونکە دەفەرموێ (درووده خوای لەسەربێ): بۆ پێوان عەیارەی خەڵکی مەدینەو بۆ کێشانیش سەنگی خەڵکی مەککە تەواو پەسەندە.

هەر بەروبوومێ، هەر ماڵێ وەقفو تەخانبێ لەسەر مزگەوتو سەنگەری غەزاو فێرگەو پردو هەژاران‌و مسکێنان‌وهەر لایەنێکی چاکە، زەکاتی لێناکەوێ، چونکە ماڵی وا خاوەنی دیاری نیە.

### ئەندازەی پێویست:

ئەو ئەندازەیەی پێویستە بدرێ لە زەکاتی میوەو دغڵ‌و دانا لەم کاتانەدا دەیەکە، کە دێمبێ‌و بە باران پێبگا، یا بەبێ ئامێر ئاو بدرێ، وەك ئەوە بە ئاوی کارێز، یا بە ئاوی چەم یا بەهۆی نزیکی رەگەکەی لە ئاوەوە، یا بە جۆگای هەڵگیراو ئاو بدرێ، لە هەموو ئەم حاڵانەدا ئەندازەی زەکاتی پێویست دەیەکە، بەڵام بیست یەکە بۆ ئەوەی کە بە ئامێر یا بەکرینی ئاو ئاوبدرێ چونکی لە بارودۆخی یەکەما مەسرەفی نیە، وەلێ لە بارودۆخی دووەما مەسرەفی دەوێ، پێغەمبەریش (درووده خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: زەکاتی بەراوو دێمەکار دەیەکە، وە زەکاتی ئەوەی بە

ولاخی چەرخگێڕ ئاو بدرێ بیست یەکە. (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: ئەوەی بە باران‌و چەم‌و جۆگەو کانی‌و کارێز ئاو بدرێ، یاخود دێمی بێ زەکاتەکەی بێزەکاتەکەی دەیەکە، ئەوەشی بە ولاخی ئاو هەلگۆز، یاخود بە ئاوکێش ئاو بدرێ زەکاتەکەی بیست یەکە. لەسەر فەرمایشتی بەیهەقی‌و کەسانی تریش یەکگرتن لەسەر ئەمە دامەزراوە. ئەوەیشی کە بە یەکسان بەم دوو جۆرە ئاودانە ئاو بدرێ سێ چارەکە دەیەکە. واتە: دەیەکێکی ئەکرێ بە چواربەشەوە، سێبەشی دەدرێ بە زەکاتاو بەشێکی دەدرێتەوە بە خاوەن سامان، کە دەکاتە سێ لە چل.

## ١٣٠) نرخاندنی سامانی بازرگانی:

سامانی بازرگانی لە سەرەتاوە بەچ دراوێ کڕابوو، لە کۆتایی ساڵا بە هەمان دراو دەقەبلێنرێ، جا ئەگەر ئەو بڕەپارەیە دەگەیشتە رادەی زەکات، یا زیاتر، ئەوە دەبێ چل یەکی زەکات لێدەربکرێ. بۆیەیش بایەخ بە نرخاندنی کۆتایی ساڵ دەکرێ، چونکە قەبلاندنی سامان لە هەموو دەم‌و ساڵێکا کارێکی ئاسان نیە، پێویستی بەهاموشۆی سەرو مڕی بازاڕو رەچاوکردنی ئەوە هەیە ئەوەیش گرانەو ئاسان نیە، بەلام ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە ماڵ کڕابوو بە پارە نەکڕابوو، ئەوە کام دراو لە وڵاتا زیاتر باوی هەیەو سەودای پێدەکرێ بەو دراوە دەقەبلێنرێ، ئەگەر هەندێکی بە پارەکڕابوو، وە هەندێکی تری بە سامان، ئەوەی بە پارە کڕابوو بە هەمان پارە دەقەبلێنرێ، وە ئەوەی بە سامان کرابوو بە پارەی بڕەو دارتری ناو وڵات دەقەبلێنرێ‌و بەپێی ئەوە زەکاتی لێ دەردەکرێ.

## ١٣١) زەکاتی کان – واتە: مەعدەن:

مەعدەن لە زمانی عەرەبیدا، هەروا کان لە زمانی کوردیدا ناوە بۆ ئەو شوێنەی کە خودا بە سروشتی، گەوهەرو جەواهیراتو شتی بەنرخی تیا دروست کردبێ، وەك زێڕو زیوو ئاسنو مسو وێنەی ئەمانە، لە عەرەبیدا بۆیە وا ناونراوە چونکە جێگەی نیشتەجێ بوونە، ئەوەتا خودا ئەم گەوهەرو کانزایانەی لەو جێگەیەدا نیشتەجێ کردووە بە هەمان واتایە کە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: (جنات عدن – رەعد – ٢٣/١٣) واتە: چەند بەهەشتێکن جێگەی دانیشتنو مانەوەن. نەتەوەی ئیسلام یەکیانگرتووە لە سەردانی زەکاتی کانی زێڕو زیو، بەپێی تێکڕایی (عوموومی) فەرموودەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: لە زێڕو زیودا چل یەك زەکات دەکەوێ وەك گوترا: زەکات هەر لە کانی زێڕو زیو دەکەوێ.

**وەلێ گوتراویشە:** لە هەموو کانێ زەکات دەکەوێ، وەك ئاسنو شتی تری وا. لە زێڕو زیوی کانا بەس گەیشتن بە رادەی زەکات مەرجە، ساڵهاتنەوە بە سەریدا مەرج نیە، رادە بۆیە مەرجە چونکە تێکڕایی بەڵگەکان هەیە، بەڵام ساڵهاتنەوە مەرج نیە چونکە نەشونمای تەواوە، لەبەر ئەوە لە دانەوێڵەو میوە دەچێ، یەکسەر لەسەر خەرمان زەکاتی لێ دەکەوێ، مەرجە ئەو زێڕو زیوەی لە کان دەردەکرێ لە زەوییەکی رەوادابێ، یا هی دەرهێنەرەکەبێ، وە دەرهێنەرەکەی لە ئەهلی زەکات بێ، کەواتە: زەکات لەسەر کۆیلە نیە، چونکە خۆیوماڵەکەی ماڵی ئاغاکەیەتی. بێبڕوایش رێگەی پێ نادرێ کەشت لە کان ببا بۆ خۆی، یا گەنجینەی دۆزراوەی کۆنی ولاتی ئیسلام ببا بۆ خۆی، هەروەك رێگەی

پێ نادرێ کە وێرانە ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام ئەوەی کە ڕێگەی لێدەگرێ فەرمانڕەوایەو بەس. ئەوەندە هەیە ئەگەر لە پێش ئەوەدا قەدەغەی لێبکرێ بیبا بۆ خۆی دەبێ بەهی خۆی، ڕێك وەك دارکردن لە کەژ.

کاتی پێویستبوونی زەکات لەم جۆرە سامانەدا لەو دەمەوەیە کە کانەکە دەکەوێتە دەستی، کاتی دەرکردنی زەکاتەکەیش لەو دەمەوەیە کە پوختە دەکرێ‌و خۆڵ‌و شتی وای پێوە نامێنێ، چونکە کاتی پێویستبوونی زەکاتی دانەوێڵەش لە کاتی ڕەقبوونی دەنکەکەیەوەیە، بەڵام کاتی دەرکردنی لەپاش سوورکردنیەتی، زەکاتی کان چل یەك، وەك لە پێشەوە گوترا.

## ۱۳۲) زەکاتی زێڕو زیوی شاراوەی کۆن:

گەنجینەی کۆنی شاراوەی سەردەمی پێش ئیسلام پێنج یەکی زەکات لێ دەکەوێ، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە گەنجینەی کۆنی شاراوەی دۆزراوەدا پێنج یەك دەکەوێ. (شەیخان) ساڵ بەسەردا هاتنەوە مەرج نیە، لەبەر ئەو بایستەی لەکاندا گوترا، لە پێویستبوونی ڕادەیشدا ڕاجیایی هەیە، گوتراوە: ڕادەی زەکات پێویستە چونکە ئەمیش وەك کان دەسکەوتی زەوییە، گوتراویشە: پێویست نیە، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە گەنجینەی کۆنی شاراوەی دۆزراوەدا پێنج یەك هەیە، لەم فەرموودەیەدا ڕادە بەمەرج نەگیراوە. گەنجینەی سەردەمی پێش ئیسلام بە جۆری مۆری سەردەمی نەفامیدا دەناسرێتەوە، وەك ئەوە ناوی پادشایێ لە پادشاکانی ئەوانی لێ هەڵکەنرابێ.

بزانن دەسگاکانی پیشەسازی هاوچەرخ کە بە ئامێری میکانیکی دەگەڕێن، هەروا ئەو دووکانو قەیسەریو بازاڕو خانووبەرانەی کە بۆ کریو بەرهەم دروست دەکرێن، ئەمانە هەموو دادەنرێن بە سامانی گەشەکردوو، هەموو سامانێکی گەشەکردوویش زەکاتی لێدەکەوێ، بەلام لەبەر هەمەکەی، چونکە ئەمانە سامانی نەگۆڕن، سامانی نەگۆڕیش زەکات لە بەرهەمەکەی دەکەوێ، بە پێودانی زەوی کشتوکاڵ، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) لە بەرهەمی زەویدا ئەگەر دێم بی، یا بەراو بێ، وە بەئامێر ئاو نەدرێ دەیەکی داناوە، لەوەیش بە ئامێر ئاو بدرێ بیستیەکی داناوە، جا پێویستە هەمان بنەماو دەستوور لە کارخانەو کارگەی پیشەسازیو خانووبەرەی کرێدا جێبەجێ بکرێ.

بەلام خانووی تایبەتی کە نیشەجێی خۆیو خێزانی بێ ئەوە زەکاتی لێناکەوێ، چونکە ئەوە لە پێداویستییە بنەڕەتییەکانە. ئەمە بڕیاری لیژنەی لێکۆڵینەوە کۆمەلایەتییەکانە، کە لە دیمەشق لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٦دا، گیراوە.

## ١٣٣) ئەوانەی کە زەکاتیان پێ دەدرێ:

زەکات دەدرێ بەم هەشت تاقمە، کە خوای گەورە لە نامەی خۆیدا ناوی دیاری کردوونو فەرموویەتی: {إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ - سورة التوبة - ٩/٦٠}

واتە: خودای گەورە خۆی زەکاتی داناوە بۆ ئەم هەشت کۆمەڵە، لە موسڵمانان.

**یەکەم:** هەژاران.

**دووەم:** مسکین‌و بێنەوایان.

**سێیەم:** کارگوزارانی سەر زەکاتەکە خۆی.

**چوارەم:** نۆ موسڵمان‌و ئەو کەسانەی کە ئومێدی سوودی ئیسلامیان لێدەکرێ، بەوماڵی زەکاتە دڵنەوایی دەکرێن.

**پێنجەم:** ئەو بەندانە کە پێویستیان هەیە بەماڵ‌و پارە، بۆ ئازادبوونیان.

**شەشەم:** قەرزاران.

**حەوتەم:** تێکۆشەرانی رێگەی حودا.

**هەشتەم:** رێبواران.

**تاقمی یەکەم:**

هەژاران، هەژار ئەوەیە کە نە ماڵی هەبێ‌و نە کاسبی، یا ماڵ، یا کاسپی هەبێ، بەڵام بەشی نەکا. وەك ئەوە پێویستی بە دەبێ‌و دووی هەبێ، تەنانەت ئەگەر لە دووره دەستیش ماڵی هەبێ هەر بە هەژار دادەنرێ، لەبەر ئەوە بۆی هەیە زەکات وەربگرێ هەتا ماڵەکەی دەگاتە دەستی، گریمان قەرزێکی دواخراوی هەبێ، مافی ئەوەی هەیە کە زەکات ئەوەندە وەربگرێ کە بەشی بکا، هەتا کاتی دانەوەی قەرزەکە، بەڵێ ئەگەر توانای کاسپی هەبوو زەکاتی پێ نادرێ، چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: زەکات بەم دوو کەسە ناشێ: نە بە دەوڵەمەندو نە بە پیاوی لەش ساخی بە توانا. بەڵام ئەگەر فەقێ بوو، ئەگەر خەریکی کاسپی دەبوو خوێندنەکەی لەکیس دەچوو ئەوە زەکاتی پێ دەچشێ بۆ ئەوەی بەردەوام بێ لەسەر خوێندنەکەی، بەڵام ئەگەر کەسێ دەیتوانی

کاسـپی بکـاو لەبـەر خـەریکبوون بـە نوێـژوو خواپەرسـتیو قورئانخوێندنـەوە کاسـپیی پـێ نـەدەکرا، ئـەوە زەکاتی پێنـادرێو ناچار دەکرێ کە کاسپیی بکا، چونکە رزگاربوون لـە چاو لەبـەریی خـەڵك گـەلێ لەو حاڵە باشترە!.

**تاقمی دووەم:**

مسکێن‌و بێنـەوایان. مـسکێن ئەوەیـە: کـە شـتێکی هـەبێ بـەڵام بـە باشی بەشی نەکا، وەك ئەوە پێویستی بـەدە هەیـە، بـەڵام حـەوتی هەیـە، هەروا ئـەو کەسـەیش کـە بتوانـێ کاسـپی بکـا، بـەڵام کاسپییەکەی بەشـی نـەکا، گریمـان بازرگـانیش بـێو ئەوەنـدە سەرمایەیـشی هـەبێ کـە بگاتـە رادەی زەکات، هەر بۆی هەیە زەکـات وەربگـرێ لـە هـەمان کاتـا پـێ‌یـستە لەسـەری زەکـاتی ماڵەکـەی خۆشـی بـدا، چـونکە دەبـێ هەردوولایەنەکـە رەچـاو بکـرێ، لایـەنی پێداویـستی، بەولایەنـە زەکـات وەردەگـرێ، لایـەنی رادەی زەکات، بەو لایەنە زەکاتەکەی دەدا.

**تاقمی سێیەم:**

زەکات کۆکەرەوەکان (کارمەنـدەکانی سەر زەکـات) ئـەو کەسـەیە کـە پێشەوای موسڵمانان دەیکا بـە سـەر کـاری زەکـات کۆکردنـەوە، تابیـدا بـە پێشیاوەکانی، بە پێی فـەرمانی خـوای گـەورە، جـا بـۆی هەیـە بەمـەرجی خۆی زەکات وەربگرێ، مەرجەکەیش ئەوەیە: شارەزای بابەتی زەکات بـێ، هەتا بزانێ چـی لـە سامانا پێویستە، وە چـەندە پێویـستە، وە شایـستەی زەکـات کێیـەو کـێ نیـە، هـەروا دەبـێ دەسـپاك‌و ئازادبـێ، دادپـەروەربێ، موسـوڵمانبێ‌و بێبڕوانـەبێ، چـونکە ئـەم سـەرکاری یـە بـەر ویـلا یـەت

دەکەوێ ئەویش نەبەکۆیلە دەدرێو نە بە بێبڕاوا، خوای مەزن دەفەرموێ: (لا تتخذوا بطان من دونكم) لە غەیری موسڵمانانی خۆتان کەس مەکەن بە دۆستو ئەمیندار یاوەری خۆتان!. عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: ئەوان خوا بە ناپاك و نا ئەمینی داناون ئیتر ئێوە چۆن متمانەو ئەمینی یان پێ دەکەن. هەروا خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً – سورة النساء – ١٤١/٤} واتە: خوای گەورە هیچ ڕێگەیەکی بۆ بێبڕوایان لەسەر موسڵمانان نەهێشتۆتەوە.

**تاقمی چوارەم:**

نۆ موسوڵمان ئەوانەن: کە ئومێدی سوودی ئیسلامیان لێدەکرێ، ئەم دەستەیەی دواوە دەبن بە چەند جۆرێ، جۆرێکیان بێبڕوان، لە کۆناشتی وا ڕێی تێدەچوو کە دڵی بێ بڕوا ڕابگیرێ بە ئومێدی سوودی ئیسلام، چونکە لە کۆنا ئیسلام وەك ئێستا ئاوا باڵا دەست نەبوو، بەڵام ئێستا کە خودا سەری ئیسلامی بەرزەوە کردووە، پێویست بەشتی وا ناکا، جۆرێ تریان موسوڵمانی دەست ڕۆییوی دەوڵەمەندن، ئومێدی یاریدەی ئیسلامیان لێدەکرێ، ئەگەر زەکاتیان پێ بدرێ هیوای ئەوە دەبی کە خەڵکی تر موسوڵمان ببن. جۆرێکی تریان ئەو موسوڵمانەن کە زەکات نەدەر دەترسێنن و ناچاریان دەکەن کە زەکاتەکەی سەریان بدەن، جۆرێکی تریان ئەو موسوڵمانانەن کە سنووری وڵات دەپارێزن و دوژمن دەترسێنن. مەبەست لە نۆ موسڵمانیش ئەو کەسەیە کە تازە موسڵمان بووبێ و هێشتا بە باشی دڵی لەسەر ئیسلامەتی دانەمەزرابێ. ئەمە بۆ دڵڕاگرتنی زەکاتی پێ دەدرێ.

**تاقمی پێنجەم**:

بەندەی کاغەز پێدراون، کە ئەو کۆیلانەن لەگەڵ خاوەنەکانیانا، بە نووسین ڕێکەوتون لە ماوەیەکی ناوبراودا بڕێ پارەی دیاریکراو لە جیباتی ئازادبوونی خۆیان بدەن بە خاوەنەکانیان، ئەمانە زەکاتیان پێدەدرێ هەتا ڕزگاریان دەبێ لە بەندی دیلی؟.

**تاقمی شەشەم**:

**قەرزداران ئەم تاقمە دەبن بە سێ جۆرەوە**...

**جۆری یەکەم**: کەسێکە قەرزی بۆ سوودی خۆی وەرگرتبێ‌و ئەوەندەی نەبێ کە بیداتەوە بۆ بێشەرعیش قەرزی نەکردبی، ئەمە هەتا قەرزەکەی بە تەواوی دەداتەوە بەقەد قەرزەکەی زەکاتی پێدەدرێ. ئەگەر دەیتوانی هەندێ لە قەرزەکەی سەری بە مالی خۆی بداتەوە لەسەر ئەوەوە لە مالی زەکات مەندەی قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە.

**جۆری دووەم**: کەسێکە قەرزی کردبێ بۆ نابژیکردن‌و کوژانەوەی ئاژاوە، زەکات بەمە دەدرێ، بۆ ئەم مەبەستە، با دەوڵەمەندیش بێ.

**جۆری سێیەم**: کەسێکە قەرزاربووبێ بەهۆی دەستەبەرییەوە، ئەمە لەسەر ئەم شێوەیە زەکاتی پێدەدرێ: کاتێ دەستەبەرو دەستەبەر بۆکراو نەدارابن، یا دەستەبەر نەدارابێ‌و دەستەبەر بۆ کراو دەوڵەمەندبێ، بەڵام ڕێگەی نەدابێ کە ببێ بە دەستەبەری، چونکە ئەگەر ڕێگەی دابێ‌و دەوڵەمەندبێ دەبێ خۆی قەرزەکە بداتەوە، بەڵام کاتێ دەستەبەر دارابێ‌و دەستەبەر بۆ کراو نەدرابی دەدرێ بە دەستەبەر بۆ کراو نەك بە دەستەبەر.

## ١٣٤) لا باسێ (فەرعی):

ئەگەر کەسێ قەرزاربێو بە خاوەن قەرزەکە بڵێ: زەکاتم بدەرێ هەتا قەرزەکەتی پێ بدەمەوە، ئەویش وای کرد، ئەوە بری زەکاتەکە دەکەوێ، بەڵام قەرزارەکە بۆی هەیە کە نەیداتەوە پێی لەباتی قەرزەکەی، ئەگەر خاوەن قەرزەکە بە قەرزارەکەی گوت: ئەو قەرزەی لەسەرتە بمدەرەوە هەتا لە باتی زەکات بیدەمەوە پێت. ئەویش بە گوێی کرد، ئەوە قەرزوەرگرتنەوەکە دادەمەزرێ. بەڵام مەرج نیە کە بیداتەوە پێی لەباتی زەکات، ئەگەر قەرزی لەسەر کەسێ بوو، گوتی: ئەو قەرزەی لەسەرتە دام بەتۆ لەباتی زەکات، لەسەر فەرمایشتی دروست بەوەندە بری زەکات ناکەوێ، بەڵکوو دەبێ قەرزەکەی لێوەربگرێتەوەو ئەوسا لە باتی زەکات بیداتێ. گوتراویشە: برێتی زەکاتەکە دەکەوێ هەوەك سپاردەیش لەکاتی وادا بەبێ وەرگرتنەوەیش برێتیی زەکات دەکەوێ.

**تاقمی حەوتەم:**

تێکۆشەرانی رێگەی خودان: مەبەست لەمانەیش ئەو غەزاکەرانەن کە لەبەر رەزای خودای گەورە غەزا دەکەن، بەبێ ئەوە کە مووچەیەکیان لە ماڵی تالانیو شتی وا بۆ براِبێتەوە، ئەمانە با دەوڵەمەندیش بن زەکاتیان پێ دەدرێ، هەتا ببێ بە کۆمەکی بۆیان لە لەسەر غەزاکردن!

**تاقی هەشتەم:**

**رێبوارە:** بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە بەرێدا رادەبوورێ، ئەمیش بەم دوو مەرجە دروستە زەکات وەربگرێ.

**یەکەم**: سەفەرەکەی سەفەرێکی رەوابێ.

**دووەم**: ئاتاج بێ، پێویستە زەکات دابەش بکرێ بەسەر ئەم هەشت تاقمەدا وە بەپێی توانا هیچ تاقمێکیان بێ بەش نەکرێ، چونکە رووکاری ئایەتەکە وا دەگەیەنێ کە زەکات هاوبەشە لە نێوانی ئەم هەشت تاقمەدا. جا ئەگەر تاقمەکان هەندێکیان نەبوونو هەندێکیان هەبوون، زەکاتەکە دەدرێ بەو تاقمانەیان کە هەن، بە رێژەیەکی یەکسان لە نێوانی تاقمەکاندا، بەلایەنی کەمەوە دەبێ زەکاتەکە بدرێ بەسێ کەس لە هەموو تاقمێ، چونکە خودای گەورە لە ئایەتەکەدا بە دارێژگە (صیغە)ی کۆناوی تاقمەکانی بردووە، ئەوەندە هەیە ئەگەر زەکات کۆکەرەوە لە ئارادا نەبوو، وەك ئەوە خاوەن ماڵ خۆی زەکاتەکەی بەسەر شایستەکانا دابەشدەکرد، ئەوە دەیدا بە حەوت تاقمەکەی تر، لە کاتێکیشدا کە یەك کەس بەس بێ بۆ کۆکردنەوەی زەکات، کە شتی وا لە شەرعا دروستەو رێش دەکەوێ، لە کاتی وادا بەشی تاقمی زەکات کۆکەرەوەکان دەدرێ بە یەك کەس چونکە خۆی یەك کەسە، لە تواناداا نیە بدرێ بە دوو کەس.

جا ئەگەر زەکاتدەر زەکاتەکەی دابەشکرد بەسەر دووکەسدا لە تاقمێ، لە هەمان کاتدا توانای ئەوەی هەبوو کە بەشی کەسی سێیەمیش بدا لەو تاقمە، ئەوە بەشی کەسی سێیەمی پێ دەبژێررێو ئەو ئەندازەیەی زەکات هێشتا لە سەرماوە. ئەوەندە هەیە ئەگەر لەهەر تاقمێ سێ کەسی دەست نەکەوت چەند کەس هەبوون لەو تاقمە، پشکی ئەو تاقمە دەدا بەوان! لە هەمان کاتا بۆی هەیە بەشی ئەو تاقمە بکا

بەسێ پشکەوە، چەند کەس لەو تاقمە هەبوون پشکی خۆیان بداتێو چەندکەس نەبوون پشکەکەیان لەسەر ئەم شێوەیە دابەش بکا: ئەگەر ئەو چەند کەسەی لەو تاقمە کە پشکی خۆیان وەرگرتووە هێشتا هەر شایستەی زەکات وەرگرتن بوون، ئەوە لەسەر فەرمایشتی هەرە دروست ئەو پشکانەیش کە ماون هەر دابەش دەکرێتەوە بەسەر ئەوانا، دەنا دەدرێ بە کەسانی تر، بەپێی یاسایەکی تر[1]!.

## ١٣٥) پێنج کەس هەن زەکاتیان پێناشێ:

**یەکەم**: دەوڵەمەند، بەهۆی ماڵەوە، یا بەهۆی کاسپییەوە بەپێی فەرمودەی خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ}: زەکات بەم دوو کەسە ناشێ: نە بە دەوڵەمەندو نە بە پیاوی لەشساخی توانا. بەڵێ ئەگەر مرۆڤی لەشساخی تونا کاسپیی دەست نەدەکەوت ئەوکاتە زەکاتی پێ دەدرێ!.

---

(١) لێرەدا ئیجازو ئیختیصارێکی زۆر موخیلل‌و موهمی هەڵەو هۆی سەر لێشێوان لە فقه المیسرەکەدا هەیە، هەر کەسێ نەگەڕێتەوە بۆ سەر کیفایەتو لئەخیارەکە وەرگەڕانەکەی بەندە بەهەڵە دادەنێ، بۆیە بە پێویستم زانی ئەمە روون بکەمەوە بە شێوەیەکی گشتی هەر کەسێ گومانێکی لە وەرگەڕاوەکەی بەندە بۆ پەیدا بوو، وە بە بۆچوونی ئەو من لە مەسەلەکە حاڵی نەبووم بۆیە بەو شێوەیە وەرم گێڕاوە، با بەوردی سەرنجی کفایة الاخیارە کە بدا، ئەوسا دەزانێ گەشتەکە چۆنە.

– وەرگێڕ –

**دووەم**: کۆیلە چونکە ئەویش مادەم گوزەرانی لەسەر ئاغایەتی لە حوکمی دەوڵەمەند دایە، وەکی تریش ئەو خۆیو هەرچی هەیە هی ئاغاکەیەتی، ئیتر زەکات چۆن وەربگرێ؟ وەریشی بگرێ بۆ خۆی نیە.

**سێیەم**: ئەم دوو بنەماڵەیە زەکاتیان پێ ناشێ: بنەماڵەی بەنی شاهەو بنەماڵەی بەنی موطەلیب، چونکە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ئەم زەکاتە چڵکاوی دەستی خەڵکانە، لەبەر ئەوە نە بە موحەمەدو نە بە کەسوکاری موحەممەد ناشێ (موسلیم). جارێ حەسەنی کچەزای پێغەمبەر {دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە ئیمامی حەسەن بێ} منداڵ بوو، دەنکێ خورمای زەکاتی هەڵگرتو نایە ناو دەمیەوە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پەنجەی کرد بەدەمیداو خورماکەی بە لیکەکەیەوە لە دەمی دەرهێناو تێی خوڕیو پێی فەرموو: قخ قخ، یەع یەع، ئینجا فەرمووی: چ عەجەب نازانیکە ئێمەی خانەوادەی محمد زەکات ناخۆین! (شەیخان گێڕاویانەتەوە). لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: ئەوە چۆن نازانی کە زەکات بە ئێمە ناشێ!. بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم خزمو کەسوکارانەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ژیوارو نەفەقەیان لەسەر بەیتولمالە، جا هەندێ زانا ئەوەیان لە لاپەسەندە ئەگەر ئەم کەسوکارانەی حەزرەت نەدارابوونو لە بیتولمال گوزەرانیان بۆ دابین نەدەکراو پشکەکەی خۆیان لە مفتەماڵ (فایأ) وەك جاران پێ نەدەدرا، کە دەکاتە یەك لە بیستو پێنجی مفتەماڵ، لەم کاتەدا دروستە زەکاتیان پێ بدرێ.

**چوارەم**: هەرکەسێ ژێوار (نەفەقە)ی لەسەر زەکاتدەرەکە بێ، وەك ژنیو باوكو دایکی هەژاری، چونکە ئەمانە ژێواریان مسۆگەرە، کەواتە:

دەوڵەمەندو بێ ئاتاجن‌و هەژار نین، لە راستیدا ئەم رایە دروستترین رایە. گەرچی گوتراویشە: دروستە زەکاتیان پێ بدرێ، چونکە ناوی هەژار ئەوانیش دەگرێتەوە. ئەوەندە هەیە ئەگەر کەسێ ئەو ژێوارەی وەری دەگرت بەباشی بەشی نەدەکرد، وەك ژنێ نەخۆش بێ، یا ژێواری کەسێکی خۆیی لەسەربێ، ئەو ژێوارەی کە لە مێردەکەی وەری دەگرێ بە باشی بەشی ژیواری خۆی‌و ئەو کەسەی کە ژیواری لەسەریەتی‌و بەشی چارەی نەخۆشییەکەیی نەدەکر، ئەمە لەم بارو دۆخەدا بۆی هەیە زەکات وەربگرێ (ئەمە فەرمایشتی قەففالە)،

**پێنجەم**: بێبڕوا (کافر) چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} بە موعاذی فەرموو: جا ئەگەر بۆ ئەمەیش بە گوێیان کردی، ئەوا پێشیان رابگەیەنە: کە خودا زەکاتی لەسەریان داناوە، لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ‌و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، ئەوەتانێ لەم فەرموودەوە ئەوە وەردەگیرێ کە زەکات لە موسوڵمان وەردەگیرێ‌و دەدرێتەوە بە موسڵمان خۆیان. لە هەمان کاتا ئەو زاتانەی کە دەفەرموون: راگوێزانەوەی زەکات لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر دروست نیە، ئەم فەرموودەیە دەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوە. بەڵام ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیما {رەزای خوایان لێبێ} دەفەموێ؟: کردنی ئەم فەرموودەیە بە بەڵگەی ئەم مەسەلەیە زۆر رۆشن نیە، چونکە راناوی کۆ لە وشەی (دەدرێتەوە بە هەژارەکان = یان) هەڵ دەگرێ مەبەست لێی هەژارانی موسڵمانان بێ، هەڵیش دەگرێ مەبەست لێی هەژارانی ئەو شارەبێ، یا هەژارانی ئەو ناوچەیەبێ، ئەم بۆچوونەیش لە بۆچوونی پێشوو ئاشکراترە. خودا بۆ خۆی لە هەموو کەس باشتری لێدەزانێ (أ . هـ) دەی ئەمەیش یاسایەکی

شەرع شوناسییە: هەر بەلگەیێ کرا بە بەلگە لەسەر شتێکی تایبەتو لە هەمان کاتا هەڵی دەگرت کە بکرێ بە بەلگە لەسەر شتێکی تریش، ئەوە ئەو بەلگەیە لە بەلگەیێ دەکەوێو نابێ بە بەلگەی ئەو شتە تایبەتە. زیاد لەسەر ئەمەیش ئایەتی دابەشکردنی زەکاتیش بەسەر ئەو هەشت تاقمەدا تێکڕایی دەگەیەنێ، کە دەفەرموێ: {إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ} هێشتا ئەوەیش ماوە کەسێ بڵێ: فەرموودەکەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێو دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، ئەمە بەس بەلگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوە کە خەڵکی یەمەن بۆیان نیە لە شارێکەوە زەکات بگوێزنەوە بۆ شارێکی تر، کەواتە نابێ بە بەلگە لەسەر هەموو شارو گوندێکی تر کە لە یەمەن نەبن!.

بەهەر حاڵ یاران (ئەصحاب لە مەزهەبی شافیعیدا) دەفەرموون: دروست نیە زەکات لە شارێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ شارێکی تر. گوتراویشە: گواستنەوەی زەکات بەبێ گومان زەکات لە کۆڵ دەخا، بەڵکوو ڕەویانی لە کتێبی (البحر)دا دەفەرموێ: گواستنەوەی زەکات بەبێ گومان دروستە. بە تایبەتی لە کاتێکا کە لەو ناوچەدا کە زەکاتەکەی بۆ دەگوێزرێتەوە خزمی هەژاری زەکاتدەرەکەی تیابێ، چونکە هەژارەکان چاویان لە دەستی خزمەکانیانەو لە دڵەوە بە تەمای ئەوەن، بە مەرجی ئەوە لە شاری سامانەکەدا هەژاری زۆر ئاتاجی ئەو زەکاتە نەبێ، دەنا لە کاتی وادا لەبەر ناچاری دەدرێ بە هەژاری شوێنەکە خۆی، ئەگەر هەژاری خزم لە شوێنێکی ترو هەژاری شاری ماڵەکە بۆ هەژاری یەکسان بوون، بەشی هەردوولایانی لێدەدا، خودا خۆی لە هەموو شتێ باشتر دەزانێ.

## ١٣٦) خێری سوننەت (صدقه التطوع):

خێری سوننەت سوننەتە، بەپێی نامەی خواو سوننەتی پێغەمبەرو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێ: {مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ – سورة البقرة – ٢/٢٤٥} واتە: ئای بۆ خودا پێ داوێ قەرزێکی جوان بدا بەخودا، خودا بە چەندین قات هەقی بۆدەکاتەوە، مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ کە ژمارەی ئەو چەندین قاتانە چەندە. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا – سورة المزمل – ٢٠/٧٣} واتە: هەر خێرو چاکەیێ لە پێش خۆتانەوە رەتی بکەن بۆ ئەو دنیاتان، ئەوە زەخیرەو دەسمایەیەکی چاکە لەلای خودا، بزانن هیچ خێرێ لەلای خودا نافەوتێ، دیارە خێرێ بە دەستی خۆتان بۆ خۆتانی بکەن ئەوە گەلێ لەوە باشترە کە چاوەڕوانی دەستی ئەم‌و ئەو بکەن. خۆشەویستیش (درودی خوای لەسەربێ) دەفەمویێ: ئەو کەسەی خێرێ بکا لە حەلاڵ، خودای مهرەبان بە دەستی راستی وەری دەگرێ‌و خۆی پەروەردەی دەکاو نەشونماو گەشە دەکا، تا بەقەد کێوێ گەورە دەبێ، وەك چۆن یەکێ لە ئێوە جوانووماینێ یا پارینە وشترێ بۆ خۆی بە دڵ‌و بەداو پەروەردە بکا ئاوا، (موسلیم) هەروا دەفەرموێ: با پیاو لەو دینارەی هەیەتی خێری لێبکا، یا لەو درەمەی هەیەتی، یا لەو مەنە گەنمەی هەیەتی خێری لێبکا. (موسلیم) هەروا دەفەرموێ: هەر کەسێ خۆراك دەرخواردی برسی بدا، خودای گەورە میوەی بەهەشتی بە نسیب دەکا، هەر کەسێ موسڵمانێکی توونی

پاراو بکا، لە رۆژی قیامەتدا خودای باڵا دەستو شکۆمەند رەحیقولە ختوومی بە نسیب دەکا، کە لەم ئایەتەدا باسی دەکاو دەفەرموێ: یسقون من رحیق مختوم: شەرابی پاکی سەربەمۆریان دەرخوارد دەدرێ، وە هەرکەسێ ئیمانداریکی رووتەڵە پۆشتە بکاتەوە، خودا لە بەرگەسەوزەکانی بەهەشت پۆشتەی دەکاتەوە! (ئەبو نەعیم لە ئەلحولیەدا، بە رشتەیەکی لاواز گێڕاویەتەوە) بە هەر حاڵ خێرکردنو شت بەخشین لە هەموو کاتێکا سوننەتە بە تایبەتی لە مانگی رەمەزانا خێرترە، سوننەتە لە مانگی رەمەزاندا موسوڵمان دەست کراوەبێو چاوی خێری لە خێزانی خۆیو لە هەژارانیش بێ، چەندەی لە تواناادا هەیە هەرزانییان تێبخا، لەمەدا پێغەمبەر بکا بەسەرمەشق، چونکە پێغەمبەر بۆ سەخێتی مانەدی نەبوو، بە تایبەتی لە رەمەزاندا، لە هەموو کاتێکی تر بەخشندەتر بوو، هەروا خێرو سەدەقە سوننەتە لەکاتی کاروباری گرنگا، وەك خەتمی قورئانو قازانجکردنی باشو رزگار بوون لە چورتم، وە کاتی نەخۆشیو کاتی سەفەر، یا لە مەککەو مەدینەدا، خودا پیرۆزتریان بفەرموێ، هەروا لە کاتی غەزاو حەجداو، لە کاتە پیرۆزەکاندا وەك مانگی رەمەزانو دەی یەکەمی مانگی قوربانو رۆژی جەژنەکانو رۆژی هەینی. هەمیشەیش سوننەتێکی گەورەیە موسڵمان چاکە لەگەڵ خزمو کەسوکاری خۆیو هاوسێ ماڵو هاوسێ دووکانو هەموو جۆرە هاوسێو دۆستو برادەرێکی تری خۆی بکا، بگرە زەکاتی فەرزیش بدرێ بە خزمی هەژارو هەژاری دراوسێو هەژاری دۆست باشترە، هەروا کەفارەتو نەزرو شتی تری لەم بابەتە بۆ ئەمانە خێرترە!.

هەتا لەناو خزمانا کامیان زیاتر دژایەتی لەگەڵ زەکاتدەرەکەدا هەبێ، زەکاتەکە بەوە خێرترە، بە مەرجێ هەژار بێ، هەروا خێریش بەوە خێری زیاترە، بەڵام بۆ خێری سوننەت خزمی ناکۆك لەگەڵ خێرکەرەکەدا مەرج نیە هەژار بێ! چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: گەورەترین خێر ئەو خێرەیە کە بدرێ بە خزمێ لە دڵەوە دژت بێ!. خێری پەنامەکی لە خێری ئاشکرا باشترە، بەڵام هەموو کاتێ نا، خزم باماڵەکەیشی دووربێ هەرپێش دەخرێ لەسەر دراوسێی بێگانە، چونکە خێر بە خزم دوو خێرە، هەم خێرەو هەم خزم بەسەرکردنەوەیە، باش نیە شتی خراپ هەڵبژێرێ بۆ خێر، بەڵام ئەگەر جلێکی نوێ بکڕی بۆ خۆتو کۆنەکەت بکەی بە خێر بەر ئەمە ناکەوێ، واباشە خۆ بپارێزێ لە خێرکردن لە ماڵی شوبهەدار، ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: درەمێ خێر لە ماڵی حەرام وەرنەگرم، لە ترسی ئەوە کە تووشی حەرامخواردن نەبم، ئەوەم لەوە پێ باشترە کە لە ماڵی حەلاڵی خۆم شەش هەزار درەم خێربکەم!. خێرکردن دەبێ لەسەر ئەم شێوەیە بێ: ژیواری خۆیو خێزانیو ئەوەی پێویستی بێ بۆ خۆیو بۆ ئەوانو بۆ بەرژەوەندی ئایینی ئەوە جێ بەجێ بکا، ئەنجا ئەوەی کە لەو ئەندازەیە پترە بۆی هەیە کە خێری لێبکا بەڵام ئەگەر لەکاتی تەنگانەدا بەرگەی نەدەگرت نابێ هەموو ئەوەی کە لەوە زیاتر بێ بکا بە خێر!.

بۆ دەوڵەمەند رەوا نیە کە خۆی وا پیشان بدا کە ئاتاجی هەیە هەتا بەو مەهانەیە خێری سوننەت وەربگرێ! چونکە پیاوێ لە دانیشتوانی صوففە مرد، دوو دیناری زێڕی لە پاش بەجێمابوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرموی: ئەم دوو دینارە دووداخی ئاگرن بۆ

خاوەنەکەی! واتە: ئەو پیاوە لە ژیانیدا کە خاوەنی ئەم دوو دینارە بووە چۆن خۆی لەناو ئەم هەژارانەدا جێکردۆتەوە هەتاخێری پێبکری؟ هەروا کەسێ پیشەیێ بە جوانی بزانێ هەتا هەیبێ، حەرامە کە سواڵ بکا، تەنانەت ئەگەر شت لە خەڵك وەربگرێ پێی حەرامە، خێر کەمیش بێ هەر خێری هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: {فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ - سورة الزلزلة - ٧/٩٩} واتە: هەرکەسێ هەرچەندێ خێر بکا، کەم بێت یان زۆر، بابەقەد تۆسقاڵێ بێ، پاداشتی باشی ئەو خێرە وەردەگرێتەوە! لە فەرموودەیشدا دەفەرموێ: خۆتان لە ئاگری دۆزەخ رزگار بکەن ئەگەر بەهۆی بەخشینی لەتێ دەنکە خورمایەکیشەوە بووە (شەیخان). واباشە کە بە تایبەتی بۆ خێرپێدان پیاوچاکان‌و ئاتاجان بەسەربکرێنەوە، نازین بە خێرکردنەوە حەرامە چوونکە پاداشتەکەی پووچ دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاء النَّاسِ - سورة البقرة - ٢٦٤/٢} واتە: ئەی ئیمانداریندە! پاداشی باشی خێرو خێراتی خۆتان بەمنەت‌و شاباش پووچ مەکەنەوە، چونکە ئەوە دەبێ بەهۆی دڵی خێرپێکراوەکە، شتی وا خێر پوچ دەکاتەوە، چونکە لاسایی خێرکردنی ئەوکەسانەیە کە بۆ ریابازی خێر دەکەن. سوننەتە لەوماڵە ببەخشێ کە لەبەر چاوی خۆشەویستە، خوای گەورە دەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ - سورة آل عمران - ٩٢/٣} واتە: ناگەگەن بە پایەی چاکەی نایاب، هەتا لە نایابی سامانەکانتان بەخت نەکەن لە رێگەی خوادا.

## ١٣٧) ڕۆژوو (الصيام):

ڕۆژوو لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ صەوم، صەوم لە زمانی ئەواندا واتە: خۆگرتن لە کردنی شت، بەم واتایەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: {إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا - سورة مريم - ٢٨/١٩} واتە: نەزرم کردووە بۆ خوای میهرەبان کە خۆ لە قسەکردن بگرم. لە شەرعیشدا بریتییە لە خۆگرتن لە ئارەزووەکانی دامەنو سك! لە شەبەقەوە هەتا خۆرئاوابوون، لەگەڵ نیازو نێتی بەڕۆژووبوون لە شەوەوە.

**بڕیارەکەی:-**

ڕۆژوو فەرزێکە لە فەرزە گەورەکانی شەریعەتی ئیسلام، فەرزبوونی بە نامەی خواو سونەتو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلام سەری گرتووە، خوای گەورە دەفەرموێ: {كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ - سورة البقرة - ١٨٣/٢} هەروا دەفەرموێ: {فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ - سورة البقرة - ١٨٥/٢} لە فەرموودەی دروستدا دەفەرموێ: ئیسلام لەسەر پێنج بنیات امەزراوە لە فەرموودەکەدا دەفەرموێ: یەکێ لەو پێنج بنیاتە ڕۆژووە، پیاوێکیش عەرزی پێغەمبەری کرد: کام ڕۆژووە لەسەرم فەرزە پێمی بفەرموو؟ فەرمووی: بەس ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان. مەرجی فەرزبوونی ئەوەیە ڕۆژووەوانەکە موسڵمانو ڕەسیدەو هۆشیارو توانابێ. چونکە هیچ فەرزێ لەسەر بێبڕوای بنەڕەتی (کافری ئەصلی) نیە بەڵکوو دایش نامەزرێ، چونکە کافر ئەهل نیە بۆ پەرستنو عیبادەتو خواپەرستی لێ

ناوەشێتەوە، رۆژوو لەسەر منداڵو شێت نیە، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە قەڵەمی تەکلیفیان لەسەر نیە: خەوتوو هەتا خەبەری دەبێتەوە، منداڵ هەتا رەسیدە دەبی، شێت هەتاچاك دەبێتەوەو دێتەوە سەر هۆش. (ئەبو داوود). بەلام کەسێ لە بنەڕەتەوە توانای رۆژووی نەبێ، یا ئەگەر بەڕۆژووبێ زیانێکی وای لێ بدا کە بەرگەی نەگرێ، جا لەبەر پیریی بێ یا لەبەر نەخۆشییەکی وابێ کە ئومێدی چاکبوونەوەی نەبێ، یا لەبەر هەر هۆیەکی رەوای تربێ، ئەوە رۆژووی لەسەر نیە، بەلام دەبی کەفارەتەکەی بدا،کەفارەتەکەی ئەوەیە. ئەگەر هەیبوو لە جیاتی رۆژوووی هەموو رۆژێ مشتێ خۆراك دەدا بە شایستەکانی زەکات، گریمان نەدارابوو لەوەدوا دەوڵەمەند بوو ئەوە دەبێ کفارەت بدا لە کاتی دەوڵەمەندیدا.

## فەرزەکانی:

### رۆژوو پێنج فەرزی هەیە :

**یەکەم**: نییەت، جێگەی نیەت شەوە، کاتی نیازهێنان رۆژوو لە خۆر ئاوابوونەوەیە هەتا شەبەق. هەموو رۆژێ بەشەو دەبێ نییەت بهێنێ، چونکە هەموو رۆژێ پەرستشێکی سەربەخۆیە، لەبەر ئەم بەلگەیەش کە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ لە شەودا نیەتی رۆژوو گرتنی نەبێ بە رۆژ بووی نیە بەرۆژووبێ! (ئەحمەدو ئەبو داوودو نەسائیو تیرمیذی).

**دووەمو سێیەم**: خۆگرتنە لە خواردنو خواردنەوەو ئەوەی لە ریزی ئەم دوەدابێ، با کەمیش بێ، لە شەبەقی بەیانەوە هەتا ئاوابوونی هەتاو

یاسای هەمەگر (زابت) بۆ ئەمە ئەمەیە: ڕۆژوو پووچ دەبێ بە گەیشتنی هەر شتێ کە بەپێی باوی زمان پێی بگوترێ: ماددەوە، وە قەوارەی هەبێ، لە دەرەوەی لەشەوە بۆ ناو هەر شوێنێ لە لەش کە بەپێی باوو یاسای زمان پێی بگوترێ بۆشایی، بەمەرجێ لە ڕێگەی کراوەوە بڕواتە ژوورەوە، وە بەقەستی بێ، وە بە هەڵەو لەبیرچوون نەبێ!.

**چوارەم**: خۆگرتن لەسەر جێی‌و خۆرەحەتکردن بە دەستی خۆی‌و بە شتی تریش، سەربەڵگەی ئەمە ئەم ئایەتەیە: {**فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ – سورة البقرة – ٢/١٧٨**}

بەڵام ئەگەرلە بیری نەبوو شتی خوارد، یا شتی خواردەوە، یا لەگەڵ ژن دروست بوو، ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کەسێ لەبیری نەبوو کە بە ڕۆژووە، وەشتی خوارد یا شتی خواردەوە، ئەوە با ڕۆژووەکەی نەشکێنێ، بەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ، ئەو ئاوو نانەیش کە دیخوات ڕزق‌و ڕۆزییە کە خودا بۆی دەرەخسێنێ! (رواه الجماعە). هەروەها پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خودا تۆڵەو سزای ئەم سێ جۆرە گوناهەی لەسەر ئوممەتم هەڵگرتووە:

**یەکەم**: گوناهێ کە خاوەنەکەی بە هەڵەیبکا

**دووەم**: گوناهێ کە خاوەنەکەی لە بیری نەبێ.

**سێیەم**: ئەو شتانەی کە بە زۆر پێیان بکەن! (ئیبنو ماجە/ طەبەرانی/ حاکم).

**پێنجەم**: خۆگرتن لە خۆرشانەوە بە قەستی، بەڵام ئەگەر رشانەوە زۆری بۆ هاوردی، ئەوە رۆژووەکەی ناشکێ، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کەسێ رشانەوە زۆری بۆ هێناو رشایەوە بەبێ خواستی خۆی، لە هەمان کاتا بە رۆژوو بوو، ئەوە گێڕانەوەی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر خۆی خۆی رشاندەوە با رۆژووەکەی بگرێتەوە (د/ت/ن).

## ١٣٨) رۆژوو بەچی پوچ دەبێتەوە:

**رۆژوو بە زۆرشت پووچ دەبێتەوە:**

**یەکەم**: بردنە ژوورەوەی شتێ لە دەرەوەی لەشەوە بۆ ناوەوەی بە قەستی، ئیتر خوا ئەوشتە خۆراك بی یانا، جگەرە کێشان بەر ئەمە دەکەوێ، مەرجی ناوەوەی لەش ئەوەیە کە دەبێ، بۆشایی بێ، ئیتر مەرج نیە کە ئەو شوێنە بۆشە هێزێکی وای تیابێ کە خواردەمەنی، یا دەرامان بگۆڕێ، کەواتە: ناوکەڵلەی سەرو ناوگوێ دەگرێتەوە، چونکە ئیبنو عەبباس {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: رۆژوو بەوە دەشکێ کە دەچێتە ناولەشەوە، نەك بەوە کە لە ناوەوەی دێتە دەرەوە! ئەوە تا بەپێی قسەکەی ئەو هەموو ناوەوەیێ بەردەکەوێ وە رۆژووی پێدەشکێ، ئیتر شتەکە خۆراك بێ یا شتێ تربێ جیاوازی نیە.

**بزانە!** ئەگەر دەسنوێژ گر زیادەڕەوی کرد لە ئاو لە دەم و لووت راناداو لە ئەنجامی ئەوەدا ئاو گەیشتە ناو بۆشایی قورگی، یاناوسکی، ناوبرناخی، ئەوە رۆژووەکەی دەشکێ، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: زیادەڕەوی لە ئاو لە دەم و لووتراپادانا بکە، مەگەر کاتێ

کە بە ڕۆژوو بیت؟ چونکە زیادەڕەوییەکە لەم دوو کاتەدا ڕۆژوو دەشکێنێ بۆیە پێغەمبەر ڕێگەی نادات، دەنا نەیی لێ نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بەبێ زیادەڕویکردن ئاوپەڕییە قورگی، یا گەیشتە بۆشایی، وە بەقەستی نەبوو، ئەوە ڕۆژوو ناشکێنێ، چونکە بەر ئەو هەڵەیە دەکەوێ، کە چاوپۆشی لێکراوە.. ئەوەندە هەیە ئەگەر ئاوی کردە ناودەمو ناو لووتی بەنیازی ئاو لە دەمو لووتڕادانیشی نا، وە ئاوەکە پەڕییەناو بۆشایی قوڕگی یاناو بۆشایی لای سەرووی لووتی ئەوە ڕۆژووەکەی دەشکێ، چونکە سوچ لە خۆیەتیو کاریشی بەشتی واتە: نیە! بەشی وا نیە تەنانەت ئەگەر ژنێ پەنجەی بکا بەناو شەرمی خۆیا، لەکاتی تاراتگرتندا، لەسەر فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس، ڕۆژووەکەی دەشکێ، لە ڕاستیدا ئەو ئەوەندەی لەسەرە کە دیوی دەرەوەی شەرمی بشوا، ئەوەی کە بەدەرەوە نیە شۆردنی لەسەر نیە.

**دووەم**: ڕۆژوو دەشکێ بە شاف هەڵگرتنو بەشت خستنە ناو دیوی ناوەوەی چووکی نێرینەو زێی مێینەوە بەپێی فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس، کە کەمێ لەمەوپێش نوسیمان، ئەم فەرمایشتەی ئیبنو عەبباس دوو بەشە، ئەم شتانە لە بەشی یەکەمی چەرت دەکرێ: پەڕینی مێش بۆ ناو قوڕگی ڕۆژووەوانو گەیشتنی تۆزی ئاردو تۆزی ڕێگەو دووکەڵی بخوورو شتیوا بۆ ناو قورگو بۆشایی، لە بەشی دووەمیشی ئەم شتانە چەرت دەکرێن: دەرچوونی خوێنی بێنوێژیو زەیستانیو منداڵبوونو خۆرشانەوەو ئاو هێنانەوە، چونکە ئەوانەی لەبەشی یەکەمی فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس چەرتمان کردن، گەرچی لەو شتانەیشن کە دەچنە ژوورەوە بۆ ناو بۆشایی لەش، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕۆژوویان

پێناشکێ، چونکە چوونە ژوورەوەکەیان بە قەستی نیە، ئەوانەیشی لە بەشی دووەمی.

فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس چەرتمان کردن، گەرچی لەو شتانەیش کە لەناو لەشەوە دەردەچن، بەڵام ڕۆژوو دەشکێنن. مایەوە سەر شرنقەو دەرزی لێدان، خوا لە دەمارەوە لێ بدرێ، یا لەلا ڕان‌و ماسوڵکەوە لێ بدرێ، ئەم ڕاجیایی تیا دایە، گوتراویشە: ڕۆژوو دەشکێنێ، گوایە بەر رووکاری بەشی یەکەمی فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس دەکەوێ، کە دەفەرموێ: ڕۆژوو بەوە دەشکێ کە دەچێتە ناو لەشەوە!.

**سێیەم**: ڕشانەوە کە بە قەستی بێ، بەڵگەکەی ڕابورد.

**چوارەم**: جووت بوون لە پێش‌و پاشەوە بە قەستی، بەڵگەکەی پاش تۆزێ دێ.

**پێنجەم**: ئاوهێنانەوەو خۆ ڕەحەتکردن، جا بەخۆ تێسوین بێ، یا بە دەست پیاهێنان بێ، ئیتر خۆی دەستی پیابێنێ، یا ژنەکەی یا کەنیزەکەکەی جیاوازی نیە، هۆی بوونی ڕەحەتبوون بەهۆی ڕۆژووشکاندن دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەم شیکردنەوەیە: مەبەستی گەورە لە جووتبوون ڕەحەتبوونە، جا لە شوێنێ جووت بوون بەبێ ڕەحەتبوونیش ڕۆژوو بشکێنێ، ڕەحەتبوون کە مەبەستی گەورەی جووتبوونە، با بەبێ جووتبونیش بێ، چۆن ڕۆژوو ناشکێنێ؟! کەواتە دەیشکێنێ‌و زیاتریش! بەڵام تەنیا لەم دوو کاتەدا ئاوهاتنەوە ڕۆژوو ناشکێنی، ئەگەر بە بیرلێکردنەوە، یا بە شەیتانبوون ئاوی هاتەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ.

**شەشەمو حەوتەم**: بێنوێژیو زەیستانی، چونکە ڕۆژوو کاتێ دادەمەزرێ کە ئەم دووە نەبن، دەی ئەگەر یەکێ لەم دووە لەناو ڕۆژووەکەدا ڕوویدا ڕۆژووەکە پوچ دەبێت، بەپێی گوتەی عائیشە {ڕەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: جاران بە سەرینی پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەکەوتینە بێنوێژییەوە، لەپاش پاکبوونەوەو خۆشۆردن، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێمان دەکرد: کە ڕۆژووی ڕەمەزان بگێڕینەوە، بەڵام نوێژ نەگێڕینەوە. دەی ئەگەر ڕۆژوو لەکاتی بێنوێژیدا دابمەزرێ پێغەمبەر فەرمانی نەدەکرد بە گێڕانەوەی ڕۆژووی کاتی بێنوێژی. لە هەمانکاتدا خودا بۆ بارسووکی نوێژی لەسەر ئافرەتی بێنوێژو زەیستان هەلگرتووە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی نەکردووە بە گێڕانەوەی نوێژ! چونکە بە درێژایی ساڵو لە زۆربەی تەمەندا شتی وا زۆر زەحمەتە، وەك ڕۆژووەکە نیە کە ساڵی مانگێ بێو بەس!.

**هەشتەم**: شێتی، بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەم سێ کەسە قەڵەمی تەکلیفیان لەسەر نیە تا کۆتایی فەرموودەکە کە لە زنجیرەی (١٣٦)دا ڕابورد.

**نۆیەم**: بێ بڕوابوونەوە: وەرگەڕان لە ئایین: پاشگەزبوونەوە کە برێتییە لە پچڕاندنی ڕشتەی ئیسلامەتی، جا بەگوتاربێ یا بەکرداربێ، یا بە بیروباوەڕ بێ، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ – سورة البقرة – ٢/٢١٧} هەروا بەپێی ئەم فەرمایشتەی

تری {لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ – سورة الزمر – ٦٥/٣٩}.
گومانیش لەوەدا نیە کە ئەهلی کوفر هەموو یەك میللەتن؟.

**دەیەم**: بوورانەوەیە، ئەگەر سەرو مربوو، بەدرێژایی ئەو رۆژە یەك هەناسە، یا پتر، نەهاتەوە سەر هۆشی خۆی ئەوە رۆژووەکەی پووچە، دەنا دادەمەزرێ ئەگەر تۆزێ یا زیاتر هاتەوە سەر هۆشی خۆی، بەلاّم ئەگەر وا رێکەوت بەدرێژایی رۆژ نووست رۆژووەکەی دادەمەزرێ، چونکە خەوتوو شیاویی (ئەهلییەتی) هەیە بۆ ئاخاوتن لە گەلّی، بە پێچەنەوەی کەسێ کە لە هۆشخۆچوبێ.

## ١٣٩) چی لە رۆژودا سوننەتە:

**بۆ رۆژووەوان ئەم سێ شتە سوننەتن.**

**یەکەم**: کاتێ بەراستی بۆی دەرکەوت کە شەو داهاتووە بە پەلە رۆژووەکەی بشکێنێ. چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: مەردوم هەتا پەلە لە بەربانگ بکەنو بەربانگ نەخەن بەفنگاو لەکاتی خۆیا رۆژوو بشکێنن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا هەر باشنو لەرێی راست لایان نەداوە. (شەیخان). ئیبنو حیببانیش لە صەحیحی خۆیدا دەگێرێتەوە کە: دەستوری پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} وابوو هەر رۆژێ بە رۆژوو بوایە، نوێژی شێوانی نەدەکرد، هەتا چەندد دەنگێ فەریکە خورمایان بۆ دەهێنا، یا ئاویان بۆ دەهێنا، جا دەنکە خورماکانی دەخوارد، یا ئاوەکەی دەخواردەوە، ئەوجا نوێژی شێوانی دەکرد، ئەمە لە هاوینا کە فەریکە خورما هەیە، بەلاّم لە زستانا، لە پێشکردنی نوێژی

شێوانا، یا بەخورما دەیشکاند، یا بەئاو. سوننەتە لە زستانا بەربانگ بەخورما یا بە ئاو بکاتەوە، لە هاوینیشا بە فەریکە خورما یا بە ئاو ڕۆژوو بشکێنێ، لەبەر فەرموودەکەی پێشەوە. لەبەر ئەوەیش چونکە ئەم دوو شتە هەریەکەی سوودێکیان هەیە لەم بارەیەوە: شیرینی هێز دەبەخشێ، ئاویش ناو سك پاك دەکاتەوە... ڕەویانیش دەفەرموێ: بەڵام ئەگەر خورما نەبوو بە شیرینی بیشکێنێ، چونکە ڕۆژوو چاووهەنای چاو کز دەکا، بەڵام خورما ڕۆشنی دەکاتەوە، شیرینیش بە گشتی دەوری خورما دەبینێ، کەواتە کە خورما نەبوو شیرینی جێگەی دەگرێتەوە.

**دووەم**: دواخستنی پارشێو، لە فەرموودەدا دەفەرموێ: دواخستنی پارشێو لە ڕەوشتی پێغەمبەرە خاوەن پەیامەکانە. (ئیبنو حەببان لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە).

دیسان لە فەرموودەدا دەفەرموێ: ئۆمەتی من هەتا پەلە لە بەربانگ بکەنو پارشێو دوا بخەن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا لەسەر ڕەوشتی باشی خۆم ماونو پەیڕەوی سوننەتی من دەکەن. (ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدی خۆیدا گێڕویەتەوە) سەرەرای ئەوەیش دروستی ڕەوایی پارشێو ئەوەیە: کە یاریدەی عیبادەتکردن دەداو خواپەرست بەهێز دەکا، دەی هەتا دوابکەوێ باشتر دەبێ بەمایەی بەهێز بوون بۆ ڕۆژووەوان.

ئەوەی کە ئەصڵی سوننەتی پارشێوە، پارشێو بەکەمێ خواردنیش یا بە کەمێ خواردنەوەی ئاویش جێبەجێ دەبێ، بەڵام واباشە پارشێوێکی وا بکا کە ببێ بەهۆی بەهێزبوون بۆ ڕۆژووەوان. ئیبنو حەببان لە صەحیحەکەیدا هەیە: ئەگەر بە قومێ ئاویش بووە پارشێو بکەن.

کاتی پارشێو لە نێوەشەوەوە دەست پێدەکا، ئیمانی رافعی لە کۆتایی کیتابی ئیمانا ئەم مەسەلەیەی باس کردووە..

**سێیەم:** زمانی بپارێزێ لە قسەی پڕو پووچو قسەی بێشەرعی جا ئەگەر ئەو قسەیە دەبوو بەهۆی گوناهباری، وەك غەیبەتو پاشەملەو دووزمانیو درۆی ناڕەواو شتی تری لەم بابەتانە ئەوە نادروستو ناڕەوایە، جا لەم کاتەدا زمان پاراستن لەم جۆرە قسانە بۆ رۆژووەوان، غەیری رۆژووەوانیشن، نەوەك سوننەتە، بەڵکو فەرزە، ئەوەتا لە صەحیحی بوخاری شەریفا دەفەرموێ: ئەو رۆژووەوانەی کە واز نەهێنێ لە قسەی ناڕەواو لە کاری ناڕەوا خودا کاری بەوەی ئەو نیە کە دەمی خۆی ببەستێو واز لە خواردنو خواردنەوە بهێنێ! لە حەدیشدا دیسان دەفەرموێ: گەلێ رۆژووەوان بەس برسێتیی لە رۆژووەکەی بۆ دەمێنێتەوە گەلێ شەو نوێژکەریش هەر شەونخوونیو ماندووبوونەکەی بۆ دەمێنێتەوە لە شەونوێژەکەی (حاکم)وە دەیش فەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەپێی مەرجی بوخارییە کە دایناوە بۆ فەرموودەی دروست. سەرەرای ئەم بەڵگانەیش قەسەی نابەجێ پاداشت پووچ دەکاتەوە.

## ١٤٠) ئەو رۆژانەی کە رۆژوویان تیادا نادروستە:

رۆژووی رۆژی جەژنی رەمەزانو رۆژەکانی جەژنی قوربان نادروستە، لە صەحیحەینا هەیە: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} رێگەی نەداوە کە لە رۆژی جەژنی رەمەزانو لە رۆژی جەژنی قوربانـدا کەس بەڕۆژووبێ. بەهیچ شێوەیەك رۆژووی ئەم دوو رۆژە دروست نیە، بە نیازی سوننەت بێ، یا بە نیازی فەرزبێ، یا بەنیازی نەزربێ، یا یا

بەنیازی هەر نیازێکی تربێ دروست نیە، هەروا گرتنی رۆژوەکانی ئەییامو تەشریقیش دروست نیە، کە برێتین لە سێ رۆژووەکەی پاش رۆژی یەکەمی جەژنی قوربان، چونکە پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لە گرتنیان. (ئەبو داوود بە رشتەیەکی دروست گێڕاویەتەوە).

لە صەحیحی موسلیما دەفەرموێ: پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} فەرمووی: سێ رۆژی پاش رۆژی یەکەمی جەژنی قوربانیش، کە مەشهورن بە ئەیامو تەشریق، واتە: رۆژانی قوربانی سەربڕینو کردنی گۆشتەکەیان بە لەتکە گۆشتو قەدید، بە هەڵخستنی لەبەرخۆر، ئەم سێ رۆژەیش رۆژانی خواردنو خواردنەوەنو بە کەڵکی رۆژوونایەن، رێك وەك رۆژی یەکەمی جەژن، بەڵام خوا دایناون بۆ یادو زیکری خۆی. گوتراویشە: بۆ ئەو حاجییەی کە تەمەتتوع بە عەمرە دەکاو لە هەمان کاتا هەدیی بەیتی نیە، ئەوە بۆی هەیە کە ئییامو تەشریق بە رۆژووبێ، لەجیاتی سێ رۆژی کافارەتەکەی کاتی حەج، مەبەست ئەو سێ رۆژەیە کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە: {فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ - سورة البقرة - ١٩٦/٢}. واتە: هەر کەسێ لە پاش کردنی عەمرە ئیحرامی شکاندو خۆشی وەرگتەوە تا کاتی ئیحرامی حەج دادەبەستێ ئەوە چی بۆ هەڵسووڕا لە ئاژەڵێ دەست بدات بۆ قوربانی سەری ببڕێ، دەی کەسێ ئاژەڵی دەست نەکەوێ ئەوە پێویستە کە سێ رۆژ بە رۆژووبێ لە کاتی حەجدا، وە حەوت رۆژیش کە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆتان. لە بوخاری شەریفا، لە عائیشەو ئیبنو عومەرەوە، دەگێڕێتەوە: دەفەرموون {رەزای خوایان لێبێ}: رێگە نەدراوە

بەکەس کە لە سێ رۆژەی ئەیامو تەشریقا بە رۆژووبێ، مەگەر بۆ ئەو حاجییە کە ئاژەڵی دیاری بەیتی دەست نەکەوێ. ئیمامی نەوەوی ئەم فەرمایشتە بە پەسەند دادەنێ، لە پێش ئەویشا ئیبنو صەلاح بە فەرمایشتی صەحیحی داناوە.

## ١٤١) رۆژووی رۆژی گومان (صوم یوم الشك):

رۆژووی رۆژی گومانەرۆژ،بە نیازی رۆژووی سوننەتی بێهۆ، نادروستە، هەروا بەناوی ئەوەیشتەوە کە لە رەمەزانە هەر نادروستە، بەلگەی ئەم بڕیارەش ئەم گوتەیەی عەمماری کوڕی یاسرە کە دەفەرموێ: هەرکەسێ رۆژووی ئەو رۆژە بگری کە خەڵك گومانی لێدەکەنو لێیان روون نیە کە ئەو رۆژە لە رەمەزانە، یا نا، ئەوە لە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەم بارەیەوە دەرچووە. (ترمیذی و ئیبنو حەببانو حاکم بە دورستیان داناوە، بوخاریش بە تەعلیق گێڕاویەتەوە). گریمان ئەگەر ئەگەر کەسی نەزری کرد گومانە رۆژ بە رۆژووبێ رۆژووەکەی دانامەزرێ. بەلام ئەگەر رێکەوتی رۆژووی سوننەتی ئاسایی خۆی کرد ئەوە نادروست نیە، وەك ئەوە رۆژ نا رۆژێ بەرۆژووبیو لە رۆژی گومانە رۆژووەکەدا سەرەی رۆژووی سوننەتی خۆی بێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەموێ: بە رۆژوو دوو رۆژ لە پێش رەمەزانا بەرۆژوو مەبن، مەگەر بۆ کەسی رۆژووی خۆی بگرێ، وەك ئەوە دەستووری وابێ دوو شەممەو پێنج شەممە بە رۆژوو بێ. (شەیخان) هەروا نادروستە کە گومانە رۆژ بلکێنێ بە رۆژووی پێشیەوە،

چونکه له حاڵی وادا سەر بۆ ئەوە دەکێشی کەس بۆ مانگی نوێی ڕەمەزان نەگەڕێ. ڕۆژە گومان ئەم سێ جۆرەی هەیە:

١) خەڵکی لە خۆیانەوە بیکەن بە مقۆمقۆ گوایە مانگیان دیوە، بەبێ ئەوە بڵێن فیسارەکەس دیویەتی.

٢) چەند کەسێ لەوانە کە شایەتییان وەرناگرێ بۆ ساخبوونەوەی مانگی نوێ، شایەتی بدەن لەسەر دیتنی، مانگی نوێی ڕەمەزان، وەك منداڵان و ژنان و بەدکاران و بەندە، کە لە ئاخرڕۆژی لە (مانگی کۆمەڵەمانگ (شەعبان)دا ئەو شایەتیە بدەن.

٣) ئەگەر باوەڕی وابوو ئەو کەسەی دەڵێ مانگم دیوە ڕاست دەکا، ئەوە پێویستە بە ڕۆژووبێ، بەڵام ئەگەر باوەڕی پێکرد ئەوە دروستە بە ڕۆژووبێ، بەڵام ئەگەر دوو دڵ بوو لەوەدا کە ڕاست دەکا یانا حەرامە بە ڕۆژووبێ.

## ١٤٢) بڕیاری دروستبوون لە ڕۆژی ڕەمەزانا:

هەر کەسێ لە مانگی ڕەمەزانا بەڕۆژوبێ، بە قەستی بە جووت بوون، ڕۆژووەکەی تێك بدا، کەفارەتی گەورەی دەکەوێتە سەر، بە مەرجێ جووتبوونەکە تەواو بێ و پێی گوناهبار ببێ، کەواتە: کەفارەت نیە لەسەر کەسێ کە لە ڕەمەزانا بەڕۆژوو نەبێ و جووت بوون ئەنجام بدا، یا لەسەر کەسێ لەبیری نەبێ بە ڕۆژووەو دروست ببێ، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خودا تۆڵەی ئەم گوناهانەی لەسەر ئومەتم هەلگرتووە: گوناهێ کە خاوەنەکەی بە هەڵە بیکاو گوناهێ کە

خاوەنەکەی لەبیری نەبێ کە ئەو کارە لەو کاتەدا درسوت نیە، کەفارەت لەسەر ژنیش نیە، چونکە ئەو هەر بە تێچوونی سەری چووك بۆ ناو لەشی رۆژووەکەی دەشکێ، بەر لەوە جووتبوون ببێ بە جووتبوونی تەواو، ئەوە رۆژووەکەی دەشکێ، هەروا رێبواریش کەفارەتی لەسەر نیە ئەگەر دروست بوونەکە بەو نیازە بێ کە رۆژووەکەی پێ بشکێنێ، چونکە مافی ئەوەی هەیە رۆژووەکەی بشکێنێ، ئەمەیش لەسەر فەرمایشتی دروست، هەروا کەفارەت نیە لەسەر کەسێ کە کات بە شەو بزانێو جووت ببێ، ئەوسا دەربکەوێ کە ئەو کاتە رۆژ بووە شەو نەبووە، چونکە بەمە تاوانبار نابێ، جا هەر کاتێ لەسەر ئەم شێوەیەی پێشەوە کەسێ جیماعی کرد، کەفارەتی رۆژووەکە یەکێکە لەم سێ شتە، بەریز دەکەوێتە سەری، وەك لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەوتاوم. فەرمووی بۆچی فەوتاوی؟ گوتی: لە رەمەزاندا بە رۆژوو بوومو لەگەڵ ژنەکەم دروست بووم. فەرمووی: ئایا هەتە کە بەندەیێ ئازادا بکەی؟ گوتی: نەء. فەرمووی: ئەی دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژووبی؟ گوتی نەء، فەرمووی: ئەی دەتوانی نانی شەست هەژار بدەی؟ گوتی نەء. ئەبو هورەیرە فەرمووی: جا پیاوەکە لە لای پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دانیشت، هەتا زەمیلەیێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: ئەمە بکە بە خێر، پیاوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لە ئێمە هەژارترە تا پێی بدەم! دەسا بەو خودایە، لەم پەڕی مەدینەوە هەتا ئەو پەڕی مەدینە خێزانێکی وای تێدانیە کە وەك خێزانەکەی خۆم پێویستی بەم خورمایە هەبێ! جا پێغەمبەر

{درووده خوای لەسەربێ} وەها پێکەنی تەنانەت ددانە پێشینەکانی وەدەرکەوتن، ئینجا فەرمووی: دەبڕۆ دەرخواردی خێزانەکەی خۆتی بدە. (شەیخان) لە گێڕانەوەیەکی ئەبو دادوددا دەفەرموێ: حەلانەیێ خورمایان بۆی هێنا ئەندازەی پازدە مەن (صاع) خورمای تیابوو. جا هەرکاتێ کە نەیبوو هیچیان بدا دەکەوێتە ئەستۆی هەتا دەیبێ.

رووکاری فەرموودەکە وا دەگەیەنێ: کە هەژارێ ئەم کەفارەتەی لەسەر بێ، دروستە بیدات بە کەسوکاری خۆی، چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} بە پیاوەکەی فەرموو: دەبڕۆ دەرخواردی خێزانەکەی خۆتی بدە، بەلاّم لەسەر فەرمایشتێ کە بە صەحیح دادەنرێ، وە فەرمایشتێکی تر بەرابەری هەیە، دەفەرموێ: دروست نیە بیدات بە کەسوکاری خۆی، دەق وەك زەکاتو چەشنە کەفارەتەکانی تر چۆن دروست نین بدرێن بە کەسوکار، کەفارەتی جووتبوونیش هەر وا. فەرموودەکە بەسێ جۆر تەئویل دەکرێ (بەلاّم بەندە تەرجەمەم نەکرد چونکە ئێرە شوێنی ئەو جۆرە وردکارییانە نیە، ئەوە دەبێ لە موتەووەلاتا باس بکرێ — وەرگێڕ).

## ١٤٣) مردوویێ رۆژووی لەسەربێ:

کەسێ بمرێو رۆژووی رەمەزان قەرزار بێ ئەمە حالّیەتی: ئەگەر بەر لەوەی بۆی رێبکەوێ قەزای بکاتەوە مرد، وەك ئەوە هەتا کاتی مردنی مەهانە رەواکەی هەرمابێ، ئەوە نەگوناهبار دەبێو نە کەفارەتو نە قەزای لەسەرە، بەلاّم ئەگەر بەبێ مەهانە فەوتاندبووی، یاخود

مەودای بوو بیگێڕێتەوەو بە ئارەزوو نەیگێڕابۆوە، دەبێ بەم شێوەیە فیدیەی بۆ بدرێ: لە کەلەپوورە بە جێماوەکەی، لە بریتیی هەر رۆژە رۆژوویەك مشتێ دغڵ بدەن بە هەژارێ. ئەمە فەتوای عائیشەو ئیبنو عەبباسە، (رەزای خوایان لێبێ) ئەم فەرموودەیەش بەڵگەی ئەوەیە: ئەگەر کەسێ مردو قەرزاری مانگی رۆژوو بوو، با هەقدارەکەی لە بریتی هەر رۆژە رۆژوویەکی، ژەمێ خۆراك بدا بە گەدایێ! (تیرمیذیو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی دەفەرموێ: قەسەی راست ئەوەیە: کە ئەم فەرموودەیە مەوقووفە لەسەر ئیبنو عومەر).

لە فەرمایشتێکی تردا دەفەرموێ: مەرج نیە فیدیەی بۆ بدرێ، بەڵکوو هەقدارەکەی هەقی هەی خۆی رۆژووەکەی بۆ بگرێتەوە، بگرە شتی وا سوننەتە، بەپێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): ئەگەر کەسێ مرد، رۆژووی لە سەربوو هەقدارەکەی دەیگێڕێتەوە بۆی!. (شەیخانو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە) لە گێڕانەوەیەکا: ئەگەر ویستی لە جیاتی ئەو بە رۆژووی بێ دژایەتی نیە لە نێوانی ئەم دوو فەرموودەیەدا، کە یەکێکیان دەفەرموێ: هەقدارەکەی خۆی رۆژووەکەی بۆ بگرێتەوە، وە ئەوی تریان دەفەرموێ: با هەقدارەکەی لە بریتی هەر رۆژە رۆژوویەك ژەمێ خۆراك بدا بە گەدایێ چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کام لەم دووکارە بکرێ بریتی کاری پێویست لەم مەسەلەیەدا دەکەوێ، خوا بە رۆژووگرتنەوە، یا بەخۆراك بەخشین بێ.

## ١٤٤) پیری ئیختیارو کەسێ لە ریزی ئەوابێ:

پیرو ئیختیارێکی وا کە توانای رۆژووی نەبێ، یا رۆژوو توشی ئەرکێکی دیژواری بکاو پیرێژنو نەخۆشێ کە ئومێدی چاك بوونەوەی لێ نەکرێ، ئەمانە رۆژوویان لەسەر نیە، بەلاّم تۆلّە (فیدیە)یان دەکەوێتە سەر، کە برێتییە لە پێدانی ژەمێ خۆراك بە مسکێنێ، لە جیاتی رۆژووی هەر رۆژێ کە فەوتابێ، بەپێی فەرمایشتی خوای گەورە:
{وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ – سورة – ١٨٤/٢}
واتە: پێویستوفەرزە لەسەر ئەو کەسانە کە لەشساغنولە شوێنی خۆیانان، بەلاّم لەبەر پیریو ناتەواوی) وە، بە خەرجکردنی هەموو توانایی نەبێ، ناتوانن رۆژوو بگرن، لەسەر ئەوکەسانەی کە ئەمە حالّیانە فەرزە: ئەگەر بە رۆژوو نەبوون، تۆلّەی ئەو رۆژووەیان بدەن، بۆ هەر رۆژەی ئەندازەی خواردەمەنی کەدایەك. ئیبنو عەبباس {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەم ئایەتە بریارەکەی هەلّ نەوەشاوەتەوە، بەلکوو ئەمە سەبارەت بە پیاوو ژنی ئیختیارە، کە نەتوانن بەرۆژووبن، لە جیاتی هەر رۆژێ رۆژوو شکاندن دەبێ ژەمێ خۆراك بدەن بە کەدایێ.

## ١٤٥) ژنی دووگیانو ژنی مەمکدەر:

ژنی دووگیانو ژنی منالّبەبەر، ئەگەر لە ترسی گیانی خۆیان یا لە ترسی نەخۆش کەوتنیان رۆژوویان نەگرت، پێویستە قەزای رۆژەووەکە بکەنەوەو، فیدیەیان لەسەر نیە، دەق وەك نەخۆش وان. بەلاّم ئەگەر لە ترسی منداڵەکەیان رۆژوویان نەگرت، وەك ئەوە سکپڕ مەترسی ئەوەی هەبێ کە سکەکەی لەباربچێ، وە منالّبەبەر مەترسی ئەوەی هەبێ کە

شیرەکەی کەم بکا، ئەوە گێڕانەوەو برێتییان لەسەرە، کە برێتییە لە خۆراکدان بە گەدایێ لە برێتی رۆژێ کە بە رۆژوو نەبن، بەپێی ئەم ئایەتە {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ} لە فەرموودەیشدا دەفەرموێ: خودای گەورە هەم رۆژووە هەم نیوە نوێژی لەسەر رێبوار هەلگرتووە، لەسەر سکپڕو منالبەبەریش رۆژووی هەلگرتووە. (ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی بە فەرموودەیەکی جوانی داناوە). وەکی تریش ئەم رۆژوو شکانە، سەرەڕای ئەم ئایەتو فەرموودەیە هۆی تریشی هەیە کە ئەمەیە: دەبێ بەهۆی بووژانەوەی دووسەر کە برێتین:لە دایكو منالکەی!.

## ١٤٦) نەخۆشو رێبوار:

بۆ نەخۆشو رێبواریش پێ نەبوون دروستە لە رەمەزانا، بە پێی ئایەتی: {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ – سورة البقرة – ٢/١٨٤} واتە: جا هەرکەسێ نەخۆش بێ، یا لەسەر سەفەربێ، وە بەرۆژوو نەبێ، ئەوە دروستە، بەلام دەشێ کە مەهانەکەی نەما چەند رۆژی خواردووە، ئەوەندە رۆژ قەزا بکاتەوە. بۆ نەخۆش ئەم دوو شتە بە مەرج گیراوە: تووشی ئازارێکی سەخت ببێ بەهۆی گرتنی رۆژووەکەوە، یا مەترسی ئەوەی هەبێ کە درەنگ چاك ببێتەوە.

جا ئەگەر نەخۆشینەکە سەرومڕبوو، بوارەی نەدەدا، ئەوە مافی ئەوەی هەیە هەر لە شەوەوە نیّت نەهێنێ، بەلام ئەگەر پچڕ پچڕ بوو، وەك کەسێ تاوە تاوە تای لێبێو ناو بەناو لەرزو تاکەی بەری بدا، ئەوە ئەگەر لە شەوا تاداربوو بۆی هەیە هەر لە شەوەوە واز لە نیّت بهێنی،

دەنـا لەسـەریەتی کـە بەشـەو نێـت بهێنـێ، جـا ئەرگـەر ئاتـاج بـوو ڕۆژووەکەی بشکێنێ، دەنا بە تەواوی بکا، ئەمە کاتێ وایە کە مەترسی نەمانیی خۆی نەبێ بەهۆی ڕۆژووەکەوە، بەلام ئەگەر مەترسی ئەوەی هەبوو، ئەوە لە سریەتی کە بە ڕۆژوو نەبێ!

بزانە کە زۆر بۆهێنانی برسێتیو تونێتی دەق وەك نەخۆشی وایە، ئەم دوەیش دەبن بەهۆی ڕۆژووشکاندن، بەپێی ئەو مەرجو حاڵەتانەی کە بۆ نەخۆشی دانراون.

بەلام ڕێبوار بەم مەرجانە مافی ڕۆژوو نەگرتنی هەیە: دەبێ سەفەرەکەی درێژو ڕەوابێ، کەواتە: لە سەفەری کورتو لە سەفەری گوناها ڕێگەی ڕۆژوو نەگرتنی پێ نادرێ، چونکە هۆی بارسووکی نابەسترێ بەبێ فەرمانی خواوە، گوناه نابێ بەهۆی بارسووکی! وەلێ بۆ ڕێبوار ڕۆژووگرتن باشترە، بە مەرجێ زیانی پێ نەگەیەنێ، ئەگەر دەبوو بەهۆی زیان بۆی ئەوە پێنەبوون خێرترە!.

## ١٤٧) ڕۆژووی سوننەت (صوم التطوع):

گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی دوو شەممانو پێنج شەممان زۆر سوننەتە، بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو هورەیرە {ڕەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} زۆر جاران ڕۆژی دوو شەممانو پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو. (ئەحمەد بەرشتەیەکی دروست گێڕاویەتەوە) گرتنی ڕۆژووی ئەییامو لبیزیش لە هەموو مانگێ سوننەتە، واتە: ڕۆژە شەو ڕووناکەکان، کە بریتین لە ڕۆژانی سیازدەو چاردەو پازدەی مانگ، بەپێی گوتەکەی ئەبو زەڕ {ڕەزای خوای لێبێ} کە

دەفـەرموێ: پێغەمبـەر {درودی خوای لەسەربێ} گردبـووی بـە یاسـا فـەرمانی پێکـردین کـە ئـەو ڕۆژانـەی شـەوەکانیان هـەتا بـەیانی مانگەشـەو، بەڕۆژووبین، کە بـریتین لـە ڕۆژانـی سیازدەو چاردەو پازدە. فەرمووی: دەیفەرموو {درودی خوای لەسەربێ}: گرتنی ئەم سێ ڕۆژە لە هەموو مانگێ، وەك ئەوە وایە کە کەسێ بـە درێـژایی سالٚ، سالٚ دوانزەمانگە بـەڕۆژوو بـێ.) نەسائی گێڕاویەتەوە، ئیبنو حەببان بەدروستی دانـاوە). سـوننەتە شـەش ڕۆژ لـە مـانگی شەشـەلآن بـەڕۆژوو بـێ، چـونکە خۆشەویـست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ لە پێشدا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ، وە لە پاش ئـەویش شـەش ڕۆژ لـە مـانگی شەشـەلآن بگـرێ، ئـەوە وەکـوو بـە درێژایی سالٚ بەڕۆژوو بێ وایە. (**رواه الجماعة الا البخاری والنسائی**).

ئەم شـەش ڕۆژە سـوننەتە بەسـەر یەکـەوە بگیریـن‌و یـەك سـەر لـە دوای ڕۆژی جەژنـەوە دەسـتیان پێبکـا، چـونکە باشـترینی چـاکە چاکەی بەپەلەیـە، باشـترین خێـر خێـری بەپەلەیـە، سـوننەتە گرتنـی ڕۆژووی ڕۆژی نۆهـەم‌و دەهـەمی موحـەڕەم، ئیبنـو عـەبباس {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبـەر {درودی خوای لەسەربێ} کـە تەشـریفی هـات بـۆ مەدینـە، تەماشـای کـرد جوولەکـەکان دەی موحـەڕەم بـە ڕۆژوو دەبـن، فـەرمووی: ئـەم ڕۆژووە هـی چییە؟ گوتیـان: ئـەمڕۆ ڕۆژێکـی زۆرباشـە، ئەمـە ئـەو ڕۆژەیـە کـە خـودا نـەوەی حـەزرەتی یـەعقووب پێغمبـەری تێـدا ڕزگارکردووە لە دەسـتی دوشمنـی خۆیـان، مووسا لـەم ڕۆژەدا سوپاس بـۆ خودا لەسەر نیعمـەتی قوتـاربوون لـە دەسـتی دوشمـن بـەڕۆژوو بووە، وە ئێمـەیش چـاو لـەو دەکـەین‌و دەیگـرین، حـەزرەتیش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کەوابی بۆ من ڕەواترە کە پەیڕەوی مووسا بکەم لەمەدا هـەتا

شێوه.. جا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خۆی گرتنی، وه فەرمانیشیدا بە گرتنی رۆژووەکەی لە لایەنی موسوڵمانانەوە. (شەیخان).

دیسان لە ئیبنو عەبباسەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} رۆژی دەی موحەڕەم کە ناودارە بە رۆژی عاشوورا بەرۆژوو بوو، وە فەرمانیدا بە موسڵمانانیش کە ئەو رۆژە بە رۆژووبن. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم رۆژە جوولەکەو گاوریش رێزی لێدەگرن، فەرمووی: کەواتە خوا حەزکات ئەگەر ماین و نەمردین لە ساڵی ئایندەدا رۆژی نۆهەمیشی دەگرین، تا خۆمان لە گاورو جوولەکەکان جیابکەینەوەو لاسکایی ئەوان نەکەینەوە. فەرمووی: ئیتر پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} (لە پێش هاتنی ساڵی ئایینەدا) کۆچی دوایی کرد. (موسلیم و ئەبو داوود) هەروا گرتنی رۆژی عەرەفەی جەژنی قوربان، بۆ غەیری کەسێ کە خەریکی حەجکردن بێ، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: رۆژووی رۆژی نۆی مانگی قوربان – کە لەو رۆژەدا حاجیان وان لەکێوی عەرەفە – برێتیی گوناهی ساڵی پێش خۆی و ساڵی پاش خۆی دەکەوێ. (موسلیم لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە) بەڵام حاجی بانەیگرێ، چونکە ئەو لەم رۆژەدا سەرگەرمی پاڕانەوەو کردارەکانی حەجە، لەبەر ئەوەیش پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لە رۆژووی رۆژی عەرەفە، بۆ کەسێ لەسەر کێوی عەرەفەبێ. (ئەحمەدو ئەبو داوودو نەسائی و ئیبنو ماجە لە ئەبو هورەیرەوە دەیگێڕنەوە) هەروا گرتنی رۆژووی نۆ رۆژی یەکەمی مانگی نۆمینە، ئەبو داوود {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نۆ رۆژ لە سەرەتای مانگی قوربانەوەو رۆژی عاشوراو سێ رۆژ لە هەموو مانگێ و یەکەم دووشەمەو یەکەم پێنج شەمەی هەموو مانگێ بەرۆژوو دەبوو.

# ١٤٨- ڕۆژووی ناباش (الصوم المكروه):

ڕۆژووی ساڵ دوانزەمانگە نابەشە، حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ڕۆژووی ئەوکەسە گیرا نەبی کە ساڵ دوانزەمانگە بەرۆژوو دەبێ! (شەیخان و کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە) لەبەر ئەوەیش پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} ڕێگەی نەدا بە ئیبنو عومەر کە ڕۆژووی ساڵ دوانزەمانگە بگرێ، ئەوەبوو کە ویستی شتی وابکا، پێی فەرموو: شتی وا مەکە. (شەیخان و کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە).

ئەنەس {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: سێ کەس چوون بۆ ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە بارەی پەرستش و عیبادەتی حەزرەتەوە پرسیاریان هەبوو، کە پێیان گوترا پەرستشی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} چەندەو چۆنە وەك بڵێی بە کەمی بزانن وابوو، جا گوتیان: ئێمە لە کوێ و پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە کوێ، ئەو زاتە خودا بە صەریحی ئایەت لە گوناهی بەرودوداوی خۆش بووە، ئەوەتا یەزدانی گەورە مژدەی دەداتێ و پێی دەفەرموێ: {إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ، لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ – سورة الفتح – ٤٨/١-٢} . جا یەکێکیان فەرمووی: من بە شەو ناخەوم هەرشەو نوێژ دەکەم هەتا هەتایە، یەکێکی تریشیان فەرمووی: منیش ساڵ دوانزەمانگە هەر بەرۆژووم دەبم و یەك ڕۆژی لێ ناخۆم، ئەویتریشیان فەرمووی: منیش لە ژن کەنار دەگرم و هەتا هەتایە ژن ناهێنم و توخنی ژن ناکەوم. جا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} هات بۆلایان و فەرمووی: ئەوە وەها دەڵێن و ئەم قسانە دەکەن! دەسا بەو خودایە لە ئێوە زیاتر لە خودا دەترسم و لە ئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، لەگەڵ ئەوەیشا من بەش بە حاڵی خۆم

ناوبەناو رۆژووی سوننەت دەگرمو نـاو بـەناو بـەرۆژوو نـابمو بـە بەشـەو بەشی شەونوێژ دەکەمو بەشی خۆیشم دەخـەومو لـە هـەمان کاتا ژنـیشم هێناوەو حـەلالو هاوسـەرم هـەیە، دەی بزانن ئەمەی بۆم باسکردن رێگـەو رەفتاری منە، ئـەوەی پـێی رازییـەو خـودای لـێ رازییـە، ئـەوەی لاری لـەم رێبازەی من هەیە لە من نیە. (شەیخانو کەسانی تریش).

رۆژووی رۆژوی هەینیش بە تەنیا ناباشە، ئەگەر بەنیازی سـوننـەت بـێ. لـە صـەحیحەینا، لـە ئـەبو هـورەیرەوە. حـەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بە تەنها رۆژی هەینـی، بۆ رۆژووی سوننـەت، بە رۆژوو مـەبن، مەگەر رۆژێ لە پێشیەوە، یا لە پاشیەوە، لەگەڵی دابگرن. هـەروا رۆژووی رۆژی شەممەیش ناباشە، حـەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفـەرموێ: رۆژووی رۆژی شەممە بە تـەنیا، بـە نیـازی سـوننـەت مـەگرن، مەگـەر رۆژووەکـەی فـەرز بـێ لەسـەرتان (ئـەبو داوودو تیرمیـذیـو ئیبنـو ماجـەو بەیهـەقی گێراویانەتـەوە، بەیهـەقی بەدروسـت – صـەحیح – ی دانـاوە) لەبـەر ئەوەیش چاولێکەریی جوولەکە نەکەین، چونکە ئەوان شـەممە بـەرۆژوی گەورەی خۆیان دادەنێن! هەرواو لـە بەرهـەمان هـۆی چاولێکـەری گرتنـی رۆژووی رۆژی یـەك شـەممەیش ناباشـە، چـونکە نەصرانـی ئـەم رۆژە بـە رۆژی خۆیان دادەنێنو بە گەورەی دازانن، پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} ئەوەی پـێی خۆشبوو کە پێچەوانەی خاوەن نامەکان بکـاو، لـە کـارو بـاری ئایینیدا چاو لە وان نەکا!.

## ١٤٩) ڕۆژووی سوننەت بۆ ئافرەت:

ڕۆژووی سوننەت بۆ ژنی مێردار، ئەگەر مێردەکەی لە گەڵیابێ، نادروستە، مەگەر مێردەکەی ڕێگەی بدا، چونکە پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: یەك ڕۆژ چییە، نابێ ژن بەبێ فەرمانی مێردەکەی ڕۆژوو بگرێ ئەگەر مێردەکەی لەماڵ بوو لە گەڵیا، ڕۆژووی ڕەمەزانی لێ دەرچێ!. (ئەحمەدو شەیخان) بەڵام ئەگەر لە ماڵ نەبوو، واتە: لە ماوەی ڕۆژووەکەدا لەگەڵ ژنەکەیدا نەدەبوو، وەك ئەوە لە سەفەربوو، ئەوە ژنەکەی مافی هەیە بەبێ ڕێگە پێدانی مێردەکەی بەرۆژووبێ!.

## ١٥٠) زەکاتی سەرفترە:

**بۆیە پێی دەگوترێ سەرفترە**، چونکە فیطر لە عەرەبیدا واتە: ڕۆژووشکاندن، ئەمەیش بەهۆی هاتنی جەژنەوە، فەرز دەبێ، جەژنیش کە هات ڕۆژوو تەواو. (لە کوردیشدا بۆیە پێی دەگوترێ: سەر + فیترە، چونکە هەموو سەرێ، سەرفیترەی لەسەرە) وەپێشی دەگوترێ: زەکاتی جەستە، چونکە دەروون خاوێن دەکاو دل پاکژ دەکاو کردەوەی باش پێی نەشونماو گەشە دەکا... سەربەلگەی فەرزبوونی، ئەو فەرموودەیەیە کە شەیخان لە ئیبنو عومەرەوە {ڕەزای خوای لێبێ} مەنێ خورما، یا مەنێ جۆ سەرفترەی دانا لەسەر هەموو موسوڵمانێ، خواە: ئازاد بێ، یا بەندە، نێرینەبێ، یا مێیینە، گەورەبێ یا بچووك.

**مەرجی پێویستبوونی ئیسلام**، (خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لەسەر هەموو موسڵمانێ..). کەواتە بێبڕوا سەرفترەی لەسەر نیە،

**دووەم مەرجی**: ئاوابوونی خۆری ڕۆژی دوا ڕۆژی ڕەمەزانە، کە بۆ بەیانی جەژنە، گوتراویشە: پێویست دەبێ بە شەبەقدانی بەیانی ڕۆژی جەژن، چونکە سەرفترە تاعەتێکە پەیوەندی بە جەژنەوە هەیە، لەبەر ئەوە، لەسەر قسەی ئەم فەرمایشتە، نابێ لێی پێش بکەوێ! دەق وەك چۆن قوربانی پەرستشێکە پەیوەندی بە ڕۆژی جەژنەوە هەیە لەبەر ئەوە بەهیچ جۆرێ لە جەژن پێش ناکەوێ سەرفترەیش ئاوا.

**سێیەم مەرجی**: دەبی دارای سەرفترەکەبێ، ئەگەر نەدارابوو سەرفترەی لەسەر نیە، نەدارا لەم شوێنەدا ئەو کەسەیە کە ئەوەندەی ماڵ نەبێ کە زیادی هەبێ لە مەسرەفو ژیواری پێویستی شەوو ڕۆژی جەژنی خۆیو هەر شتێ کە گوزەرانی لەسەری بێ، خواه مرۆڤ بێ یا شتی تربێ، جا ئەگەر لەم ئەندازەیە زیادی هەبوو، دەبی بە پێی توانا سەرفترە بدا.

هەرکەس سەرفترەی خۆیو سەرفترەی ئەو کەسەی لە موسڵمانان کە ژیوارو گوزەرانی دەکەوێتە سەری دەدا، وەك ژنیو منالی وردی خۆیو منالی گەورەی خۆی کە کاسپیی بۆ نەکرێ، هەروا باوكو دایکی هەژاری، هەروا باپیرەو نەنکی هەژاری، هەروا خزمەتکارو کارەکە، ئەگەر بە نانەسکی ئیشیان بۆ دەکرد. بەڵام ئەگەر خزمەتکارو کارەکەر بەکرێ ئیشیان بۆ دەکرد. ئەوە سەرفترەیان لەسەر ئەو نیە، لەسەر خۆیانە، هەروا سەرفترەی بەندەی خۆیی دەکەوێتە سەر، بەپێی فەرموودەکەی

ئیبنو عومەر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر خوا {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی کردووە کە سەرفترەی ئەمانە بدرێ: بچووك‌و گەورەو ئازاو بەندەو هەر کەسێ کە ژیواری لە سەرتان بێ!. (موسلیم‌و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە). بەلاّم هەندێ بیّبڕوا هەن ژیواریان لەسەرتە، بەلاّم چونکە موسلّمان نین سەرفترەیان بۆ نادرێ، ئەمانە وەك ژنی کیتابی‌و خزم‌و بەندەو کەنیزەکی ناموسلّمان.

ئەندازەی پێویستی سەرفترە بۆ هەر کەسێ یەك من (صاع)ە لە پێبژێوێ کە زۆربەی خەلّکی ئەو شوێنە بەوەبژین. بە پێی فەرموودەکەی ئیبنو عومەر کە لە پێشەوە رابورد. ئەو دانەوێلّەو میوەیەی کە دەیەکی لێدەکەوێ بۆ زەکات بە کەلّکی سەرفترەیش دێ. تەنانەت کەشکیش بۆ سەرفترە دەست دەدا، چونکە فەرموودەیەکی دروست سەبارەت بە کەشك هەیە، بەلاّم تەنیا بۆ ئەو کەسە دەست دەدا کە خۆراکی کەشك بێ، ئەوەی دەدرێ بە سەرفترەدا دەبێ نەنگدار نەبێ، وە دەبێ دانەوێلّە بێ، بەهاکەی نابێ، چونکە دەق (نەص) لەسەر دانەوێلّەکە کراوە. بۆیەیش دەبێ لە پێبژیوی خەلّکی شار بێ، چونکە هەژاران دلّیان لەسەر ئەوەیە. مەن بە پێوانەی میسری چواریەکی کیلەیە، کەواتە: کەیلەی میسری بەشی سەری چوارکە دەکا. هەندێ زانا دەفەرموون: بەهای زەکاتەکەیش دەبێ، بەمەرجێ قازانجی هەژاری تیادابێ، چونکە موعاز بە خەلّکی یەمەن دەفەرموێ: جل‌و بەرگ شالّ‌و چۆغەو لەجیاتی جۆو گەنمەسامی بۆ بهێنن، چونکە هێنانی ئەمانە بۆ ئێوە بارسووکی ترەو بۆ هاوڕێیانی پێغەمبەرو دانیشتوانی مەدینەیش باشترە!.

زەکات‌و سەرفترە دروست نیە بدرێت بە بنەچەو وەچە واتە: زەکات بە ئوصول‌و فوروع دەرناچێ، چونکە ژیواری ئەمانە ئەگەر هەژار بن لەسەر زەکاتدەرەکەیە، واتە: هەر کەسێ ژیواری لەسەر کەسێ بی زەکاتی ئەو کەسەی پێ ناشێ، وەلێ لە لای ئیمامی مالیك {رەزای خوای لێبێ} دروستە باپیرە زەکاتی خۆی بدا بە کوڕی کوڕی خۆی. بەلام زەکات بە براو برازاو مامەو ئامۆزاو بەخوشك‌و خەشکەزاو بە خاڵ‌و خاڵۆزاو بە پوورو پورزا دەردەچێ بە ناوی هەژارانەوە. دروست نیە زەکات لە شوێنێکەوە ببرێ بۆ شوێنێکی تر چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ‌و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان. گوتراویشە: گواستنەوەی زەکات دروستە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، بەپێی فەرمایشتەکەی موعاذ، کە تۆزێ لەمەوپێش نووسیمان.

ئەگەر هەژارێ قەرزێکی لەسەربوو، خاوەن قەرزەکەی پێی گوت: ئەوا ئەو قەرزەی لەسەرتە دام بە تۆ لە جیاتی زەکاتی سەرفترە، بەمە لە کۆڵی ناکەوێ، لەسەر فەرمایشتی دروست، بەڵکوو دەبێ قەرزەکە وەربگرێتەوە ئەوسا بیداتەوە پێی لە جیاتی سەرفترە، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لەم رۆژەدا هەژاران لە گەدایی بێ نیاز بکەن بەڵێ ئەگەر قەرزەکە سپاردەبی ئەوە دروستە. [1]

---

[1] ئەمە تەرجەمەی ئەم دەقەیە، کەتایبەتە بە فیقهولویە سەرەکە، لە کفایە الاخیارەکەدا نیە: (واذا كان الفقير عليه دين فقال لە الدائن: جعلته عن زكاتي لا يجزئه على الصحيح حتى يقبضه لقوله صَلّى الله عليه وسلم: أغنوهم عن السؤال في هذا اليوم) بۆ ئەوەی بزانین کە چۆن ئەم حەدیسە دەبێ بە بەڵگە بۆ ئەم بڕیارە. دەڵێین: لەم

## ١٥١) کاتی دەرکدنی:

دروست نیە دەرکردنی سەرفترە لە شەوو رۆژی جەژن وابخری، مەگەر لەبەر مەهانەی رەوا، وەك ئەوە کەسێکی وای دەست نەکەوێ کە زەکاتی پێ بشێ، یا دەستی دەکوت، بەڵام لەبەر هۆیێ دەستی پێی نەدەگەیشت. باشترین کات بۆ دانی سەرفترە لە پاش شەبەقی بەیانی رۆژی جەژنەوەیە هەتا کاتی دەرچوونی مەردوم بۆ نوێژی جەژن! چونکە ئیبنو عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: خێرترینی ئەوەیە کە لەپێش ئەوەدا مەردومەکە بچن بۆ نوێژ بدرێ بە هەژاران. (شەیخان) زاناکان لە سەر ئەوە رێکەوتوون: کە بە رۆژێ دوو رۆژ لە پێش جەژنا دروستە بدرێ، ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: دروستە سەرفترە لە پێش رەمەزانیشەوە بدرێ، شافعیش دەفەرموێ: دروستە لە سەرەتای ەمەزانەوە بدرێ. وا باشترە سەرفترە بدرێ بەو خزمانە کە ژیواریان لەسەر سەرفترە دەرەکە نیە، وەك خوشكو براو مامەو پوورو خاڵو خوشکی دایكو منالی ئەمانە، بگرە هەتا نزیکتربێ خێترە.

---

دۆخەدا، هەژارەکە، راستە قەرزەکەی لەسەر نامێنێ، بەلام بە عەمەلی هیچ وەرناگرێ بۆ خەرجی رۆژی جەژنی، لەکاتی وادا، هەژار لە سواڵو دەرووزەی رۆژی جەژن بێ نیازابێ.

- وەرگێڕ -

## ١٥٢) حیكمەتی سەرفترە:

حیكمەتی سەرفترە ئەوەیە خودا كردوویەتی بە هۆی پاككردنەوەی رۆژووەوان لە ئۆبالّی قسەی پڕوپوچ، بە پێی ئەم فەرمایشتەی ئیبنو هەبباس {رەزای خوای لێبێ} كە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سەرفترەی داناوە هەتا رۆژووەوان پاك بكاتەوە لە ماكی قسەی پڕوو پوچو هەرزەگۆیی، وە هەتا بشبێت بە خۆراكی جەژنی هەژاران. (ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو حاكم گێڕاویانەتەوە، حاكم بە دروستی داناوە) دیسان لەبەر ئەوەیش كە هەژاران بپارێزێ لە رووی زەردی سوالّ، لەم رۆژە پیرۆزەدا، وەك حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لەم رۆژەدا هەژاران بێ نیاز بكەن لە گەڕانی دەرگاو دەگا (حاكم گێڕاویەتەوە).

## ١٥٣) باسی گەورەیی رۆژوو:

فەرموودەی گەلێ زۆر سەبارەت بە بەهرەی رۆژوو هەیە، لە فەرموودەیەكا خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: رۆژوو و قورئان، لە رۆژی قیامەتا، تكا دەكەن بۆ بەندە، رۆژوو دەفەرموێ: ئەی خودایە! بەهۆی منەوە، لە رۆژدا، نانو ئاوو ئارەزووەكانی لێ قەدەغە بوو بوو، كەواتە هەقی لەسەرمە، لەبەر ئەوە من لە خزمەت تۆدا تكای بۆ دەكەم، ئومێد دەكەم كە تكاكەم قەبوولّ بفەرمووی، قورئانیش دەفەرموێ: منیش بەشەو خەوم لێ زڕاندبوو، كەواتە تكام گیراكە بۆی، جا تكای هەردوكیان قەبوولّ دەكرێ! (ئەحمەد بە رشتەیەكی دروست

گێڕاویەتەوە) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ {درودی خوای لەسەربێ}: هەر بەندێ بۆ رەزای خوادا یەك رۆژ رۆژوو بگرێ، مسۆگەر کە خودا بەهۆی رۆژووی ئەو رۆژەوە حەفتا ساڵ لە ئاگری دۆزەخ دوری دەخاتەوە! (رواة الجماعة الا ابا داود).

## ١٥٤) هەڕەشە لە رۆژوو نەگرتنی رەمەزان:

هەڕەشەی زۆر هەیە لەو کەسەی کە لە رەمازانا بەبێ بەهانەی رەوا بە رۆژوو نەبێ، وەك ئەوە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کەسێ (بەبێ بەهانەیەکی رەوا کە خودا رێگەی پێدابی) رۆژێ لە رۆژووی رەمەزان بخوات، ئەگەر گریمان بە درێژایی ساڵ لە جیاتی ئەو تاقە رۆژە بەرۆژوو بێ، هێشتا شوێنی ئەو تاقە رۆژە پڕ ناکاتەوە! (د/ماجە/ت).

## ١٥٥) نزای رەوا بەزمانی بەرۆژووەوە:

تیرمیذی {رەزای خوای لێبێ} بە رشتەیەکی جوان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەم سێ جۆرە کەسە نزاو پاڕانەوەیان لە لای خوا گیرایە: رۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوەو پێشەوای دادپەروەرو مرۆڤی ستەمدیدە، هەروا خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەیە بۆ رۆژووەوان لەکاتی بەربانگکردنەوەدا، نزایێ کە خوا گیرای دەکا (ئیبنو ماجە گێڕاویەتەوە).

## ١٥٦) مانگە پیرۆزەکە:

پێغەمبەری خوا {دروودی خوای گەورەی لەسەربێ} لە کۆتایی مانگی کوڵەمانگا، لە دوا رۆژیدا، وتارێکیدا، فەرمووی: ئەی موسڵمانەکان! وا بەخێرو خۆشی مانگێکی مەزنی پیرۆز، تەشریفی هێناوسێبەری رەحمەتی لەسەر کردن، ئەو مانگە مەزنەیە کە لەیلەتولقەدری تیادایە، کە شەوێکی وایە لە هەوار مانگ گەورەترە، ئەومانگەیە کە خودا گرتنی رۆژووی رۆژەکەیی فەرزکردووە لە سەرتانو، شەونوێژی شەوەکەیی سوننەتێکی گەورە بۆتان، هەر کەسێ لەم مانگەدا کارێکی سوننەت بکا، وەك ئەوە وایە کە ئەو کارەی لە مانگەکانی تردا بە فەرزی کردبێ (دوو رکات نوێژی سوننەت لە رەمەزانا بەقەد دوو رکات نوێژی فەرز لە مانگەکانی تردا خێری دەگا، وە هەروا خێرو سەلاواتو قورئانخوێندنو سەلاواتو وە هەرکەسێ لەم مانگەدا فەرزێ ئەنجام بدا وەك ئەوە وایە کە ئەو فەرزەی لە مانگەکانی تردا حەفتاجار جێبەجێ کردبێ، ئەم مانگە هەر خۆی مایەی ئارامو هێمنیە، ئارامیش پاداشتی گەورەیە، کە برێتیە لە بەهەشتی بەرین، هەر خۆی مانگی دڵدانەوەو نەوازوشە، ئەو مانگەیە کە رقو رۆژی ئیماندار تیادا زیاد دەکا، هەر کەسێ لەم مانگەدا بەربانگ بۆ رۆژووەوانێ بەربانگی پێ کردتەوە خێری دەگا، بەبێ ئەوە کە لە پاداشی رۆژووەوانەکە ئامادە بکا، دەبێ بەهۆی داپۆشینی گوناهەکانیو دەبی بەهۆی ئازادبوونی لە ئاگری دۆزەخ! سەرەڕای ئەوەیش رێك بە قەد ئەو رۆژووەوانە کە هیچ کەم ببێتەوە. یاران عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! هەندێ لە ئێمە ئەوەندەی نیە کە بەربانگێك تەاو بۆ رۆژووەوان دروست بکا، ئەی ئەوەچی بکاو چۆن ئەم بەهرە گەورەیەی لەکیس

نەچێ؟! فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: خوای گەورە بە رەحمەتی خۆی ئەم بەهرە گەورەیە دەدا بەو کەسانەیش کە ئەوەیان بۆ ناکرێ بەڵام بە دەنکێ خورما، یا بە جامێ ئاو، یا بە ژەمێ شیراو، بەربانگ دەکەنەوە بە رۆژووەوانێ! رەمەزان ئەو مانگەیە کە هەوەڵکەی رەحمەتە، ناوەڕاستەکەی لێخۆشبوونە، دەی کۆتایی ئازادبوونە لە ئاگری دۆزەخ! هەتا دەتوانن لەم چوار کارەی زۆر تیادا بکەن: دووکاریان دەبن بەهۆی خۆشنوودیو رەزامەندی پەروەردگارتان، دوو کاریشیان بەبی ئەوان ناتان کرێ، ئەو دووەیان کە دەبن بەهۆی رەزامەندی خودا، یەکەمیان شەهادەی (لا الـه الا الله)یەو دووەمیان تەوبەو ئیستیغفارە، ئەو دوویشیان کە بەبی ئەوان ناتانکرێ، یەکەمیان ئەوەیە لە کە خودا داوای بەهەشت بکەنو دووەمیان ئەوەیە کە پەنا بگرن بە خودا لە ئاگری دۆزەخ، وە هەرکەسێکیش رۆژووەوانێ تێربکا، خودا لە حەوزی کەوسەری من تێراوی دەکا، تێراوێکی وا کە لە پاشی قەت تینووی نەبێ هەتا دەچێتە بەهەشتێ!. (ئیبنو خوزەیمەو بەیهەقیو ئیبنو حیببان گێڕاویانەتەوە).

## ١٥٧) خەڵوەکێشان لە مزگەوتا (اعتكاف):

پێناسەکەی:خەڵوەکێشان لەزمانی عەرەبدا پێی دەگوترێت اعتكاف.اعتیکافیش لەزمانی عەرەبدا واتە: گوڵوڵە بوون بەدیار شتێکەوە، ئیتر باش بێ یاخراپ هەر پێی دەوترێ (اعتكاف) ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: {مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ – سورة

الأنبیـاء – ٥٢/٢١} واتــه: ئیــبراهیم بێــزاری دەربــڕی لــەبتانو بەباوکیوبەگەلی خۆی فەرموو: ئەم پەیکەرە بێ گیانو بێ خێرو بێ دەسەڵاتانە چینو بەچی ئەقڵێکەوە ئێوە ئاوا بەدیاریانەوە گلۆڵە بوونو بە بێ لێکدانەوە سەرتان کردۆتە پەرستنیان.

لەشەرعیشدا واتـە:نیشتەجێبونێکی تایبەت لەسەر شێوەیەکی تایبەت.خەڵوەکێشان لەهەموو کاتێکدا سوننەتە، لە دەی دوایی ڕەمەزانا لە هەموو کاتێکی تر خێرترە، لەمەیشدا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سەرمەشقە، چونکە ئەو وای کردووە، لە هەمان کاتدا دەبێ بە گەڕانیش بەشوێن لەیلەتولقەدردا، کە ئەو شەوەیە لە هەموو شەوەکان گەورەترە، سەربەلگەی سوننەتییەکەی قووڕئانو سوننەتو یەکگرتنی ئوممەتە. خوای گەورە دەفەرموێ: {أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ – سورة البقرة – ١٢٥/٢} وە دەفەرموێ: {وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ – سورة البقرة – ١٨٧/٢) لە فەرموودەو سوننەتدا هەیە کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هەموو ڕەمەزانێ دە ڕۆژ خەڵوەی دەکێشا، بەڵام لەو ساڵەدا کە کۆچی دوایی تیاداکرد، بیست ڕۆژ لە ڕەمەزانا خەڵوەی کێشا (فەرموودەیێ لەسەر ئەم مەسەلەیە هەیە ئەبو داوودو بوخاریو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە). هاوڕێکانی پێغەمبەرو هاوسەرەکانی لە ژیانی پێغەمبەرداو لە دوا ژیانیشی خەڵوەیان کێشاوە، گەلێ موسوڵمان لەسەر ئەمە یەکیان گرتووە.

## بنیاتەکانی:

### بنیاتەکانی خەڵوەکێشان چوارشتە:-

**یەکەمیان:** نیەتە، چونکە ئەمەیش وەك هەموو پەرستنێ عیبادەتە، لەبەر ئەوە پێویستی بە نیەتە.

**دووەمیان:** مانەوەیە لەناو مزگەوتا بەلآم ئەوەندە بەس نیە بە ئەندازەی ئارامبوونەوەیێ کە بە عەرەبی پێی دەوگوترێ طومەئنینەی ناو روکوع، وەك هەندێ کەس دەڵێن: بەڵکوو پێویستە لەو ئەندازەیە پتربێو ئەوەندە ببێ کەپێی بگوترێ گوڵۆڵەبوونو نیشتەجێبوون، شافیعی {رەزای خوای لێبێ} وا بەباش دەزانێ کە بەلایەنی کەمەوە خەڵوەکێش رۆژێ خەڵوەبکێشێ، هەتا لە راجیایی دەرباز ببێ، ئەوەیش کە دەڵێین: بڕیارە مانەوە کە لە ناو مزگەوتا بێ، چونکە خەڵوەکێشان لەناو مزگەوتا یاساو دەستووری پێغەمبەرو یارانیو هاوسەرەکانی بووەو لەوانەوە لەسەر ئەم شێوەیە بۆ ئێمە ماوەتەوە، لە هەمان کاتا پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خەڵوەکێشان دەبێ لەناو مزگەوتێکابێ کە جەماعەتی تیادا بکرێ. (ئیبنو ئەبی شەیبەو سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویانەتەوە، بەشێکە لە فەرموودەکەی حوزەیفە).

**سێیەمیان:** خەڵوەکێشە، مەرجی خەڵوەکێش ئەمانەیە: ئیسلامو هۆشو پاکی لە لەشپیسی بێنوێژیو زەیستانی، .

**چوارەمیان:** جێگەی خەڵوەکێشان،واتە خەڵوەکا، یا خەڵوەخانە، مەرجەکەی ئەوەیە کە دەبێ مزگەتبێ، وەك باسمانکرد، ئەگەر خەڵوەگاکە مزگەتێ بێ جومعەی تیا بکرێ ئەوە باشترە، تا ناچار نەبێ

دەربچێ بۆ نوێژی هەینی، لەبەر ئەوەیش چونکە مزگەوتی وا جەماعەتەکەیشی گەورەترو زۆرترە! ئیمامی زوهری ئەمەی بە مەرج گرتووە، شافیعیش {رەزای خوای لێبێ} لە فەرمایشتی دیرینیدا ئاماژەی بۆ ئەم رایە کردووە!

## خەڵوەی نەزرکراو:

خەڵوەکێشان تاعەتەو هەموو تاعەتێکیش هۆی نزیکبوونەوەیە لە خوای مەزن، جا هەرکاتێ خەڵوەکێش کە خەڵوەکێشانی نەزرکرد لەسەر خۆی نەزرەکەی دادەمەزرێ، پێویستە لەسەری کە جێبەجێی بکا، بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ تاعەتێ لەسەر خۆی نەزربکا با بیکا، بەڵام ئەگەر کەسێ گوناهێکی لەسەر خۆی نەزر کرد با نەیکا (ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتەوە، هەروا بوخاریش) ئیمامی عومەریش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! لەسەر دەمی نەزانی پێش ئیسلاما، فووتوو (نەزر)م کردووە کە شەوێ لە ناو مەسجیدولحەرامدا خەڵوەبکێشم، جا تۆ دەفەرمووی چی؟ پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: نەزرەکەت بەجێبێنە، ئەویش لە ناویدا شەوێ خەڵوەی کێشا (شەیخان). جا ئەگەر نەزریکرد دە رۆژ خەڵوە بکێشێ، لە سەریەتی کە جێ بەجێی بکا، ئیتر نەزری کردبوو کە دەرۆژەکە بەسەریەکەوە بێت، یا پچڕ پچڕبێ یەکسانە، لەوماوەیەدا بۆی نیە لە مزگەوتەکە بچێتە دەرەوە مەگەر لەبەر مەهانەی رەوا، مەهانەی رەوایش جۆری زۆرە: وەك دەرچوون بۆ سەراو، خوا بۆ پیسایی بێ، یا بۆ گمیزبێ، بۆ ئەم مەبەستە خۆشۆردنی لەشپیسی شەیتانی بوونیش وەك

سەراوکردن وایە، دەرچوون بۆی زیانی نیە، وەك برسێتی، بۆی هەیە لەبەر برسێتی لە مزگەوت دەربچێو بچی نان بخواتو بێتەوە، بەڵام ئەگەر تینووی بوو سەرنج دەدەین: ئەگەر لە ناو مزگەوتا ئاوی دەست دەکەوت، بۆی نیە لە مزگەوت دەربچێ، ئەگینا بۆی هەیە، جیایی نێوانی خواردنو خواردنەوە ئەوەیە: نانخواردن لە ناو مزگەوتا شەرمی لێدەکرێ، بەڵام ئاوخواردنەوە وانیە، وەڵێ دروست نیە بچی بۆ سەردانی نەخۆش، یا بۆ نوێژی مردوو، چونکە حەدیثێ هەیە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەکاتی خەڵوەکێشاندا لەلای نەخۆشەوە رەت دەبوو، لە رێگەی ئاسایی خۆیەوە تێدەپەڕی. لای نەدەدا بۆ لای نەخۆشەکە بۆ هەواڵپرسی. (ئەبو داوود) دیسان ئەبو داوود لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: یاساو دەستووری خەڵوەکێش بەم شێوەیەیە: نەبچێ بۆ دیدەنی نەخۆشو نە بچی بە دیار تەرمو نە دەست بەرێ بۆ ژنو نە لەگەڵیا دروست بێ، وە بۆ پێویستییەکی ناچاری خۆشی نەبێ، نابێ لە مزگەوت دەربچێ یەکێ تر لە مەهانەی رەوای دەرچوون: پەیدابوونی بێنوێژییە، لە کاتی وادا لە سەریەتی کە گورج لە مزگەوت دەربچێ، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ناو مزگەوت رەوا نابینم نە بۆ بێنوێژو نە بۆ لەشپیس!.

**یەکێ تریان:** نەخۆشیە، ئەگەر بە نەخۆشییەوە مانەوە لە مزگەوتا زەحمەت بوو، وەك ئەوە پێویستی بە نوێنو هامشۆی پزیشك بوو، ئەوە رەوایە بۆی کە لە مزگەوت دەرچێ، وە بەوە پەیوەستی خەڵوەکێشانەکەی ناپچڕێ، هەروا ئەگەر لەبیری نەبوو لە مزگەت دەرچوو، یا بە زۆر لە مزگەوت دەریان کرد خەڵوەکەی ناپچڕێ. بەڵام

ئەگەر دەرچوو هەتا بچێ بۆ نوێژی هەینی ئەوە خەڵوەکەی پوچ دەبێتەوە، چونکە لە سەرەتاوە دەیتوانی لەو مزگەوتەدا خەڵوەبکێشێ کە جومعەی تیا دەکات.

**یەکێ تریان:** ئەوەیە مەترسی ئەوەی هەبێ کە بەهۆی تەواو کردنی خەڵوەکەوە حەجی لەکیس بچێ، ئەوە خەڵوەکەی پووچ دەبێتەوە، ئەگەر لەگەڵ خێزانی، یا لەگەڵ شتێ جووت بوو، واتە: جیماعی کرد، خەڵوەکەی پووچ دەبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ – سورة البقرة} واتە: ئەی موسوڵمانەکان! لە کاتێکا کە ئێوە لەناو مزگەوتا خەڵوەدەکێشن، لەگەڵ ژنی خۆتاندا دروست مەبن. هەتا ئەگەر دەستبازی لەگەڵ ژندا کرد، یا ماچی کردو ئاوی هاتەوە، خەڵوەکەی پووچ دەبێتەوە.

## ١٥٨) حەج لە زمانی عەرەبدا واتە:

چوون بۆ شتێ، لە شەرعیشدا برێتییە لە چوون بۆ ماڵی خوا، کە ناوی بەیتولحەرامە، بۆجێ بەجێکردنی کردارەکانی حەج، وەك تەوافو سەعی نێوانی سەفاو مەڕوەو وەستان لە کێوی عەرەفەو دەستوورو یاساکانی تری حەج، بە نیازی جێبەجێکردنی فەرمانی خوا، بە هیوای دەستگیربوونی ڕەزامەندی خوا.

**بڕیار = حوکمەکەی:**

حەج بە نامەو سوننەتو یەکگرتنی نەتەوە لەسەر موسوڵمان فەرز بووە، خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً – سورة آل عمران – ٩٧/٣} واتە: وە بۆ خودا هەیە لەسەر گشت کەسێ کە توانای چوونو هاتنەوەی ڕێگەی حەجی هەبێ، کە بچێ بۆ حەج. پێغەمبەری ئازیزیش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئیسلام لەسەر پێنج بنیات دامەزراوە، تا کۆتایی فەرموودەکە. کە یەکێك لەو پێنجە حەجە، حەزرەت دیسان دەفەرموێ: بەر لەوەی حەجتان لە دەست بچێ حەج بکەن (بەیهەقی لە سونەنی بەیهەقیدا دەیگێڕێتەوە). حەج لەو کارە گرنگانەیە کە لە ئایندا بەڵگە نەویستو هەموو کەس دەیان زانێ، لەبەر ئەوە هەر کەسێ حاشای لێبکاو بە فەرزی نەزانێ بە کافر دادەنرێ.

**لە تەمەندا حەج یەکجار پێویستە:**

گەلێ موسوڵمان بە یەکگرتن بڕیاریان لەسەر ئەوەداوە: کە لە تەمەندا حەج یەکجار لەسەر موسوڵمان فەرزە، ئەقرەعی کوڕی حابیس لە پێغەمبەری خوای پرسی: حەج هەموو ساڵێکە، یا لە تەمەندا یەك حەج پێویستە لەسەر موسوڵمان؟ خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: نەخەیر هەموو ساڵی فەرز نیە، بەڵکوو لە تەمەندا یەك حەج فەرزە، بەڵام هەرکەسێ حەجی زیاتر بکا ئەوە حەجی سوننەتەو پاداشتی گەورەی هەیە. (ئەحمەد).

## ١٥٩) عەمرە:

عەمرەیش رێك وەك حەج فەرزە، چونكە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ – سورة البقرة – ٢/١٩٦} واتە: حەج و عەمرە بە تەواوی و بەرێكوپێكی بیانكەن ساخ لەبەر رەزای خوا. عائیشەیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەری خوام كرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ژنان غەزایان لە سەرە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەلاّم ئەو غەزایەی كە لەسەر ئەوانە شەڕو شۆڕی تیا نیە، كە برێتییە لە حەج و عەمرە، وەلێ ئەو هەواڵەی كە تیرمیذی لە جابیرەوە دەیگێڕێتەوە: گوایە جابیر فەرموویەتی: پرسیار كرا لە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لە بارەی عەمرەوە كە ئایا فەرزە یا سوننەتە؟ لە مەجمووعا، سەبارەت بەم فەرموودەیە دەفەرموێ: بە ئیتتیفاقی حوففاظی حدیث ئەم حدیثە ضەعیفە. واتە: پسپۆڕە ئاگادارەكانی فەرموودە بە یەكڕا بەكۆی دەنگ، دەفەرموون: ئەم فەرموودەیە لاوازە. عەمرەیش رێك وەك حەج لە تەمەندا یەكجار فەرزە، كردارەكانیشی هەمان كردارەكانی حەجە، بەس ئەم وەستانی عەرەفەی تیا نیە.

### (فێربوونی بڕیارەكانی حەج):

پێویستە لەسەر ئەو كەسە كەدەیەوێ حەج بكا فێری بڕیارەكانی ببێ، چی تیادا پێویستەو چی تیادا پێویستەو چی تیادا حەرامەو چی تیادا ناپەسەندەو چی تیادا رەوایەو چی كردن و نەكردنی یەكسانە، چونكە خودا داوای لەكەس نەكردووە كەبەنەزانی بیپەرستێ، بەڵكوو هەر شتێ لەئایینا كردنی پێویست بێ فێر بوونیشی پێویستە. زاتی

مەزن دەفەرموێ: {فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ - سورة النحل - ٤٣/١٦} واتە: هەرشتێ نازانن لەپسپۆرانی خۆی بپرسنەوە، کەبەباشی دەیزانن.پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: گەڕان بەدوای زانست دا ئەرکێکی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ (بەیهەقی دەیگێڕێتەوە) لەگێڕانەوەیەکا ئەمەشی پترە: ئەرکێکی پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێ، چ نێرینە بێ چ مێ بینە!.

**( یەکەم شت کەفێربوونی دروستە ):**

لەم بارەیەوە یەکەم شت کەفێربوونی دروستە فێربوونی حەلاڵ‌و حەرامە، چونکە حەلاڵ مرۆڤ لەتاعەتی خواوە نزیك دەکاتەوە، بەلاّم حەرام بەپێچەوانەوە، حەلاڵ مرۆڤ لەبێ فەرمانی خوا دوور دەخاتەوە، خودایش خۆی پاکە، هەرچیش پاك نەبێ وەری ناگرێ، وەکی تریش خودای گەورە لەم بارەیەوە یەك جۆرە فەرمانی بەئیمانداران‌و پێغەمبەران کردووە، ئەوەتانێ فەرمانی بەهەر دوولا وەك یەك کردووە کەحەلاڵ خۆر بن‌و پاکخۆربن، بەپێغەمبەرانی فەرمووە: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ - سورة المؤمنون - ٥١/٢٣} بە ئیماندارانیش دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ - سورة البقرة - ١٧٢/٢}. بەگشتیش ئەم فەرمایشتە راستەکە دەڵێ: هەر کەسێ کاسپی یەکەی حەلاڵ بێ کارەکەی پیت‌و فەڕی تێ دەکەوێ‌و گەشەو نەشونما دەکا، هەر کەسێ کاسپییەکەی حەلاڵ نەبێ مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ کە کردەوەی پەسەند نەکرێ! ئەوەتا یەزدانی مەزن لەم بارەیەوە دەفەرموێ: {إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ

الْمُتَّقِينَ – سورة المائدة – ٥/٢٧} واتە: لەراستی دا خودای گەورە بەس کاری ئەوانە پەسەند دەکا، کەپارێز لەنافەرمانی خوا دەکەن‌و بەهیچ جۆرێ فەرمانی ناشکێنن! (رەحمەت لەپێشینان کەدەفەرموون: لەوە بترسە کەلە خوا ناترسێ!) شاعیریش دەفەرموێ:

اذا حججت بمال أصله سحت
فما حججت، ولكن حجت العير!

**واتە:**

**ئەگەر بەماڵی حەرام حەج بکەی**
**حەج بۆ خۆت ناکەی، حەج بۆ کەرەکەی!**
**کەسێ بەماڵی حەرام حەج بکا**
**کەرەکەی ژێری زیاتر حەج دەکا**

**بە پەخشانیش واتە:** ئەگەر بەماڵی حەرام حەج بکەی، ئەوە پێی ناگوترێ حەج‌و تۆ بەوە نابی بەحاجی، بەڵکوو کەرەکەی ژێرت لەتۆ حاجیترە لەحاڵی وادا.[1] حەج لەگەورەترین کردەوەی مرۆڤە، چونکە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: باشترین کردەوە لەلای خوا ئەمانەیە: باوەڕی تەواو، کەبەهیچ جۆرێ بۆنی گومانی لێ نایەت، غەزایەکیش کە دەستپیسی لەدەسکەوتی جەنگی تیا نەکرێ، حەبێکی دروستیش. (ئیبنو حیببان لەصەحیحی خۆی دا دەیگێڕێتەوە) حەزرەت دیسان دەفەرموێ: هەرکەسێ بۆ خودا حەجێ بکاو لەکاتی کردنی

---

[1] العير قافلة الحمير . المنجد. أنظر النهاية في غريب الحديث والأثر. واتە: عير بەکاروانی کەر دەگوترێ.

– وەرگێڕ–

حەجەكەدا پارێز لەكەیف كردن لەگەڵ ژندا بكاو گورێز لەهەرزە گۆیی‌و قسەی پڕو پووچ بكاو گوناە نەكا، ئەوە وەك ئەو ڕۆژە كەلەدایك دەبێ ئاوا لەگوناە پاك دەبێتەوە! (أخرجه الجماعة). گەرچی حەج فەرزێكی پشوودارەو ئەركێكی ماوەدارەو مەرج نییە دەسبەجێ جێ بەجێ بكرێ، بەلاّم باشتر وایە كەبەزوویی دەستو بردی لێ بكرێ، چونكە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەركەسێ توێشەی ڕێگەو ولاّخێكی سواری وای هەبێ كە بیگەیەنێتە خانەی خوا، وەحەج نەكا، ئەوە دەیەوێ بەجوولەكەیی بمرێ یا بەگاوریی كەیفی خۆیەتی. (تیرمیذی) دیسان دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: هەركەسێ حەجی لەسەر پێویست ببێ‌و بەئارەزوو بەبێ بەهانایەكی رەوا حەج نەكا، ئەوە كەیفی خۆیەتی دەیەوێ بە جوولەكەیی بمرێ یا بەگاوریی ئەوە خۆی لەو دووە سەر پشكە، بەلاّم ئەگەر بەهانایەكی رەوای هەبوو ئەوە جیایە، وەك ئەوە نەخۆشی نەهێڵێ بچێ بۆ حەج، یاپێویستیەكی ناچاریی نەهێڵێ، یاكار بەدەستی ستەمكار ڕێگەی نەدا. (ئەحمەد).

## ١٦٠) مەرجەكانی پێویستبوونی حەج:

### پێویستبوونی حەج ئەم چەند مەرجەی هەیە:

**یەكەم**: ئیسلام، چونكە حەجیش وەك نوێژو زەكات پەرستشە، بەس پەرستشی موسوڵمانیش دادەمەزرێ. بەپێی فەرموودەیەیش كە موعاذ: دەیگێڕێتەوە، كەدەفەرموێ: حەزرەت كەناردمی بۆ یەمەن پێی فەرمووم:... لەپێشا داوایان لێ بكە كەشایەتی بدەن: كەهەر خودا خودایەو.. تادوایی فەرموودەكە كەبەپێی ئەم فەرموودەیە حەجیش

فەرزێکە لەفەرزەکان. کەواتە: حەج لەسەر بێبڕاوی‌بنەڕەتی پێویست نابێ‌و داوایشی لێ ناکرێ کەحەج بکا. بەلاّم هەلگەڕاوە کەتوانای حەجی هەبوو ئیتر لەکۆڵی ناکەوێ. جا لەوەدوا ئەگەر لەحالّی هەژاری دا گەڕایەوە بۆ سەر ئیسلام، ئەوە بەهۆی توانا بوونەکەی کاتی هەلگەڕانەوە کەیەوە حەج دەکەوێتە سەری، بەلاّم ئەگەر بەدەولّەمەندی گەڕایەوە بۆ سەر ئیسلام‌و لەپێش ئەوەدا حەج بکا مرد، ئەوە لەمیراتیەکەی حەجی بۆ دەکرێ. دووەم: ڕەسیدەبوون، چونکە منداڵ حەجی لەسەر نییە، چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە قەڵەمی تەکلیفیان لەسەر نیە، یەکێ لەو سێ کەسە منالّە، وەك لەزنجیرە (١٣٤)دا رابورد. دیسان حەجیش بەقیاس لەسەر هەموو پەرستشێکی تر ناکەوێتە سەر منالّ. سێیەم: هۆش، شێت حەجی لەسەر نییە، بەپێی فەرموودەی: قەڵەمی تەکلیف لەسەر ئەم سێ کەسە هەلگیراوە، کەیەکێ لەو سێ کەسە شێتە. چوارەم: ئازادییە، بەندە حەجی لەسەر نییە، چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر کۆیلەیێ حەجی کرد، لەپاشا ئازاد کرا ئەوە حەجێکی تری لەسەرە! بەپێی ئەم بەلگەیەیش کەدەفەرموێ: کۆیلە نوێژی هەینی لەسەر نییە، جا لەشوێنێ نوێژی هەینی بەو نزیکی یە لەسەری نەبێ، لەبەر ئەوەی مافی ئاغاکەی بەهۆی چوون بۆ هەینییەکەوە نەفەوتێ، چۆن حەج بەو دووری‌و درێژییە دەکەوێتە سەری؟؟ پێنجەم: لەتوانابوونە. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ ← ز – ١٥٥} . توانین دوو جۆری هەیە: یەکێکیان ئەوەیە موسوڵمانەکە خۆی توانای حەجکردنی هەبێ، ئەوی تریان ئەوەیە خۆی

نەتوانێ کەسێکی تر حەجی بۆ بکا، توانینی بەخودی خۆی ئەمانەی پێویستە:

**یەکەم**: هۆی سواریی دەست بکەوێ چماڵی حاجی خۆیبێ، یاهی کرێ بێ، ئەمەیش بۆ کەسێ مەرجە کەنێوانی ماڵی ئەوو نێوانی مەککە ماوەی کورتکردنەوەی نوێژبێ یا پتربێ. جا ئەگەر ماوەکە لەمە کەمتر بوو، بەڵام کابرا بێهێز بوو نەیدەتوانی بەپێ بڕوا، یادەیتوانی بەڵام تووشی زیانێکی ئاشکرا دەبوو ئەوە لەم کاتەیشدا ولاخ مەرجە، دەنا دەبێ بە پێ بچێ بۆ حەج.

**دووەم**: ئەوەیە مەسرەفی چوونو گەڕانەوەی هەبێ. مەرجە کەولاخو خەرجی ڕێگە زیاد بێ لە ژێواری خۆیو ژێواری ئەو کەسانەی کە ژێواریان لە سەریەتی، هەروا زیاد بن لەجلو بەرگی پێویستی خۆیو ئەوانو لە هەموو پێویستییەکی تریان لەو کاتەوە دەڕوا هەتا دەگەڕێتەوە بۆ لایان.

بزانە ئەگەر کەسێ پارەی حەجی هەبوو، بەڵام لە هەمان کاتا پێویستی بەژنهێنان هەبوو، لە ترسی ئەوە نەبادا تووشی شەروالپیسی ببێ، ئەوە لەم کاتەدا باش وایە ژنی پێ بهێنێ، نەك حەجی پێ بکا، چونکە لەم حاڵەدا ژنهێنان پێویستیەکی کات هاتووە، بەڵام حەج ماوەکەی مەودا دارە، بەڵام ئەگەر مەترسی شەروالپیسی نەبوو، ئەوە پێشخستنی حەجەکە باشترە.

**سێیەم**: ڕێگە ئەمین بێ، ترسی سەروماڵو ناموسی نەبێ، با ترسەکە کەمیش بێ، چونکە بە هۆیەوە تووشی زیان دەبێ.

**چوارەم**: ئەوەیە هیوای فریاکەوتنی حەجی هەبێ، واتە: حەجەکە کاتی ئەوەندە مابێ حاجی لە ماڵ دەرچوو پێش بەسەرچوونی کاتی حەج فریای وەستانی عەرەفە بکەوێ.

جۆری دووەم لە توانین ئەوەیە کە یەکێکی تر حەج بکا بۆ مرۆڤ. بۆ ئەمە مەرجە: ئەو کەسەی کە لەباتی کەسێکی تر حەج دەکا، زیاتر لە کرێی ئاسایی داوانەکاو خۆی حەجی کردبێ‌و حەجی نەزریشی لەسەر نەبێ. ئەو کەسەیشی کە یەکێکی تر دروستە حەجی بۆ بکا یەکێکە لەم دووکەسە: یا مردووەو حەجی لە ئەستۆدایە، ئەمە پێویستە لەو کەلەپوورەی کە بەجێی هێشتووە حەجی بۆ بکرێ‌و کەسێ بنێرن حەجی بۆ بکا، یا کەسێکە زیندووەو پەك کەوتووەو لەبەر پیری یا لەبەرشتی تر وەك زەحمەتی زۆر ناتوانێ خۆی بچێ بۆ حەج.

# ١٦١) بنیاتەکانی حەج (أركان الحج)

## بنیاتەکانی حەج پێنج بنیاتن:-

**یەکەم**: ئیحرام دابەستن، کە بریتییە لە نێتی چوونە ناو حەج، یا چوونە ناو عەمرە، بۆیە ناونراوە ئیحرام چونکە رێگە لە شتی حەرامکراو دەگرێ. سەر بەڵگەی پێویستبوونی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ): هەموو کردەوەیێ بەپێی نیازو نییەتەکەیەتی، ئیحرامیش سێ جۆری هەیە: جیاجیا: (إفراد)، پشوودان: (تەمەتووع) تێکەڵکردن: (قیران). راجیایی لەوەدا نیە کە هەریەکێ لەم سێ شێوەیە رەوایە، بەڵام راجیایی لەوەدا هەیە کە کامەیان خێرترن.

شافیعی {ڕەزای خوای لێبێ} لـە زۆربـەی کتێبەکانیدا بـە دەق فەرموویـەتی کـە حەج و عەمرە بەجیاجیا (إفراد) خێرتـرن، ئنجا جۆری پشوو وەرگـرتن (تەمەتووع) ئنجا تێکەڵکردن (قیران).

**شێوەکاری جیاجیا ئاوایـە:** حـەج بـە تـەنها دابەستیٚ‌و حـەج تـەواو بکا ئەوجا عەمرە دابەستیٚ‌و تـەواوی بکـا، شـێوەکاری پـشوو وەرگـرتنیش ئاوایە: لە میقاتی وڵاتی خۆیەوە عـەمرە دابەسـتیٚ‌و تـەواوی بکـاو ئەوسـا لە مەککەوە ئیحرامی حەج دابەسـتیٚ. ئـەم چۆنێتە یـەکگرتنی لەسـەرە. بۆیـە پێـی دەگـوترێ: پـشوو وەرگـر، چـونکە لـەم پـشوودا ئـەوەی لێـی قەدەغە بووبوو ڕەوا دەبێتەوە بۆی. شێوەکار (صورەت)ی تێکـەڵکردنیش ئاوایە: ئیحرامی حەج‌و عەمرە پێکەوە دابەستیٚ، کردارەکـانی عـەمرە لـە نـاو کردارەکـانی حەجـدا تێهـەڵکێش دەکـرێن. سـەربەڵگەی ئـەم سـێ شێوەیەیش ئـەم فەرموودەیـەی عائیـشەیە {ڕەزای خوای لێبێ} کـە دەفـەرموێ: دەرچووین، جا هـەمان بـوو هـەر ئیحرامـی عـەمرەی دابەسـتبوو، هـەمان بوو ئیحرامی حـەج‌و عـەمرەی بـە یەکـەوە دابـستبوو، هـەمان بـوو بـەس ئیحرامـی حـەجی دابەسـتبوو، پێغەمبـەر خـۆی هـەر ئیحرامـی حـەجی دابەستبوو (ئەحمەدو شەیخان‌و مالیك).

**بنیاتی دووەم:** وەستانی چیای عەرەفەیە، چونکە پێغەمبەری خـوا {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی فەرموو، جارچییەك جاری دەدا: حەج بریتییـە لـە ئامـادەبوونی عەرەفـە واتـە: زوربـەی بنیاتـەکانی حـەج عەرەفەیـە. وەسـتان لـە عەرەفـە بـە ئەوەنـدە دەێتـەجیٚ کـە لـە بەشـیٚ لـە خـاکی عەرەفەدا ئامادە ببیٚ، تەنانـەت بـە ئەوەنـدەیش جێبـەجیٚ دەبیٚ کـە بـە

دوای بەندەیەکی هەڵهاتوودا بگەڕێ‌و لە عورفەوە ڕەتبێ، یا بە دوای هەر شتێکا لەوێوە ڕەتبێ حلێبە، هەتا ئەگەر بە خەوتوییش ئامادەی عەرەفە بێ‌و خەبەریشی نەبێتەوە هەتا کاتەکەی بەسەر دەچێ هەر برێتی دەکەوێ، چونکە لەکاتی خەویشدا تەکلیف لەسەر مرۆڤ دەمێنێ!.

**مەرجی برێتیکەوتنی ڕاوەستان لە خاکی عەرەفەدا ئەوەیە:**

ڕاوەستاوە کە شیاوی پەرستش بێ (واتە: حاجی لەو کاتەدا کە لە عەرەفە ڕادەوەستێ ئەهلی عیبادەت بێ) لە عەرەفە لە هەرشوێنێکا ڕاوەستێ دروستە، چونکە گشتی هەر عەرەفەیە، کاتی ڕاوەستان لە عەرەفاتدا دەست پێدەکا لە نیوەڕۆی ڕۆژی نۆهەمی مانگی قوربانەوە هەتا شەبەقی بەیانی ڕۆژی جەژن، مەرج نیە بەشێ لە ڕۆژو بەشێ لە شەو لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕۆژی نۆهەما گەیشتە عەرەفات سوننەتە لەوێ بمێنێتەوە هەتا شەو دادێ.

**بنیات (ڕوکن)ی سێیەم:** تەوافە، واتە: حەوت جار هەڵسووڕانە بەدەوری تەواوی خانەی خودادا، مەبەست ئەو تەوافەیە کەپێی دەگوترێ تەوافی ئیفاضە، چونکە یەکگرتن هەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست لەم ئایەتە تەوافی ئیفاضەیە: **وليطوفوا بالبيت العتيق**. وە ئەو فەرموودەیەیش کە باسی بێنوێژییەکەی صەفییەی هاوسەری حەزرەت دەکا، ئەوە دەسەلمێنێ کە تەوافی ئیفاضە فەرزە، کەواتە: ئەو تەوافە ڕوکنە، نەك تەوافەکانی تر، وەك تەوافی قودووم‌و تەوافی ویداع، واتە هەڵسووڕانی گەیشتنەجێ‌و هەڵسوڕانی ماڵئاوایی.

## ١٦٢) ئەرکەکانی هەڵسووڕان:

### پێویستییەکانی تەواف:-

پێویستییەکانی تەواف چەند شتێکن: یەکێکیان پاکییە لە بێدەسنوێژیو لە لەشپیسی، وە لەپیسی لەشو بەرگو جێگە.

**یەکێ تریان:** داپۆشینی شەرمگای کاتی نوێژە بە جلێکی پاك، لەکاتی تەوافا، پێغەمبەر{درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: تەوافی بەیتیش بە نوێژ دادەنرێ، تەنیا ئەوەندە هەیە لە تەوافا خودا ڕێگەی قسەکردنی داوە، جا ئەگەر تەوافکەر لەکاتی تەوافا، قسەیکرد با هەر قسەی باش بکاو بەس. عائیشەیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: کە گەیشتمە مەککە بێنوێژبووم، ئیتر نەتەوافی بەیتم کردو نە سەفاو مەڕوەمکرد، وە عەرزی حەزرەتمکرد کە حاڵم وایە، فەرمووی: هەرچی حاجی دەیکا تۆیش بیکە، بەڵام تەواف مەکەو بەگردی بەیتا هەڵمەسووڕێ تا پاك دەبیتەوە لە بێنوێژیو خۆت پاك دەشۆریت. (دانەر دەفەرموێ: ئەم گوفتو گۆیە لە نێوانی ئەسمائی کچی عومەریشو پێغەمبەردا {درودی خوای لەسەربێ}: ڕووی داوە، بەڵام ئەمەی من نووسیومە لە صەحیحەیندا هەیەو پتر جێگەی متمانەیە — وەرگێڕ).

جا ئەگەر لەناو تەوافدا دەسنوێژەکەی شکا، لەسەر فەرمایشتی دروست، پێویستە گورج دەسنوێژ بگرێتەوەو لەسەر ژمارەی پێشووەوە تەوافەکانی تەواو بکا، گوتراویشە: پێویستە سەرلەنوێ لە نووکەوە لە تەوافەکەی تێ هەڵچێتەوە.

**یەکێ تریان:** ڕێزلێگرتنە لەو حەوت جارە کە بەگردی کابەدا دەسووڕێتەوە لەسەر ئەم شێوەیە: لە سەرەتای سووڕانەوەکانەوە هەتا تەواو بوونی هەر حەوتیان هەموو خانووی کەعبە بخاتە لای چەپیەوە، وە لە بەرابەری حەجەرول ئەسوودەوە دەست پێبکا.

**یەکێ تریان:** ئەوەیە لەکاتی هەموو سووڕانەوەکانا هەموو لەشی لە دەرەوەی هەموو کەعبەبێ، جا ئەگەر کەسێ لەسەر ئەو زیادە لادیوارەوە ڕۆیشت، کە لە زەمانی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا دزراوەتەوە لە بناغەی دیواری کەعبە ئەوە تەوافەکەی دانامەزرێ، بەهەر چوار دەوری بناخەی کەعبەدا کوتە دیوارێ هەیە، نووساوە بە کەعبەوە، بەقەد دووسێیەکی باسك (ذراع)ێ لە زەوی بەرزە، دەق دەڵێی گەردانەیە لە گەردنی بناغەی بەیتا بە کوردی پێی دەگوترێ: هەزارە، بە عەرەبی پێی دەگوترێ: شاذەروان، پەراوێزی بەرگی کەعبەی لێچەسپ دەکرێ، ئەم ئەندازەیە لەکاتی خۆیدا کە قوڕیش بەیتیان دروست کردۆتەوە، لە دیواری کەعبەیان دزیوەتەوە، لەبەر دەستکورتی، کەواتە: ئەم کورتە دیوارە خۆی‌و هەوای سەربانەکەی هەتا سەرسەرەوە بەشێکە لە کەعبە، لەبەر ئەوە ئەگەر کەسێ تەواوی لەشی، یا بەشێ لە لەشی، وەك دەستی، یا سەری، لەکاتی تەواف‌و هەڵسووڕانا، لەسەر سەربانی ئەو کورتە دیوارەبێ، ئەوە تەوافەکەی دانامەزرێ، تەنانەت لەکاتی ماچکردنی بەردەرەشەکەو دیواری کەعبەدا، دەبێ هەردوو پێی لە جێگەی خۆیان چەسپ بکاو لە پاش ماچکردنەکە ڕێك لە شوێنەکەی خۆیدا ڕابوەستێتەوە، هەتا سەرو دەستی بکەونەوە دیوی دەرەوەی سەربانی ئەو کورتە دیوارە، ئەوسا هەڵسووڕانەکەی دەست پێ بکاتەوە! هەروا دەبێ

تەواوی لەشی تەوافکەر لە دەرەوەی حیجری ئیسماعیل بێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە دەرەوەی حیجر تەوافی دەکرد.

**یەکێ تریان:** ئەوەیە دەبێ هەموو تەوافەکان لەناو حەوشی مزگەوتەوەبێ، چونکە مزگەوتەکە هەمووی حەرەم‌و بەستە، جا لەهەر کوێیەکیدا بسوورێتەوە دروستە.

**یەکێ تریان:** ژمارەی هەڵسوڕانەکانە، کە مەرجە دەبێ حەوت تەواف بن. لەسەر فەرمایشتی دروست یەك لە شونیەکی (مووالات) فەرز نیە، بەڵکوو سوننەتە. سوننەتە لەناو تەوافەکانا هەر خەریکی یادی خودابێ! عەبدوڵڵای کوڕی سائیب {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ژنەوتم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} لە نێوانی گۆشەی یەمانی‌و حەجەرو لئەسوەدا دەیفەرموو: (**ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار**): خودایە! ئەی پەروەردگاری میهرەبان! هەم لە جیهاناو هەم لە دوارۆژدا چاکمان بۆبکەو بەشی باشمان بدەرێ، وە لە سزای ئاگر بمانپارێزە. (ئەحمەدو ئەبو داوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە، ئیبنو حیببان‌و حاکم بە دروستیان داناوە). ئەبو هورەیرەیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: کەسێ حەوت جار بە دەوری خانەی خودادا هەڵسوڕێ‌و قسەی تر نەکا جگە لەم نزایە، دە خراپە لە خراپەکانی کوێردەکرێتەوەو دە چاکەی بۆ دەنووسرێ‌و دە پایەیش پێی بەرز دەبێتەوە، نزاکەیش ئەمەیە: (**سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة الا بالله**) خودا خودایەکی پاك‌و پیرۆزە، سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودایە، هەر یەزدانی پاك خودای

راستو دروستەو خودای ترنیە خودا لە هەموو کەسێ گەورەترە، دەستەڵاتو هێزیش هەر بە دەستی خودایە. (ئیبنو ماجە). عائیشەیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەڵسووڕانی دەوری خانەی خوداو هاتوچۆ لە ناوەندی صەفاو مەروەداو رەجمی شەیتان، بۆ ئەوە دانراون کە هەمیشە یادکردنی خودای گەورە پایەدار بێ (ئەبو داوودو حاکم).

**بنیاتی چوارەم:** هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروەیە، بەپێی کردنی پێغەمبەر خۆی، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەکاتی هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروەدا بەردەم راگردنەوە فەرمووی: ئەم هاموشۆیە بە هەڕاکردن ئەنجام بدەن، چونکە خودای گەورە ئەم هەڕاکردنەی لە سەرتان نووسیوە، وەکی تریش ئەمە خواپەرستییەکی تایبەتە، لە کاتی حەجو عەمرەدا دەکرێ. مەرجە کە ئەم راگردنە لە دوا تەوافێکی درووستەوەبێ، ئیتر خوا تەوافی ئیفاضەبێ، یا تەوافی هاتن (**طواف القدوم**)بێ، هەروا ریزلێگرتن مەرجە، لەسەر ئەم شێوەیە: لە صەفاوە دەست پێبکا، هەتا دەگاتە مەروە، وە حەوت جار هاتوچۆبکا لە نێوانی صەفاو مەروەدا، رۆیشتنەکەی جارێكو گەڕانەوەکەی جارێك، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئاوای دەکرد، لەم هاتوچۆیەدا پاکیو پۆشینی شەرمگاو مەرجەکانی تری نوێژ مەرج نیە، ئەم هاتوچۆیە بەسواریش دەبێ، بەڵام بە پیادەیی خێرترە، نەکردنی ئەم بنیاتە بەسەربڕینی ئاژەڵ پڕنابێتەوە، بەبێ کردنیشی نابێ ئیحرام بشکێنێ.

**بنیاتی پێنجەم:** تاشینی یا کورتکردنەوەی مووی سەرە، چونکە یەزدانی مەزن دەفەرموێ: {مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ} : چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: رەحمەتی خوا لەو کەسانەبێ کە لەپاش تەواوکردنی حەج و عەمرە سەری خۆیان دەتاشن، یارانیش عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! رەحمەت بکە لەو کەسانەیش کە لە پاشکردنی حەج و عەمرە مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لەو کەسانەیش بێ کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە. (شەیخان) سەرتاشین و کورتکردنەوەی موو هەردوو لایان بۆ پیاوو ژن دروستن، بەلام بۆ پیاو سەرتاشین و بۆ ژن کورتکردنەوە باشترە، لای کەمی کورتکردنەوە بۆ پیاوو ژن هەڵپاچینی سێ مووە، کاتێ موو هەڵپاچین بۆ حاجی لە پاش بەرد فڕەدانە بۆ کۆگابەردی جەمرەتولعەقەبە، وە بۆ عەمرەکەرو حاجی پشوو وەرگر لەپاش هەڕاکردنی نێوانی صەفاو مەروەیە، بۆ کەسێکیش ئاژەڵی دیاری بەیتی پێ بێ لەپاش سەربڕینی ئەو دیارییەیە لە مینا، بۆ حاجی، وە لە مەروە بۆ عەمرەکەر، بەلام ئەوەیشمان لەیادبێ کە کاتی سەربڕینی دیاری بەیت، کاتی سەربڕینی قوربانیە، کە بڕتییە لە چوار رۆژەکەی جەژن. ئەو کەسەیش کە سەری مووی پێوە نەبێ هەر سوننەتە جەقۆ بهێنێ بەسر سەریا.

## ١٦٣) پێویستییەکانی حەج - ئەرکەکانی حەج:

لە پێشەوە گوتمان بنیاتەکانی حەج پێنجن‌و قسەمان لێکردن ئێستا ئەرکەکان (واجبات)ی حەج روون دەکەینەوە، جیایی نێوانی بنیات‌و ئەرك ئەوەیە: حەج بەبێ کردنی بنیاتەکانی دانامەزرێ، ئەگەر هەرکامێ لەو بنیاتانە فەوتان حەجەکە پووچ دەبێتەوە، بە سەربڕینی ئاژەڵ تۆڵەی ناکرێتەوە، بەلام حەج بەبێ کردنی ئەرکەکانیشی دادەمەزرێ، ئەگەر ئەرکێکی فەوتا بەسەربڕینی ئاژەڵێ تۆڵەی بۆ دەکرێتەوە.

**پێویستی یەکەم:-**

### ئیحرام دابەستنە. پێویستییەکانی ئیحرام دابەستن سێ شتن:

**یەکەم:** ئیحرام بەستنە لەکات‌و شوێنی دیاریکراوەوە بۆ ئیحرام دابەستن. جا ئەگەر لە نیشانگای ئیحرام بەبێ ئیحرام دابەستن تێپەڕ بوو، ئەگەر دەستی نەکردبوو بە کردارەکانی حەج‌و عەمرە، ئەوە لەسەریەتی کە بگەڕێتەوە بۆ نیشانگاکەو لەوێ ئیحرام دابەستێ، هەتا ئەگەر لە پاش تێپەڕبوون لە نیشانگا (میقات مکانی) ئیحرامی دابەستبوو، مادەم دەستی نەکردووە بە کردارەکان، بەس ئەوەندەی لەسەرە کە بگەڕێتەوە بۆ نیشانگاو لەوێ ئیحرام دابەستێ، بەلام ئەگەر نەگەڕایەوە، یا پاش ئەوە گەڕایەوە کە بەو ئیحرام دابەستنە ناتەواوە دەستی کردبوو بە کردارەکان، ئەوە خوێنێکی لەسەرە، واتە: لە کەفارەتی ئەم سەرپێچییەدا دەبێ ئاژەڵێ سەرببڕێ بۆ هەژارانی مەککە، تەنانەت ئەگەر لە بیریشی نەبووبێ یا بە هەڵە لە نیشانگا تێپەڕبووبێ هەروایە،

ئەوەنـدە هەیـە لـەم دووکاتـەدا گونـاهی لەسـەرنییە. چاکتر وایـە لـە سـەرەتای نیـشانەگاوە ئیحـرام دابەسـتیٚ، هـەتا مـاوەی ڕێگەکـە بـە ئیحرامەوە ببڕیٚ، بەڵام بۆ نیشانگای ذولحولەیفە واباشـە لـەو مزگەوتـەوە ئیحـرام دابەسـتیٚ کـە پێغەمبـەر {دروودی خـوای لەسـەربیٚ}: ئیحرامـی لێـوە دابەستووە.

بزانن کە نیشانگا دوو جۆرە: کاتو شوێن، کاتی ئیحرامدابەستن بۆ حەج مانگی شەشەڵانو ناوجەژنانو دەشەوی یەکەمی مانگی قوربانە، دواشەوی شەوی جەژنە، لەسەر فەرمایشتی دروست، بەپێی ئایەتی: {الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ – سورة البقرة – ١٩٧/٢}. واتە: کاتی خەریکبوون بە کردەوەکانی حەجەوە چەند مانگێکی ئاشکراو دیاریکراون، وە بەپێی ئایەتی: {يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ – سورة البقرة – ١٨٩/٢} ئەمە کاتی دابەستنی حەج بوو، وە بە درێژایی ساڵ ئیحرام بۆ عەمرە دادەبەستریٚ، چونکە زاناکان یەك ڕان لەسەر ئەوە کە عەمرە هەموو کاتیٚ دروستە، لە بارەی نیشانگای شوێنیشەوە ئاوایە: ئەوەی نیشتەجێی مەککەیە – ئیتر چ خەڵکی مەککەبیٚ، چ خەڵکی شوێنێکی تربیٚ – ناوشاری مەککەیە، گوتراویشە: مەککەو هەموو بەستی مەککە نیشانگایە بۆ ئیحرام دابەستن، واتە: نیشتەجێی مەککە لە ماڵی خۆیەوە ئیحرام دادەبەستیٚ. بۆ ئەوەیشی کە نیشتەجێی مەککە نەبیٚ، سەرنج دەدەین: ئەگەر ماڵەکەی دەکەوتە نێوان مەککەو نیشانگای ئیحرام دابەستنەوە ئەوە لە دەرگای ماڵی خۆیەوە ئیحرام دابەستیٚ، خواه گوندنشینبیٚ، یا

کۆچــبەری بــێو هــەوار نــشینبێ، ئەگــەر ماڵەکــەی دوورتربــوو لــە نیشانگاکان، ئەوە نیشانگاکەی یەکێکە لەم پێنج شوێنە:

**یەکــەم:** بــۆ ئــەو کەســەی کــە لــە مەدینــەی نــازدارەوە هاتبــێ ذولحولەیفەیە، کە ئێستا ناودارە بەبیری عەلی، کە دو قۆناخ لە مەککەوە دوورە.

**دووەم:** بــۆ ئــەو کەســەی لــە شــامو میــصرو مەغریبــەوە هاتبــێ جوحفەیە.

**سێیەم:** بۆ ئەو کەسەی لە تیهامەی یەمەنەوە هاتبێ یەلەلەمە.

**چوارەم:** بۆ ئەوەی لە نەجدی یەمـەنو نەجدی حیجازەوە هاتبێ قەرنە. ئەم چوارەیان پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ) لە فەرمووده‌یـەکا دەســت نیــشانی کــردوونو بــە دەق نــاوی هێنــاون، لــە کۆتــایی ئــەو فەرمووده‌یەدا دەفەرموێ: ئەم شوێنانە جێگەی ئیحرام دابەستنن بۆ ئەو کەسانەی کە دێن بۆ حەجو عەمرە، لە خەڵکی ئەم وڵاتانەو لە خەڵکی وڵاتانی تریش کە بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەجو عەمرە، وە کەسێ لەم شوێنانە نزیکتربوو ئەوە جێگەی ئیحرام دابەستنی لەو شوێنەوەیە کە دەکەوێتەڕێ! تەنانەت خەڵکی مەککە لە مەککەوە ئیحرام دابەستن.

**پێنجــەم:** وە بــۆ ئــەوەی لــە خۆرهەڵاتــەوە هاتبــێ، وەك عێــراقو خۆراســان زاتوعیرقــە. لــە فەرمووده‌یــەکا دەفــەرموێ: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خوای لەسەربێ) زاتــورعیرقی دیاری کــردووە بــۆ جێگــە ئیحــرام بەســتنی خەڵکی عێراق. (ئەحمـەد/د/ن - سند صحیح). گوتراویـشە: عومـەر بـە تێکۆشان واتە: بە اجتهاد ذاتوعیرقی بۆ خەڵکی عێراقو خۆراسـان دیاری

کردووه. جا وەك گوترا هەرکەسێ ویستی بچێ بۆ حەج و عەمرە، وە ئیحرامی دانەبەست هەتا لە نیشانگا رەتبوو، وەبەو ئیحرامە ناتەواوە کردارێ لە کردارەکانی حەج یا عەمرەی کرد، خوا ئەو کردارە فەرزبێ یا سوننەت، ئەوە خوێنێکی دەکەوێتە سەر، کە برێتییە لە کاوڕێکی یەك ساڵە، یا لە چتیر بزنێکی دووساڵە. چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ کرداری لە کردارەکانی حەج و عەمرە نەکا خوێنێکی لەسەرە. (ئیبنو عەبباس بە مەرفووعیو بە مەوقوفی گێڕاویەتەوە).

**پێویستی دووەم:**

رەجمکردنی شەیتانە لەسەر ئەم شێوەیە: لە رۆژی یەکەمی جەژندا حەوت بەرد فڕێ دەدەن بۆ کۆگا بەردی جەمرەتولعەقەبە، لە رۆژی دووەمو سێیەمو چوارەمی جەژنا (کە ناوداران بەسێ رۆژەی ئەییاموتەشریق) بەرد فڕێ بدەن بۆ سەر هەرسێ کۆمەڵە بەردەکە، بۆسەر هەر یەکێکیان حەوت بەرد، جا ئەگەر کەسێ لە رۆژی دووەما رەجمی شەیتانی کردو ویستی لە خاکی مینا دەرچێ لە پێش خۆرئاوابوونا ئەوە دروستەو مانەوەی شەوی سێیەمی لە خاکی مینادا لە کۆڵ دەکەوێ، هەروا رەجمکردنی رۆژەکەیشی.

بزانن ژمارەی بەردی هەموو رۆژێ لەم سێ رۆژە بیستو یەك بەردە، مەرجە بەریز بەردەکان فڕێ بدا لەسەر ئەم شێوەیە: ئیبنو عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەیفەرموو: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە رەجمی شەیتانی دەکرد لەسەر ئەم شێوەیە دەیکرد: یەکەمجار حەوت بەردی

فـرێ دەدا بـۆ کۆگـا بەردەکـەی ئـەولای مزگەوتەکـەی میـنـاوە، لـەپاش هەڵدانی هەموو بەردێ ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، دەیفەرموو: (**الله أكبر، الله أكـبر، لا الــه الا الله والله أكـبر، الله أكـبر، ولله الحمــد**) ئینجـا دەچـــووە پێـــشەوەو بـــەرەو رووگـــە رادەوەســـتاو هـــەردوو دەســـتی بـەرزدەکردەوەو دەسـتی دەکـرد بـە نزاکـردن‌و بـەپێوە زۆر دەپاڕایـەوە لەوێدا، ئینجا دەڕۆیشت بـۆ کۆگابـەردی دووەم، کـە نـاوداره بـە کۆمـەڵـەی ناوەڕاست (واتـە: جـەمرەتول وسـطا) وە حـەوت بـەردی فـڕەدەدا بـۆ ئـەو میلەیش‌و لەپاش تێگرتنی هەموو بەردێ ئەڵڵاهوئەکبـەری دەکـرد، ئنجا بـەلای چـەپا لـەلای شـیوەکەوە دادەپـەڕی‌و بـەرەو رووگـە رادەوەسـتاو هـەردوو دەسـتی بـەرز ەکـردەوەو دەسـتی دەکـرد بـە پاڕانـەوە، ئینجـا دەڕۆیشت بۆ کۆگابەردەکەی لای عەقەبـەوە حـەوت بـەردی فـڕێ دەدا بـۆ ئەم میلەیش، وە لەپاش تێگرتـنـی هەربـەردێ ئـەڵڵاهو ئەکبـەری دەکـرد، ئیتر دەگەڕایەوەو لەوێ نەدەوەستا. (بوخاری/ ئەبوداوود).

دەبێ شێوەی هاویـشتنەکەی بـە جـۆرێ بـێ پێـی بگـوترێ فڕێـدان، ئەگـەر بەردەکـەی هـەلگرت‌و داینـا لـەی‌ناو کۆگـا بەردەکـەدا، لەسـەر فەرمایـشتی دروسـت ئـەوە حـسێب نیـە، چـونکە بـەوە نـاگوترێ تێگـرتن، مەرجە مەبەستی لە تێگرتنەکەی فڕەدانبێ بۆ کۆگابەردەکـە، جـا ئەگـەر بەردێکی هەڵدا بەحەواداو کەوتە ناومیلەکەوە ئەوە حلێب نیـە، مەرجـە کە بەدەستی تێی بکرێ، ئەگەر بەقاچ تێیگرت، یا بەکەوان، یـا بـە بـەردە لاستێك حلێـب نیـە، مەرجـە ئـەو حـەوت بـەردە کـە فـڕێ دەدرێتـە سـەر کۆگابەردەکان یەکەیەکە فڕێ بررێت، وە نابـێ لـە جیـاتی شـتی تـر فـڕێ بـدرێ، ئەگـەر دوو بـەردی بـە یـەکجار تێگـرت وە هـەردوو بەردەکـەیش

کەوتنە ناکۆگاکەوە ئەوە بە یەك بەرد دادەنرێ، هەروا ئەگەر حەوت بەردیش بە جارێ تێبگرێ، ئەگەر لەبەر نەخۆشی یا لە بەرشتێ تر نەیتوانی خۆی ڕەجم بکا، بۆی هەیە کە یەکێ بکا بە وەکیل، مەرجە کە جێگرەکە بەردی خۆی فڕەدابێ، ئەوسا بەردی موکلکەی فڕە بدا دەنا دروست نیە.

**پێویستی سێیەم:**

مانەوەی شەوە لە موزدەلیفە.

**پێویستی چوارەم:**

مانەوەی شەوەکانی پاش جەژنە لە میتادا.

**پێویستی پێنجەم:**

خۆپاراستنە لەو شتانە کە بەهۆی ئیحرامەوە حەرام دەبن لەسەر حاجی (لە ئەصڵەکەدا دەفەرموێ: سێیەم سەرتاشین یا کورت کردنەوەیە، چوارەم و پێنجەمیش باس نەکرابوو، من لەبەر ڕوونیو ئاسانی ئاوام نووسی، وە لە شەریعەتی ئیسلامی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریسەوە نەقڵمکردن – وەرگێڕ).

## ١٦٤) حەجی ژن:

حەج لەسەر ژنیش وەك پیاو فەرزە، بەلام سەرەرای مەرجە پێشینەکان مەرجە کە ژن مێردی، یا کەسێکی خۆیی لە گەلابێ، یاخود کۆمەڵە ژنێکی باوەڕپێکراوبن، با خۆیی (مەحرەم) یشیان لەگەڵ نەبێ، کۆگر (ضابطە)ی خۆیی ئەوەیە: بە هیچ جۆرێ هەتا هەتایە مارەی لێی

نەبێ، بەهۆی رشتەی خزمایەتی یا ژن‌و ژنخوازای یا شیروخواردنەوە.
ئیبنو عەبباس {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: هیچ ژن‌و پیاوێکی بیانی دوو بە دوو بەبێ خۆیی ژنەکە لەگەڵ یەکا کۆنەبنەوە، ژنیش لەگەڵ خۆییدا نەبێ نەچێ بۆ سەفەر، پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ژنەکەم دەچێ بۆ حەج‌و خۆیشم ناونووس کراوم بۆ ئەو غەزایە؟ فەرمووی: دەخۆیشت برۆ لەگەڵ ژنەکەتا حەج بکە. (بوخاری/ موسلیم)
یەحیای کوڕی عباد دەفەرموێ: ژنێکی خەڵکی رەی کاغەزێکی نووسی بۆ ئیبراهیمی نەخەعی، لێی پرسی: من هێشتا حەجی فەرزم نەکردووە، کە یەکەم حەجەو پێی دەڵێن: حەجی ئیسلام وە دەوڵەمەندیشم، خزمی خۆییشم نیە کە لەگەڵما بێ بۆ حەج؟ یەحیا وەڵامی بۆ نووسییەوە: تۆ مەهانەی رەوات هەیە لەبەر ئەوە حەجت لەسەر نیە.

## ١٦٥) سوننەتەکانی حەج:

**یەکەم**: کردنی حەج بەحجیا، چۆنێتی ئەم جۆرە لە حەج لە پێشەوە رابوورد.

**دووەم**: لەببەیکە کردنە، بەم شێوەیە: (**لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك. ان الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك**).
سوننەتە لەگەڵ نێتەکەیدا لە ببەیکە بکا، چونکە پاشینان وایان نەقڵ کردووە لە پێشینان، سوننەتە لەپاش ئیحرام دابەستن زۆر خەریکی لەببەیکەکردن بێ، بە تایبەتی لەکاتی گۆڕانی وەزعدا، وەك سواربوون‌و دابەزین‌و سەرکەوتن بۆ شوێنی بەرزو داپەڕین لە شوێنی بەرزەوەو

تێکەڵبوون لەگەڵ کۆمەڵدا، لەکاتی داهاتنی شەوو هاتنی رۆژدا، لەکاتی بێنوێژیی‌و لەشپیسی‌و زەیستانیشدا لەببەیکە زۆرکردن سوننەتە، هەروا لە مزگەوتی ئەلخیفداو لە مەسجیدولحەرامدا، بەلاّم لەکاتی تەوافی قودوم‌و لە تەوافی سەفاو مەروەدا تەلبییەکردن سوننەت نیە، چونکە ئەمانە ویردی تایبەتی خۆیان هەیە، هەروا لە تەوافی ئیفاضەو تەوافی ماڵئاواییدا لەببەیکە نەکات، چونکە کاتی بەسەرچووە، چونکە کاتی لەببەیکەکردن لەگەڵ رجمکردنی شەیتان لە جەمرەتولعەقەبە بەسەردەچێ. سوننەتە بۆ پیاو نەك بۆ ژن دەنگ لە لەببەیکەکردن هەڵبڕێ، سوننەتە کە لەببەیکەی تەواوکرد سەلاّوات لەسەر پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} بدا، وە داوای بەهەشت‌و رەزامەندی خودا بکا، وە پەنابگرێ بەخودا لەئاگری دۆزەخ! ئەوجا بە ئارەزووی خۆی نزابکا، لەکاتی تەلبییەدا باقسە نەکا، سلاّوکردن لێی لەوکاتەدا ناباشە، بەلاّم ئەگەر کەسێ سلاّوی لێکرد وەلاّمی دەداتەوە.

**سێیەم**: تەوافی هاتن، کەناودارە بە تەوافی قدووم، چونکە ئەم تەوافە دیاری (تحیە)ی بەیتولحەرامە. لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {درووده خوای لەسەربێ} کە تەشریفی گەیشتە مەککە تەوافی بەیتی کرد.

بەلاّم ئەگەر عەمرەکەر تەوافی عەمرەیکرد، بری تەوافی هاتن دەکەوێ، هەر وەك چۆن کردنی نوێژی فەرز بریتیی نوێژی دیاری مزگەوت دەکەوێ.

**چوارەم**: شەومانەوە لە موزدەلیفە، بەوە دەیّتەجێ کە زوربەی شەو لەوێ بێ، رافیعی وا دەفەرموێ: گوتراویشە: دێتەجێ بەیەك چاوترووکان لە پاش نیوەشەو، نەوەویش (رەحمەتی خوای لێبێ) ئەمە بە لەبارتر دەزانێ.

**پێنجەم**: دوو رکات سوننەتی تەوافی فەرزە، هەندێ دەفەرموون ئەم دوو رکاتە فەرزە، بەڵام قسەی دروست ئەوەیە کە سوننەتەو فەرز نیە، چونکە لە فەرموودەیەکی شەیخەیندا دەفەرموێ: پیاوێ لە بارەی ئیسلامەوە پرسیاری هەبوو، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لە شەوو رۆژێکا دەبێ پێنج نوێژ بکەی، پیاوەکە گوتی: باشە نوێژی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەء، نوێژی ترت لەسەر نیە، مەگەر بە ئارەزووی خۆت نوێژی سوننەت بکەی[1].

---

[1] لێرەدا دانەر دەفەرموێ: خامسها: (رکعتا الطواف (أی طواف الفرض) لقوله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (خمس صلوات في اليوم والليلة) تا کۆتایی فەرموودەکە. دیارە کە ئەمە ئیختصارێکی زۆر موخیللە بۆ ئەم عیبارەتەی کیفایە کە، کە دەفەرموێ: (ورکعتا الطواف.. واختلف في رکعتی الطواف.. فقیل بوجوبهما والصحیح عدم وجوبهما لقوله علیه الصلاة والسلام: (خمس صلوات.. الخ)، جا لەبەر ئەوە ناچار بووم کە راستی بکەمەوە. لە راستیدا من بەش بە حاڵی خۆم ئەگەر شارەزاییەکی باشم نەبوایە لە حەدیسدا، وە ئەصڵی حەدیس و مەسەلەکەم لەسەر چاوەکاندا نەدۆزیایەتەوە لەم تەرجەمەدا تووشی هەڵەی گەورە گەورە دەبووم، چونکە بە راستی ایجازی مخلّی زۆر تیادایە، ئەو رەشە خەڵکە لە کوێ لەم هەمکە مەتەڵ و برووسکەو هێماو رەمزو ئاماژەیە تێدەگا.. ئەگەر کەسێکی بە ویژدان ئەصڵەکەو تەرجەمەکە بەرابەر بکا، ئەوسا بۆی دەردەکەوێ کە زۆر شوێن لە ئەصڵەکە وەك هەواڵەکردن و مەتەڵ داهێنان وایە. فەرموو

**شەشەم:** شەو مانەوە لە خاکی مینا لە ڕۆژی جەژن‌و سێ ڕۆژەکانی دوای جەژندا. بەوە دێتەجێ کە زوربەی شەوەکان لەوێبێ.

**حەوتەم:** تەوافی ماڵئاوایی، کە برێتییە لە دواشت کە حاجی دەیکا، دەگێڕنەوە: عومەر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: دواهەمین کردارەکان تەوافی بەیتە (مالیك لە مووەطادا دەیگێڕێتەوە).

## ١٦٦ خۆ ڕووتکردنەوە لە جل‌و بەرگی دووراو:

ڕاجیایی هەیە لە نێوانی زاناکاندا کە ئایا خۆ ڕووتکردنەوەی پیاو لە جل‌و بەرگی دووراو، سوننەتە یا پێویستە، هەندێ دەفەرموون: فەرزە، ئەمە بڕیاری ڕافیعی‌و نەوەوییە، کەسانی تر هەن دەفەرموون: سوننەتە، ئیسنائی دەفەرموێ: ئەم ڕایە بەجێیە.. جا کاتێ خۆی ڕووتکردەوە سوننەتە دوو پارچە بەرگی سپی تایبەتی (ئیزارو ریداء) بپێچێ بە خۆیەوە، جووتێ سۆلیش لەپێ بکا، ئیبنولونذیر دەفەرموێ: چەسپیوە کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کە ئیحرام دادەبەستن بەشتە ماڵێکی سپی‌و بەرکۆشێکی

---

چی لەم عیبارەتە تێ دەگەی: (الواجب الثاني: رمي الجمار الثلاث ثلاث مرات أيام التشريق الثلاثة غير جمرة العقبة فانها ترمى اليها سبع حصيات فقط!!) کە ئەمە جۆرە تەحریفێکە بۆ کیفایەکە. دەفەرموو، تەرجەمەکەی لە زنجیرە (١٦٢)دا بخوێنەوە، هەتا ڕاست‌و دروستی ئەم ڕوونکردنەوەیەت بۆ ڕوون ببێتەوە.

- وەرگێڕ -

سپی بپۆشن لەگەڵ جووتێ شۆڵدا. لە بوخاری شەریفیشدا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} کە ئیحرامی دەبەست، ئیزارو ریدائێکی دەپۆشی، هەروا هاورێکانیشی. (موسلیم) بەرگی سپیش بۆ ئیحرام بەپێی ئەم فەرموودەیە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (البسوا من ثیابکم البیاض.. الحدیث)، تەرجەمەکەی لە زنجیرە (١٠٣)دا رابورد. بۆ ئیحرامدار جلی رەنگکراو ناپەسەندە، وە سوننەتە لە پێش ئیحرام دابەستندا دوو رکات نوێژی سوننەت بکا، بە نیازی سوننەتی پێش ئیحرام، لە رکاتی یەکەمدا {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}ە بخوێنێو لە دووەما {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} هەتا ئەگەر لەمکاتەدا نوێژی فەرز بکا برێتیی ئەم سوننەتە دەکەوێ.

## ١٦٧) ئەو شتانەی نادروستن بۆ ئەو کەسەی لە ئیحرامدابێ:

### ئەو شتانە کە نادروستن لەسەر مرۆڤ لە ئیحرامدادە شتن:

**یەکەم**: لەبەرکردنی جلی دووراو.

**دووەم**: ئەوە کە پیاو هەموو سەری، یا هەندێکی داپۆشێ.

**سێیەم**: ئەوەیە کە ئافرەت رووی خۆی داپۆشێ. جا کاتێ پیاو ئیحرامی بەست ئیتر نابێ، زیاد لە بەرگی ئیحرام شتی تر لەبەر بکا، خوا دووراو بێ وەك کراسو دەرپێو کەواو شتی وا، یا چنراوبێ وەك فانیلە، یا هۆنراوبێ وەك کراسی زریە، وە نابێ سەری بە کڵاوو مێزەرو

شتی وا داپۆشێ، بەڵکوو دەبێ قەناعەت بکا بە تەنها ئەو دوو خاولییە گەورەیە.لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: ئیبنو عومەر {ڕەزای خوایان لێبێ} فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بەرگی ئیحرام چییە بۆ کەسێ لە ئیحرامدا بێ؟ فەرمووی: مێزەرو کراسو دەرپێو خوف لەبەر نەکا، ئەگەر کەسێ جووتێ سۆڵ (وای) دەست نەکەوت ( کە هەموو پەنجەکانی بە دەرەوە بێ) ئەوا با جووتێ خوف (لە خوار قاپەڕەقەڵەیەوە ببڕێتەوە) ئەوجا لە پێیان بکا، وە هەر بەرگێ زەعفەرانو وەرسی پێوەبێ لەبەری مەکەن.

**دەڵێن**: ئەگەر کەسێ سۆلی دەست نەکەوت دروستە جووتێ خوف لەپێبکا، وە نەیشی بڕێتەوە قەیناکا، بەڵام واباشە بیکات بە سەرپێوە، گوایە فەرموودەکەی بڕینەوەی خوف لە قاپەڕەقەڵەدا، بەم فەرموودەیە هەڵوەشاوەتەوە کە دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی کەسێ جووتێ سۆلی دەست نەکەوت ئەوا جووتێ خوف لەپێ بکا، وە کەسێ پەشتەماڵ (إزار)ی دەست نەکەوت، با دەرپێ لەپێ بکا. (شەیخان. واتە: شێخی بوخاریو شێخی موسلیم گێڕاویانەتەوە).

ئەو بڕیارەیش کە دەفەرموێ نابێ ئیحرامدار سەری داپۆشێ بە پێی ئەم فەرموودەیە: پیاوەکەی کە لە ئیحراما لە وشترەکەی کەوتە خوارەوەو ئەمری خودای کرد، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: سەری دامەپۆشن بە چمکی کفنەکە، با سەری بەدەرەوە بێ، چونکە ئەمە کە لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەبێتەوە، لەسەر ئەم حاڵەی ئێستای بە بەرگی ئیحرامەوە زیندوو دەبێتەوە! (شەیخان) دروستە بە تاڵێ بەن،

یا به بەندەخۆێنێ بەکۆش (ئیزار)ەکەی قایم بکا بە قەدیەوە، یا پشتێنێکی بەسەردا ببەستێ، یا سەرێکی ببەستێ بە خاولییەکەی ناوشانیەوە، بەلام دروست نیە بییان دووری بەیەکەوە، هەروا دروست نیە چمکێکی خاولییەکەم ناوشانی ببەستێ بە چمکێکی تریەوەو کرێی بدا، یا بییان دوری بە یەکەوە، یا بە تالێ بیان بەستێ بە یەکەوە، دروستیشە ئیحرامدار شمشێر بکاتە ملیو کەمەربەندی پارەکەی ببەستێتە پشتی. ئەمە بۆ پیاو بوو، بەلام ژن بەس روخساری نابێ داپۆشێ، چونکە روخساری ژن لەم بارەیەوە لە حوکمی سەری پیاودایە، داپۆشینی دروست نیە، بەلام دەبێ سەریو باقی لەشی بە جلو بەرگ داپۆشێ، بەهی دووراویش دروستە، وەلێ ئەوەندە هەیە ژن بۆی هەیە پەچە بگرێتەوە، یا بە رووپۆشێ رووی خۆی بپۆشێ، بە مەرجێ ئەو پەچەو رووپۆشە نەکەوێ لە روخساری، ئیتر لەبەر پێویستی وا بکا، یا بە ئارەزوو، یا لەبەر گەرماو سەرما، یا لەترسی ئاژاوەو روانینی نارەواو شتی وا ئەوە چون یەکە.

**چوارەم**: شانەکردنی مووی سەروریشو هەموو موویەکی تر نادروستە، چ بۆ ژن، چ بۆ پیاو، تەنانەت ئەگەر دەیزانی بە خوران بە نینۆك مووەکان هەڵ دەوەرێن ئەوەیش دروست نیە، چونکە لەکاتی ئالۆسکانو پەستان بەسەریەکا شتی وا روودەدا، هەروا چەورکردنی مووی ریشو سەرو سمێڵو ئەندامانی تری لە بۆ پیاوو ژن نادروستە.

**پێنجەم**: لابردنی مووی لەشو جەستەیە ئیتر بە تاشین بێ، یا بە هەلکەندنو هەلکێشان بێ، یا بەکوتکردنەوە بێ، یا بەهەلکورووزان بێ، یا بەرووتانەوەبێ بەهۆی دەرمانی حەمامەوە، ئەمانە هەمووی چون

یەکەو حەرامە، سەرتاشین بەدەقی ئایەتی قورئان حەرامە کە دەفەرموێ: {وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ - سورة البقرة - ١٩٦/٢}.

**شەشەم**: لابرنی نینۆکیش وەك لابردنی موو نادروستە، ئیتر بەرهەرشتێ نینوکی بکا نادروستە، یا بەددانیش بیقرتێنی، یا بەدەست بیشکێنێ، چونکە زاناکان بەیەك دەنگ بڕیاریان داوە کە ئەوە نادروستە.

**حەوتەم**: بەکارهێنانی بۆنی خۆش بۆجل‌و بەرگ‌و لەش نادروستە، چونکە ئەوە کەیف‌و سەفایە، حاجیش دەبێ سەرگەرمی کارەکانی حەجبێ‌و بەهۆی ئەوەوە قژئالۆسکاوی تەپ‌و تۆزاوی بێ‌و، سەرقژنەو بۆرەکەڵ بێ، وەك لە فەرموودەدا وا دەفەرموێ. لەبەر ئەوەیش کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم بۆنی خۆشەی کەواپێتەوە سێ جار بیشۆ، مەبەست ئەوەیە ئەوەی بۆنە خۆش بێ - وەك گوڵ‌و رێحانەو یاسەمین‌و وەنەوشە - نابێ نەبیدا لە خۆی‌و نەبیدا لە دەمووچاوی. بەڵام ئەگەر پارچەیێ میسکی هەڵگرت، یا هەر بۆنێکی تری لەکیسەو شووشەو پریاسکەی بەستراوەدا هەڵگرت ئەوە نادروست نیە، خوا بۆنی بکا یا بۆنی نەکا. ئەمە شافیعی بە دەق فەرموویەتی.

**هەشتەم**: راوکردن‌و کوشتنی نێچیر. مەبەست لە نێچیرە هەموو گیاندارێکی دەرەکی وایە کە گۆشتی بخورێ، ئیتر خوا ماڵی بووبێ یا کێوی بێ، خوا چوارپێ بێ یاخود مەل‌و باڵنەدەبێ، چونکە هەردوولایان پێیان دەگوترێ نێچیر. سەر بەڵگەی نادروستیی راوی نێچیر ئەم

ئایەتەیە: {وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا – سورة المائدة – ٥/٩٦} واتە: راوی نێچری وشکانی لە ئێوە حەرامە، کاتێ لە ئیحرامدابن.

گیانداری کە گۆشتی نەخوری بە نێچیر دانانرێ، لەبەر ئەوە راوو کوشتنی نادرست نیەو تۆڵە لەسەر بکوژیان نیە، بەڵکوو ئەم چەشنە هەیانە کوشتنی بۆ ئیحرامدارو بێ ئیحرام سوننەتە، چونکە ئازاردەرو وەزەنکەرن، بەڵکوو ئیمامی رافیعی {رەزای خوای لێبێ} لەسەر باسی خواردەمەنییەکانا دەفەرموێ: دڕندەو جانەوەری زیانە خورۆ پێویستە بکوژرێن، وەك مارو دووپشكو مشكو سەگی نهێنگرو سەگی هارو قەڵەڕەشەو گورگو شێرو پڵنگو ورچو سیسارکەو هەڵۆو کێچو مێشوولەو زەردەواڵەو زەردەزیرە.

**نۆیەم**: ژن بەشوودانو ژن مارەبڕینە، هەروا سەرجێیی و دروستبوونو دسبازی بە شەهوەتەوە. ئیحرامدار دروست نیە بۆی کە ژن بۆ خۆی مارە ببڕێ، یا ژن لە کەسێکی تر مارە ببڕێ، خوا بە سیفەتی جێکاریی (وەکالەت)بێ، یاخود بە سیفەتی هەقداری (ویلایەت)بێ. چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئیحرامدار نەژن لە خۆی مارەدەکا، نەژنیش لە کەسێ تر مارەدەکا لە گێڕانەوەیەکا: نابێ خوازبێنیش بکا. (موسلیم) لە گێڕانەوەی دارە قوطنیدا: ئیحرامدار نە ژن دێنێو نە ژن لەکەسێ مارە دەکا. جا گریمان ئەگەر ستی وای کرد ئەوە گرێدان (عەقد – مارەبڕین)ەکە پووچە، چونکە ئەم جۆرە نەیکردنە نادروستیو تێکچوون دەخوازێ، ئەم بڕیارە یەکگرتنی

هاوڕێیانی پێغەمبەری لەسەرە. خوای گەورە لە بارەی جووتبوونەوە لەگەڵ ژندا دەفەرموێ: {الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ – سورة البقرة – ١٩٧/٢} واتە: کاتی خەریکبوون بە کردەوەکانی حەجەوە چەن مانگێکی ئاشکراو دیاری کراون، جا هەرکاتێ خەریك بوون بە ئادابی حەجەوە، لەکاتی حەجدابەستنەوە ئیتر نابێ بچنە لای حەلاڵی خۆتان، وە نابێ دەرچن لە یاسای ئایینو نابێ کاری بەدبکەن، بەهیچ جۆرێ نابێ دەرچن لە یاسای دامەزراوی حەج، هەروەك جووتبوونو کەیفکردن لەگەڵ ژندا نادروستە خۆرەحەتکردنیش نادروستە، چونکە لە شوێنێ بۆنی خۆشو ژن مارەکردن، کە هۆکارن لە بۆ جووتبوون، نادروست بن، دیارە کە جووتبوونو شتی وا نادروستترن، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا تێکەڵی ژنو پیاوو کەیفکردنیان پێکەوە لەکاتی خەڵوەکێشان – واتە: اعتكافدا - کە لەحەج بچووکترە، نادروستە، کەواتە چۆن لەکاتی حەجدا دروست دەبێ، بەڵکوو لەم کاتەدا پتر نادروست دەبێ.

## ١٦٨) تۆڵە (فیدیە) پێویستە لەسەر کەسێ ئەمانە بکا:

ئەم شتانە کەباسمانکردن، هەموو نادروستن، کەسێ بیانکات، تۆڵەی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئەمە باسێکی دوورو درێژە، لقو پۆپی زۆری لێ دەبێتەوە، ئێمە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەم چەند شتە دەکەین: لەکاتی دسبازیو ماچو مۆچا کاتێ تۆڵەی دەکەوێتە سەر کە ئاوی

بێتــەوە. ژن مــارەکردنیش تۆڵــەی نیــە، چــونکە کارەکــە دانامــەزرێو مەبەستەکە نایەتە جێ، جووتبوونیش، چ بەپێش بێ، چ بەپاش بێ چ لەگەڵ ئادەمیزادا بێ، چ لەگەڵ گیانلەبەری تردا بێ، حەجو عەمرە هەڵ دەوەشێنێتەوە، ئاشکرایە کە عەمرەیەك ئیحرام شکاندنی هەیە، ئەوەندە هەیە هەر چەند عەمرەو حەجەکەی بەتاڵ دەبنەوە، بەڵام دەبێ تەواویان بکا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ – بر: ز – ١٥٨} = راڤەی ئەم ئایەتە لە زنجیرەی (١٥٨)دا رابورد.

هەروەها پێویستە لەساڵی دواییدا بەبێ تەفرە قەزای ئەو حەجو عەمرەیە بکاتەوە، ئیتر حەجەکە فەرزبێ سا سوننەتبێ قەزا کردنەوەکەی چون یەك پێویستە. ژن ئەگەر پیاو بەزۆر جووت بوو لەگەڵیدا، یاخەوتبوو، ئەوە حەجەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام ئەگەر لەسەر رەزای خۆی بوو، وە دەشیزانی کە ئەو ئیشە نادروستە ئەوە حەجەکەی پووچ دەبێتەوە.

## ١٦٩) کەسێ فریای وەستان لە عەرەفات نەکەوێ حەجی لە دەست دەچێ:

هەرکەسێ لەپێش شەبەقی بەیانی رۆژی جەژندا فریای وەستانی عەرەفە نەکەوێ، حەجی ئەو ساڵەی لەکیش دەچێ! چونکە پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ لە شەوی جەژندا فریای هاتن بۆ عەرەفات بکەوێ ئەوە فریای حەجی ئەوساڵە دەکەوێ، هەرکەسێ هەتا شەوی جەژن تەواو دەبێ فریای هاتن بۆ کێوی عەرەفە نەکەوێ ئەوە

حەجی ئەو ساڵەی لە دەست دەچێ، با ئیحرامی عەمرە دابەستێ، لە ساڵی دواییشدا حەجی لەسەرە (دارە قوطنی) چونکە وەستان لە عەرەفە بنیاتێکە بەستراوە بە کاتێکی تایبەتەوە، کە کاتەکە بەسەرچوو ئەویش بە سەردەچێ، کە بنیاتێکیش لە کارێ فەوتا، کارەکە گشتی دەفەوتێ، رێك وەم نوێژی هەینی کە کاتەکەی بەسەر چوو خۆشی بەسەردەچێ، جا لەم کاتەدا بەبێ درەنگ کرداری عەمرەیێ تەواو دەکاو ئیحرام دەشکێنێ، کە برێتییە لە تەوافو هەڕاکرنو سەرتاشین، بەبێ راجیایی دەبێ بۆ ئەم عەمرە تەواف بکا، بەڵکوو دەبێ هەڕاکردنیش ئەنجام بدا، ئەمە کاتێ وایە ئەگەر لە پاش تەوافی هاتن هەڕاکردنی نێوانی سەفاو مەڕوەی ئەنجام نەدابوو، بەڵام رەجمی شەیتانی لە مینا ناوێ، هەروا سوننەت نیە شەویش لە مینا بمێنێتەوە، با کاتی ئەم دوو شتەیش مابێ، گوتمان ئەم جۆرە کەسە کە دێن بۆ حەجو فریای وەستان لە خاکی عەرفە ناکەون، دەبێ لە ساڵی ئایندەدا ئەو حەجە قەزابکەنەوە، هەروا دەبێ دیاری بەیتیش سەرببڕن... دەگێڕنەوە: هەبباری کوڕی ئەسوەد، لە رۆژی جەژندا دێ بۆ خزمەتی ئیمامی عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ژمارەی رۆژەکانمان لێتێکچوو، بۆیە وا درەنگ هاتووین، دەی چارمان چییە؟ عومەر پێی دەفەرموێ: بڕۆ بۆ مەککە لەوێ تەوافی بەیت بکە، خۆتو ئەوانەی کە لەگەڵتان، ئەوجا هەڕاکردنی نێوانی سەفاو مەڕوە ئەنجام بدەن، ئەگەر هێناوتانە سەرو دیاری بەیتیش سەربڕن، ئەوجا یا سەرتان بتاشن، یا کورتی بکەنەوە، ئیتر بگەڕێنەوە بۆماڵەوەتان، لە ساڵی ئایندەدا حەج بکەنو دیاری بەیتیش سەربڕن، بەڵام ئەگەر کەسێ دیاری لەباردانەبوو، با سێ رۆژ

لەکاتی حەجداو حەوت رۆژ لە ولاتی خۆی بەرۆژوو بێ! (مالیك {رەزای خوای لێبێ} لە مووەطادا بە رشتەیەکی دروست دەیگێڕێتەوە) جا ئەم بریارەی عومەر شۆرەتی دەرکرد، وەکەس رەخنەی لێی نەبوو، لەبەر ئەوە سەری گرت و بوو بە یەکگرتنی نەتەوە (ئیجماعی ئوممەت).

## ١٧٠) کەسێ بنیاتێ نەکا حوکمی چییە:

ئەگەر کەسێ بنیات (روکن)ێ لە بنیاتەکانی حەجی لە کات و شوێنی خۆیدا نەکرد، نابێ ئیحرام بشکێنێ، بەڵکوو ئەگەر مەودای مابوو دەبێ بگەڕێتەوە سەری و بیکا، وە نەکردنی بنیات بەخوێن تۆڵەی ناکرێتەوە، چونکە حەجەکە بەبێ ئەو تەواو نابێ، چونکە ماهییەت و چییەتی حەج بەبێ کردنی گشت بنیاتەکانی نایەتە جێ، چونکە چییەتی (ماهییەت)ی شت بە فەوتانی بەشێکی، گشتی دەفەوتێ، وەك نوێژ هەتا گشت بنیاتەکانی ئەنام نەدا نابێ دەستی لێهەڵبگرێ.

## ١٧١) ئەو گیاندارەی کە سەربڕینی پێویست دەبێ لە ئیحرامدا:

ئەو خوێنانەی کە کردنیان بەم بۆنەیەوە پێویست دەبێ، بەهۆی نەکردنی ئەرکێکەوە (واتە: واجبێکەوە)، یا بەهۆی کردنی شتێکی قەدەغەوە، مەڕە یا بزنە بە مەرجێ بۆ قوربانی بشێن، بەلام لەکاتی جووتبووندا دەبێ وشترێ سەربڕێ بۆ گەدایانی بەست (حەرەم)ی

مەککە. تەنیا ئەوەندە هەیە تۆڵەی راوی نەچیر بەم شێوەیە: هەر نەچیرێ بکوژێ دەبێ بە وێنەی خۆی تۆڵەی بدا: لە جیاتی بچووک بچووك‌و لە جیاتی گەورە گەورە.

## ١٧٢) ئەو خوێنە پێویستانە پێنجن:

**یەکەم**: خوێنێکە کە پەیوەندی بە نەکردنی ئەرکێکەوە هەبێ وەك نەکردنی ئیحرامدابەستن لە نیشانگاو جێگەدابەستنی خۆیدا، وەك نەکردنی رەجمی شەیتان، ئەم خوێنە خوێنی ریزلێگرتن‌و قەبلاندنە، واتە: دەبێ بە ریزیەکێ لەم سێ شتە بکا: پێویستە مەرێ یا بزنێ بدا بە هەژارانی بەستی مەککە، ئەگەر ئەوەی پێنەکرا مەرێ بقەبلێنێ بە پارەو بە پارەکە خۆراك بکرێ‌و بیکا بە خێر، ئەگەر ئەوەیشی بۆ نەکرا، لە جیاتی هەر مشتی لەو خۆراکە، کە مەرجە پێبژیوی بێ، رۆژێ بە رۆژووبێ. رافیعی لە (المحرر)دا ئەمە دادەنێ بە فەرمایشتی دروست، خاوەنی مەنهەجیش لەم بڕیارەدا پەیڕەوی رافیعی دەکا.

**دووەم**: ئەو خوێنەیە کە بەهۆی سەرتاشین‌و رابواردنەوە پێویست دەبێ، جا ئەگەر کەسێ سێ تەڵ مووی لە لەشی خۆی بڕی یا زیاتر، یا سێ نینۆکی خۆیی کرد ئەمە پێویست دەبێ لەسەری: یا ئاژەڵێکی وا سەربڕێ کە بۆ قوربانی بشێ، یا سێ مەن پێبژێوی بدا بە شەش گەدا، یا سێ رۆژ بەرۆژووبێ! ئەم خوێنەیش خوێنی وەجەڵ دیاریکردن‌و سەپشککردنە، واتە: پێویستە لەسەرت یا خوێنێ بکەی یا وەجەڵە دیاریکراوەکەی بکەی، وە لەکردنی هەریەکێ لەم دووشتە خۆت

سەرپشکی. سەر بەڵگەی ئەم سەرپشکییە ئەم ئایەتەیە: {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ - سورة البقرة - ٢/١٩٦} واتە: هەرکەسێ لە ئێوە لەکاتی ئیحراما نەخۆش کەوت یا ئازارێ لە سەریدا بوو، بەهۆی یەکێ لەم دووشتەوە بە ناچاری سەری خۆی تاشی، ئەوە لە سەریەتی تۆڵەیێ بدا لە باتی ئەو سەرتاشینەی، ئەو تۆڵەیە سێ جۆری هەیە خۆی سەرپشکە لە کردنی یەکێکیان، کە بریتین لە رۆژووی سێ رۆژ، یا خواردە مەنی شەش هەژار، یا ئاژەڵێ سەرببڕێو دابەشی بکا بەسەر هەژارانا. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) لەم فەرموودەیەدا ئەم مەسەلەیەی روونکردۆتەوە: کەعبی کوڕی عوجرە (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: لەکاتی حودەیبییەدا ئاگرم لە ژێر مەنجەڵێکا خۆش دەکرد، ئەسپێ لەسەرم هەڵ دەوەری لە بەرزۆری، لەوکاتەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەشریفی هات بۆ لام، فەرمووی پێم: ئەم جرۆجانەوەرانەی سەرت ئازات دەدەن؟ وتم: بەڵێ. فەرمووی: سەرت بتاشە، لە پاشا یا مەڕێ یا بزنێکی خێر سەرببڕە، یاخود سێ رۆژ بە رۆژوو بە، یا خود سێ مەن خورما بدە بە شەش هەژار. (شەیخان). ئەوەیشمان لە یادبێ کە نینۆککردنیش رێك وەك سەرتاشین وایە بۆ ئەم تۆڵەیە، هەروا هەموو رابواردنەکانی تریش، وەك بۆنی خۆشو خۆچەورکردنو جلی دووراو لەبەرکردنو بەراییەکانی سەرجێیی، چونکە هەموو ئەمانە بەشێکن لە رابواردنو کەیف.

**سێیەم**: ئەو خوێنەیە کە بەهۆی ئیحصارەوە پێویست دەبێ، جا ئەگەر حاجی یا عەمرەکەر رێگەی حەجی لە لایەن دوژمنەوە لێگیراو نەیتوانی حەج یا عەمرەکەی یا هەردووکیان تەواو بکا، خوا ئەو شوێنە

خاكی بەست بێ یانە، وەرێگەی تریش نەبوو جگە لەو رێگەیە كە چووبووە بەست، ئەوە ئیحرامەكەی هەڵدەوەشێنێتەوەو لە كوێدا رێگەی لێقەدەغە بووبوو لەوێدا ئاژەڵێ بە دیاری سەردەبڕێ بۆ هەژارانی ئەو جێگەیە، لای كەمی ئەم ئاژەڵە مەڕ یا بزنێكە كە دەست بدا بۆ قوربانی، ەبێ نیازی ئیحرام تێكدان بهێنێ. سەر بەڵگەی ئەم كارە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ} واتە: ئەگەر قەدەغەكران لە تەواوكردنی خودا پەرستییەكەتان ئەوە ئاژەڵێ بكەن بە دیاری، بەپێی توانای خۆتان. دەربڕینی مەبەستی تەواو لە ئایەتەكە ئاوایە: ئەگەر رێتان لێچووە بەست، بۆتان هەیە ئیحرام هەڵوەشێننەوە، بەڵام ئاژەڵێكی دیاریتان دەكەوێتە سەر. لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} ساڵی رێككەوتنی حودیبییە لە ئیحرامی عەمرەدا بوو، هاوبەشپەیداكەرەكان رێگەیان نەدا عەمرەكەی تەواو بكا، لەبەر ئەوە ئیحرامی شكاند. دەبێ لە پێش سەرتاشیندا، بۆ ئەم ئیحرام شكاندنە، ئاژەڵی دیاری سەربڕێ، نەك بە پێچەوانەوە چونكە خوای مەزن دەفەرموێ: {وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ - سورة البقرة - ١٩٦/٢} واتە: سەرتان مەتاشن هەتا دیارییەكە دەگاتە جێگەی سەربڕینی خۆی.

**چوارەم:** خوێنی پێویست بەهۆی گوشتنی نێچیرەوە. ئەم خوێنە ئاوایە: ئەو نەچیرە كوژراوە ئەگەر وێنەداربوو، ئەوە خۆی سەرپشكە بە یەكێ لەم سێ شتە: یا وێنەكەی سەربڕێو بیبەخشێتەوە بەسەر هەژارانی بەستی مەككەدا، یا ئەو ئاژەڵەی كە دادەنرێ، بە وێنەی نەچیرە راوكراوەكە، دەقەبڵێنێ بە پارەو پارەكەی دەدا بە خواردەمەنیو

خواردەمەنییەکە دەدا بە هەژارانی بەستی مەکە، یا لەجیاتی هەر مشتێ لەو خۆراکە پێیقەبلاوە رۆژێ بە رۆژوو دەبێ. بەپێی ئەم ئایەتە {فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا – سورة المائدة – ٩٥/٥} واتە: ئەی موسوڵمانەکان! لەکاتێکا کە ئێوە لە ئیحرامدابن نەچیر مەکوژن، وە هەرکەسێ لە ئێوە لەم کاتەدا نەچیرێ بە قەستی بکوژێو بزانێ کە ئەوە کارێکی حەرامە، ئەوە لەسەریەتی تۆڵە دانەوە بە گیانلەبەرێ کە وەکوو ئەو نەچیرە وابێ، کە دوو پیاوی خاوەن دادو عەدالەت دایبنێنو حوکمی پێبکەن، وە دەبێ ئەو ئاژەڵە تۆڵەیە بنێرێ بۆ حەرەمی مەککەو لەوێ سەرببڕێ بۆ هەژارانی حەرەم، یا کەففارەتێ بدا کە برێتییە لە بەهای ئەو ئاژەڵە تۆڵەیە، وە دەبێ بەو بەهایە خۆراكو دانەوێڵە بکڕێو بیدا بە هەژاران، یاخود بە ئەندازەی ئەو خواردەمەنیە بە رۆژووبێ، بەم شێوەیە لە باتی هەموو مشتێ رۆژێ بە رۆژووبێ، بەلام ئەگەر نەچیرێکی وای کوشت کە وێنەی دیاری نەکرابێ لە شەرعا، ئەوە خۆی سەرپشکە لە یەکێ لەم دوو شتە: یا دەقەبلێنرێ بە پارەو بە پارەکە خۆراکی پێدەکڕێو دەیبەخشێتەوە بەسەر هەژارانا، یا لەباتی هەر مشتێ لەو خۆراکە رۆژێ بە رۆژوو دەبێ، دەق وەك نەچیری وێنەدار. بەپێی نرخی ئەو شوێنەی کە نەچیرەکەی تیادا دەکوژرێ نرخو بەها بۆ نێچیرەکە یا بۆ وێنە وەجەڵەی دادەنرێ، مەبەستیش لە وەجەڵی وێنەدار ئاژەڵێکی ماڵییە کە شێوەی نزیکبێ لە شێوەی نەچیرەکە، مەبەست ئەوە نیە کە وەجەڵەکەشی لە توخمی خۆی بێ، هەتا بگوترێ: پێویستە لە جیاتی وشتر مەرغ وشتر مرغ بدرێو لە

جیاتی ئاسك ئاسك بدریٚ. چونكه خودای گەورە لە ئایەتەكەدا وێنەی نەچیرەكەی بڕیوە بەسەر ئاژەڵدا، لەبەر ئەوە وەجەڵی نەچیرەكە لە توخمەوە دەگۆڕیٚ بۆ وێنەی خۆی لە ناو ئاژەڵیٚماڵیدا! كۆمەڵیٚ لە یاران، لە چەن ڕووداوێكا، بڕیاریان داوە كە لەجیاتی وشترمرغیٚ وشتریٚ دەدریٚ، وە لە جیاتی كەرەكێویو گاكێوی گایٚ، وە لە جیاتیی دێڵەكەمتیاریٚ بەرانیٚ، جابیر {رەزای خوای لیبیٚ} هەواڵی داوە كە ئەمە بڕیاری پێغەمبەرە {درووددی خوای لەسەربیٚ} كە تۆڵەی كەمتیاریٚ بەرانیٚ بیٚ، هەروا كۆمەڵێكیش لەیاران بۆ تۆڵەی كەمتیار بەرانێكیان داناوە، وە لەجیاتی ئاسك بزن، وە لەجیاتیی كەروێشكیٚ گیسكیٚ، ئەمە بڕیاری ئیمامی عومەرو عائیشەیە، لەجیاتیی بچووك بچووكو لەجیاتیی گەورە گەورەو لەجیاتی نێر نێرو لەجیاتیی میٚ میٚو لەجیاتیی ساخ ساخو لەجیاتی شكسدار شكسدار، واتە هاو وێنەیی بەپێی ئایەتەكە لە هەموو ئەم شێوانەدا ڕەچاو دەكریٚ، كەواتە: ئەگەر مەڕەكێوییەكی كوشت تۆڵەكەی مەڕێكە، ئەگەر بەرانە كێوییەكی كوشت تۆڵەكەی بەرانێكە، میٚ لەباتی میٚو نێر لەباتی نێر.

**پێنجەم**: خوێنی پێویست بوو بە جووتبوون – جماع) ئەم خوێنەیش خوێنی ریزلێگرتنو قەبلاندنە. واتە: خوێنی تەرتیبو تەعدیل، واتە دەبیٚ بەریزیەكیٚ لەمانە بكا: یەكەم وشتریٚ سەببڕیٚ بۆ هەژاران، ئەگەر ئەمەی نەتوانی گایەك سەرببڕیٚ، ئەگەر دەستی نەكەوت حەوت سەر مەڕ یا بزن سەرببڕیٚ بۆ گەدایانی بەست (حەرەم)ی مەككە. ئەگەر ئەوەیشی بۆ نەكرا بەهای وشترەكە بدا بە پێبژیویو دابەشی بكا بەسەر داماوانی بەستی مەككەدا، ئەگەر ئەوەیشی پێنەكرا لە جیاتیی هەر مشتێك خۆراك ڕۆژیٚ بە ڕۆژووبیٚ. بەلگەی پێویستبوونی وشتر

ئەوەیە کە ئیمامی عومەرو عەبدوڵلای کوڕی {رەزای خوای لێبێ} بڕیاری ئەوەیان داوە، هەروا ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە. بۆیەیش ئەگەر وشتر نەبوو دەچین بۆ گا یا بوحەوت سەر مەڕ یا بزن. چونکە گایێ یا حەوت سەر ئاژەڵی وردە، لە قوربانیدا، وەك وشتر وان، بۆیەیش ئەگەر ئاژەڵ نەبوو دەچین بۆ خۆراك، چونکە شەرع لە تۆڵەی نەچیردا لە ئاژەڵەوە دەچێ بۆ خۆراکدان بە هەژاران. بەپێی نرخی ناو مەککە نرخ بۆ وشترەکە دادەنرێ، ئەوەوی لە شەرحی (المهذب)دا وا دەفەرموێ گوتراویشە: بەپێی نرخی مینا وشترەکە دەقەبلێنرێ بە پارەو بە پارەکەیش خۆراك دەکڕرێ. گوتراویشە: لە جێگەی کردنی هۆی ئەم خوێنە. واتە: لە کۆی کۆبووە لەگەڵ ژندا بەپێی نرخی ئەوێ وشترەکە دەقەبلێنێ.

## ١٧٣) جێگەی ئاژەڵی دیاری و خۆراك بەخشین:

ئاژەڵی دیاری یا بەهۆی (احصار) چوونە بەستەوەیە، یا بەهۆی شتێکی ترەوەیە، جا ئەگەر بەهۆی ڕێچوونە بەستەوە بوو ئەوە لەکوێدا ڕێگەی لێ قەدەغەکرابوو لەوێدا سەری دەبڕێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە حودەیبییە لەوێدا دیاری سەربڕی، کە ڕێگەی لێ گیرابوو. بەڵام خوێنی پێویستبوو لەبەرکردنی حەرام یا لەبەر نەکردنی پێویست، ئەوە دەبێ لە حەرەمدا سەر ببڕێ چونکە ئایەت دەفەرموێ: {هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ – بڕ: ١٧١ن) جا پێویستە گۆشتەکەی دابەشبکرێ بەسەر گەدایانی بەستدا، چونکە گۆشتەکە مەبەستە لە بەخشینەوەدا.

بۆ ئەوە جیایی هەژاری نیشتەجیو هەژاری میوان نیە، بەڵام بەخشینی بە نیشتەجێکان خێرترە، ئەگەر لە جیاتی سەربڕینی ئاژەڵ خۆراکی دابەشکرد، دەبێ بە تایبەت دابەشی بکا بەسەر هەژارانی حەرەمدا، چونکە وەجەلیش حوکمی وەجەڵداری هەیە، بە پێچەوانەی رۆژووەوە، بۆ رۆژوو لەکوێ ئارەزوو دەکا لەوێ بیگرێ، چونکە قاوزانج وەچاو ناکرێ بۆ هەژار لەوەدا کە کابرا لە خاکی حەرمدا بەرۆژووبێ، بەلایەنی کەمەوە دەبێ تۆڵەکە بە سەرسێ هەژاردا دابەشبکرێ، بەڵام مەرج نیە بە یەکسان دابەش بکرێ بەسەریاندا چونکە دروستە هەندێ کەس زیاتر لە هەندێ کەس وەربگرن.

## ١٧٤) کوشتنی نەچێری حەرەمو بڕینی درەختی:

راوکردنی نەچیری بەستی مککە نادروستە، چی بۆ ئحرامدار چی بۆ بێ ئیحرام، هەروا بڕینی دارو گیای حەرەمی مەککە، بەمەرجی گیانلەبەرکە زیانەخورۆ نەبێو رووەکەکە ئازار دەر، یا وشك نەبێ، بەڵام گیانلەبەری زیانەخورۆو رووەکی وشك، یا رووەکی ئازاردەر کوشتنو بڕینیان دروستە، هەموو رووەکێکی دڕکدار بە ئازاردەر دادەنرێ.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە رۆژی گرتنی مەککەدا فەرمووی: ئەم شاری مەککەیە بەستەو گەلێ شت لە شوێنانی تر کردنیان دروستە، بەڵام لێرە دروست نین، ئەمەیش دەستی قەدرو رێزە خودا لەم شارەی ناوە، دەی نەدارو دەرختی دادەپاچرێ، وەنەچیری دەرەوێنرێتەوە، وەنەشتی

داکەوتووی هەڵ دەگیرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ کە ناونیشانی هەڵبدا، هەتا خاوەنەکەی پەیدا ببێ و بیباتەوە، نەگیای پاکۆ دەدرێ، عەبباس فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! تەنیا گیای سورِناتیکی لێ دەرچێ، چونکە بۆ سووتەمەنی ئاسنگەرو بۆ سووتەمەنی ناوماڵ و بۆ پەردووی سەردارەرا بەکاری دێنن؟ پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: باشە تەنیا گیای سورِناتکی لێ دەرچێ بردنی گەڵای درەختەکەی دروستە، بەڵام نابێ بەداو گڵاکوتك و شتیوا بیوەرێنێ، نەبادا بەرتوێکڵەکەی بکەوێ ئەگەر لقێکی بڕی و خەڵفی دەرنەکردەوە ئەوە دەستەبەرەو تۆڵەی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر لە هەمان ساڵا شوێنەکەی خەڵفی دەرکردەوە ئەوە هیچی لەسەر نیە، وەك بردنی گەڵا، هەموو دارو گیایێ کە لەخۆیەوە سەوز بووبێ بڕینی نادروستە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: نەگیای پاکودەدرێ. دیارە کە بڕینی نادروست بێ هەڵکەندنیشی نادروستترە! بەڵام دروستە ئاژەڵی تێبکرێ هەتا تیادا بلەوەڕێ، ئەگەر بۆ ئاڵفیش بیبا دروستە، لەسەر فەرمایشتی فرەدروست! گوتراویشە: دروست نیە گیاکەی بکرێ بە گزرە بۆ ئاڵفی ئاژەڵ، چونکە رووکاری فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێ کە دروست نەبێ، بەڵام بڕینی بۆ دەرمان دروستە، لەسەر قسەی فرە دروست، چونکە پێویستی دەرمان گەلێ گرنگترە لە پێویستیی سورِناتك بەپێی فەرموودەی دروست، دوورینی گیای سورِناتك، بۆ پەردووی سەردارەڕا دروستە.

## ١٧٥) حەجکردن لە جیاتیی کەسێکی تر:

ئەگەر موسوڵمانێ حەجی کەوتە سەرو حەجی نەکرد هەتا پەکی کەوت پێویستە لەسەری موسوڵمانێ بنێرێ حەجی بۆ بکا، خوا پەککەوتنەکەی لەبەر پیریبێ، یا لەبەر نەخۆشییەکی وابێ کە ئومێدی چاکبوونەوەی نەبێ. بەڵگەی ئەمە ئەم فەرموودەیە: ئیبنو عەبباس فەرمووی: ژنێکی خەسعەمی هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج (کە فەرزی خودایە لەسەر بەندەکانی خۆی) کەوتۆتە سەرباوکم، کە پیرە مێردێکی ئیختیاری وایە خۆی بەسەر وڵاخەوە بۆ ناگیرێ، جا ئایا دەبێ من خۆم لەباتی ئەو حەجی بۆ بکەم یا نابێ؟ فەرمووی: بەڵێ دەبێ. ئەم پرسیارو وەڵامەیش لە کاتی کردنی حەجیماڵئاواییدا بوو (مالیك/ شافیعی/ شەیخان/ ئەبو داوود/ نەسائی) ئیمامی تیرمیذی دەفەرموێ: سەبارەت بەم باسە چەن فەرموودەیەکی دروست تۆماربووە.

ئەگەر کەسێ مردو حەجی فەرزی لەسەر بوو کە پێی دەگوترێ: حەججەتول ئیسلام، پێویستە لەسەر هەقدارەکەی موسوڵمانێ بنێرێ حەجی بۆ بکا، مەسرەفی حەجەکە لەو کەلەپوورە دەردەکرێ کە بەجێی هێشتووە. چونکە دەگێڕنەوە: ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: ئافرەتێکی جوهەینەیی هاتەلای حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم نەزری کردبوو کە حەجێ بکا، وە نەیشیکرد هەتا مرد، ئایا دەبێ ئێستا من ئەو حەجەی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، دەبێ، حەجی بۆبکە. مەرجە ئەوکەسەی کە حەجی فەرزدەکا لە جیاتیی مردوو، یا لەجیاتی موسوڵمانی پەککەوتوو، خۆی حەجی

کردبێو حەجی فەرزی لەسەر نەبێو، لە هەمانکاتدا باوەڕپێکراو بێو لە حوکمەکانی حەج بزانێ. سوننەتە وەکیلحەجەکە، لەکاتی حەجدابەستندا، بڵێ: ئەی خودایە! ئیحرامی حەج دادەبەشستم بۆ تۆ، لە جیاتیی فیسارەکەس.

## ١٧٦) حەجەکەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}:

پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} سێ حەجی کردووە، دوو حەج لە پێش کۆچداو حەجێ لە پاش کۆچ، ساڵی دەهەمی کۆچی، ناودارە بە حەجیماڵئاوایی، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەو حەجەدا خوا حافیزی لە مەردومەکە کردو فەرمووی: هەتا خۆم ماوم باوو یاسای حەجو عەمرەی خۆتان لە خۆم فێر ببن، چونکە من نازانم چەندەی تر دەژیم، دوور نیە کە بمرمو حەجی ترم بە نصیب نەبێ! بفەرموون ئەمەیش فەرموودەیەکی تێرو تەسەلە لەبارەی حەجی ماڵئاواییەوە:

لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکیەوە {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: چووین بۆ لای جابیری کوڕی عەبدوللا {رەزای خوایان لێبێ} کوێربوو بوو، یەکە یەکە دەیپرسی: ئەمە کێیەو ئەوە کێیە، تا سەرە هاتە سەرمن، گوتم: من موحەممەدی کوڕی علی کوڕی حوسەینم، کەوام گوت دەستی هێنا بەسەر سەرماو دەستی هێنایە خوارەوە بۆ سینگو بەرۆکمو دوگمەی سەرەوەو دوگمەی خوارەوەی ترازاندمو لەپی هێنا بە سینگما بۆ موبارەکیو فەرمووی: خۆش هاتی ئەی برازای خۆشەویستم! پرسیارت چییە بیکە. منیش ئەو حەلە کوڕێکی لاو بووم، ئینجا کاتێ

نوێژ داهات هەڵسا نوێژی بۆ کردین تەیلەسانێکی لەبەردابوو، پێچابووی لە خۆیەوە، لەبەر بچووکی کە دەیدا بەسەرشانیا چمکەکانی هەڵ دەکشانەوە بۆلای خۆی، پشتەماڵ (ریداء)ەکەشی لە تەنیشتیەوە بەسەر سێ پایەکەوەبوو، جا کە نوێژی بۆ کردین، لەپاشا لێم پرسی گوتم: باسی حەجەکەی پێغەمبەرم بۆبکە {درودی خوای لەسەربێ} جا نۆ پەنجەی خۆی ژماردو فەرمووی: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} نۆ ساڵ مایەوە لە مەدینە، لەوماوەیەدا حەجی نەکرد، جا لە ساڵی دەهەمدا، جاڕی دابەناو مەردومدا کە: ئەمساڵ پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەچێ بۆ حەج. ئیتر عەشاماتێکی گەلێ زۆر هاتن بۆ مەدینە، وە هەموویان دەیان ویست کە پەیڕەوی حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} بکەنو چاو لەو بکەنو ئەو هەرچی کرد لە حەجەکەیا ئەوانیش بیکەن. ئینجا لە خزمەتی حەزرەتدا {درودی خوای لەسەربێ} کەوتینەڕێو رۆیشتین هەتا گەیشتینە ذولحولەیفە لەوێ ئەسمای کچی عومەیری موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، وە هەواڵی نارد بۆ لای پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} کە چۆن بکا؟ فەرمووی: خۆت بشۆرەو ناواخنێ بۆ خۆت بکەو تۆپەوانەیێ بۆ وانێکەکەت بکەو خوێنەکەی پێ بەربەست بکەو ئیحرام ببەستە.

جا پێغەمبەر {درودی خوای گەورەی لەسەربێ} لەوێ لە مزگەوتەکەدا نوێژی عەصری کرد، ئینجا سواری قەصواء بوو، رۆیشت تا بە سواری سەرکەوتەسەر کێوی بەیدا، لەوێ بەهەر چوارلادا تەماشام کرد تا چاوم بڕی دەکرد هەرسوار بوو، وە هەر پیادە بوو لە دەوری حەزرەت {درودی خوای گەورەی لەسەربێ} ئەو دەمە وەك ئێستانەبوو، حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} خۆی لەنامانا بوو پەیتا پەیتا قورئانی بۆ دەهاتە خوارێ، وە خۆی بە جوانی

ڕاڤەو تەفسیری قورئانەکەی دەزانی، ئیتر ئەو خۆی هەرچی بکردایە ئێمەیش لە شوێن ئەوەوە ئەوەمان دەکرد، ئینجا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} بەم وشە پیرۆزەیە کە دروشمی یەزدان پەرستییەو نیشانەی یەکتایی خودایە ئیحرامی حەجی بەست: (**لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك**).

مەردومەکەی تریش تا بەمەی خۆیان ئیحرامی پێ دەبەستن بەوە ئیحرامیان بەست، بەلاَم پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لێی نەگرتن، وەلێ حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} بۆ خۆی هەر لەسەر تەلبییە کردنەکەی خۆی بەردەوام بوو.

جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: تەنیا هەر نیازی حەجمان هەبوو خەیالَی عەمرەمان نەبوو، چونکە لەوەو پێش لە ڕۆژانی حەجدا عەمرەمان نەدەکرد، تا ئەو حەلە کە لە خزمەتی حەزرەتدا چووینە بەیتو لەوێ حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەستی هێنا بە ڕوکنی حەجەرولئەسوەدداو ماچی کردو سێ جار بە هەڕاکران و چوار جار بە ڕۆیشتنی ئاسایی هەلَسووڕا بە گردی خانەی خودادا، ئینجا ڕۆیشت بۆ مەقامی ئیبراهیم {دروودی خوای گەورەی لەسەربێ} و ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە: {وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} : وە مەقامی خستە بەینی خۆی و بەینی بەیتەوەو دوو ڕکات سوننەتی نوێژی تەوافی کردو لە ڕکاتی یەکەمدا لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحا، سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی خوێند، ئینجا گەڕایەوە بۆ سەر حەجەرولئەسوەدو دیسانەوە دەستی پیا هێنایەوە، ئینجا لە دەرگای نزیك صەفاوە دەرچوو ڕۆیشت بۆ

صەفا، کە لەصافا نەزدیك بووەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**ان الصفا والمروة من شعائر الله**): وە فەرمووی: بەوەیان دەست پێبکەن کە خوداپێشی خستووە، ئینجا دەستی کرد بە تەوافی صەفاو سەرکەوتە سەرتەپۆڵکەی صەفا تا خانووی بەیتی لێوە دەرکەوت، جا رووی کردە رووگەو شایەتمانی هێناو ئەڵلاهو ئەکبەری کردو فەرمووی: (**لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شىء قدير، لا اله الا الله وحده أنجز وعده ونصر عبده وهزم الاحزاب وحده**): هەر خودا خودایەو تاكو تەنیایە، بێ هاوەڵو بێ چوونە، خاوەنی موڵكو پادشاییو سەڵتەنەتە سوپاسو ستایش هەر لە بۆی خۆی جوانەو هەر قابیل بەخۆیەتی، هیچی لە دەست دەرناچێو توانای هەموو شتێکی هەیە، هەر خودا خودایەو، بەڵێنەکەی خۆی هێنایە دی، وە بەندەکەی خۆی کە موحەممەدە سەرخست، وە ئەو کۆمەڵانەی کە لە رۆژی غەزای خەندەقا گەلەکۆمەیان لە ئیسلام کردبوو، خۆی بە تەنها شکاندنیو ژێری خستن. وەسێ جار پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} ئەم ذیکرەی خوێند، وە لە بەینی ئەم سێ جارەشدا دەپاڕایەوەو دوعاو نزای تری دەکرد.

ئینجا حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} داپەڕی بۆ مەڕوە، کە پێینایە ناو شیوەکەوە پێی هەڵگرتو خێرا رۆیی تا گەیشتە هەورازەکە، ئینجا بە ئاسایی رۆیشت تا چووە سەر مەڕوە، وە لەسەر صەفا چیکرد لەسەر مەڕوەیش هەمان شتی دووبارەکردەوە، تا دوا تەوافی لەسەر مەڕوە تەواوکرد فەرمووی: تازە لە دەستم چوو ئەگینا دیاریی بەیتم لە گەڵ

خۆم نەدەهێنا، وە دەمکرد بە عەمرە، جا هەر کەساتان کە دیاریی پێ نییە با ئیحرام بشکێنێو بیکا بە عەمرە. سوراقەی کوڕی مالیکیش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە هەر بۆ ئەمساڵ وایە یاخود هەتا هەتایە هەروا دەمێنێ؟ پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} پەنجەکانی خۆی تێك پەڕاندو دووجار فەرمووی: عەمرە تێکەڵی حەج بوو هەتا هەتایە! عەلیش {ڕەزای خوای لێبێ} لە یەمەنەوە وشتری قوربانی هێنا بۆ پێغەمبەرو {درودی خوای لەسەربێ} کەهات روانی فاطیمە {ڕەزای خوای لێبێ} ئیحرامی شکاندووەو جلی ڕەنگاویی پۆشیوەو چاوی ڕشتووە، جا عەلی بە فاطیمەی فەرموو: ئەمە چییە؟ فاطیمەیش {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: باوکم فەرموویەتی وابکەم. فەرمووی: کاتێ علی لە عیراق بوو دەیگوت: جا چووم بۆلای پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} تا گاڵی بدەم لە فاطیمە، کە بۆ وای کردووە، وە بۆ ئەو قسەیەش کە گوتی: باوکم فەرموویەتی کەوا بکەم هەر لێم پرسی، وە عەرزیشم کرد کە من ئەو کارەی ئەوم پێخۆش نیە، جا حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: فاطیمە ڕاست دەکا من خۆم پێم گوتووە کە ئیحرام بشکێنێ. تۆ خۆت کە ئیحرامی حەجت دابەست چیت گوت؟ علی فەرمووی: گوتم: گوتوومە ئەی خودایە ئەوا نێتی حەجم هێنا لەسەر ئەو نێتەی کە پێغەمبەری تۆ دەیهێنێ. فەرمووی: دە تۆ ئیحرام مەشکێنە، چونکە من دیاریی بەیتم پێیە.

فەرمووی: ئەو دیارییەی کە عەلی لە یەمەنەوە هێنابووی لەگەڵ ئەو دیارییەدا کە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لەگەڵ خۆی هێنابووی سەرجەم سەد وشتر بوو. فەرمووی: ئیتر خەڵکەکە هەموو ئیحرامیان شکاندو مووی سەریان کورت کردەوە، پێغەمبەرو ئەو کەسانە نەبێ کە

دیاریی بەیتیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، جا لە رۆژی تەروییەدا کە دەکاتە رۆژی هەشتەمی مانگی نۆمینە بەرەو مینا جمان‌و ئیحرامی حەجیان بەست، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سوار بوو، وە نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوان‌و خەوتنان‌و بەیانیی لەوێ کرد، ئینجا لەوێ کەمێ مایەوە تا خۆر هەڵهات وە فەرمانیدا کە لە نەمیرە دەوارێکی بۆ هەڵدەن، جا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ)کەوتە رێ قورەیش وایان دەزانی کە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) وەك سەردەمی نەزانی خۆیان لە مەشعەرولحەرام دەوەستێ، بەڵام پێغەمبەر لەوێ رەتبوو، وە نەوەستاو رۆیشت تا چووە نزیکی عەرەفە سەیریکرد لە نەمیرە دەوارەکەیان بۆ هەڵداوە، جا لەوێ دابەرزی، وە لەوێ مایەوە تاخۆر لایدا.

ئەوجا فەرمانی دا قەصوایان بۆ کۆپان کردو چوو بۆ ناو شیوەکەو لەوێ وتارێکی داو فەرمووی: خوێن‌و سەرو ماڵ‌و نامووستان لە یەکتری زۆر زۆر حەرامە، رێك وەك چۆن شکاندنی رێزی ئەم رۆژە پیرۆزەتان لەم مانگە پیرۆزەتانا لەم شارە پیرۆزەتانا زۆر زۆر حەرامە، سەرو ماڵ‌و نامووسیشتان بە یەکتری ئاوا حەرامە. ئاگاداربن! کەوا هەرچی کارو باری سەردەمی نەزانییە پووچەو بەتاڵەو بێ بایەخە، خوێنی سەردەمی نەزانی بەتاڵە، وەیەکەم خوێن - لە خوێنی کەسوکاری خۆم - کە بە بەتاڵ‌و بێ بایەخی دادەنێم خوێنی کوڕەکەی رەبیعەی کوڕی حاریثە، کە لەناو هۆزی بەنی سەعددا درا بوو بە دایەن وە هۆزی هوزەیل دەیکوژن. وە سوودی سەردەمی نەزانی هەمووی پووچ‌و بەتاڵە، وە یەکەم سوودیش - لە سوودی کەسوکاری خۆم - کە بەتاڵی دەکەمەوە سوودی عەبباسی کوڕی موططەلیبە، ئەو سوودە هەمووی بەتاڵە، وە دەربارەی

ئافرەتانیش لە خودا بترسن‌و بێ دادیی‌و ناهەقییان لێ مەکەن‌و رەفتارتان جوان بێ لەگەڵیان، چونکە ئەوان ئامانەتن‌و سپاردەی خودای گەورەن لەلای ئێوەی پیاوان، پیاو هەر خیانەت بکا نابێ خیانەت لە ئەمانەتی خودای خۆی بکا، وە ئەوان لەسەر فەرموودەی خوداو بەپێی قسەی شەریعەتی ئەو حەڵاڵ بوون بۆتان‌و دێنە باخەڵتان‌و دەچنە لایان.

وەمافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کە ئەوکەسە کە ئێوە حەزی لێ ناکەن نەیهێننە سەربەرەتان‌و نەیەڵن بێتە ماڵتان، جا ئەگەر شتێ وایان کرد کە بەدڵی ئێوە نەبوو، ئەوا تا دەتوانن چاوپۆشییان لێ بکەن‌و بە نەرمونیانی لەگەڵیانا رەفتار بکەن، وە بەبێ هۆیەکی رەوا تەڵاقیان مەدەن، بەڵام ئەگەر بەم شێوە شیرینەیش چاریان نەکرا ئەوا شەریعەت رێگەتان دەدا کە بەئەسپایی لێیان بدەن.

وەمافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بەباشی‌و بەپێی باوی ولاتی خۆتان رۆزی‌و خۆراك‌و بەرگ‌و پۆشاکیان پێ بدەن، وەکی هاوسەری هاوشانی خۆتان، تا هەست بە هاوسەرکەمی نەکەن!.

وەمن یاسایەکی وەهایشم لەپاش خۆم بۆ ئێوە جێ هێشتووە ئەگەر بێتو پەیرەوی بکەن لەناو خۆتانا هەتا هەتایە جارێکی تر سەرتان لێ ناشێوێ، ئەویش ئەم قورئانەیە کە نامەی خودایە.

وە ئێوە لە دوا رۆژدا لەبارەی منەوە پرسیارتان لێ دەکرێ، جا ئێوە وەڵامتان چی دەبێ؟

یاران فەرموویان: شایەتی دەدەین کە تۆ کۆتایی‌و درێغیت نەکردووە، تەبلیغی خۆتت کردووەو ئەرکی سەرشانی خۆتت بەجێ هێناوەو ئامۆژگاری خێری ئێمەت کردووە!.

جا حەزرەت {صەڵات و سەلام و درودی خوای گەورەی لێبێت} سێ جار پەنجەی دۆشاومژەی خۆی هەڵبڕی بۆ ئاسمان‌و داینەواندەوە بۆ ناو خەڵکەکەو هەموو جارێکیش لەگەڵ ئەم ئاماژەیەدا دەیفەرموو: خودایە! تۆ بەشایەت بە.

ئینجا فەرمانی فەرموو، بانگ‌و قامەت کراو نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین‌و فەرمانی کردەوە قامەت کرایەوەو نوێژی عەصریشی بە جەمع بۆ کردین وە لە بەینیانا هیچ نوێژی تری نەکرد.

ئینجا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} سواربوو ڕۆیشت تا گەیشتە ئێستگاکەی خۆی لە عەرەفات. جارووی وشترەکەی - کە ناوی قەصواء بوو - کردە تاوێرە بەردەکانی داوێنی کێوی جەبەلوڕەحمە کە ئەم چیای ڕەحمەتە خۆی وا لەناوەراستی خاکی عەرەفاتدا وەکۆمەڵی حاجییە پیادەکانی خستە بەردەمی خۆیەوە، وە رووی کردە رووگە. ئیتر لەوێدا راوەستا تا خۆر ئاوابوو، جا ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆیەوەو داپەڕی بۆ موزدەلیفە، هەوسارەکەی قەسواشی وا گورج کردبۆوە، تەنانەت سەری قەسوا دەیدا لە قەڵپووزی کۆپانەکەی، وە بە دەستی راستیشی ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو، خەڵکینە! لە سەرخۆبن، خەڵکینە هێواش، بەلام کە دەگەیشتە تەپکەو ماسۆڵکە لمێ، کەمێ جڵەوەکەی بۆ قەسوا شل دەکرد، تاسەر دەکەوتە سەری، جا ڕۆیشت تا تەشریفی گەیشتە موزدەلیفە جا

لەوێ نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بە جەمعەتەئخیر کرد بەیەك بانگ‌و بەدوو قامەت، وە هیچ نوێژی سوننەتی لە بەینیاندا نەکرد، ئینجا تەشریفی خەوت هەتا شەبەقی دا.

جا کە بەیانی تەواوی دا، فەرمانی دا بانگ دراو قامەت کراو نوێژی بەیانیی کرد. ئینجا سواری قەصوا بۆوەو ڕۆیشت تا گەیشتە مەشعەرولحەرام، جا ڕووی کردە ڕووگەو لە خودا پاڕایەوەو ئەڵلاهو ئەکبەرو تەلیلەی کردو ناوی خودای تاك‌و تەنیای هێنا.

وە لەوێ ڕاوەستا تا تەواو دنیا ڕووناك بۆوە، جا لەپێش خۆرکەوتندا کەوتەڕێ بۆ مینا، وە فەضلی کوڕی عەبباسی خستە پاشکۆی خۆی، فەضلیش پیاوێکی قژجوانی سپیلکەی شۆخ‌و قۆز بوو، جا لەوکاتەدا کە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} کەوتەڕێ تاقمێ ژن لە ناو کەژاوەدا، دایان بەلایدا، فەضلیش دەستیکرد بە تەماشا کردنیان، پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەستی نا بەڕووی فەضلەوەو بەری چاوی گرت، فەضلیش ڕووی وەرچەرخان بەولاداو لەولاوە تەماشای دەکردن.

پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەستی لەولاوە گواستەوە بۆ لایەکەی ترو نایەوە بە ڕووی فەضلەوە تا بەرچاوی بگرێتەوەو تەماشا نەکا. ئیتر حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} ڕۆیشت تا گەیشتە ناو شیوی موحەسیر لەوێ تۆزێ خێرا لێی خوڕی‌و ڕێگەی ناوەڕاستی گرت کە دەچێ بەسەر کۆگای گەورەدا، جا ڕۆیشت تا گەیشتە لای کۆگا بەردەکە، کە لەلای درەختەکەدایە، وە حەوت بەردی بۆ فڕەدا، بەردەکان وەك بەردێ وابوون کە بەپەلە پیتکە دەهاوێژرێ، گشت جارێ کە بەردێکی

تێ دەگرت ئەللاهو ئەکبەری دەکرد، لە ناو شیوەکەوە بەردەکانی تێ دەگرت.

ئینجا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} تەشریفی رۆیشت بۆ کوشتنگا (مەنحەر: کوشتارگە) کەو لەوێ بە دەستی خۆی شەستو سێ وشتری سەبڕی، ئینجا چەقۆکەیدا بە عەلیو عەلیش باقی مەندەی وشترە دیارییەکانی حەزرەتی سەربڕی[1]، وە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} عەلی کرد، بە هاوبەشی خۆی لەم وشترە دیارییانەدا، ئینجا فەرمانی دا لە گۆشتی هەر وشترێ پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوە کوڵانیانو خۆیو عەلی لە گۆشتەکەیان خوردو لە ئاوی مەرگەکەیان خواردەوە، ئینجا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سوار بوو، رۆیشت بۆ بەیتو تەوافولئیفاضەی کرد، وە نوێژی نیوەڕۆی لە مەککەکرد. جا چوو بۆ لای نەوەی عەبدولمطەلیب، لە سەربیری زەمزەم ئاویان بە حاجیان دەدا.

فەرمووی: ئەی نەوەی عەبدولمطەلیب! ئاو هەڵگۆزنو بیدەن بە حاجیانو بە مەردوم، نەبادا خەڵك واتێ بکەن کە ئاو هەڵگۆزینیش لە کردارەکانی حەجە، وە لەم حاڵەدا زۆرتان بۆ بێننو رێگەتان نەدەن کە بەئاسایی ئاو بدەن بە حاجیان، نەبادا ئەمە رووبدا ئەگینا ئەم ئیشەی ئێوە ئەوەندە کارێکی پەسەندە منیش ئاوم هەڵدەگۆشت لە گەڵتانا، جا ئەوانیش سەتڵێ ئاویان بۆ برد، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لێی خواردەوە (موسلیمو ئەبو داوودو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە).

---

[1] رەنگبێ ئەم (٦٣)یە رەمز بێ بۆ ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی پێغەمبەر.
- وەرگێڕ -

## ١٧٧) ســـەردانی مزگەوتەكـــەی پێغەمبـــەرو مەرقەدی پیرۆزی {دروودی خوای لەسەربێ}:

سوننەتە حاجی (كە حەجی تەواكرد) تفاقی سەفەربخاو بڕوا بۆ مەدینەی مونەوەرە، بۆ دیدەنی مزگەوتەكەی پێغەمبەرو بۆ ئەوەی كە شادبێ بە سەردانی گۆڕە پیرۆزەكەی‌و لێی[1] نزیك بێتەوە ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم لە حەزرەتی ئەبو هورەیرەوە {رەزای خوایان لێبێ} دەگێڕنەوە دەفەرموێ: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: مەسجیدولحەرامی لێ دەرچێ یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا خێرترە لە هەزار نوێژی شوێنانی تر.

دیسان دەفەرموێ: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ سەفەر ناكرێ: بۆ ئەم مزگەوتەی من‌و بۆ مەسجیدولحەرام‌و بۆ مەسجیدولئەقصا (ش/د/ت/ن).

---

[1] نفدی بنور عیننا محمدا

فما لنا وما لنا له الفدا!

صلى علیك الله یا نور الهدى

من اقتدى بهدیكم قد اهتدى

صوبی لمن تضمه أجواء

أرجائها بنوره تضاء!

ولی الی خیر الوری رجاء

(یكون لی في حبه الفناء!)

المترجم

١٩٩٥/١١/٥

دیسان حەزرەت {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر کەسێ دێنیی گۆڕەکەم بکا مافی ئەوەی دەکەوێتە سەرم کە لە قیامەتداشەفاعەتی بۆ بکەم! (بەزارو دارە قوطنی و ئیبنو عەدی لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاویەتەوە) دیسان دەفەرموێ {درووده خوای لەسەربێ}: هەرکەسێ ساخ لەبەر رەزای خوا بێت بۆ سەردانی گۆڕەکەم، ئەو مافەی دەکەوێتە سەرم کە لە رۆژی قیامەتا ببم بە تکاکار بۆی! (دارە قوطنی لە ئەمالی داو طەبەرانی لە موعجەمول ئەوسطدا، ئەم فەرموودەیەیان لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاوەتەوە). دیسان پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیز (درووده خوای گەورەی لەسەربێ‌و سەروماڵو هەستو نەست هەمووی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ دەفەرموێ: لە پاش مردنم، هەرکەسێ کاتێ حەج تەواو دەکاو لە ئادابی حەج دەبێتەوە ئەوسا بۆ روسمی وەفا ساخ لەبەر رەزای خوابێ بۆ دینیی گۆڕەکەی منیش، ئەوە وەکوو ئەوە وایە کە لە حاڵی ژیانما هاتبێ بۆ سەردانم‌و چاوی بەمن کەوتبێ[1] (ئەم فەرموودەیە دارە قوطنی لە سونەنداو طەبەرانی لە موعجەمول کەبیرو لە موعجەمول ئەوسطداو بەیهەقی لە سونەنی بەیهەقیدا گێڕاویانەتەوە). قازی عەیاز دەفەرموێ: دێنیی‌و سەردانی گۆڕی

---

[1] واتە: لە پایەی هاوڕێی پێغەمبەر دەبێ‌و لەریزی ئەوان دەژمێردرێ. چونکە پێناسەی هاوڕێی پێغەمبەر ئاوایە: هەر کەسێ بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتبێ‌و لەسەر ئیسلامەتی مردبێ بە سەحابەی پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دادەنرێ: (الصحابی من رای النبی أو رآه ومات علی الاسلام).

- وەرگێڕ -

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سوننەتێکی گەلێ گەورەیەو بووە بە سوننەتێکی دامەزراو لە نێوانی موسوڵمانانداو بەهرەیەکی گەورەیەو ئیجماعی نەتەوەی ئیسلامی لەسەرە.

## ١٧٨) دەستووری سەردانەکە:

سوننەتە بۆ ئەوکەسە کە بە نیازی سەردان دەڕوا بۆ مەدینە لە ڕێگە سەڵاوات زۆربدا لە دیداری پێغەمبەر (دروودی خوای گەورەی لەسەربێ) وە لەپێش ئەوەدا کە بگاتە مەدینە خۆی بشواو بەرگی پاك لەبەر بکا، کاتێکیش کەچاوی دەکەوێ بە دارو درەختی دەوری مەدینەو بەنیشانەی حەرەمی مەدینە پتر سەڵاوات لێ بداو لە خوای گەورە داوا بکا کە ئەو زیارەتەی بۆ بکا بەمایەی بەهرەوەریو لێی قەبووڵ بفەرموێ.

لەو کاتەیشدا کە دەچێتە ناو مەدینەوە بڵێ: **(باسم الله. رب أدخلني مدخل صدق وأخرجني مخرج صدق واجعل لي من لدنك سلطانا نصيرا، اللهم افتح لي أبواب رحمتك، وارزقني من زيارة رسولك** *(صلى الله عليه وسلم)* **ما رزقت أولياءك وأهل طاعتك، واغفر لي وارحمني يا خير مسئول. اللهم اني أسألك خير هذه البلدة وخير أهلها وخير ما فيها وأعوذ بك من شرها وشر أهلها وشر ما فيها)** واتە: بە ناوی خودا، خودایە! بە میهرەبانی خۆت بە خێرو خۆشی داخڵی شاری مەدینەم بفەرموو، وە هەروەها بە خێرو خۆشیو بەبێ وەی لە شاری مەککەی پیرۆز بەڕێم بکە، وە لە لایەنی خۆتەوە بەهێزێکی یارمەتیدەر چاودێریم بکەو هەمیشە چاوی خێرت لێم بێ،

خودایه! لەهەر چوارلاوە دەرووی رەحمەتی خۆتم بۆ بخەرە سەرپشت، خودایە، لە سەردانی پێغەمبەری نازداری خۆت ئەوەم بە نصیب بفەرموو کە کردووتە بە نصیبی پیاوچاکانی خۆت بە نصیبی دەستەی تاعەتی خۆت، ئەی باشترین داوالێکراو! داوات لێدەکەم کە لێم خۆشبێ‌و رەحمم پێبکەی. خودایە! داوات لێدەکەم کە لە خێرو بێری ئەم شارە بەشی باشم بدەیتێ، وە لە خەڵکی ئەم شارەوە تووشی خێرو خۆشی ببم، وە لەو خێرەیش کەوا لە ناو ئەم شارەدا نائومێد نەبم، خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ کە لەو شەڕەی کە ئامادەکراوە بۆ خراپەکارانی ئەم شارە بە دووربم، هەروا لە شەڕو وەزەنی خەڵکەکەی‌و لە شەڕەی کەوا لە ناویدا.

با زۆر زۆر بە سەلاری‌و هێمنی‌و بێ هەوایی‌و سەرکزی خۆی بگرێ، ئەوەی لە یادبێ کە ئەمە ئەو شارە بەرزە پیرۆزە بەرێزەیە کە خوا هەڵی بژاردووەو کردوویەتی بە خانەی کۆچی پێغەمبەرو بەرەوگەی پیرۆزی‌و کردوویەتی بە هەوارگەی سرووش بەسەرچەشمەی سازو سافی بڕیارەکانی شەریعەت.

هەرکاتێ ویستی بچێتە ناو مزگەوتەکەوە با قاچی راستی پێش بخاو بڵێ: (**باسم الله، والصلاة والسلام على رسول الله. رب اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك. أعوذ بالله العظيم وبوجهه الكريم وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم**): بە ناوی خودا دەچمە ناو ئەم جێگە پیرۆزەە، درووود لە پێغەمبەری خوا، خودایە! تاوانەکانم ببۆشە، لەهەر چوارلاوە دەرووی رەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە. پەنا دەگرم بە یەزدانی مەزن، بە زاتی پیرۆزی، بە دەسەڵاتی دێرینی، لە زیانی شەیتانی لە رەحمەتی خودا بێبەش.

ئەوجا رووبکاتە رەوضە، کە بەینی مەرقەدی موبارەك‌و مینبەرە، لە وێدا لە تەنیشتی مینبەرەوە دوورکات نوێژی سوونەتی دیاری مزگەوت بکا. لە ئەبو هورەیرەوە {رەزای خوای لێبێ} لە پێغەمبەرەوە {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە نێوانی ماڵەکەم‌و لە نێوانی مینبەرەکەما باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، مینبەرەکەیشم وا لەسەر حەوزەکەم لە بەهەشتا (مالیك‌و شەیخان‌و تیرمیذی، تیرمیذی بە دروستی داناوە) (واتە: لە نێوانی گۆڕەکەم‌و دوانگەکەما باخێکە لە باخەکانی بەهەشت‌و بارانی رەحمەتی لێ دەبارێ، خۆشی لەو بەختەوەرەی کە لەم شوێنە پیرۆزەدا طاعەت‌و خواپەرستی جوان دەکا، وە مینبەرەکەشم لەسەر حەوزی کەوسەر دادەنرێتەوە بۆم‌و لە بەهەشتا لە سەری دادەنیشم‌و پێشوازی لە ئامادەبووانی ئۆمەتم دەکەم کە بۆ نۆشین لە ئاوەکەی دێن. تەماشای ئەم شوێنانە بکە بۆ زیادە بەهرە تەرجەمەی تاجول ئوصول بە کوردی: بەرگی یەکەم، زنجیرەی ١١٥و بەرگی دووەم زنجیرە ١٤٤ لاپەرە ٢٩٣ — وەرگێڕ.)

## ١٧٩) چۆنێتی ئەم سەردانە: دەستووری سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}:

کاتێ دوورکاتە سوننەتەکەی تەواوکرد، جا بێت بۆ نزیکی مەرقەدی پیرۆز، بەڵام پەلاماری نەداو خۆی نە نووسێنێ پێیەوەو دەستی بۆ رانەکێشێ، بە ئەدەبەوە روو بکاتە سەری پیرۆزی پێغەمبەرو پشت بکاتە قیبلە، وە ماوەی چوار گەز دوور راوەستێ، وە بە ئەدەب سلاّو

بکاو بڵێ: (السلام علیك یا رسول الله) یا بەیەکێ لەم شێوانەی دواوە سڵاو بکا. ئەمەیش بەپێی ئەم فەرموودەیە: دەگێڕنەوە: ئیبنو عومەر {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: وا سوننەتە کاتێ دەچیت بۆ سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەری نازدار {دروودو سڵاوو صەڵاوات و ڕەحمەتی خودای گەورەی لەسەربێ} لە ڕووی قیبلەوە بچیتو پشت بکەیتە ڕووگەو ڕوو بکەیتە گۆڕەکەو ئەوجا بڵێی: (السلام عیکم ورحمة الله وبرکاته).

دێنیکەر بۆی هەیە کە ئاوا سڵاو بکا: (السلام علیك یا خیر خلق الله، یا امام المتقین، یا سید المرسلین، انی أشهد أن لا اله الا الله وحده لا شریك له وأنك عبده ورسوله. قد بلغت الرسالة وأدیت الامانة ونصحت الامة فجزاك الله عنا أفضل ما جازی نبیا عن أمته. اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد کما صلیت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم انك حمید مجید. وبارك علی محمد وعلی آل محمد کما بارکت علی ابراهیم وعلی آل إبراهیم إنك حمید مجید الهمَّ انك قلت: ولو أنهم اذ ظلموا أنفسهم جاؤك فاستغفروا الله واستغفر لهم الرسول لَوَجَدوا الله تواباً رحیماً. وقد أتیتك یا رسول اله مستغفراً من ذنوبی مستشفعا بك الی ربی فأسألك یا رب أن توجب لی المغفرة کما أوجبتها لمن أتاه في حیاته. اللهم أجعله أول الشافعین یا أرحم الراحمین).

ئنجا بپاڕێتەوە بۆ باوكو دایکیو بۆ گشت موسوڵمانان، ئەگەر کەسێ ڕاسپێریی ئەوی کردبوو کە سڵاوی ڕابگەیەنێ بە پێغەمبەر، با سڵاوەکەی لەسەر ئەم شێوەیە ڕابگەیەنیو بڵێ: (السلام علیك یا رسول

الله) لـه جیاتی فیساری کوڕی فیسار، یا بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! فیسارەکەسی کوڕی فیسارەکەس سڵاوی لێ دەکردی ئەوجا بگەڕێتە دواوە بۆ لای راستی بە قەد گەزێو سڵاو لە ئەبو بەکری صەدیق بکا، وا باشە ئاوا سڵاوی لێبکا: (**السلام عليك يا خليفة رسول الله. السلام عليك يا صاحب رسول الله** *(صلى الله عليه وسلم)* **وأنيسه في الغار وأمينه على الاسرار. جزاك الله عن أمة محمد** *(صلى الله عليه وسلم)* **خيرا**): سڵاو لە تۆ ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا! سڵاو لە تۆ ئەی هاوڕێ ئازیزەکەی پێغەمبەری خوا! ئەی تاقە هاودەمە دڵسۆزەکەی ناو ئەشکەوتی ئەوری! ئەی ئەمینداری سەر رازو نهێنییەکانی! خودا لە باتی نەتەوەی موحەممەد پاداشتی باشت بداتەوە. ئەوجا بەقەد گەزێکی تریش بێتە دواوەو سڵاو لە حەزرەتی عومەر بکا، واباشە ئاوا بڵێ: (**السلام عليك يا أمير المؤمنين. السلام عليك يا ناصر المسلمين. السلام عليك يا من أعز الله به الاسلام. جزاك الله عن أمة محمد** *(صلى الله عليه وسلم)* **خيَرا**): سڵاوی خوا لە تۆ ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! سڵاو لە تۆ ئەی یاریدەدەری موسوڵمانان! سڵاو لە تۆ ئەی ئەو کەسە کە خواکردی بە مایەی سەربەرزی بۆ گەلی ئیسلام. خودای گەورە پاداشتی باشت لە جیاتی نەتەوەی موحەممەد بداتەوە (نەتەوە: واتە/ ئوممەت).

ئەگەر کەسێ ئەمەی بۆ نەدەکرا ئەمە بڵێ بەسیەتی: (**السلام عليك يا رسول الله**) نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەستووری وابوو کە لەسەفەر دەهاتەوە دەچوو بۆ مەزگەوت، ئەوجا دەچوو بۆ خزمەت مەرقەدی حەزرەتو دەیفەرموو: (**السلام عليك يا**

رسول الله، السلام عليك يا أبا بكر، السلام عليك يا أبتاه): سلاوت لێبێ ئەی پێغەمبەری خوا! سلاوت لێبێ ئەی ئەبو بەکر، سلاوی خوات لێبێ ئەو باوکە! (بەیهەقی). با دێنیکەر ئەوە بە باشی رەچاو بکا کە پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} گوێی لە سلاوەکەی دەبێ و وەلامی سلاوەکەی دەداتەوە، بەپێی ئەم فەرموودەیەیە: ئەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە پاش مەرگم، هەرکەسێ سلاوم لێبکا خودا گیانم دەکاتەوە بە بەردا تا سەلامەکەی دەسەندمەوە. (ئەحمەدو ئەبو داوو بەیهەقی بە رشتەیەکی دروست گێڕاویانەتەوە).

گەلێ دووپاتکراوەتەوە کە دەبێ دێنیکەر لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا زۆر دەنگ هەڵنەبڕێ و دەنگە دەنگ نەکات سائیبی کوڕی یەزید دەفەرموێ: لە مزگەوت پاڵکەوتبووم، پیاوێ چەوێکی تێگرتم، کە تەماشایم کرد عومەری کوڕی خەططاب بوو، فەرمووی: بڕۆ ئەو دوو کەسەم بۆ بهێنە، منیش چووم هێنامن بۆی، پێی فەرموون: ئێوە کوێندەرین؟ گوتیان: خەڵکی طائیفین، فەرمووی: ئەگەر نابەڵەد نەبوونایەو خەڵکی ئەم شارە بوونایە ئێشم پێ دەگەیاندن، چۆن لە مزگەوتی پێغەمبەردا {دروودی خوای لەسەربێ} دەنگە دەنگ دەکەن! (بوخاری رەحمەت لە گۆڕی نازداری).

وا سوننەتە کاتێ دێنیکەر سەردانەکەی تەواو دەبێ لەناو رەوضەی پیرۆزدا سلاواتێکی زۆر لێبدا، وە هەموو جارێ کە دەچێتە ناو مزگەوتەکەوە یەکسەر نێتی خەڵوەکێشان (اعتكاف) بهێنێ، هەتا لەو

کاتانەیشدا کە بە مزگەوتدا تێپەڕ دەکا هەر نێتی خەلوەکێشان بهێنێ، بە مەجێ بەقەد مانەوەی ناو سەجدەیەکی ئاسایی لەناویدا ئارام بگرێ.

## ١٨٠) سەردانی گۆڕستانی جەننەتولبەقیع و ئارامگای شەهیدانی ئیسلام:

سوننەتە لەو ماوەیەدا کەوا لە مەدینە هەموو رۆژێ سەردانی گۆڕستانی جەننەتولبەقیع بکا، بە تایبەتی لە رۆژی هەینیدا، سەر لە گۆڕەکان بدا. عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: هەموو جارێ کە سەرەی شەوی من بوایە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە کۆتایی شەودا دەردەچوو، دەچوو بۆ دێنی گۆڕنشینەکانی گۆڕستانی بەقیع و بۆیان دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (**السلام علیکم دار قوم مؤمنین، وأتاکم ما توعدون داً مؤجلون، وإنا ان شاء الله بکم لاحقون، اللهم اغفر لاهل بقیع الغرقد**): سلاوتان لێبێ ئەی دانیشتوانی شاری خامۆشان، ئەی ئەو موسوڵمانانەی کە ئەم گۆڕستانە بووە بەماڵی دوا رۆژتان؟ ئەو بەڵێنەی کە درابوو بە ئێوە کە ئەو زیندوانەی لە دوا ئێوەوە دێن، خوا ناخوا زوو یا درەنگ ئەوانیش دەمرن و دێن بۆ لاتان، ئەوا ئەو بەڵێنە رۆژ بە رۆژ دێتەجێ و هەر رۆژەی دەستەیێ دێن بۆ لاتان، ئێمەش خوا حەزکا پێتان دەگەینەوە، خودایە! لە دانیشتوانی گۆڕستانی بەقیع خۆش ببە. (موسلیم و بەیهەقی). بە تایبەتی سوننەتە دێنیی ئەو گۆڕانە بکا کە خاوەنەکانیان ناسراون، وەك گۆڕی ئیبراهمی کوڕی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} و گۆڕی عوسمان و عەبباس و حەسەنی کوڕی عەلی و کەسانی

تریش، وەدێنی یەکەی بەسەردانی گۆڕی صەفەییەی پووری پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} کۆتایی بهێنێ.

هەروا سوننەتە کە رۆژی پێنجشەمان زوو سەر لە بەیانی دێنیی گۆڕی شەهیدەکانی ئوحدود بکا، بە گۆڕی ئیمامی حەمزەی مامی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەست پێ بکا، کە ناودارە بەسید الشهداء، واتە: سەرووەری شەهیدان، با موسوڵمانی هۆشمەند کە پەرۆشی دینی خۆیەتی، لەکاتی سەرداندا، خۆی لە بیدعەتەکانی سەردان بپارێزێ، وەك باوەشکردن بە گۆڕداو ماچ کدرنیو سووڕانەوەو خولانەوە بە دەوریدا، یا خوانەخواستە لە خاوەن گۆڕەکە بپاڕێتەوەو داوای نیازو مرازو مەبەستو هاتنەدی شتی لێبکا، کە شتی وا بەس لە خوا داوادەکرێ، هەروا لەوەیش خۆی بپارێزێ کە لەلای گۆڕەکانیان نوێبکا، چونکە ئەوەی بەپێی شەرع رەوایە هەر ئەوەندەیە کە نزا بکاو بۆیان بپاڕێتەوە. بەبێ گومان داواکردنی مراز لێیانو سوێند خواردن لە خوا بەهۆی ئەوانەوە، بێ گومان شتی وا گومڕاییو کاری ناشایستەی تازەقەڵلایە، بە یەکێتی واتەی پێشەوایانی موسوڵمانان، کەس لە هاورێیانی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} شتی وایان نەکردووە. پێشەوایان بە یەك را دەفەرموون: واباشە بۆ کەسێ لەم شوێنانەدا نزا بکا روو بکاتە رووگە، نەوەك روو بکاتە گۆڕەکە.

## ١٨١) سەردانی ئەو مزگەوتانە كە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نوێژی لەناویاندا كردووە:

**گرنگترینی ئەو مزگەوتانە ئەم پێنجەن:**

١) مزگەوتی قوباء: دێنیی ئەم مزگەوتە سوننەتە، باشتر ئەوەیە كە لە رۆژی شەممەدا بكرێ. بەپێی فەرمایشتی ئیبنو عومەر {رەزای خوای لێبێ} كە دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هەموو رۆژێكی شەممان، بە سواریو بە پیادەیی، دێنیی مزگەوتەكەی قوبای دەكردو دوو ركات نوێژی تیادا دەكرد. (شەیخانو ئەبو داوودو نەسائیو بەیهەقی).

٢) مزگەوتی ئەلفەتح: دێنی ئەم مزگەوتە سوننەتە، هەروا نوێژكردنو نزاكردن لە ناویدا سوننەتە، بەپێی ئەم فەرموودەیە: جابیر كوڕی عەبدوللا {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} لە مزگەوتی ئەل(فەتح)دا، سێ رۆژ لەسەر یەك نزایەكی هەبوو دەیكرد لە رۆژی دوو شەممەو سێ شەممەو چوار شەممەدا، لە رۆژی چوار شەممەدا نزاكەی گیرابوو، خۆشی كەوتە روخساری! جابیر دەفەرموێ: ئیتر لەوكاتەوە هەركاتێ كارێكی گرنگی قورس یەخەی پێم گرتبێ منەی ئەوكاتەم كردووەو نزام تێیدا كردووەو نزاكەم گیرابووە. (ئەحمەدو بەزار).

ئیبنولحەكەمی كوڕی ئەوبان دەفەرموێ: كەسێ ئەم فەرموودەیەی بۆم گێڕاوەتەوە كە خۆی لە مزگەوتی ئەل(فەتح)دا لە پشتی پێغەمبەرەوە نوێژی كردووە، لە پاشا پاڕاوەتەوەو فەرموویەتی:

اللهم لك الحمد هديتني من الضلالة فلا مكرم لمن أهنت ولا معز لمن أذللت ولا مذل لمن أعززت ولا ناصر لمن خذلت، ولا خاذل لمن نصرت ولا معطى لما منعت ولا مانع لما أعطيت، ولا رازق لمن حرمت ولا رافع لمن خفضت ولا خافض لمن رفعت ولا خارق لمن سترت ولا ساتر لمن خرقت ولا مقرب لما باعدت ولا مباعد لما قربت): پەروەردگارم! سوپاس هەر بۆتۆیە، تۆ منت لەسەر لێشێواوی رزگارکردووە، ئەوەی تۆ تڕۆی بکەی بەکەس رێزدار ناکرێ، ئەوەی تۆ کەساسی بکەی بەکەس نازدار ناکرێ، ئەوەی تۆ نازداری بکەی بەکەس کەساس ناکرێ، ئەوەی تۆ پشتی نەگری بەکەس یاریدە نادرێ، ئەوەی تۆ یاریدەی بدەی بەکەس پشتی نادرێ لە زەوی، هەرچی تۆ نەیدەی بەکەسی تر نادرێ، هەرچێش تۆبیدە بەکەسی تر نابڕێ، هەر کەسێ تۆ بێبەشی بکەی بەکەس رزق‌و رۆزیی نادرێ، ئەوەی تۆ ژێری بخەی بەکەس سەرناکەوێ، ئەوەی تۆ سەری بخەی بەکەس ژێرناکەوێ، ئەوەی لە ژێر پەردەی تۆدا شارابێتەوە بەکەس ریسوا ناکرێ، ئەوەی تۆ ریسوای بکەی بەکەس نەنگی داناپۆشرێ، هەرچی تۆ دووری بخەیتەوە بەکەس نزیك ناخرێتەوە، هەرچیش تۆ نزیکی بکەیتەوە بەکەس دوور ناخرێتەوە (ئەحمەد).

٣) مزگەوتی ئەل(جومعە). لە فەرموودەدا دەفەرموێ: بە خودی خۆم نوێژی هەینیم لەپشت پێغەمبەرەوە کردووە، لەناو خێڵی نەوەی سالمی کوڕی عەوفا، لەو مزگەوتەدا کەوا لەناو شیوی رانووناداا، ئەو

هەینییەیش یەکەم نوێژی هەینی بوو، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە مەدینە کردی!.

٤) مزگەوتی ئەل(فەضیخ). ئەم مزگەوتە دەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی مزگەوتی قوباء. ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) لە مزگەوتی ئەل(فەضیخ)، مزراوی بەرسیلەی خورمایان بۆ هێنا، نۆشی کرد. (ئەحمەد). بۆیە ناونراوە مزگەوتی ئەل(فەضیخ)، چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کاتێ ئابلۆقەی جوولەکەکانی بەنی نەخێری دا، لە شوێنی ئێستای ئەم مزگەوتەدا دەوارەکەی خۆی هەڵدا. لەوێ چەند ڕۆژێ مایەوە، جالەو ماوەیەدا فەرمانی حەرام بوونی مەی و بادەهات بۆ پێغەمبەر، کە بەجۆرێ لە جۆرەکانی بە عەرەبی دەگوترێ ئەل(فەضیخ).

٥) مزگەوتی ئەل(ئەحزاب)، ئەم مزگەوتە لە سەردەمی حەزرەتدا دروست کراوە. جابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەشریفی چوو بۆ مزگەوتی ئەحزاب، بەرماڵەکەی شانی داناو بەپێوە ڕاوەستاو هەردوو دەستی بە درێژی بەرزەوە کردو دەستی کرد بەنزای شەڕ لە ئەحزاب، بەڵام لەم جارەدا نوێژی نەکرد، هەتا جارێ تر تەشریفی چووەوە بۆ ئەوێ وەنزای شەڕی لێ کردنەوە، ئەمجارەیان نوێژی لێکرد. (ئەحمەد)

## ١٨٢) سەردانی ئەو بیرانەی مەدینە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئاوی لێ نووش کردوون:

**ئەم بیرانە زۆرن، گرنگەکانیان ئەم پێنجەیەن:**

١) **بیری ئەریس،** دەکەوێتە لای خوارووی خۆر هەلاتی مزگەوتی قوبائەوە، ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە مۆری (محمد رسول الله)ی پێوە بوو، کە لە سەردەمی جێنشینی ئیمامی عوسماندا کەوتبووە لای ئەو، کە وتە ناو ئەم بیرەوە، گەلێکیش بۆ یگەڕان نەیان دۆزی یەوە.

٢) **بیری ئیهاب،** کە ئێستا ناسراوە بەبیری زەمزەم، ئاوەکەی لە ئاوی بیری زەمزەمی مەککە دەچێ، هەر لەبەر ئەوەش ناونراوە زەمزەم، چونکە ئاوی ئەمیش وەك ئاوی ئەو بۆ مووفەڕك ولاتەو ولات دەیبەن.

٣) **بیری بەیروحاء،** بیرێکە وا لە باخێکا، دەکەوێتە لای سەرووی شووراکەی مەدینەوە لەلای خۆرهەلاتەوە، گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەچوو لەبن سێبەری ئەو باخەدا دەحەسایەوەو لە ئاوەکەی دەخواردەوە.

٤) **بیری بوضاعە،** وا لەلای باکووری خۆرنشینی بەیروحائەوە، بۆ خۆشەوەبوون (واتە: بۆ شیفا) سێ رۆژ لە سەریەك خۆیان لە ئاوەکەی دەشۆرن. گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە ئاوی ئەم بیرەی دەخواردەوە.

٥) **بیری رۆمە،** کە ناوداره بە بیری عوسمان، چونکە خۆی کڕیو کردی بە وەقف. بیشری کوڕی بەشیری ئەسلەمی لە باوکیەوە

دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کاتێ کۆچکاران ڕوویانکرد بۆ مەدینە ئاوی شیرینیان دەست نەدەکەوت، پیاوێ هەبوو لە خێڵی بەنی غیفار کانیەتی هەبوو، ناوی ڕۆمە بوو ئاوەکەی سازگار بوو، پڕکوندەیەکی لێ دەفرۆشت بە پڕمستێ خۆراك، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: دەی فرۆشی پێم بەکانییەکی بەهەشت؟ پیاوەکە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! کۆشێ خێزانم هەیە، گوزەرانمان لەسەر ئەم ئاوەیە. جا ئەم گفتوگۆیە دەگاتەوە بە عوسمان {ڕەزای خوایان لێبێ} بیرەکە لە خاوەنەکەی دەکڕێ بە سیی‌و پێنج هەزار درەم، ئەوجا دەچێ بۆ خزمەت پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: عەرزی دەکا: قوربان! ئەو بەڵێنەی داوتە بە خاوەنی پێشووی بیری ڕۆمە، دەشی دەی بەمن کە من ئێستا خاوەنی ئەو بیرەم؟ پێغەمبەر {دروودی خوای گەورەی لەسەربێ} فەرمووی: بەڵێ، ئەگەرئەو کانییە دەفرۆشێ بەمن هەتا ئاوەکەی بە بەلاش بدەم بە موسوڵمانان، ئەوامن دەبم بە دەستەبەری ئەوەت کە خودا لە بەهەشتا کانییەك لەباتی ئەم کانییەت پێ دەبەخشێ! عوسمانیش فەرمووی: دەئەوا ئەو کانییەم تەرخان کرد بۆ خێراو بۆ موسوڵمانان (بەغەوی) هەق وایە بۆ ئەوکەسەی کە لە مەدینەی مونەوەرە زۆر بمێنێتەوە، سەردانی هەموو شوێنە پیرۆزە کان‌و گشت مزگەوت‌و سەرجەم مەڵبەندە ڕێزدارەکانی مەدینە بکا، دەنا ئەگەر کەم لەوێ بمێنێتەوە ئەوە واباشترە کە ئەوماوەیە لە خزمەت مەرقەدی حەزرەتدا بمێنێتەوە، لەم کاتەدا دەرفەت بە هەل بزانێ لە حوزوری گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرا بێ زۆر باشترە! خوا بە لوتفی خۆی ئەم زیارەتانە بکا بە نصیبمان سوننەتە چەندەی بۆ دەلوێ لە مەدینە بە ڕۆژووبێ، وە بەپێی توانا خێرو خێرات بەسەر هەژارانی خەڵکی مەدینەدا بکا، هەروا بەسەر هەژارە غەریبەکانا.

## ۱۸۳) دەستووری گەڕانەوە:

سوننەتە بۆ ئەوکەسەی کە دەیەوێ لە مەدینەی نازدار دەربچێو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، بە دوو رکات نوێژی سوننەت خواحافیزی لە مزگەوتە پیرۆزەکەی پێغەمبەر بکا، بە نیازی سوننەتی خواحافیزیی مزگەوتەکە بیانکات، لە رکاتی یەکەما لە پاش فاتیحە سوورەتی: {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ} بخوێنێ، لە رکاتی دووەما لە پاش فاتیحە ئیخلاص بخوێنێ، بۆ هەموو خواستو مرازێکی ئایینیو جیهانی خۆی بە ئارەزووی خۆی لە خوا بپاڕێتەوە، کۆتایی نزاو پاڕانەوەکەی بە سوپاسی خواو سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر بهێنێ! هەر لەوێدا تەوبە تازە بکاتەوە، ئەوجا زیارەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر بکا، لەسەر شێوەی یەکەم جارو بڵێ: (اللهم لا تجعل هذا آخر العهد بنبيك ومسجده وحرمه ويسر لنا العود الى زيارته والعكوف في حضرته سبيلا سهلا، وارزقني العفو والعافية في الدنيا ولآخرة): خودایە! ئەمە دواجار نەبێ کە بەخزمەت ئەم پێغەمبەرەی تۆو بە خزمەت ئەم مزگەوتەیو ئەم حەرەمەی بگەم، ئەی خودایە! بە ئاسانی جارێکی تریش سەردانی ئەم شوێنەم بۆ فەراهەم بێنە، کە لە خزمەتی حەزرەتدا چەن دەمێکی پڕپیتو فەڕ بمێنمەوە، خودایە! ببورە لێمو ئاسوودەیی هەردوو جیهانم پێ ببەخشە[1] ئەوجا بڕوا بۆ بەرابەر

---

[1] کۆتری نامەبەر: شنەبای رەحمەت
رابەری نێوان حەزرەتو ئوممەت!
تکام ئەوەیە: کە بەبێ زەحمەت

روخساری پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بەڵام پشتاو پشت نەڕوا، لەوێدا بفەرموێ: (**اللهم إنا نسألك في سفرنا هذا البر والتقوى ومن العمل ما تحب وترضى**): خوایە! ئەم سەفەرەم بۆ بکە بە مایەی خێرو خۆشیو تەقوای تۆ، خوایە! ئەو کارو فرمانانەی کە دەبن بەهۆی خۆشەویستیو ڕەزای تۆ بە نصیبمانی بفەرموو.

سوننەتە کە لە مەدینەوە دیاری ببا بۆ کەسوکاری، وەك خورماو شتی تری وا، سوننەتە لەسەر بەرزاییەکان ئەڵڵاهو ئەکبەر بکاو بە یەکێ لەو نزایانە کە باسکران نزابکا. لە ئیبنو عومەرەوە {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: جاران کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} کە لە غەزا یا لە حەج یا لە عەمرە دەگەڕایەوە کە سەردەکەوتە سەر گردو یاڵو بەرزاییەکان، سێ جار بە دەنگی بیسراو ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، ئەوجا دەیفەرموو: (**لا اله الا الله وحده لا شريك له. له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير، آيبون تائبون عابدون ساجدون لربنا حامدون، صدق الله وعده ونصر عبده، وهزم الاحزاب وحده**): هەر خودا خودایەو بەس! هیچ خودایەکی تر نیە، خودایەکی تاكو تەنیایە، هیچ

---

ئەم نامەم بەری بۆ خزمەت حەزرەت:

لە پاش بەیانی عەرزی سلاوم!

ئاواتی گەورەم، ئەی نووری چاوم:

(بەگەردی گۆڕت برێژم چاوم

بەڵکوو بینا بێ هەتاکوو ماوم!)

- وەرگێڕ -

هاوبەشێکی بۆ نیە، موڵكو دارایىو پاشایەتیو سەڵتەنەتو سوپاسو ستایش هەمووی لە راستیدا بۆ ئەوە، وە ئەو خودایەکی وایە دەستی دەڕوا بەسەر هەموو شتێکاو تەواناى هەموو شتێکى هەیە، ئەوا لە سایەی خوداوە دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەمان، پەشیمانین لە گوناهەکانمان، هەمیشە بەندەیی ساخ بۆ خودای پەروەردگارمان دەکەینو، لە سوپاسو ستایشی درێغی ناکەین، خودا بەڵێنی خۆی هێنایەدی، موحەممەدیی بەندەی خۆی سەرخستو بە تەنیا خۆیو بەس ئەو کافرانەی کە بە لەشکرێکی گەلێ زۆرەوە گەلەکۆمەیان لە ئیسلام کردبوو، ژێری خستنو شکاندنی. (بەیهەقی گێڕاویەتەوە).

جا کاتێ حاجی گەیشتە دەورو بەری شاری خۆی بە ناوی خودا بهێنیو بڵێ: (آیبون تائبون عابدون ساجدون لربنا حامدون. **صدق الله وعده ونصر عبده وهزم الاحزاب وحده، اللهم اجعل لی فیها قرارا ورزقا حسنا**). وا باشە کە کەسێ بنێرێ هەواڵ بدا بە کەسوکاری کەوا دێتەوە، وە لەناکاوا نەکا بەمالا، کاتێ گەیشتە ناو شارو دێکەی خۆی با لە پێشدا بچێ بۆ مزگەوتو دوورکات نوێژی دیاری مزگەوتی تیادا بکا، ئەوجا بچێ بۆ ماڵەوەی، لە ماڵەوەیش دوو رکات نوێژی سوننەت بکا. بەپێی ئەم فەرموودەیەی نافیع لە ئیبنو عومەرەوە دەیگێڕێتەوە: دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} کە لە سەفەری حەجەکەی گەڕایەوە، کە گەیشتە ناو مەدینە وشترەکەیی پیخدا، لەبەر دەرگای مزگەوتەکەدا، ئەوجا رۆیشتە ناویو دوورکات نوێژی لێکرد، لە پاشا رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. نافیع دەفەرموێ: عەبدوڵلای

کوڕی عومەریش ئەمە دەستووری بوو. (ئەحمەدو ئەبو داوود بە ڕشتەیەکی باش ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە).

## ١٨٤) بە پیرەوەچوونی حاجیو پیرۆزبایی لێکردنی:

سوننەتە دۆستو برادەرو ناسیاو بچن بەپیر حاجییانەوە، پێش ئەوەی بگەنەوە ماڵی خۆیان، بەخێرهاتنیان لێبکەنو تەوقەیان لەگەڵدا بکەنو داوای نزای خێریان لێبکەنو پیرۆزباییان لێبکەن، وەك ئەوە پێیان بڵێن: (**قبل الله حجك وأعظم أجرك وأخلف نفقتك وغفر ذنبك**): خوا حەجەکەت گیرا بفەرمویٚ، پاداشی فرە گەورەت بداتەوە، مەسرەفەکەتت بۆ پڕبکاتەوە، لە گوناهت خۆشبیٚ. ئیبنو عومەر {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرمویٚ: پێغەمبەر خوا {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: کاتیٚ گەیشتی بە حاجی کە لە سەفەری حەجدا بوو، پێش ئەوەی بچێتەوە ناو ماڵی خۆی، سڵاوی لێبکەو تەوقەی لەگەڵدا بکەو داوای لێبکە کە بۆت لە خودا بپاڕێتەوە، چونکە ئەو لەوکاتەدا گوناهی پێوە نەماوە، وەك منالی ساوا بێگوناهە، جا با هەتا تێکلاوی گوناه نەبۆتەوە بۆت بپاڕێتەوە. (ئەحمەدو حاکم). حاکم دەفەرمویٚ: ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی ساخی دروستە، چونکە بەپێی مەرجی صەحیحی موسلیمە.

## ١٨٥) چەن کارێکی ناشایستەی تازەقەڵلا کە لەناو حەجو زیارەتدا سەریارن هەڵداوە:

حاجیان گەلێ کاری ناشایستەی تازەقەڵلایان داهێناوە، ئەوەیش لەناو حەجو لەکاتی سەردانی ئارامگای پیرۆزی حەزرەتدا. گەلێ مۆدەی ناشایستەیان بەپاکردووە، کەشتی وا لە شەرعی خوادا نەبووە. شەیتانی لەعنەتی لەبەر چاویانی جوان کردووە هەتا بەو فێڵە تەفرەیان بداو لە بەهرەی گەورەی حەجو لە پاداشی باشی بێ بەشیان بکاو، هەتا لە راستەرێگەو شەقامەرێی راست هەڵەیان بکا یەکی لەوانە: پێشخستنی عەرەفەیە لەسەر کاتی شەرعی خۆی، کە برێتییە لە نێوان نیوەڕۆی رۆژی عەرەفەو شەبەقدانی بەیانی رۆژی جەژن. ئیبنو ئیسحاق دەفەرموێ: نافیع قسەی بۆ کردم، لە ئیبنو عومەرەوە {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} سەر لەبەیانی رۆژی عەرەفە، لە پاشکردنی نوێژی بەیانی، لە میناوە تەشریفی هێنا بۆ چیای عەرەفە، جا لە نەمیرە دابەزیو لەوێ مایەوە تا خۆرلای دابوو بە نیوەڕۆ، ئیتر زووبەزوو بەو قرچەی نیوەڕۆیە کەوتەڕێو نوێژی نیوەڕۆو عەصری بە جەمعکرد، وتارێکی بۆ مەردوومەکە دا، ئەوجا سەر لە ئێواری رۆیشت لە ئێستگاکەی خۆی لە چیای عەرەفات راوەستا. (ئەبو داوود).

**یەکێ تریان:** لە بیرو باوەڕی رەشەخەلکەکەدا هەرچیای _جبل الرحە)، جێگەی راوەستانی بە راستییە، وە شوێنەکانی تری وانییە، ئەمەیش هەڵەیەکی گەورەیە، بەلکوو باشترین شوێنی راوەستان،

ئێستگاکەی حەزرەت خۆیەتی، کەوا لەلای تاوێرە بەردەکانی داوێنی کێوی جەبەلورەحمەوە لەلای چەپی کێوەکەوە، کە ئەم چیای رەحمەتە خۆی وا لە ناوەڕستی خاکی عەرەفاتدا. بەپێی ئەم فەرموودەیەی سولەیمانی کوڕی مووسا، لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە {رەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: عەرەفات گشتی ئێستگایە، بەڵام پەڕ لەناو شیوی عورنەبگرن، ئەو شیوە بەرخاکی عەرەفات ناکەوێ. (ئەم فەرموودەیە ئەحمەدو بەزارو تەبەرانی لە (المعجم لکبیر)دا گێڕاویانەتەوە، پیاوانی رشتەی تەبەرانی گشتیان متمانە پێکراون).

**یەکێ تریان:** حاجیان رۆژی عەرەفە، کە نۆی مانگە، لە نیوەڕۆدا لە مەککە دەردەچنو یەکسەر دەچن بۆ عەرەفات، لەبەر ئەوە گەلێ سوننەت لە کیس خۆیان دەدەن، چونکە خۆی وا سوننەتە، لە رۆژی تەروییەدا، کە دەکاتە رۆژی هەشتەمی مانگی نۆمینە، لەپاش خۆرکەوتن، لە مککە دەربچنو بەرەو مینا بجمێنو نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوانو خەوتنان لەوێ بکەنو ئەو لەوێ بمێننەوە هەتا بەیانی رۆژی نۆهەم، وە نوێژی بەیانیش هەر لەوێ بکەن، جا لە پاش هەتاو هەڵهاتن ئەوجا لە میناوە بەرەو خاکی عەرەفات بکەونەڕێ، وە لەڕێ کاتێ گەیشتنە نەمیرە کە شوێنێکە وا لە نزیکی عەرەفاتەوە، دابەزنو لەوێ بمێننەوە هەتا بیوەڕۆ، ئەوجا لە پاش نیوەڕۆگوێ بۆ وتاری میرحەجی ئەوساڵە رابگرن، لەپاش تارەکە لە مزگەوتی نەمیرە نوێژی نیوەڕۆو عەصر بە جەمعە تەقدیم بکەن. جابیر {رەزای خوای گەورەی لێبێ} سەبارەت بە چۆنێتی حەجەکەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: {درودی خوای

لەسەربێ} دەفەرموێ: جا لە رۆژی تەروییەدا کە دەکاتە رۆژی هەشتەمی مانگی قوربان، بەرەو مینا کەوتنەڕێ‌و ئیحرامی حەجیان بەست، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سوار بوو، وە نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوان‌و خەوتنان‌و بەیانیی لەوێ کرد، ئینجا لەوێ کەمێ مایەوە تا خۆر هەڵهات.

**یەکێ تریان:** رابەر حەج (موتەوویف)ەکان، لە پێش خۆر ئاوا بوونا، لە عەرفەوە حاجیەکان دادەپەڕێنن، یەکسەر لە عەرەفاتەوە بۆ مینا، وەشەو لە موزدەلیفە نامێننەوە، جا ئەو سوننەتە گەورەیان لە کیس دەچی. ئەمە لە کاتێکدا کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە موزدەلیفە شەو ماوەتەوەو، نوێژی بەیانی لەوێ کردووەو، رێگەی بە کەس نەداوە کە بەشەو لە موزدەلیفەوە بڕوا بۆ مینا، تەنیا بۆ ژنان‌و لازەبوونەکان رێگەی دەدا، هەروا ئەو سوننەتەیش لەکیس حاجیان دەدەن کە بۆ چوونە ناومەککەیان، لەبیر زی تەوا خۆیان بشۆرن، هەروا پەلەپەل لە حاجیان دەکەن‌و ناچاریان دەکەن کە لەپێش نیوەڕۆی رۆژی دوازدەهەمی مانگی قورباندا رەجمی شەیتان بکەن، ئەمە لەکاتێکا کاتی هاتنی ئەم رەجمە لەپاش نیوەڕۆی ئەو رۆژەوە دەست پێ دەکا.

**یەکێ تریان:** مەردوم لە پێش کاتدا، بۆ ماوەیەکی زۆر، بۆ ئەوەی لە نزیکی کابەدا بن، لە دەوری کابە، لەسەر تەوافگاکەی دەوری کابە، دادەنیشن‌و چاوەڕوانی نوێژی جەماعەت دەکەن‌و دەبن بەهۆی زیانێکی زۆرو رێ لە تەوافکەرەکان دەگرن‌و کێشەیەکی زۆر لەناو خۆیان‌و تەوافکەرەکاندا بەرپا دەکەن.

**یەکێ تریان:** ئەوەیە لەکاتی جەماعەتکردن لە ناو مەسجدولحەمدا زۆر لە حاجیان لە باتی ئەوەی لە ریزی جەماعەتدا بن دەچن خەریکی تەوافی سەفاو مەروە دەبن!.

لە گشتی ناخۆشترو دڵ تەزێنتر ئەوەیە کە لەکاتی جەماعەتی نوێژی شێوانیشدا، کە ماوەکەی زۆر کەمە، هەمان هەڵە دەکەنو خەریکی ئەم تەوافە دەبن، هەتا نوێژی شێوانیان دەچێ!.

دەی چۆن ئومێدی خێر لە کەسانی وا دەکرێ، کە بەقەستی فەرزێ لە فەرزەکانی خوا بچوێنن، وەلحاڵ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کەسێ نوێژ نەکا فرێی بەسەر ئیسلامەوە نیە! (ئەحمەد).

## ١٨٦) ناشایستەکانی ناوسەردانی گۆڕی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}:

بەڵێ بە راستی دێنیی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەری نازدار {دروودی خوای لەسەربێ} یەکێکە: لەو تاعەتە هەرە گرنگو هەرە باشانەی کە دەبن بەهۆی نزیکبوونەوە لە خوا، دێنیکەر لە هەردوو جیهاندا سەری پێی بەرز دەبێو، دەبێ بە مایەی بەختیاریی بۆیو دەیگەیەنێ بە ئاواتو مرازی خۆی. بەلام هەمیشە شەیتان وا لە کەمیندا، بۆ ئەو کەسانەی کە حەزیان لە خێرو چاکە هەیە، دەچێ شتی نارەوای تازەقەلایان لەناو تاعەتەکەیاندا، لەبەرچاو جوان دەکا، هەتا لە رەزای خوای پاکو پیرۆز دووریان بخاتەوە. یەکێ لەم کارە ناشایستانە لەکاتی سەردانی گۆڕی

پیرۆزدا ئەویە: دێنیکەرەکان دەچن دەست دەهێنن بە مەحەجەری گۆڕەکەداو ماچی دەکەن‌و خۆیانی تێ هەڵ دەسوون‌و بەدەوریدا وەك تەواف هەڵ دەسووڕێن‌و لەناو نوێژدا رووی تێ دەکەن‌و خۆیان دەچەمێننەوە بۆ گۆڕە پیرۆزەکە. لە گشتی دزێوتر ماچکردنی زەوی ناو هۆدەی گۆڕی پیرۆزە. ئەمانەیش هەمووی بە یەکگرتنی رای زانایانی ئیسلام کاری ناڕەواو نادورستن، چونکە لە کوڕنووشێ دەچێ کە بۆ کەسێکی تر بێ بێجگە لەخوا[1].

---

(١) لەو بڕوایەدام ئەم قسانە زیادە رەوییی زۆریان تیادایە، راستە لە ئیسلامدا کوڕنووش‌و روکوع‌و پەرستش بە هەموو جۆرێکیەوە هەر دەبێ بۆ خوابێ، وە بابەتی عیبادات هەمووی تەوقیفییە، دەبێ فەرمانی رۆشنی شەرعی لەسەربێ، بەلاّم عادات لە عیبادات جیایە، لە عاداتا باوو دەستوورو نەریت بەپێی رۆژو کات‌و حاڵ‌و چاخ دەگۆڕێ رێزلێگرتن‌و خۆشەویستی‌و تەعبیر لە هەستی مرۆڤ بەرابەر بە کەسێ کە خاوەنی چاکە بێ لە سەری، ئایا ئەو کەسە مردوو بێ یا زیندوو، بەپێی کات‌و شوێن شیاوی گۆڕانە، کەواتە: ئەگەر کەسێ بلێ: ماچکردنی گۆڕی پێغەمبەر {درוودی خوای لەسەربێ} نیشانەی زیادە خۆشەویستییەو لەبەر هیچی تر نیە، قسەکەی رێی تێ دەچێ‌و پەسەندیش دەکرێ. لەبەر ئەم چەند هۆیە: پێغەمبەر {درוودی خوای لەسەربێ} حەجەرولئەسوەدی ماچکردووە، ئەویش هەر دارو بەردە، حەزرەتی ئەبو بەکری صەدیق {رەزای خوای لێبێ} بە مردوویی پێغەمبەری ماچکردووە، کەواتە: ماچکردنی مردوو لەزاتی خۆیدا بۆ تەعظیم نیە، بۆ مەحەبەت‌و خۆشەویستییە، کەوا بێ ماچکردنی گۆڕەکەیشی هەروا، لە راستیدا هەر شتێ بەڵگەیەکی رۆشن لەسەر نەهیی لێکردنی نەبێ، وە لە ریزی باوی ناو کۆمەڵ‌و لەبەشی عاداتبێ، ئەوە کردنی ئەوە دانانرێ بە خەرقێکی گەورە لە ئیسلامدا، وەك هەندێ کەس بۆ تەرویجی حیزبی خۆیان هەڵەیەکی

بچووکی پێشینان گەورە دەکەنو دەیکەن بە هاتو هاوارو گاڵەگاڵ. ئەگەر کەسێ سەرانسەری سوننەتی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} بگەڕێ، بەڵگەیەکی صەریحی دەست ناکەوێ کە بڵێ ماچکردنی قەبر حەرامە!.

**بەندە مەبەستم یەك خاڵەو بەس:** دەبێ رەخنە گرتن لە بیدعەت مەبەست لێی موحارەبەی مەزهەبەکان نەبێ، چونکە بەراستی هەوڵ دان بۆ تێکدانی ئەم مەزهەبانە، بەناوی جەنگکردن لەگەڵ باوی ناشایستەو قەلاچۆکردنی بیدعەتەوەو تەحریفی ئیسلامە چونکە ئەوەی ئەبو حەنیفەو مالكو شافیعیو نەوەویو رافعیو زوفەرو ئەبو یوسفو ئیبنو حەجەر {رەزای خوایان لێبێ} کردوویانە بەم موجتەهیدانی ئاخرزەمانانە ناکرێ، کە یەکی شەش حەوت حەدیسیان لە بەرەو بەس. بگرە زۆریان بازرگانی بە کتێبو نووسینو خامەکانیانەوە دەکەنو بە دڵی ئەم لایەنو ئەو حاکمو ئەو پارەدار قسە دەکەن!.

ئەمانە لە کوێو زاتێکی وەك ئیمامی نەوەوی لە کوێ کە ساڵ دوانزە مانگەی خوا بە رۆژوو بووەو دەستێ جلی خامی لەبەردا بووەو مێزەرێکی شاڵی بەسەروە بوو، لەگەڵ جووتێ سۆڵو مەسینەیەکاو ئاو بێنەوە دەست بشۆ!.

برابیکەن بە خاتری خوا ئێوەیش مەبن بە سیاسەتمەدارەکانمان، ئەوان ژیانی دنیایان لێ تاڵ کردووین، دەی ئێوەیش (خوانە خواست) لە دیندا سەرمان لێ بشێوێنن ئیتر قوڕی کوێ بەسەر خۆماندا بکەین؟!.

وەڵڵا برا من کە نووری فارس حەمەخانم: (أموت علی ما مات علیه النووی، رضوان الله تعالی علیه) بەڵام لە هەمان کاتدا ئەگەر دەمزانی کە شتێ پەڕیوەتە ناو مەزهەبی شافیعییەوە، وە ئەو شتە سوور بە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرەوەیە، ئەوە ئەرکی سەرشانمە کە ئەو هەڵەیە، بەبێ قڕەو تەپڵ لێدانو تەکفیرو تۆمەتی ئیشراك لەمو لەو، راست بکەمەوە! ئەمە لە کۆنیشدا هەروا بووە، کتێبە ناودارەکانی شەرع پڕن لەم جۆرە رەدوبەدەلەی من عەرزتانی دەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا وەك ئەمڕۆ ئاوا شاڵاوی

یەکێ تر لەو کارە ناشایستانە کە لەکاتی سەردانی گۆڕی پیرۆزدا دەکرێ ئەوەیە: کە خەڵکی مەدینەو خەڵکی شوێنانی تریش لەلای رۆژهەڵاتی مەرقەدەوە دەوەستنو سەڵاوات لەسەر جوبرائیلو میکائیلو ئیسرافیل دەدەن، ئەمە کارێکی تازەقەڵای ناشایستەیە سەربەڵگەی لە سونئەتدا نیە!.

**یەکێ تریان:** ئەوەیە کە خەڵکی مەدینە کردوویانە بە عادەت لەپاش سڵاوکردن لە ئەبو بەکرو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەڕۆن بۆ

---

بەروالاّ بۆ فەوتانی مەزهەب نەبووە. بۆ نموونە: ئەگەر ئێمە حوکم بە قیاس بکەین دەتوانین. (استلامی قەبرو تەقبیلو رووتێکردنی لە نوێژداو تەواف بە دەوریداو باوەشدان لە مەحجەرو قەراخەکەی بە قیاس اسبات بکەین). چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خۆی حەجەرولئەسوەدی ماچکردووەو تەوافی بەیتی کردووەو دەستی هێناوە بە مولتەزەمداو رووی خۆی نووساندووە بە دیواری کەعبەوەو نوێژی مردووی لەسەر تەرمو لەسەر گۆڕ کردووە، واتە: لە نوێژەکەدا رووی لە تەرمەکەو لە گۆڕەکە بووە، دەی دەبێ گۆڕی پێغەمبەر چی لە حەجەرولئەسوەد کەمتر بێ؟ ئەگەر مەسەلەی بەردوداروو مردووە، هەر دوو حاڵەکەبەردودار مردووە، کەواتە: بۆ لایەکیان خالیصی تەوحیدەو ئەولایەکە یتر یان مەحزی اشراکە!

ئازیزان! قوربانتان بم، مەبەستم ئەوە نیە کە بەرگری لە بیدعەت بکەم، بەخوا لە زۆر کەس زیاتر لە دژی بیدعەتم، بەڵام مەبەستم ئەویە کە دینەکە نەبێ بە دینی ئەحزاب، دەنا بە خودا حاڵ دەگاتە ئەوە ئایەتەکانی قورئان لە سوچی سەیارە دەنووسرێن: (الا هل بلغت اللهم فاشهد). تکام ئەوەیە بە چاوی ویژدان سەرنجی ئەم سەرنجە بفەرموون.

- وەرگێڕ-

سەردانی گۆڕی فاطیمەی زەهرا، ئەوجا دەگەڕێنەوە بۆ ئیستگای جاری یەکەمیان بۆ بەردەم گۆڕی پیرۆز، لەوێدا ئێستێکی بچکۆلانە دەکەنەوە، ئەوجا دەچن بۆ لای میحرابی عوسمانی، لەوێ بەرەو قیبلە دەوەستن و دەست دەکەنەوە بەنزاو پاڕانەوە، شتی وا لە سوننەتدا بێ سەرو بەرەو سەربەلگەی نیە!.

**یەکێ تریان:** ئەویە دێنیکەرەکان لەپاش هەموو فەرزێ (جگە لە نوێژی خەوتنان) ریز دەبەستن و بەیەك قیژە سلاو لە پێغەمبەرو دوو هاوڕێکەی دەکەن و، لەپاش رابەری سەردانەوە (واتە: موزەووير) هەموو بە یەکەوە بەدنگێکی ناسازی هەراسانکەر بە چریکە سەلاوات لەسەر پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەدەن، ئەمەیش کارێکی زۆر ناپەسەندی دزێوە، بەپێی قورئان و سوننەت و ئیجماعی نەتەوەی ئیسلام حەرامە. خوای گەورە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ - سورة الحجرات - ٤٩/٢}.

**ئیجماعی ئوممەت لەسەر ئەوەیە:** کە قەدرو رێزی پێغەمبەری خودا {درووودی خوای لەسەربێ} بە مردوویش رێك وەك حالی ژیانی وایە، سەرەڕای ئەمانەیش ئەوەتا خودا لە قورئاندا پەسنی ئەو زاتانە دەکا، کە لە خزمەتی حەزرەتدا بە ئەدەبەوە بە دەنگی نزمی پڕ لە رێزو قەدر قسەو گوفتوگۆ دەکەن و مزدەی گەورەی لەسەر ئەم بەهرەیە پێداون، وەك دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ - سورة

الحجرات - ٣/٤٩} له هەمان كاتدا زەمی كەسانێكی تر دەكا، لەسەر ئەوە كە لە خزمەتی حەزرەتدا (درودی خوای لەسەربێ) دەنگیان بەرزەوەكردووەو نەفی هۆشیان لێدەكا. دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ - سورة الحجرات - ٤/٤٩} دەگێڕنەوە جارێ ئەبو جەعفەری مەنصوور گوفتوگۆیێ لەگەڵ ئیمامی مالیكدا سازدەدا، لە مزگەوتی حەزرەتدا (درودی خوای لەسەربێ). ئیمامی مالیك (ڕەزای خوای لێبێ) پێی دەفەرموێ: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! لەناو ئەم مزگەوتەدا دەنگت بەرزەوە مەكە، ئەوەتا بە ڕاشكاوی خودا لە قورئاندا كەسانێ فێری وێڵو ئەدەب دەكاو پێیان دەفەرموێ: {لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ}، تا كۆتایی ئایەتەكە. لە هەمان كاتدا زەمی كەسانێكی تر دەكاو دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ... جا منصور: فەرمانی ئەم ئایەتانەی قەبووڵكرد.

**یەكێكی تریان:** پشتو سك نووساندنە بە گۆڕە پیرۆزەكەوەو دەست پیاهێنانیەتی، ئەوە زۆر ناپەسەندە، چونكە ئەدەب وا دەخوازێ لەحاڵی مردنیشدا بەقەدحاڵی ژیانی دێنیكەر كەمێ دوور لە خزمەتی حەزرەتدا ئامادە بێ ئەوەیش بیروباوەڕێكی ناپەسەندە، كەرەشە خەڵكەكە گومان وادەبەن كە گوایە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەركەسێ لەیەك ساڵدا سەردانی گۆڕی منو گۆڕی ئیبراهیمی بابام بكا، دەبم بە دەستە بەری بەهەشت بۆی! فەرموودەی وا بێ سەرو بەرە، پووچو دەست هەڵبەستە، شتی وا لە سوننەتدا نەبیستراوە! (تەماشای: ارشاد الناسك بكە - پەراوێزی ئەصڵەكە).

## ١٨٧) کڕین و فرۆشتن:

فرۆشتن لە زمانا وەرگرتنی شتێکە لەبری شتێکی تر. لە شەرعدا: گۆڕینەوەی ماڵە بە ماڵێکی تر، کە شیاوی کەردان پێکردن بن، لەسەر شێوەی ئیجابو قەبووڵ، بە جۆرێ خاوەنداریی پێ دابمەزرێ.

**بەڵگەی ڕەوابوونی:**

سەر بەڵگەی (ئەصڵ)ی ڕەوا بوونی قورئانو فەرمووده و یەکگرتنی نەتەوەیە (ئەصڵ لە ڕەوادیتنی کڕینو فرۆشتندا کیتابو سوننەتو ئیجماعی ئوممەتە) یەزدانی مەزن دەفەرموێ: {وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا – سورة البقرة – ٢/٢٧٥} واتە: خوا کڕینو فرۆشتنی ڕەوادیوە، بەڵام سەوداو مامەڵەی سوودی ڕەوانەدیوە). پێغەمبەری خۆشەویستو نازداریش (دروودی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ) دەفەرموێ: کڕیارو فرۆشیار هەردوو لایان خۆیان سەرپشکنو دەتوانن پەشیمان ببنەوە لە سەوداکەیان هەتا لە یەکتری جیا دەبنەوە هەتا لە یەکتری جیادەبنەوە. (شەیخانو ئەحمەدو نەسائیو ئەبو داوودو تیرمیزی گێڕاویانەتەوە).

یەکگرتنیش واتە: إجماعیش لەسەر ئەمە دامەزراوە.

**(بنیاتەکانی – ئەرکانەکانی):**

(بڕوانە: مختصری صحیحی بوخاری بە کوردی بەرگی سێیەم لاپەڕە: (٥) هەتا لاپەڕە (٦٩) واتە: لە ژمارە (٩٣٣)وە هەتا ژمارە (٩٩٧).

## بنیاتەکانی کڕین و فرۆشتن چوارشتن:

**یەکەم**: فرۆشیار.

**دووەم**: کڕیار.

**سێیەم**: فرۆشراو.

**چوارەم**: گوتەی گرێدان، کە برێتییە لە (صیغە: دارێژگە) واتە: لەو قسەیەی کە لە نێوانی فرۆشیارو کڕیاردا دەبێ، کە جێبەجێکردنی ئەو کڕین و فرۆشتنە دەگەیەنێ کە برێتییە لە کردنە قەباڵ و قەبووڵکردن (ئیجاب و قەبوول). پێویستە کڕیارو فرۆشیار چەند مەرجێکیان تیادا بێتەدی: مەرجە کڕیارو فرۆشیار کڕین و فرۆشتنیان لە باردابێ، کەواتە: مامەڵەی منداڵ و شێت و کەمهۆش دانامەزرێ، هەروا مەرجە کە مامەڵەکە بە ئارەزووی خۆیانبێ، نەك بە زۆری کەسێ، مەگەر بە زۆری شەرع، وەك ئەوە کەسێ قەرزی لەسەر بێ و کاتی دانەوەی هاتبێ و قازی زۆری لێبکا، کە هەندێ لە ماڵی خۆی بفرۆشێ هەتا قەرزەکەی پێ بداتەوە، یا پارەی سەلەمی دادابێ و قازی ناچاری بکا کە سەلەم تیاکراوەکە بکڕێ و وەری بگرێ لە جیاتی پارەکەی. گوتەی گرێدانیش برێتییە لەو قسەیە کە کردنە قەباڵ و لێوەرگرتنی پێ دامەزرێ، وەك ئەوە فرۆشیار بڵێ: ئەوەم فرۆشت بە تۆ، یا تۆم کرد بە خاوەنی، یاخود وەك ئەوە کڕیار بڵێ: ئەوا وەرم گرت، یا ئەوا کڕییم لێت، کەواتە: فرۆشتن و کڕین تەنها بە ئاڵوگۆڕی پارەو ماڵ کە پێی دەڵێن (موعاطات: ئاڵو گۆڕ: لەیەك وەرگرتن) بەبێ گوتەی گرێدان دانامەزرێ.

بەڵام ئیبنو شورەیح دەفەرموێ: فرۆشتن بە شێوەی ئاڵوو گۆڕ (واتە: بەبێ گوتەی گرێدان) دادەمەزرێ لە شتێکا کە گران بەهانەبێ، بەپێی باوی دامەزراوی ناو کۆمەڵ، رەویانیو کەسانی تریش بڕیاریان بەمە داوە. مالیکیش دەفەرموێ: بەڵێ فرۆشتن دادەمەزرێ لەسەر هەر شێوەیێ بێ بە مەرجێ مەردوم، لەناو خۆیاندا ئەو شێوەیە دابنێن بە فرۆشتن، ئیبنو صەبباغیش ئەمەی لەلا پەسەندە. نەوەویش {رەزای خوا لە هەموویان بێ} دەفەرموێ: ئەم رایەی کە ئیبنو صەبباغ پەسەندی کردووە رایەکی سەنگینە، سەبارەت بە بەڵگە، لەبەر ئەوە دادەنرێ بەرای هەڵبژاردە، چونکە لە راستیدا لە شەرعدا، مەرج بوونی قسە بۆ دامەزراندنی گرێدان، دیاری نەکراوە، کەواتە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەر باوی ناوکۆمەڵ کە پێی دەگوترێ (عورف: باوی باشی ناوکۆمەڵ کە خەڵك بە ئاشکرا، بەبێ شەرمو شکۆ، لە بەرچاوی خەڵك بیکەنو ئەو باوە بەرەبەرە لەناو کۆمەڵدا بناسرێو دابمەزرێ، بەبێ رەخنەلێگرتن) یەکێ لەو کێشانەی کە هەموان پێی گیرۆدەبوون ئەوەیە: بووە بەباو لە هەموو وڵاتێ کە لەبەر ناچاری مەردوم منداڵان دەنێرن بۆ کڕینی پێداویستییەکان، جا هەق وایە کە ئەمەیش بە چاوی ئاڵو گۆڕ (موعاطات) رەفتاری لەگەڵ بکرێ. پاڵفتەی گوتە ئەمەیە: هەرکاتێ ئەو مەبەستە هاتەجێ کە گوتەی گرێدان لەبەر ئەو مەبەستە بەمەرج گیراوە، ئەوە مامەڵەکە دا دەمەزرێ، بە مەرجێ شتە وەرگیراوەکە هاوتای بەهاکەی بکا، ئەم زانایانەی کە ئەم بڕیارەیان داوە، ئەمەیان کردووە بە بەڵگە: کە لەسەردەمی ئیمامی عورمەردا {رەزای خوای لێبێ} ژنە لەچکدارەکان دەچوون کە نیزەكو نۆکەرو کچو کوڕی منالکاریان دەنارد بۆ کڕینی

پێداویستییەکان، لەگەڵ ئەوەیشدا عومەر رەخنەی لێنەدەگرتن، هەروا ئەم عادەتە لەکاتی ئەوو لەکاتی کەسانی تریشدا، لە پێشینانو پاشینان هەر باوبووەو کەسیش تاڕەزایی لێ دەرنەبڕیوە.

## ١٨٨) جۆرەکانی کڕینو فرۆشتن:

**جۆرەکانی کڕینو فرۆشتن سێ جۆرن:**

**جۆری یەکەم:** ئەوەیە ئەو شتە کە دەفرۆشرێ زانراوبێو لەبەرچاوبێ. ئەمە دروستە.

**جۆری دووەم:** ئەوەیە لەبەر چاودا نەبێ، بەڵام چۆنێتیی باسکرابێو ناونیشانی درابێو، لە ئەستۆی خاوەن سامانەکەدابێ، کە بەم فرۆشتنە دەگوترێ سەلەم، ئەمیش دیسان دروستە.

**جۆری سێیەم:** ئەوەیە ئەو شتە کە دەفرۆشرێ نادیاربێ، نەکڕیارو نەفرۆشیارو نەهیچ کامێکیان نەیدیبێ، ئەم جۆرە سەودایە دروست نیە، هەتا شتەکە ئەگەر ئامادەیش بێو لەبەر دەستابێ، مادەم لەبەرچاو نەبێو تەماشا نەکرێ هەر دروست نیە! چونکە ئەم جۆرە سەودایە لە مامەڵە دەستەشکێنەکانە، کە شەرع رێگەی نەداون، مامەڵەی دەستەشکێن لە شەرعدا ئەوەیە کە سەرەنجامەکەی شاراوەبێ!.

# ١٨٩) مەرجەکانی دامەزرانی فرۆشتن:

**فرۆشتن بەم پێنج مەرجە دادەمەزرێ:-**

**یەکەم:** ئەوەیە فرۆشراوەکە پاك بێ، واتە: شتەکە لە زاتی خۆیا پاك بێ، واتە: عەینەکەی پاك بێ، کەواتە فرۆشتنی شتێ کە لەزاتی خۆیدا پیس بێ دانامەزرێ وەك مەیو بادەو مردارو گۆشتی بەرازو سەگو شتی تری لەم بابەتە. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ}: بێگومان کە یەزدان فرۆشتنی ئەمانەی قەدەغە کردووە: فرۆشتنی ئارەقو مردارەوەبوو بەرازو بت. (شەیخان گێڕاویانەتەوە) لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} نەیی دەکا لە بەهای سەگ، مەگەر سەگی راویی (تیرمیذی لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویەتەوە).

بەڵێ شتی پیسبوو، ئەگەر دەتوانرا پاك بکرێتەوە ئەوە فرۆشتنەکەی دادەمەزرێ، وەك جلو بەرگو شتی وا، کە بەهۆی شۆردنەوە پاك دەبێتەوەو پیسییەکەی نامێنێ، بەلام ئەگەر نەدەتوانرا کە پاك بکرێتەوە ئەوە سەوداکە دانامەزرێ، وەك هەنگوینو شیرو شتی تری ترنگی ئاوەکی، چونکە ئەمانە بە شۆردن نامێننو لەگەڵ ئاوەکەدا مەحف دەبنەوەو دەڕژێن، بەهەر حاڵ پیساییەکەیان هەر دەمێنێ.

بەلام رۆنی پێسبوو، وەك رۆن زەیتو رۆنە زەنگو رۆنی پیوی تواوەی شل، دوو فەرموودە هەیە لە بارەی پاکەوەکردنیەوە، دروستترینیان ئەوەیە کە پاك نابێتەوە، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} کاتێ پرسیاری لێ کرا، لەبارەی مشکێکەوە لەناو رۆندا بتۆپێ، فەرمووی: ئەگەر رۆنەکە مەیی بوو ئەوە بەس مشکەکەو دەوروبەرەکەی

فرێ بدەن، بەڵام ئەگەر ڕۆنەکە شل بوو، نەیبەستبوو ئەوە گشتی بڕێژن!. دەی ئەگەر پاککردنەوەی ڕۆنەکە لە توانادا هەبوایە، ڕشتنەکەی دروست نەبوو، چونکە شتی وا بە فیڕۆدانی سامانە، ئاشکراشە کە پێغەمبەری خوا {درودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لە بەفیڕۆدانی سامان.

**مەرجی دووەم:** بۆ دامەزراندنی کڕین‌و فرۆشتن ئەوەیە: ئەو شتە لە زاتی خۆیدا قازانجێکی شەرعی تیادابێ، کەواتە: فرۆشتن‌و کڕینی شتی بێخێر دانامەزرێ، بەڵکوو وەرگرتنی ماڵ لەباتی ئەو شتە بێ سوودە لە بابەتی خواردنی ماڵی خەڵکە بە ناهەق، شتی وایش خوا نەیی لێدەکاو دەفەرموێ: {وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ – سورة البقرة – ٢/١٨٨} ماڵی یەکتری بە ناهەق مەخۆن. دەی لە شوێنێ فرۆشتن‌و کڕینی شتی بێ خێر دروست نەبێ، کڕین‌و فرۆشتنی شتێ کە زیانی هەبێ باشتلا دروست نیە، وەك زەهرو شتی بەنجکەرو سڕکەرو شتی سەرخۆشکەر، بە هەموو جۆرێکیانەوە، ئەگەر بۆ زیان بەکارهێنران، بەڵام ئەو زەهرو شتە بەنجکەرانەی کە لە شتی بەسوددا بەکار دەهێنرێن (ئارەقی لێ دەرچێ) فرۆشتنیان دروستە. غەزالی‌و کەسانی تریش ئەو رایە بەسەنگین دادەنێن کە دەفەرموێ: فرۆشتنی زەهر دروستە. لە فەرموودەدا دەفەرموێ: هەر کاتێ خوا شتێ قەدەغە بکا بەهاکەیشی قەدەغە دەکا.

بەڵام ئامێری بەزم‌و ڕەزم، کە یادی خودا لەبیر دەباتەوە، نەفرۆشتن‌و نەکڕینی دروست نیە، چونکە ئامێری ڕەوشت تێك دان‌و لەرێدەچوونەو بە کەڵکی ئەوە نەبێ بەکەڵکی هیچی تر نایەت. لە ئەبو هورەیرەوە حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە ئاخر زەمانا کەسانێ

له نەتەوەی ئیسلام خودا دەیانکا بە مەیموون‌و بەراز. یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەوانە لەلای خۆیان شایەتمان دەهێنن‌و دەڵێن: هەر یەزدانی پاك خودایەو تۆیش پێغەمبەری خودای، ئیتر چۆن دەبن بە بەرازو مەیموون؟ فەرمووی: بەڵێ وایە، بەڵام سەردەکەنە ئامێرژەندن‌و خوو دەدەنە ژنی گۆرانی بێژو دەف‌و دەهۆڵ لێدان، جا شەوان لەسەر ئەم حاڵە رادەبوێرن، هەتا رۆژێ کە بەیان دەکەنەوە دەڕوانن بوون بە مەیموون‌و بەراز. بوخاری فەرموودەیەکی لەم بابەتە گێڕاوەتەوە.

ئەگەر ئەم ئامێرانە لەپاش شکاندنیان دانەدەنران بەماڵ، وەك ئەو ئامێرانەی کە لە دارو شتی وا دروست کراون، ئەوە فرۆشتنیان دانامەزرێ، چونکە بەپێی شەرع شتی وا بێ کەڵکەو، کەسێ دەیکا کە گوناه پیشەبێ، بەڵام ئەگەر لەپاش شکاندنیان دادەنران بە ماڵ، وەك ئامێرێ لە زێڕو زیو دروست کرابێ، ئەوە فرۆشتنیان بە شکاوی دروستە، چونکە ماڵەو بۆ مەبەستی رەوا دەتوانرێ بەکاربێ، وەك ئەوە دەکرێ بە خشڵ‌و بە پارەو شتی وا.

**مەرجی سێیەم:** ئەوەیە ئەو ماڵە کە دەیفرۆشێ مولکی تەواوی فرۆشیارەکە بێ، یا هی هەقداری خاوەن ماڵەکەبێ‌و بەپێی شەرع خۆی سەرپەرشتکاری سەر ئەو ماڵەبێ، یا جێداریی (وەکالەت)ی هەبێ، جا ئەگەر بەبێ سەرپەرشتیاری‌و جێداریی سامانی کەسێکی تری فرۆشت، بەبێرا لە سەربوونی خاوەنی، ئەوە دروست نیە، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: تەڵاق کاتێ دەکەوێ کە تۆ خاوەنی ئەو ژنەبی لەکاتی تەڵاقدانەکەدا، بەندەیش کاتێ ئازاد دەبێ کە لەکاتی

ئازادکردنەکەیدا هی تۆبێ، وە شت کاتێ فرۆشتنەکەی سەر دەرگرێ کە لەکاتی فرۆشتنەکەدا هی تۆبێ، وە هەرشتێکیش کە ماڵی تۆ نەبێ نەزری دانامەزرێ!. تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە. لەسەر فەرمایشتێ: لەکاتی وادا فرۆشتنە کە رادەگیرێ، لەسەر ئەو شێوەیە: ئەگەر خاوەنەکەی رێگەیدا، دادەمەزرێ. دەنا نا، بەڵگەی ئەم فەرمایشتەیش ئەم فەرموودەیەیە: عوروە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ جارێ پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دینارێکی داپێم، کە مەڕێکی بۆ بکڕم، منیش بەو دینارە دوو مەڕم پێکڕی، مەڕێکیانم فرۆشتەوە بە دیناریێو دینارێك و مەڕێکیشم بردەوە بۆ پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} کە حاڵەکەم بۆی باسکرد، فەرمووی: خودا پیت و فەڕ بخاتە سەوداو مامەڵەو کڕین و فرۆشتنتەوە!. (تیرمیذی بە رشتەیەکی دروست دەیگێڕێتەوە) دەی نزاکەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} کە بۆیکردووە بەڵگەی رەزامەندی لە سەوداکەیەتی و نیشانەی رێگەپێدانیەتی.

**مەرجی چوارەم:** دەبێ ماڵە فرۆشراوەکە شیاوی پێدانی راستەقینەبێ، یا شیاوی تەسلیمکردنی شەرعی بێ، کەواتە شتێ کە نەتوانێ بە راستەقینە بیداتە دەست کڕیار، وەك شتی گومبوو یا ماڵی زەوتکراو، ئەوە فرۆشتنی دانامەزرێ. چونکە مەبەست لە فرۆشتن بەهرە وەرگرتنە لە فرۆشراو، ئەوەیش لەکاتی وادا دەست نادا.. بەڵێ دروستە فرۆشتنی ماڵی داگیرکراو بە کەسێ کە بتوانێ بیسێنێتەوە لە زەوتکەرەکەی بەرگر (مانع)ی شەرعیش وەك فرۆشتنی شتی رەهنکراو بەبێ فەرمانی رەهنکەرەکە، چونکە بەپێی شەرع فرۆشیار لە ماوەی رەهنەکەدا ناتوانێ فرۆشراوە رەهنکراوەکە بداتە دەست کڕیار، چونکە ئەگەر شتی وا دروست بێ رەهنەکە سوودی نابێ، لە دانەوەی قەرزەکەی

دڵنیا نابێ، چونکه شته بارمتهکهی له دهستا نامێنێ، ههتا لهکاتی پێویست له جیاتی قهرزهکهی بیفرۆشێ.

**مهرجی پێنجهم:** ئهوهیه فرۆشراوهکه زانراوبێ. چونکه پێغهمبهر (درودی خوای لهسهربێ) نهیی کردووه له فرۆشتنێ که ههڵخهڵهتانی تیابێ، که پێی دهڵێن: (بیع الغرر). (موسلیم فهرموودهیهکی لهم بارهیهوه گێڕاوهتهوه) بۆ پێشگیریی له خهڵهتان مهرجه که شتهکه بهچاو ببینرێو له بهرچاوبێو ئهندازهکهی دیاری بێ. وهك ئهوه بڵێ: ئهمهم به تۆ فرۆشت، بۆ ئهندازهیش ژمارهکهی دیاری بکا، یا عهیارهکهی یا سهنگو کێشهکهی باس بکا، له فرۆشتنی به شێوهی سهلهمیشدا مهرجه فرۆشراوهکه به نیشانهو صیفهت دیاریو باسکراوبێ وهك له باسی سهلهمدا له دواوه دێ.

## ١٩٠) باسی سهلهم:

**(بڕوانه: تهجرید- مختصر صحیح البخاری) بهکوردی: بهرگی ٣ - ل- ٧٠ ز- ٤٠)**

سهلهم به عهرهبی سهلهفیشی پێ دهگوترێ، بۆیه پێی دهگوترێ (سهلهم: پێدان: دانهدهست) چونکه پارهکه له سهرهتای سهوداکه وهدهدرێ، بۆیهیش پێی دهگوترێ (سهلهف — پێشینه) چونکه بههاکه، یا پارهکه له پێشهوه دهدرێ له کۆڕی دانیشتنی سهوداکهدا. سهلهم: بریتییه له فرۆشتنی شتێ که لهبهرچاودا نهبێ، بهڵکوو به روونکردنهوهی ناوونیشانی دیاری کرابێ، وه له ئهستۆی خاوهن ماڵهکهدابێ، بهپێی چهند مهرجێ. سهربهڵگهکهی ئهم ئایهتهیه: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ

– سورة البقرة – ٢٨٢} ئەی کەسانێ کە باوەڕتان بەخوداو بە پێغەمبەری ئیسلام هەیە! هەرکاتێ مامەڵەیەکی قەرزتان لەناو خۆتاندا هەتا ماوەیەکی دیاریکراو ئەنجامدا بینووسن. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست لەم قەرزە سەلەمە. ئیبنو عەبباس {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} تەشریفی هێنا بۆ مەدینە، خەڵکی مەدینە بەسەر بەری دارو درەختو شینایی سەلەمیان دەکرد بۆ ماوەی یەك دوو ساڵ. جا فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: هەرکەسێ سەلەم بەسەر شتێ دەکا با ئەندازەی شتە سەلەم بەسەرکراوەکە دیاری بێ، دەبێ پێوانەی یاکێشانەی بزانرێ، هەروەها بۆ ماوەی چەندیشە ئەو ماوەیە ناو ببرێ. (ش/د/ت/ن). لەبەر ئەوەیش خاوەن کارو پیشەکان جارو بار هەوەجێیان بە پارە دەبێ، کە خەرجی بکەن بۆ بەڕێوەچوونی کارو پیشەکانیان، وە پارەشیان بە دەستەوە نابێ، لە هەمانکاتدا خاوەن سامانەکانیش لە هەرزانی بەهاکە بەهرەوەر دەگرن، جا لەبەر ئەم دوو هۆیەو لەبەر پێداویستی زۆر سەلەم دروستە، گەرچی کەمێ تەفرەی تیادایە (تەفرە = غەرەر).

## ١٩١) مەرجەکانی سەلەم:

**بۆ دامەزراندنی سەلەم چەند مەرجێ پێویستە:**

**یەکێکیان:** ئەوەیە ماڵە سەلەم تیادا کراوە کە بەشێوەیەکی وادیاری بکرێو نیشانەی هەڵ بدرێ کە بەباشی بناسرێو بزانرێو بە نەناسراوی نەمێنێتەوە. چونکە سەلەم خۆی گرێدانێکی وایە کە هەڵخەڵەتانو هەرزان فرۆشی (غەرەر)ی تیادایە، جا ئەگەر بە باشی

شتەکە دیاری نەکریٚو بە باشی نە ناسریٚ، ئەوەیش دەبیٚ بە هەرزان فرۆشیی دووەم، شتیش دووجار هەرزان فرۆش بکریٚ، وەك تالاّن فرۆشی لیٚ دیٚ، شتی وایش لە شەرعدا لە کێشدا نیە.

**یەکیٚ تریان:** ئەوەیە کە ماڵە سەلەم تیادا کراوەکە حازر نەبیٚ، یا لەزیمنی شتێکی حازری دیاری لە بەرچاو نەبیٚ، وەك ربەیێ جۆ لە خەرمانیٚ، چونکە پێویستە سەلەم تیاکراوەکە قەرزبیٚ، چونکە سەلەم فرۆشتنی شتێکە کە لە ئەستۆدا بیٚ، نەك لەبەر دەست دابیٚ، دیاربوونو حازربوونو لەبەر چاویش دژی بە قەرزبوونیەتی.

**یەکیٚ تریان:** ئەوەیە وادە (ئەجەل)ەکەی دیاری کراوبیٚ، وەك ئەوە: ئەندازەکەی بە مانگیٚ، یا بە دوو مانگ، یا بە ساڵیٚ، یا بە دوو ساڵ، یا بە ماوەیەکی ناوبراوی وا دیاری کرابیٚ، تا زێدە تەفرەو هەرزان فرۆشی روو نەدا، لەبەر ئەوەیش کە خوا دەفەرمویٚ: {إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى} لەبەر ئەوەیش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویٚ: هەتا ماوەیەکی دیاری کراو.

**یەکیٚ تریان:** ئەوەیە ئەو ماڵە لەکاتی هاتنی وادەی تەسلیم کردنیا لەو کاتەدا هەبیٚ دەنا دانامەزریٚ، وەك سەلەم دادان بەسەر فەریکە خورما (روتاب) لە زستاندا، چونکە لە زستانا فەریکە خورما نیە، هەروا سەلەم لە شتێکا کە لەکاتی هاتنی وادەکەیدا بە دانسقە دەست بکەویٚ دانامەزریٚ، چونکە شتی وا غەرەرە.

**یەکێ تریان:** نیشانەکردنی جێگەی وەرگرتنی ماڵەکەیە، ئەمە کاتێ مەرجە کە گواستنەوەی ماڵە سەلەم تیادا کراوەکە، بۆ جێگەی دانە دەست مەسرەفی تێبچێ، چونکە لە حاڵێ وادا قازانجو زیان فەرق دەکا.

**یەکێ تریان:** ئەوەیە بەهاکە زانراو بێ، ئەندازەی پارەکە دیاری بکرێ، ئەگەر دیاری نەکرێ سەلەمەکە دانامەزرێ، چونکە شتی وا تەفرەیە.

**یەکێ تریان:** دەبێ پارەکە یا بەهاکە لە کۆڕی گرێدان (مەجلیسی عەقد)ەکەدا وەربگیرێ، دەنا وەك فرۆشتنی شتی قەرز بە پارەی قەرزی لێ دێ، شتی وایش پووچەو نەیی لێکراوە، لەبەر ئەوەیش سەلەم گرێدانێکە کە تەفرەی تیایە، لەبەر پێداویستی رێگەی پێدەدرێ، جا بەوەرگرتنی بەهاکە لە پێشەوە تۆڵەی ئەو تەفرەو هەرزان فرۆشییە دەکرێتەوە، وەلحاڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەیی کردووە لە فرۆشتنی قەرز بە قەرز.

**یەکێ تریان:** دەبێ ماڵە سەلەم تیاکراوە کە ئەندازەکەی بە پێوانە یا بە کێشانە، یا بە ژمارە، زانراوبێ. چونکە خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەبێ پێوانەی یا کێشانەی بزانرێ.

## ١٩٢) فرۆشتنی شت لە پێش وەرگرتنیدا:

شت لە پێش وەرگرتنیدا فرۆشتنی دروست نیە، ئیتر زەویو زاربێ یا شتی تر بێ جیاوازی نیە، فرۆشیاری یەکەم رێگەی ئەوەی دابێ یا نا، کڕیار بەهاکەی تەسلیم کردبێ یانا، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا

فرۆشتنەکە دانامەزرێ. بەپێی ئەوەی حەکیمی کوڕی حیزام دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من با یەکم ئەم جۆرە کڕین و فرۆشتنانەی کە هەن لە ناودا، ئەنجام دەدەم، دەی پێم بفەرموو، کە کامەیان حەڵاڵە بۆم و کامەیان حەرامە بۆم؟ فەرمووی: ئەی کوڕی برام! شت هەتا وەری نەگری لە فرۆشیاری یەکەم مەیفرۆشەوە بە کەسێکی تر! ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: رشتەکەی جوانە. هەروا دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ} هەر کەسێ خۆراکێ دەکڕێ نابێ بیفرۆشێتەوە هەتا خۆی بە تەواوی وەری نەگرێ. (أخرجه الستة الا الترمذی).

## ١٩٣) فرۆشتنی قەباڵەو کومپیالەو شتی وا:

ئەگەر سەنەدات و کومپیالەو چەك و شتی وابفرۆشرێتەوە بە هەمان بەها کە تیادا نووسراوە ئەوە پووچەو ئەو فرۆشتنە دانامەزرێ، چونکە ئەوە دەبێ بە (ربا النسيئە: سوودی دواخراو) چونکە فرۆشیار ئەو بەهایە وا لە پسووڵەکەدا دەدا، بەڵام وەجەڵەکەی لە دواییدا وەردەگرێ، کاتێ وادەی دانی کومپیالەکە دێ، وەلحاڵ لە شتێکیشدا کە لەیەك توخم بن فرۆشتن دەبێ دەستاو دەست بێ، خۆ ئەگەر بەکەمتریش لەو بەهایە کەوا تیادا بفرۆشرێ: هەر دانامەزرێ چونکە ئەوە هەم (ربا الفضل: زێدە سوود)ە و هەم (ربا النسيئە)یە، ئەم دوو جۆرەیش حەرامن، هەروەها ئەگەر توخمەکانیش جیابن هەروەها، بۆ نموونە: کومپیالەکە بفرۆشێ بەگەنم، ئەمەیش هەر دانامەزرێ، چونکە ریبای نەسیئەی تیادایە. بەڵام ئەگەر ئەم قەواڵەو کومپیالانە

بفرۆشرێن بە سامانی بازرگانی ئەوە دروستە، چونکە فرۆشتن بە قەرز بۆ ماوەیەکی ناوبراو دروستە لەبەر ئەوە نابێ بە سوود.

## ١٩٤) فرۆشتنی گۆشت بە گیانلەبەر:

دروست نیە فرۆشتنی گۆشت بە گیانلەبەرێ کە لە توخمی خۆی بێ. واتە: دروست نیە گۆشت بفرۆشرێ بە گیانلەبەرێ کە گۆشتی بخورێ[1] خوا بەقەد یەك بن، یاخود کەم‌و زیادی یان لە بەیندا هەبێ. چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەیی کردووە لەوە کە بزن‌و مەڕ بفرۆشرێ بە گۆشت (حاکم گێراویەتەوە)و دەفەرموێ: گێڕەرەوەکانی هەموو پێشەوان فەرموودەرەوانن‌و جێگەی بتمانەن. بەیهەقیش دەفەرموێ: رشتەکەی دروستە، لەسەر ئەم پێودانە (واتە: بە قیاس لەسەر گۆشت بە حەیوان) دروست نیە فرۆشتنی گەنم بە ئاردی گەنم، یا کونجی بە تلْپ‌و کەپەکی کونجی رۆن لێگیراو.

بەلاّم هەندێ دەفەرموون: دروستە فرۆشتنی گۆشت بە گیانلەبەری زیندوو کە لە توخم (جینس)ی گۆشتەکە نەبێ، وەك فرۆشتنی مریشکێ بە دوو کیلۆ گۆشتی مەڕ، هەروەها دروستە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ‌و گیانلەبەر بە گیانلەبەرێکی تر، ئیتر هەردووکیان لە یەك توخم بن یا توخمیان جیابێ، وەخوا بەقەد یەك بن، یا کەم‌و زۆرییان لە نێواندا هەبێ، وەك یەك وشتر بە دوو وشتر، یا وشترێ بە

[1] دەقی ئەصڵەکە کەم‌و کوڕی تیادایە رەنگبێ هەڵەی چاپ بێ.
- وەرگێڕ-

وشترێ، یا مەڕێ بە دوو قەلەموون. ئەم شێوانە هەموویان دورستن بە مەرجێ کارەکە سەرنەکێشێ بۆ سوود، وەك مەڕێ پڕ گوانی لە شیربێ بدرێ بە مەڕی کە گوانی شیری تیادا نەبێ ئەوە لەم حاڵەدا دروست نیە.

## ١٩٥) فرۆشتنێ تەفرەدانی تیادابێ کە مەشهوورە بە (بیع الغرر):

تەفرەدەر (غەرەر) ئەوەیە کە ئەنجامەکەی لە ئێمە نادیار بێ، وەك فرۆشتنی ماسی لەناو ئاوی گۆمو چۆمدا، وەك فرۆشتنی مەل بە حەواوەو شتی بزربوو، وەك فرۆشتنی پەموو لەناو قۆزاخەکەیداو شیر لەناو گواندو بەچکە لەناو سکدا. سەربەلگەی نەیی لەم جۆرە کڕینو فرۆشتنە ئەم فەرموودەیەیە کە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لە فرۆشتنێ کە تەفرەدانی تیادابێ!. (موسلیم). نادیاریی نرخو بەهایش وەك نادیارییو نەزانراویی فرۆشراو وایە، ئەویش وەك ئەو زیانی هەیە.

## ١٩٦) باسی سوود (واتە: ریبا):

(بڕ: تجرید/ ٣ ل – ٤٩ = ژ: ٩٧٩ هەتا ژ: ٩٨١)

**ریبا لە زمانی عەرەبدا واتە:** زیاتریو پتری، دەگوترێ: (ربا الشیء) واتە: شتەکە زیاتر بووە، بەم واتایەیە کە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: {اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ – سورة – ٥/٢٢} (ریبا) کە بە کوردی

پێی دەگوترێ: (سوود) لە شەرعا واتە: زیاد لە دەسمایەکە. خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: {وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ – سورة البقرة – ٢٧٩/٢} واتە: ئەگەر فەرمانی شەرع قەبووڵ بکەن و لە مامەڵەی سوود وازبێنن و لێی پەشیمان ببنەوە ئەوە کارێکی زۆر پەسەندە لەبەر ئەوە بەپێی شەرع دەسمایەکەی خۆتان بەبێ زیادو کەم دەکەوێتە.

(بڕیاری سوود): سوود بەپێی فەرمانی نامەی خوداو بەپێی فەرمانی سوننەتی ئەی پێغەمبەرو بەپێی یەککگرتنی نەتەوەی ئیسلام حەرامەو نادروستە. خوای گەورە دەفەرموێ: {وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا – سورة البقرة – ٢٧٥/٢} واتە خودا سوودکاری حەرام کردووە. هەروا دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ، فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ، وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ – ٢٧٨/٢ – ٢٧٩} واتە: نەتەوەی ئیسلام! هەمیشە پارێز لە گوناه بکەن و لە ترسی خوا بێئاگا مەبن و هەموو کاتێ لەبێ باکیی خودا بترسن و لە مەکری ئەمین مەبن، وە بە ئیجگاری دەسبەرداری سوود خۆری ببن و، بە هیچ جۆری مامەڵەی سوودو سووکاری مەکەن، ئەگەر ئێوە ئیمانداری تەواون، دەنا ئەگەر دەسبەردار نەبن و واز لە سوود خۆریی نەهێنن ئەوە ئیعلانی شەڕ لەگەڵ خواو لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەن و شەڕی وایش بە زیانی خۆتان تەواو دەبێ ، چونکە ئێوە دەرەقەتی خوا نایەن، بەڵام ئەگەر وازی لێبهێنن و تۆبەی لێبکەن ئەوە

سەرمایەکەی خۆتان بەبێ زیادو کەم وەربگرنەوە، لە حاڵی وادا نەستەم لە کەسێ دەکەن‌و نە کەسێ ستەمتان لێدەکا.

**پێغەمبەریش** {درودی خوای لەسەربێ} **دەفەرموێ:** لەعنەت‌و نەفرینی خوا لە سوود خۆرو لە سوود وەرگرو لەو کەسە کە دەینوسێ‌و لەو کەسەیش کە دەبێ بە شایەتی. (ئەحمەدو تیرمذی‌و ئەبو داوودو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە). سوود لە تاوانە هەرە گەورەکانە، لە شەرعی هیچ دینێکا حەلاڵ نەبووە بەپێی ئەم ئایەتە: {وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ – سورة النساء – ٤/١٦١} واتە: لە کتێبە پیشینەکانی خوادا، خودا جڵەوگیریی کردووە لە سوود، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوان هەر سەوداو مامەڵەی سوودیان ئەنجام دەدا. لە قورئاندا خوای گەورە بەس لەگەڵ سوود خۆردا ئیعلانی شەڕی کردووە. لەبەر ئەوە هەندێ دەفەرموون: ئەوەی بەردەوام بێ لەسەر سوود، نیشانەی ئاخر شەڕیەتی. پەنا بەخوا لە شتی وا. سوود (کە بریتییە لە زیادە وەرگتن لە سەودادا) هەر لەم شتانەدا حەرامە: لەزیرو زیو بە زیوو خۆراکدا. بەپێی گوتەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: زێڕ بە زێڕو زیو بە زیوو گەنم بە گەنم‌و جۆ بە جۆو خورما بە خورماو خوێ بە خوێ مەفرۆشن، مەگەر دەق بە قەد یەك بن‌و دەست بە دەست بن، بەڵام زێڕ بە زیوو زیو بە زێڕو گەنم بە جۆوو جۆ بە گەنم‌و خورما بە خوێ‌و خوێ بە خورما، چۆن ئارەزوو دەکەن ئاوا بیفرۆشن. ئیتر ئەوەی زیاتر بدا، یا زیاتر وەرگرێ ئەوە سوود خۆرە، وە لە تاواندا سوود خۆرو سوود دەر وەك یەکن. (شافیعی گێڕاویەتەوە) ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کە فرۆشتنی زێڕ بەزێڕو زیو بەزیوو

فرۆشتنی خواردەمەنیە هاو وێنەکان دروست نیە، مەگەر بەم سێ مەرجە:

**یەکەم:** ئەوەیە ئەو دوو شتەی دەدرێن بە یەکتری، وەك گەنم بە گەنم ئەوەندەی یەك بن.

**دووەم:** ئەوەیە هەردووکیان حازربن.

**سێیەم:** ئەوەیە هەردوو کەسەکە مافی خۆیان لە کۆڕی دانیشتنەکەدا وەربگرن. ئەمەیش کاتێ وایە کە هەردوو شتەکە لە یەك توخم بن، وەك زێڕ بە زێڕ، گەنم بە گەنم. دەنا ئەگەر توخمەکان لە یەك جیابوون و هاو وێنە نەبوون، وەك زێڕ بەزیوو گەنم بە جۆ، ئەوە تەنها دوو مەرجە دواییەکە پێویستەو بەس، لەبەر ئەوە دروستە یەکێکیان لەوی تریان زیاتربێ، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەگەر هەردوو شتەکە لە چەشنی یەك نەبوون وەك گەنم بەجۆ، یا زێڕ بە زیو، ئەوە چۆن ئارەزوو دەکەن ئاوا بیفرۆشن، بە مەرجێ دەست بە دەست بێ. (موسلیم). وە ئەگەر دوو شتەکە هاو وێنە نەبوون و لە هەمان کاتدا هۆی سوود (**علة الربا**)یشیان یەك نەبوو، وەك زیوو گەنم و مس و کووتاڵ و شتی تری ئاوا لە یەك جیا، ئەوە هیچ کام لەم سێ مەرجە پێویست نیە. لەبەر ئەوە لەکاتی وادا فرۆشتن بەحازری و بە وادەو بەهاو ئەندازەو بەکەم بەزۆر دروستە. هاو ئەندازەیی لە شتێکا کە بەپێوانەبێ بەوە دەبێ کە هەردوو شتەکە بە پێوانە بەقەد یەك بن، وە لە شتێکا کە بەکێشانەبێ بەوە دەبێ کە هەردوو شتەکە بەکێشانە بەقەد یەکتربن، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: زێڕ بە زێڕو زیو بە زیو مەفرۆشن مەگەر بە کێشانە

بەقەد یەکتربن. (موسلیم) هەروا دەفەرموێ {درووودی خوای لەسەربێ} ئـەوەی بـە کێشانەبێ دەبـێ هـەردوو وەجەڵەکـە دەقـاو دەق بـن، بـە مـەرجێ لەیـەك چەشن بن، واتە: هاو وێنە (متماثـل)بـن، ئەوەیـشی بـە پێوانـەبێ هـەروا، بەڵام ئەگەر لەدوو جۆری جیاجیا بوون ئەوە چۆنی دەفرۆشـن قـەی ناکا (دارە قوطنی).

## ١٩٧) جۆرەکانی سوود:

**سوود دابەش دەبێ بەم چواربەشە :**

**یەکەم:** مەشـهـوورە بـە (ربـا الفـضل) کـە برێتییـە لـە فرۆشـتنی شتێ کە ریبەوی بێ بەهاو توخمی خۆی بە زیاتر لە ئەنـدازەی خۆی، یـا بەکەمتر، وەك مسقاڵێ زێڕ بە مسقاڵو چارەکێ زێڕ. سامانی ریبـەوی، یـا بڵێین: مـاڵی سـوود لـە خـۆگر، ئـەو جـۆرە ماڵەیـە کـە لـە هەنـدێ کـا تـدا سوودی تیا هەبێ، وەك زێڕو زیوو خـۆراکی پێبـژێو، بـەڵام ئاسـنو مـسو سەوزەو شتی وا پێیان ناگوترێ سامانی سوود لـە خـۆگر، چـونکە بـەهیچ جۆرێ سوودیان تیادا نابێ.

**دووەم:** ناودارە بە (ربا الید) واتە: سوودی دەست بـە دەست، کـە برێتییە لە فرۆشتنی دوو شتی سـوود لـە خـۆگری هـاو تـوخم، یـا تـوخم جیا، بەبێ زیادەو بەبێ وادە، بەڵام لە دانیشتگەکەدا هەرکـەس مـافی خـۆ وەرنـەگرێ، وەك دیناری بە دیناری بەڵام لە مەجلیـسەکەدا، یـەکێکیان یـا هەردووکیان دینارەکەی خۆی وەرنـەگرێ.

**سێیەم**: ناوداره به (**ربا النسیئة**) واته: سوودی دواخراو، ئەوەیە زیادە لە ناوا نەبێ، بەڵام لە سەوداکەدا وادە دابنرێ، وەك ئەوە دە درەمی حازر بفرۆشێ بە دە درەمی تا سەری مانگ، وادەکەیەك چاوترووکانیش بێ هەردەبێ بە سوود.

**چوارەم**: ناوداره بە (**ربا القرض**) واتە: سوودی قەرز، کە بریتییە لەهەر قەرزێ کە سوودێ بگەیەنێ بە قەرزدەرەکە. لەم جۆرە سوودەیە ئەو جۆرە سەودایەی کە لەناو عەرەباندا ناسراوە بە (**الغاروقه**) کە ئەوەیە کەسێ شتێ بۆ ماوەیێ دەفرۆشێ بە کەسێکی تر، بەهاکەی وەردەگرێ، لەو ماوەیەدا شتەکە بە دەست کڕیارەوە دەبێ، بەکاری دەهێنێو سوودی لێوەردەگرێ، جا کاتێ ماوەکە تەواو بوو ئەگەر فرۆشیار بەهاکەی گێڕایەوە بۆ کڕیار ئەویش شتەکەی دەداتەوە، دەنا دەبێ بەهی خۆی.

## ١٩٨) **بایستی قەدەغەکردنی سوود** (**علە تحریم اربا**):

**زاناکان** {رەحمەتی خودایان لێبێ} **سەبارەت بە بایست ( هۆ)ی قەدەغەکردنی سوود چەن بۆچوونێکیان هەیە:**

**یەکەمیان دەڵێ**: سوود زەوتکردنی سامانی مرۆڤە بەبێ وەجەڵ، بە بەلاش، چونکە دوو درەم بە درەمێ، بە قەرز بێ یا بە حازر، درەمێکان دەکەوێتە بەلاش، لە شەریعەتیشدا سامانیش وەك خوێن ڕێزو حورمەتی خۆی هەیە. پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: سەرو

سامانی مرۆڤ وەك یەك خاوەن ڕێزو حورمەتن دەی وەك چۆن ڕشتنی خوێنی مرۆڤ بە خۆڕایی ناڕەوایە، بردنی ماڵیشی بە بەلاش ناڕەوایە.

**بۆچوونی دووەم**: دەفەرموێ: سوود خەڵك لە كارو كاسپی دەكا، فێری بەلاش خۆرییان دەكا، سەردەكێشێ بۆ پەكخستنی مەردوم، ڕوونو ئاشكرایشە كە بەرژەوەندەكانی بەندەكان بەبێ كاسپی حەلاڵ وەك بازرگانیو پیشەسازیو كشتوكاڵ، ناچن بەرێوە، دەی سوود پەكی ئەوە دەخات.

**بۆچوونی سێیەم**: دەفەرموێ: سوود دەبێ بە ماكی فەوتانی چاكە خوازی، وای لێدێ كەس قەرز بەكەس نادا مەگەر بەسوود، كەس لا لە كەس نەكاتەوە مەگەر لە ڕێگەی سوودەوە، ئەوەیش دەبێ بە هەوێنی پشتكردنە یەكو نەمانی هاوكاریی نێوان هەژارو دەوڵەمەندو نەمانی پیاوەتیو چاكە، لەكاتی وایشدا نەداراو ئاتاجەكان ناچار دەبن كە شت بە سوود وەربگرن.

**بۆچوونی چوارەم**: دەڵێ: زوربەی كات قەرزدەر دەوڵەمەندەو قەرزكەر هەژارە، دەی ڕەوادیتنی سوود زاڵكردنی دەوڵەمەندە بەسەر هەژاردا، بە ئارەزووی خۆی دەیچەوسێنێتەوە، هەژار دەبێ بەدیلی دەستی ئاتاجیو پێداویستی، شتی وایش لە ڕەفتاری بەرزی مرۆڤی میهرەبان ناوەشێتەوە.

**بۆچوونی پێنجەم**: حەرامبوونی سوود بەپێی دەقی قورئانو سوننەت چەسپاوە، لەبەر ئەوە دەبێ گومان نەبێ لە حەرام بوونیدا.

وەکی تریش تێکڕای ئەم راو بۆچوونانە حیکمەتی قەدەغە بوونی سوود دروست دەکەن.

## ١٩٩) ئەنجامی خراپەکانی سوود:

یەکێیان ئەوەیە: خوا رقی لێیەتیو پیتو فەڕی مامەڵە دەبا بە حەوادا، وەك دەفەرموێ: {يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا – سورة البقرة – ٢٧٦/٢} واتە: خودا سوود مەحف دەکاتەوە، ئەنجامێکی تری ئەوەیە سوود خۆر لە رەحمەتی خوداوە دوور دەبێ. لە حەدیسدا دەفەرموێ: خودا نەفرەت لە سوود خۆر دەکا. ئەنجامێکی تری ئەوەیە: سوود خۆر لە قیامەتدا کە لەقەبر دەردەچێ دەبێ بە پەند وەك شێتو فێداری لێدێ، خۆش خۆش هەڵ دەستێو دەیەوێ بڕوا بەڵام گشت جارێ دەکەوێ بەلاداو وەك شێت سەری لێدەشێوێو لاڵو پاڵ دەکەوێو ریسوا دەبێ. وەك دەفەرموێ: {الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ – سورة البقرة – ٢٧٥/٢}.

## ٢٠٠) سەرپشکیی کڕیارو فرۆشیار:

حوکمی کڕینو فرۆشتنو باسی جۆرەکانیو باسی مەرجەکانیو حوکمی سوود ئەمانە هەموویان لە پێشەوە باسکران، مایەوە سەر ئەوە کە بزانین: ئایا لە کڕینو فرۆشتندا سەرپشکیو مافی پەشیمان بوونەوە لە سەوداکە هەیە یانا؟

**سەرپشكی – واتە: خیار – دەبێ بە دوو بەشەوە:**

**یەكێكیان**: پێی دەگوترێ خیاری مەجلیس، واتە: سەرپشكیی نیشتنگا، واتە: مافی پەشیمانبوونەوە لە سەوداكە، بەمەرجێ هێشتا كڕیارو فرۆشیار لە یەك جیانەبووبنەوە.

**ئەوی تریان**: خیاری شەرتە واتە: بە مەرج گرتنی سەرپشكیی بۆماوەیێ، بە مەرجێ ئەوماوەیە لەسێ ڕۆژ پتر نەبێ. سەرپشكیی نیشتنگا مافی چەسپاوی هەر دوولایە، هەتا لە یەك جیادەبنەوە، كە لەیەك جیابوونەوە سەوداكە دادەمەزرێ، پێغەمبەر {دروودو سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێ} لەم بارەیەوە دەفەرموێ: كڕیارو فرۆشیار هەردوولایان وەك یەك خۆیان سەرپشكن‌و دەتوانن لە سەوداكە پەشیمان ببنەوە هەتا لە یەكتری جیادەبنەوە. (شەیخان). جیابوونەوە ئەوەیە كە هەردوولایان بەلەش كۆڕی گرێدانی سەوداكە بەجێ بهێڵن. گریمان ئەگەر ماوەیەكی زۆریش لە دانیشتنگەكەدا مانەوە ئەوە سەرپشكییە كە هەر بەردەوامە، یا هەردووكیان هەستان‌و بەیەكەوە دەستیان كرد بە ڕۆشتن‌و پیاسەكردن ئەویش هەروەها، بەڵام هەركاتێ لەیەكتر جیابوونەوە ئیتر مافی سەرپشكییان نامێنێ، بۆ بڕیاردانی لەیەك جیابوونەوەیش دەگەڕێینەوە بۆسەر عورف‌و یاساو باوی ناو كۆمەڵ، ئیتر هەرچی بەپێی یاسای ناوكۆمەڵ دابنرێ بە جیابوونەوە سەوداكەی پێ دەچەسپێ، دەنا نا، جا ئەگەر سەوداكە لەناو خانوودا بوو لەیەك جوێ بوونەوەكە بەوە دەبێ كە یەكێكیان بچێتە دەرەوە لێی، ئەگەر لە بازاڕدا بوو، یا لە سارادا بوو ئەوە ئەوەندە بەسە كە یەكێكیان پشت لەوی تریان هەڵبكاو كەمێ لێی

دووربکەوێتەوە. سەرپشکیی بەوەیش کۆتایی دێ کە هەردووکیان بڵێن: ئەوا مامەڵەکەمان دامەزراو بە تەواوی چەسپاو جێگیربوو، یا بەهەر شێوەیەکی تر بڕیاری دامەزرانی سەوداکە رابگەیەنن و ئاشکرای بکەن کە سەوداکە بە تەواوی دامەزراوە. کەواتە: ئەگەر یەکێکیان بڕیاری دامەزراندنی سەوداکەیدا هەر ئەوەیان مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نیە، ئەوی تریان ئەومافەی هەیە، بەلام ئەگەر یەکێکیان سەوداکەی دامەزراندو ئەوی تریان هەڵی وەشاندەوە ئەوە کار بە هەڵوەشاندنەوەکە دەکرێ.

سەرپشکیی مەرجیش (واتە: خیاری شەرطیش) بەمەرجێ دادەمەزرێ کە لەسێ رۆژ زیاتر نەبێ، چونکە ئەگەر زیاتر بێ سەوداکە بە تەواوی هەڵ دەوەشێتەوەو پووچ دەبێتەوە. ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: پیاوێ عەرزی پێغەمبەری کرد، کە لە سەودادا دەخەڵەتێ، فەرمووی پێی: کە سەودای شتێ دەکەی بڵێ: بەبێ فڕو فێڵ و قوڵ بڕین، سەرەڕای ئەوەیش هەرشتێ دەکڕی هەتا ماوەی سێ شەو مافی سەرپشکیت بۆ هەیە، لەو ماوەیەدا دەتوانی پەشیمان ببیتەوە (بەیهەقی و ئیبنو ماجە بەرشتەیەکی جوان گێڕاویانەتەوە، بوخاریش لە تەئریخەکەیدا بە مورسەلی گێڕاویەتەوە). بەپێی رووکار (ظاهیر)ی فەرموودەکە ئەگەر ماوەی سەرپشکی لەسێ رۆژ پتر بوو سەوداکە پووچە.

## ٢٠١) گێڕانەوەی فرۆشراو بەهۆی نەنگەوە:

مافی پەشیمانبوونەوە لە سەودا بەهۆی دەرکەوتنی نەنگێکی پێشووەوە ئاوایە: دروستە بۆ کڕیار پەشیمان ببێتەوە لەو مامەڵەیەی کە کردوویەتی، بەهۆی دەرکەوتنی نەنگێکی کۆنەوە، بە مەرجێ ئەو نەنگە لەپێش وەرگرتنی فرۆشراودا رووی دابێ، یا لەدوا گرێدانی سەوداکەیش رووی دابێ. ئەوەی کە دەگوترێ: دروستە سەودا هەڵبوەشێتەوە بەهۆی دەرکەوتنی عەیبی کۆنی پێش گرێدانی سەوداکەوە ئەوە یەکگرتن (ئیجماع)ی لەسەرە. عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: پیاوێ بەندەیەکی کڕی، ئەوەندە خوا حەزکا لەلای مایەوە، لەپاشا نەنگێ لە بەندەکە دەرکەوت، پیاوەکە لەگەڵ فرۆشیارەکەدا بۆ شەرعکردن چوونە خزمەت حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بەندەکەی دایەوە بەسەر خاوەنی پێشوویدا. (ئەم زاتانە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە: ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی ئەبو داوودو ئیمامی تیرمیذیو ئیمامی ئیبنو ماجە {رەزای خوایان لێبێ} تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی دروستە. حاکمیش دەفەرموێ: رشتەکەی دروستە. حاڵەتی روودانی نەنگیش کە لەپاش گرێدان بێو لە پێش وەرگرتن دابێ بەم پێوانە حسێبی بۆ دەکەین چونکە لەم ماوەیەدا فرۆشراو لە ضەمانی فرۆشیار دایە، چونکە هەرکاتێ کڕیار بەهای بە تەواویدا دەبێ لە بەرابەری ئەوەدا فرۆشراو بە ساخی وەربگرێ، دەنا تووشی زیان دەبێ، لەبەر ئەوە رێگەی پێدەدرێ کە بەهۆی زیانەوە فرۆشراو رەت بکاتەوە.

بزانــە كــە نــەنگ (واتــە: عــەیبی هەڵوەشانەوەی ســەودا) زۆرن.
یاسای كۆگر لەم مەسەلەیدا ئاوایە: هەرچــی نــەنگێ كــەمیی بــێ بۆ زاتــی شتەكە، وەك خەساویی، یا لە نرخەكەی كەم بكاتــەوە، كەمییــەكی وا كــە مەبــستێكی دروســتی ڕەوای پــێ بفــەتێ، ئــەوە دەبــێ بــەهۆی گێڕانــەوەی فرۆشــراوەكە بۆســەر خــاوەنی پێــشووی. مــەرجی ئــەم ڕەتكردنــەوەیش ئەوەیە كە كڕیار بتوانێ ماڵە فرۆشراوەكە وەك خۆی تەسلیم بكاتــەوە، دەنــا ئەگــەر ئــەوەی بــۆ نــەدەكرا ئەومافــەی بــۆ نیــە، وەك ئــەوە شــتەكە فەوتابێ، یا ئــاژەڵ بووبــێو مردبــێ ئــەوجا بــە نەنگەكەی زانیبــێ، ئــەوە مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نیە، بــەڵام مــافی زەدەبــژێری بــۆ هەیــە، كــە ناودارە بە تۆڵەو ئەرشی عەیب! مەبەست لە زەدەبژێری ئەمەیــە: نەنگــە كە بەپێی نرخی بازاڕ چەندەی لــە نرخــی فرۆشــراوەكە كــەم دەكــردەوە، دەبێ فرۆشیار ئەوەنــدە لــە بەهاكــە ڕەت بكاتــەوە بــۆ كڕیــار، بــۆ نموونــە: شتەكە بەبێ نەنگ لە بازاڕدا بایی ســەد دینــار بــوو، بــەڵام بــە عەیبــداری بایی نەوەد دینار بوو، دەبێ بەرێژەی یەك لە دەی بەهاكــە ڕەت بكاتــەوە، كە لەم حاڵەدا دەكاتە دە دینار.

**بزانن:** گێڕانەوەی ماڵی عەیبــدار دەبــێ دەس بــەجێ بــێ، كەواتــە هەركاتێ كڕیار بەبێ بەهانــەی ڕەوا گێڕانــەوەی دواخــست ئــەوە ســەوداكە دەچێتە ئەستۆی، مەگــەر لەبــەر ئــەوە دوای خــستبێ كــە نــەیزانیبێ بــەم حوكمــە، چونكە زانینــی شــتی وا بــۆ عــەوامو ڕەشــەخەڵك كارێكی ئاســان نیە.

## ٢٠٢) باسی فرۆشتنی بەری باخو دانەوێڵە:

تێکڕا دروست نیە فرۆشتنی بەری دارو درەختو شینایی تا پێ دەگاو بەکەڵکی خواردن دێو قازانجی دەردەکەوێ، ئەوەیش لە میوەی خۆڕەنگدا بەوە دەبێ کە دەس بکا بە گەیشتن، یاخود لەپاش مزربوون دەست بکا بە شیرین بوون، لە میوەو بەرو بوومی وایشدا کە رەنگ بگرێ بەوە دەبێ کە ئەو رەنگەی تیا دەربکەوێ کە نیشانەی گەیشتنیەتی، لە میوەی سووردا دەست بکا بەسوور بوون، لە زەردا دەست بکا بە زەردبوون، لە رەشدا دەست بکا بەرەشبوون، وە هەروەها بەم جۆرە. جا هەرکاتێ ئەم نیشانانەی تیادا دەرکەوت فرۆشتنی دروستە، ئیتر خوا بە مەرجێ رنینو بڕین بێ، یا بەمەرجی هێشتنەوە بێ هەتا بەپێی عادەت کاتی بڕینی دێ.

**بەپێی فەرموودەی خۆشەویست (دروودی خودای گەورەی لێبێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست گشتی بە قوربانی خاکی بەرئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ)** کە دەفەرموێ: بەری درەختو شینایی نافرۆشرێ هەتا پێ دەگاو بە کەڵکی خواردن دێ. (شەیخان - رەحمەتی خودایان لێبێ) گێڕاویانەتەوە. بەڵام ئەگەر کەڵكو قازانجی ئەو بەروبوومە دەرنەکەوتبوو ئەوە دروست نیە بفرۆشرێ مەگەر بەم دوو مەرجە:

**یەکەم:** مەرجی بڕینو لابردنی.

**دووەم:** ئەوەیە کە ئەو بەرەکاڵەبڕاوە قازانجێکی ئاسایی هەبێ، وەك بەرسیلەو فەریکە چوالە، نەك وەك هەرمێو بەهێ. بەڵام ئەگەر بەربەدارەوە لەگەڵ درەختەکەیدا، بەر لە دەرکەوتنی قازانجی، فرۆشرا

ئەوە بەبێ مەرج دروستە، چونکە بەر پاشکۆ (تابیع)ی درەختە، لە کاتی وایشدا بەهۆی ئەوەوە کە بنکی درەختەکە بە ساخی دەمێنێتەوە بەرەکەیشی هیچی لێنایەت، بەپێچەوانەی کاتی رنینی بەری کاڵ. چونکە لە حاڵی وادا بە خۆڕایی بەرەکە خەسار دەبێو دەڕزێ. هەروا نادروستە فرۆشتنی شینایی‌و چێنراوی سەوز مەگەر بە دوو مەرج: بە مەرجی بڕین‌و بە مەرجی هەبوونی قازانج، وەك قەرسیلی سەوز بۆ ئالفی ئاژەڵ. بەپێی ئەم فەرموودەیە کە موسلیم گێڕاویەتەوە: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ) نەهی کردووە لە فرۆشتنی خورما بە دارەوە بەر لەوە کە ماتەبدا، واتە: زەرد هەڵ گەڕێ، یا سووربێ، وە لە فرۆشتنی دانەوێڵە لەناو گوڵەکەیدا بەر لەوە کە سپی هەڵ گەڕێ‌و لە دەردو بەڵای ئاسمانی رزگاری ببێ، بەڵام ئەگەر ئەو چێنراوە لەگەڵ زەوییەکەدا فرۆشرا ئەوە دروستە. دەق وەك فرۆشتنی بەر بەسەر درەختەوە.

## ٢٠٣) فرۆشتنی ئەو شتەی سوود لە خۆگربێ بە تەڕی بەتوخمی خۆی (بیع ما فیه الربا بجنسه رطبا):

هەرچی ماڵی سوود لە خۆگربێ (واتە: ماڵی ریبەوی بێ) دروست نیە بە تەڕی بفرۆشرێ بە وێنەی خۆی لە توخمی خۆی، وەك روتاب بە روتاب، یا ترێ بە ترێ، چونکە هاوئەندازەیی‌و مومماسەلە لەکاتی تەڕیدا نایەتەدی. یاسای دامەزراویش دەفەرموێ: نەزانینی هاو ئەندازەیی دەق وەك هەبوونی زیادەی بەراستی وایە. بەڵام ئەو سەوزانەی کە وشك

ناکرێنەوە وەك خەیارو تروزیو شتی وا ئەوە دروستە بە تەڕی بگۆڕدرێنەوە بە یەکتر، هەروا شیر بە شیریش دروستە، چونکە شیر حاڵەتی تەواوەتییە بەڵام مەرجی دامەزراندنی فرۆشتنی شیر ئەوەیە: کە بەئاگر نەکوڵابێ، دەنا دروست نیە، چونکە هاو ئەندازەیی نایەتەدی، لە هەرشتێکی کە ئاگر کاری تێ کردبێ، فرۆشتنی نانیش بە نانو هەرشتێکی تریش کە ئاگر کارێکی زۆری تێکردبێ هەر وایە، لەبەر ئەوە دروست نیە فرۆشتنی هەندێکی بە هەندێکی، مەگەر کارتێ کردنێکی کەم، بۆ پاڵاوتنی هەنگوێنو هەڵقرچاندنی دووگ بۆ گرتنی رۆنەکەی.

## ٢٠٤) چەن فرۆشتنێکی پووچو بەتاڵ:

وەك لە پێشەوە زانیمان فرۆشتن برێتییە لە وەرگرتنی سامانێ بەرابەر سامانێکی تر، کە هەردوو سامانەکە شیاوی گەردانو تەصەرووف پێکردن بن. جا لەم گۆشە نیگایەوە: ئەگەر بەوردی بۆ هەندێ مامەڵەو سەودای هاوچەرخ بڕوانین، کە بەپێچەوانەی ئەم یاساو باوەوە روو دەدەن، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم جۆرە مامەڵانە پووچو نارەوانو، بەربەشی فرۆشتنە نادروستەکان دەکەون، کەناو دارن بە (بیوع فاسدە) کە شەرعی پیرۆز رەوای نەدیون. بۆ نموونە: کڕینی بیتاقەی یانسیبو بلیتی بەرهەمهێنانی پارەو سامان لە بەنگدا لەم جۆرەیە. ئەوە کڕینی بیتاقەی یانسیب دیارو ئاشکرایە کە ساخ قوماری رووتەو، قوماریش گومان لە حەرام بوونیدا نیە، چونکە یانسیب یا دەیباتەوەو قازانج دەکا ئەوە بەرئەم یاسا دامەزراوە دەکەوێ کە دەفەرموێ: هەر قەرزێ قازانج بەخاوەن قەرز بگەیەنێ ئەوە سوودە، یا دەیدۆڕێنیو زیان دەکا،

ئەوەیش ماڵ بە فێرۆدانەو گەوجی‌و دەستبلاوییە، هەموو قومارێکیش هەروایە.

کڕینی بلیت‌و کومپیالەی بەرهەمهێنانی پوول‌و پارەو سامان‌و دانانی پارە لە بەنگدا بە قازانج، بە هەموو جۆرەکانیەوە، ئەم جۆرە سەوداو مامەڵەیانەیش فرۆشتنێکی نادروستن، چونکە حاڵ لەم دوو خاڵە بە دەرنییە: چونکە ئەگەر لەو جۆرە مامەڵانەبێ، کە خاوەن قازانجن‌و لەسەر دەستووری شەرع نین، ئەوە بەر ئەو قەرزە دەکەوێ کە سوودو قازانج بە قەرزدەر دەگەیەنێ، ئەوەیش وەك زانیت نادروستە، ئەگەر بەبێ قازانجیش بێ ئەم دوو جۆرەی هەیە: یا بەتەمای دەسکەوتنی خەڵات (جائیزە) دایدەنێ، ئەوە دیسان بەر ئەو قەرزە دەکەوێ کە قازانج بە خاوەنی بگەیەنێ، یا بەتەمای بردنەوەی خەڵات دایانێ، ئەمەیش هەر حەرامە، چونکە بەر ئەو جۆرەکەسانە دەکەوێ کە یارمەتی تاوان دەدەن، چونکە ئەو بەنکەی کە ئەو ئەوپارەی تیادا دادەنێ مامەڵەی سوود ئەنجام دەدا، شتی وایش هاوبەشی‌و هاوکارییە لە تاواندا، ئەوەتا خوای گەورە هەڕەشە لە شتی وا دەکا. گەر کەسێ بڵێ: ئەو خەڵاتەی بەنك دەیبەخشێ بە بەشدارەکانی لە بابەتی بەخشین‌و هیبەیە، هیبەو شت بەخشینیش لە شەرعا پەسەندە، کەواتە ئێوە چۆن دەڵێن: نا دروستە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم داوایە دوورە لە ڕاستی، چونکە ئەم جۆرە بەنکە لەسەر ئەم بناخەیە دامەزراوە: ببەخشە هەتا وەربگری. ئەگەر بەهۆی ئەوەوە نەبێ کە بەنگ لەم جۆرە سامانانە، کە بەشدارەکانی دایان دەنێن لەلای، قازانجێکی باش دەکا، یەك پوول چییە نەیدەدا بەکەس. کەواتە: بەنك لەو قازانجە خەڵات دەدا بە خاوەن

پـشکەکان، کـە بـەهۆی مامەڵـەی سـوود بـە پارەکـانی ئەوانـەوە دەسـتی دەکەوێ، بەشی ئەوان لە چاوهی خاوەن بەنکا چکێکی زۆر کەمە، چونکە بەنك قازانجێکی مشەی حەرامی دەست دەکەوێ، ئەمـەیش مـەعنای وایـە کە ئەم بەخشینە لە سامانی حەرامە، هیبـەیش لـە مـاڵی نـاڕەوای حـەرام دروست نیە، چونکە خـودای گـەورە خـۆی پـاكو پـیرۆزەو هـەر شـتێکیش پـاك نـەبێو نـەبێ بەمایـەی پیرۆزیـی بـۆ خـاوەنی، خـوا وەری نـاگرێو قەبووڵی ناکا. (لێرەدا – من کـە وەرگێـڕم - بەنـدە یـەك تێبینـیم هەیـە: سەوداو مامەڵەکردن لەگەڵ ئـەو بەنکانـەدا، کـە مامەڵـە بەسـوود دەکـەن، ئەگـەر گریمـان هـەموو جـۆرێکی لـە بابـەتی یاریـدانو هاوکـاریکردن بـێ لەسەر تاوان، ئەوە دەبـێ بـەهیچ جـۆرێ هاریکـاریو مامەڵـە لـە گەڵیانـدا نەکرێ، هەتا نابێ مرۆڤ بەهۆی ئەو بانکانەوە حەوڵە بنێـرێ بـۆ کەسـێ، یا نابێ پارەشیان لـەلا بگۆڕێتـەوە. یا وردبکاتـەوە. دەی شـتی وایـش لـەم رۆژگارەدا زۆر زەحمەتە، زیانی لە قازانجی زیاترە، کەواتە: لەبەر ناچاری وا باشە کـە مـرۆی موسـوڵمان زۆر لـە شـت نەکۆڵێتـەوە {لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ} بـەرای بەنـدە هـەر جـۆرە هاوکارییـەك لەگەڵ ئەم جۆرە بەنکانەدا کە لەبەر ناچاری بێو بەبێ وەرگرتنی سـوود (ریبـا) بـێ دروستە. دەق لـە بابـەتی سـەوداکردنە لەگـەڵ کەسـێکدا کـە مامەڵەکـەی تێکـەڵ بـێ لـە حـەلاڵو حـەرام. گەرچی وا باشـە موسـوڵمان هەمیشە مامەڵە لەگەڵ موسوڵمانی باشو حەلاڵ خـۆردا مامەڵـە خـۆشو سەر راستو ماڵ پاکدا بکا، بەلام لە هەمان کاتدا دروسـتە مامەڵـە لەگـەڵ مرۆی خراپو کافرو فاسقیشدا بکـا. لـە شـوێنێ نوێـژ بـەو هـەموو رێـزو دەورە گرنگەیـەوە کـە هەیـەتی، دروسـت بـێ لـە پـشت فاسـقو پیـاوی

بەدکارەوە بکرێ، چۆن مامەڵەی توورو گێزەر لە گەڵیدا دروست نابێ: (الصلاة المكتوبة واجبة خلف كل مسلم برا كان أو فاجرا وان عمل الكبائر – رواه ابو داود والدار قوطني). کەواتە: ئەگەر کەسێ لەبەر ئەمینی، وە بۆ حیفظو پاراستنی ماڵی خۆی، کە مەبەستی سەرەکین لە بابەتی ئەمانەتو سپاردەدا، ماڵی خۆی لە بەنگ دانا، بە مەرجی ئەوە قەرزە حەسەنە بێ، زیادە وەرنەگرێ، ئەوە دروستە. بگرە لەوەیش باشترە کە لەلای موسوڵمانێکی باشی نابووتی ئاتاج بە ئەمانەت دایبنێ، چونکە دەست کەوتنەوەی ماڵەکەی لەلای بەنکەکە مسۆگەر ترە. بەندە دووبارەی دەکەمەوە: (کەشت زۆر قووڵ کردنەوەو باری ژیانی خەڵك گرانکردن بەهۆی تەفەلسوف لە دین داو، وشکە سۆفێتیو لە قاڵبدانی هەوڵدان بۆ ژیان، بە پێودانی کۆنو بەبێ رەچاوکردنی بەرژەوەندی بالاّی زوربەی خەلکی ئەم رۆژگارە، کاری وا دەست خستنە بینەقاقای خودی ئیسلامە هەتا رادەی خنکاندن) سەرنج بفەرموون چی دەقەومێ ئەگەر فەقیهێکی متزمت حوکم بە نادروستی ئەم جۆرە شتانە بکا: وێنە، بەنك، تەشریح، منع الحمل، دەرمانێ مادەی سڕکەری تیابێ، بەنکەنەوت، وەزیفەی ژن، التزام بە قانوونی دەولەتی زەرورەت، عەسکەری، وەرگرتنی مووچە، چونکە لە پارەی باجو گومرگو شتی وا کۆ ەکرێتەوە، ریش تاشین، لەبەرکردنی جلو بەرگی نوێ، وەك چاکەتو پانتۆڵ، سەر رووتی، گومرگو زەریبەو باجو خەراج! تەلەفیزیۆن، سینەما، شانۆ، گۆرانی، یانەو نادی چونکە شوێنی فەسادن، قاچاخ، عەقاری.. تاد. پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هلك المتنطعون، ئیمامی موسلیم {رەحمەتی خوای لێبێ} گێڕاویەتەوە. ئیمامی نەوەوی {رەحمەتی خوای

لێبێ} له ریاضوصالیحیندا ئاوا شەرحی دەكا: المتنطعون: المبالغون في الامور.

مەبەست ئەوە نیە كە جلەو بۆ رەشەخەڵك شل بكرێ بەكەیفی خۆیان چی بە باش دەزانن بیكەن، بەڵكوو مەبەست ئەوەیە زاناكان كار ئاسانكەربن، بار لە خەڵك گران نەكەن، لە زەمانی پێغەمبەردا مامەڵە لەگەڵ هەموو جۆرە كەسێ كراوە، مەلاكان ئەگەر ئارەزوو بكەن دەقە ئاینییەكان تا بلێی بە پێزو بە كش‌و كشیان دێ. حیلە شەرع‌و شتی وایش زۆرن بۆ پینەو پەڕۆو چارەسەكردنی زۆر لە كێشەكان. حیلە شەرع لە قورئاندا نموونەی هەیە، لە سوورەتی صاددا خودا بە پێغەمبەر ئەییوب {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: {وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ – سورة ص – ٣٨/٤٤} هەروا بە دەق لە سوورەتی یوسفدا دەفەرموێ: {وكذلك كدْنَا ليُوسُفَ..} لە سوننەتیشدا نموونەی زۆرە وەك ئەوە: عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: كاتێ لە ناونوێژدا دەسنوێژەكەتان شكا، دەست بگرن بە لووتتانەوەو گوایە لووتتان پژاوەو ئەوە بكەن بە بەهانە، تا تەریق نەبنەوە، ئینجا بەم فێڵەوە نوێژەكات ببڕن‌و بڕۆن!.

دەنا ئەگەر زاناكان كارئاسانی بۆ مەردومەكە نەكەن، بە خودا كاتێ دەزانین كار لەكار دەترازێ‌و بەرە بەرە كۆمەڵەی موسوڵمانان لە رەوتی كاروانی ژیان بە سەدان قۆناغ بەجێ دەمێنن‌و، ئەو وەختەیش سەدجار پێ هەڵبگرن تۆزی قولی ئەو خەڵكە لە پەت بەربووە، بەرەو ژیانی بەربەرەڵڵایی غاركردووە ناگرنەوە، سەرنجام دین‌و ئەهلی دین

جێگەیان مەتحەفو مۆزەخانە دەبێو ئێمەیش وەك خەڵکی خۆراوای دەستە پاچەو کوشتەی دەستی عیلمانیەتو ئیباحییەت دەبێ هەموو چاوتروکانێ چاوەڕێی شەپۆلی قەهرو غەزەبی خوابکەین!.

**بەهەرحاڵ، پەنا بەخوا لە زانای بێ تەقوا.**

**(وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين).**

**وەرگێڕ: نوری فارس حەمە خان حسن**

**سلێمانی (١٩٩٥/١٢/١٢)**

## ٢٠٥) باسی بارمته (رەهن):

**(بر: تەجریدی بوخاری ٣ ل – ١٧٤ – ژ. ١٠٨١ هەتا: ژ. ١٠٨٢)**

بارمته لە زمانی عەرەبدا پێی دەگوترێ رەهن، رەهنیش واتە: راگرتن‌و ماتڵ کردن، لە عورفی شەرعیشدا برێتییە لەوە کە مرۆڤ زاتی ماڵێ بکا بە بارمتەی هەقێ کە وا بەسەریەوە، بۆ دڵنیایی خاوەن هەقەکە لەوە کە هەقەکەی نافەوتێ‌و لە وادەی دیاری کراوی خۆیدا دەستی دەکەوێتەوە. بەڵگە لەسەر ئەوە کە رەهن لە زمانی عەرەبدا بە مانا راگرتن‌و بەندبوونە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: {كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ – سورة المدثر – ٣٨/٧٤) واتە: هەموو کەسێ لە قیامەتدا لەپاش زیندووبوونەوە، لە لای خودا پێوەندو بارمتەی کردەوەی خۆیەتی، چارەنووسی بەسراوە بە باشی‌و خراپی کردەوەکەیەوە، وەك بەندییەك وایە کەچاوەڕوانی دادگاییەکی دادپەروەرانە بکا.

سەر بەڵگەی دروستبوونی بارمتەیش قورئان‌و سوننەتە. قورئان دەفەرموێ: {فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ – سورة البقرة – ٢٨٣/٢} لە سوننەتیشدا بوخاری‌و موسلیم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەربێ) زریەیەکی هەبوو، دایابوو لەلای جولەکەیێ، لە بارمتەی بڕێ جۆدا، بۆ بژێوی خێزانەکەی.

**(مەرجەکان)**:

مەرجی بارمتە ئەوەیە کە شتێکی وابێ فرۆشتنی دروست بێ، کەواتە رەهنکردنی شتی وەقف دروست نیە، وە دەبێ شتێکی حازریشبێ، کەواتە رەهنکردنی قەرز دروست نیە، چونکە قەرز وەرگرتنی مومکین نیە، دەنا لە قەرزیی دەردەچێ، مەرجی ئەو ماڵەیش کە رەهنی بۆ دادەنرێ (واتە: شەرتی مەرهوونوبیهی) ئەوەیە قەرزێکی دامەزراوو پێویست بێ لە ئەستۆی رەهنکەردا، چونکە مەبەست لە بارمتە وەرگرتنەوەی قەرزەکەیە بە تەواوی لە شتە رەهن کراوەکە، لەبەر ئەوە وەرگرتنەوەی عەین لە عەین تەصەوور ناکرێ، مەرجی قەرزەکەیش ئەوەیە: کە ئەندازەو ماوەکەی لەلای هەر دوولا زانراوبن!.

**(کەی بارمتە پێویست دەبێ؟)**

بارمتە کاتێ پێویست دەبێ کە رەهن وەرگر بارمتەکە وەربگرێ، چونکە زاتی پاك دەفەرموێ: فَرِهانٌ مقبوضةٌ: ئەمە دەقە لەسەر ئەوە کە دەبێ بارمتەکە وەربگیرێ، کەواتە: ئەوە مەرجە لە بارمتەدا. جا ئەگەر رەهنی کرد بەڵام هێشتا رەهن وەرگر بارمتەکەی وەرنەگرتبوو ئەوە رەهنکەر بۆی هەیە کە لە رەهن کردنەکە پەشیمان ببێتەوە، چونکە هەتا بارمتەکە وەردەگیرێ گرێدانەکە بەدەست رەهنکەرەکەیە، لەبەر ئەوە وەرگرتندا دەتوانێ هەڵی وەشێنێتەوە پەشیمان بوونەوەیش جاری وا هەیە بەقسە دەبێ، جاری وایش هەیە بە کردەوە دەبێ، وەك ئەوە بارمتەکە بفرۆشێ، یا بیکا بە وەقف، یا شتێکی وای لێبکا کە لەهی ئەو دەربچێو ببێ بە ماڵی کەسێکی تر.

### ( ماڵی ڕەهنكراو ئەمانەتە لە دەستی ڕەهن وەرگردا )

لەبەر ئەوە ڕەهنوەرگر نابێ بە زامنی فەوتانی، مادەم كەمتەرخەمیی نەكا لە چاودێریكردنیدا، هەموو سپاردەو ئەمانەتێكی تریش هەروایە. بەڵام ئەگەر ڕەهنكراو لەبەر كەمتەرخەمیی ڕەهنوەرگر فەوتا، وەك ئەوە دەسكارییەكی وای كرد، كە ڕێگەی ئەوەی پێنەدرابوو ئەوە دەستەبەرە. ئەگەر ڕەهنكەر داوای ئەوەی كرد كە ڕەهنوەرگر سووچبارە لە فەوتانی ڕەهنكراودا، ئەگەر شایەتی نەبوو، ئەوە ڕەهنوەرگرەكە سوێند دەدرێ، چونكە ڕەهنوەرگر ئەمینداره. ئەمە كاتێ وایەو بە سوێن بڕوای پێدەكرێ كە هۆیەكی ئاشكرا باس نەكا دەنا بەبێ بەڵگە داواكەی وەرناگیرێ.

### ( دانەوەی هەندێ لە قەرزەكە ڕەهنكراو ئازاد ناكا )

هەموو ماڵە ڕەهنكراوەكە بامتەی دڵنیاییە بۆ هەموو قەرزكەو بۆ هەموو بەشەكانیشی، كەواتە: ڕەهنكراو لە بەندیی ڕەهنوەرگر ڕەها نابێو ناچێتەوە ژێر تەصەرروفی خاوەنەكەی، هەتا هەموو قەرزەكە بە تەواوی دەداتەوە بە خاوەن قەرزەكە.

### ( قازانجو كەڵك وەرگرتن لە بارمتە – مەرهوون ):

دروست نیە كەڵكو سوودی بارمتەكە بۆ ڕەهنوەرگربێ، دەنا بەر ئەو جۆرەقەرزە دەكەوێ كە كەڵك دەگەیەنن بە خاوەنیانو، لەبەر ئەوە دەبن بە سوودو ڕیبا. كەواتە هەموو كەڵكێكی ڕەهنكراو بۆ خاوەنیەتی، هەروا كەڵكی بەریو كەڵكی بەچكەیشی هەر هی ئەوە، بە هیچ جۆرێ

رەهنـوەرگر مـافی نیـە کـە کـەڵکی لێ وەربگـرێ، لـەم دوو شـتەدا نـەبێ: ئەگـەر شـتی سـواریی بـێ دەتوانـێ سـواری بـێ، ئەگـەر ئـاژەڵی شـیرداربێ دەتوانـێ شـیرەکەی بخـوا. بـەپێی فەرموودەکـەی خۆشەویـست (دروودی خوای لەسەربێ): ولاخـی سـواری - ئەگـەر لـە بامتـەدا دانرابـێ – دروسـتە بارمتـەوەرگر سـواری پێبکـا، ئـاژەڵی شـیرداریش – ئەگـەر لـە بارمتـەدا دانرابـێ – دروسـتە بارمتـەوەرگر شـیرەکەی بخواتـەوە، مەسـرەفی ولاخ و ئاژەڵەکەیش لەسەر ئەو کەسەیە کە سواری ئەو ولاخە دەبێ، یاشیری ئەو ئاژەڵە دەخواتەوە! (بوخاری).

## ٢٠٦) دەست بەست (الحجر):

(بڕ: **تەجرید**/ ٣ ل – ١٤٠ = ژ: ١٠٤٦ **هەتا** ١٠٥١ ز: ٤٨).

دەست بەست لە زمانی عەرەبدا پێـی دەڵێن: حیجـر، یـا حـەجر، حــەجریش واتــە: نەهێـشتن، لــە عــورفی شــەرعدا واتــە: نەهێـشتنی تەصـەرووفکردنی کەسـێ لـە مـاڵی خۆیـدا. ئەمـەیش دوو جـۆرە، دەسـت بـەس لەبـەر پاراسـتنی قـازانج و بەرژەوەنـدی دەسـت بەسـتەکە، واتـە: (محجـور علیـە) یەکـە. وە دەسـت بەسـت لەبـەر پاراسـتنی بەرژەوەنـدی کەسێکی تر.

**جۆری یەکەم:** وەك ئەوە نەهێڵرێ منداڵ و شێت و نـەفام گـەردان و تەصـەرووف لـە مـاڵی خۆیانـدا بکـەن. سـەر بەڵگـەی ئـەم بابەتـە ئـەم ئایەتەیـە: {**فَـإِن كَـانَ الَّـذِي عَلَيْـهِ الْحَـقُّ سَـفِيهًا أَوْ ضَـعِيفًا أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ** – سورة البقرة – ٢٨٢/٢} واتـە:

جا ئەگەر ئەوکەسە کە حەقەکەی وا بە سەرەوە خۆی بێ ئەقڵو بێ فام بوو – واتە: سەفیەو نەفام بوو – یا زەبوون بوو، وەك منداڵی نەباڵق و پیری خەڵەفاو، یاخود خۆی مەودای ئەوەی نەبوو کە قسەبکا بۆ نووسەرەکە، یا لە لایدا حازر ببێ، یا زمانی نەدەزانی، با لەم کاتانەدا ئەو کەسە کە خاوەنی کاری ئەو کەسەیە، وەك هەقداری، یا سەرپەرشتیاری، یاجێدار (وەکیل)ی، یا تەرجمانی، بائەو کەسە قسەکان بکا بۆ نووسەرەکە.

ئەوەتا زاتی پاکی بێگەرد لەم فەرمایشتەدا: هەواڵ دەداو دەفەرموێ: با ئەو نەفامانەی کە دەستبلاْونو ماڵی خۆیان بەهەوانتە بە فیرۆ دەدەن، هەروا ئەو هۆش زەبوونانەی کە لەبەر منداڵی، یا لەبەر پیریو خەڵەفاوی ئەقڵیان بە قازانجی خۆیان ناشکێو نازانن بەجوانی گەردان لە ماڵی خۆیاندا بکەن، هەروا ئەو کەسانەیش کە خۆیان ناتوانن و نازانن قسە بۆ نووسەرەکە دابنێن، وەکوو شێتو ئەمانە، با ئەمانە هەقدارەکانیان لە جیاتی خۆیان سەرەوکاریی سامانەکانیان بکەن، چونکە بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدایە.

**جۆری دووەم:** وەك ئەوە کە نەهێڵرێ مرۆی نابووتو لاتکەوتوو سامانی خۆی سەرف بکا، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی خاوەن قەرزەکان نەفەوتێ وەك ئەوە نابێ ماڵەکەی بفرۆشێ، یا ببیبەخشێ، یا بیکا بە وەقف، هەروا هەموو گەردان پێکردنێکی تری لەم بابەتەی لێ قەدەغەیە. چونکە تەصەڕوفو گەردان پێکردنەکەی دەبێ بەهۆی لەکیس چوونی سامانی کەسێکی ترو مافی خەڵکی تری پێ دەفەوتی، لەبەر ئەوە تەصەڕوفەکەی دانامەزرێ، دەنا مەبەستی سەرەکی حەجر (واتە: دەست

بەست) کە پاراستنی مافی خەڵکە لە فەوتان، نایەتە جێ. وەکو ئەوەیش کە نەهێڵرێ کە نەخۆش لە نەخۆشینی سەرەمەرگا، زیاتر لە سێیەکی ماڵی خۆی سەرف بکا، بۆ ئەوەی مافی شەرعی کەلەپوور بەرەکان نەفەوتێ، بەڵام رێگەی ئەوەی ناگیرێ کە هەرچی قەرزێکی لەسەرە هەمووی بداتەوە، با هیچیش بۆ میراتگرەکان نەمێنێتەوە، هەروا ئەگەر میراتبەریشی نەبێ وەسێتی پتر لە سێیەك هەردانامەزرێ، بەڵام لە سێیەکدا دادەمەزرێ. پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خودای گەورە لە سەرەمەرگا رێگەی ئەوەی پێتان داوە کە سێیەکی سامانەکانتان بکەن بەخێر، هەتا کردەوەی باشتان لە قیامەتدا زرۆبن. وەکوو ئەوەیش کە بەندە دەست بەست بکرێ‌و بۆ بەرژەوەندی ئاغاکەی حیجر بخرێتە سەر تەصەروفی ماڵی، چونکە تەصەروفی بەندە بەبێ رێگە پێدانی ئاغاکەی دانامەزرێ، چونکە بەندە نەماڵی هەیەو نەخاوەنی شتە، بەڵکوو هەم خۆی‌و هەم هەرچی هەیە هی ئاغاکەیەتی، وەکوو ئەوەیش کە بۆ بەرژەوەندیی موسوڵمانان وەرگەڕاو لە دین (مُرْتَدّ) دەست بەست بکرێ، یا بۆ پاراستنی مافی بارمتەوەرگر بارمتەکەر دەست بەست بکرێ‌و نەهێڵرێ لە ماڵی رەهنکراودا تەصەڕوف بکا، هەتا لە رەهنەکە دەری دەکا، یا کەلەپوورگر دەست بەست بکرێ بۆ پاراستنی مافی مردووەکە، یا بۆ پاراستنی مافی خاوەن مافانی تر، وەك خاوەن قەرز، یا قەرزار دەست بەست بکرێ ئەگەر خاوەن قەرزەکە داوای ئەوەی کرد.

ئەمانە هەموو وێنەو نموونەن بۆ جۆری دووەمی حیجر.

## ٢٠٧) تەصەڕوفی منالّو شێتو نەفام (سفیە):

تەصەڕوفی مندالّو شێت دانامەزرێ، دەنا دەست بەست كردنیان بێ كەڵك دەبێ، نەفامیش هەروا، بەڵام نەفام ئەگەر ژن تەلاق بدا، یاژن خولع بكا تەلاقو خولعەكەی دادەمەزرێ. تەڵاقدانەكەی بۆیە دادەمەزرێ چونكە حیجرو دەست بەست بەس بۆ ماڵە، تەلاقیش ماڵ نیە، خولعەكەیشی بۆیە دادەمەزرێ، چونكە دەڵێین: لە شوبێنێ تەلاقدانی بە بەلاش دابمزرێ، تەڵاقدانی لەگەڵ دەستكەوتنی ماڵدا بۆ دانامەزرێ؟ چونكە خولع تەڵاقە بەرابەر بە ماڵ، دەی ئاشكرایشە كە ئەمانە هەقی تەصەروفیان نەبێ دەبێ هەقداریان مافی ئەوەی هەبێ، بەپێی ئەم ئایەتە: (فلملل ولیە). لە پێشترین هەقداریش بەپێی یەككگرتن باوكە، ئەگەر باوكی نەبوو باوكی باوكیەتی، وە بەم جۆرە تادەڕوا، چونكەباوكی باوك بۆ بەشوودانو ژن مارەكردن وەك باوك وایە، دەی بۆ ماڵیش دەبێ هەروابێ، لەدوا باوكو باپیر سەرپەرشتە (واتە: وصی) لەدوا ئەویش سەرپەرشتی سەرپەرشتە. ئەوجا حاكمی وەقتە. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} كە دەفەرموێ: فەرمانڕەوا هەقداری ئەو كەسەیە كە هەقداری تری نەبێ!.

لەم جۆرە هەقدارانەدا عەدالەتو داد مەرجە، چونكە مرۆی بەدكاری بێدادلێی ناوەشێتەوە كە ئاگاداری سامان بكاو بیپارێزێ. هەندێ دەڵێن: دادگەری لە باوكو باپیردا مەرج نیە، چونكە ئەم دووە بەسروشت دڵسۆزی نەوەی خۆیانن.

## ٢٠٨) تەصەڕوفی لاتكەوتوو (موفلیس):

لاتكەوتوو كەسێكە كە بووبێ بەژێر قەرزەوەو ئەو قەرزانەی كەوان لەسەری كاتی دانەوەیان هاتبێو زۆرتریش بن لەو ماڵەی كە هەیەتیو قازی لەبەر هۆیێ، یا لەسەر داواكردنی خاوەن قەرز، حیجر دابنێ لەسەری ئیتر تەصەڕوفی لەوماڵەدا كە حیجری لە سەردانراوە دانامەزرێ. دەنا كەڵكی حیجرەكە پووچ دەبێتەوە. سەربەڵگەی ئەم باسە ئەم فەرموودەیەیە كە دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} حیجری دانا لەسەر موعاذ، لە سەرماڵەكەی، چونكە قەرزێكی لە سەربوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بۆدانەوەی ئەو قەرزە ماڵەكەی موعاذی فرۆشتو قەرزەكەی لێدایەوە (دارە قوطنیو بەیهەقیو حاكم گێڕاویانەتەوە، حاكم بە فەرموودەیەكی دروست – صەحیح –ی داناوە) هەروا ئەم فەرموودەیەیشە كە دەفەرموێ: ئەبو سەعید {دروودی خوای لێبێ} فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا {دروودی خوای لەسەربێ} پیاوێ بەری باخێكی كڕی، لەپاشا بەرەكە فەوتا، پیاوەكە تێشكاو بووبەژێر قەرزو قۆڵەوە. جا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: خێری پێبكەنو زەكاتی بدەنێ، جا خەڵكیش خێرو زەكاتیان پێدا، بەلام بەشی بژاردنی قەرزەكەی بەتەواوی نەكرد. جا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بە خاوەن قەرزەكانی فەرموو: چیتان دەست كەوتووە بیبەن، چونكە هەر ئەوەتان دەكەوێو بەس!. (موسلیمو كەسانی تریش گێڕاویانەتەوە، رەزای خودایان لێبێ).

## ٢٠٩) تەصەڕوفی نەخۆش لە زیاتر لە سێیەکی ماڵی خۆی:

تەصەڕوفی نەخۆش لە سێیەکی ماڵەکەیدا دروستەو جێبەجێ دەبێ. چونکە بەرای کوڕی مەعروور {ڕەزای خوای لێبێ} وەسێتیکرد کە سێیەکی ماڵەکەی بۆ پێغەمبەربێ {دروودی خوای لەسەربێ} پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} قەبووڵی کرد، بەڵام کە سێیەکەکەی وەرگرت دابەشی کردەوە بەسەر میراتبەرەکانی بەرائدا. بەڵام ئەگەر نەخۆش پتر لە سێیەکی سامانی خۆی کرد بەخێروبەخشی بەکەسێ، ئەوە دەبێ بۆ ئەوەی کە زیاترە لە سێیەك میراتبەرەکان رازی بن، دەنا لە زیادەکەدا وەسێتەکە دانامەزرێ. دەبێ رازیبوونەکەیان لە پاش مەرگی مردووەکەیان بێ، چونکە لەپێش مەرگیدا ئەو مافەیان نیە، لەبەر شتێ تریش کە ئەویش ئەوەیە: کە دوور نیە کە ئەو کەسەی کە ئێستا میراتبەری نەخۆشەکەیە، لەکاتی مردنەکەیدا ئەو مافەی نەمێنێو لە میراتبەریی بکەوێ، وەك ئەوە ئەم لە پێش ئەودا بمرێ.

## ٢١٠) تەصەڕوفی کۆیلە (تصرف العبد):

کۆیلە ئەگەر ئاغاکەی رەزای لەسەر نەبێ، کە سەوداو مامەڵە بکا، کڕینو فرۆشتنی نە بۆ خۆیو نە بۆ ئاغاکەی دانامەزرێ. بۆ خۆی بۆیە دانامەزرێ چونکە کۆیلە شیاویی (ئەهلییەت)و یارای خاوەنداریی‌و موڵکییەتی نیە، بۆ ئاغاکەیشی بۆیە دانامەزرێ چونکە بەبێ فەرمانو رەزابوونی ئەو مافی ئەوەی نیە.

# ٢١١) ڕێکەوتن (صولّح)

(بر: تەجرید/ ٣ل – ٢٣١ – ز: ٥٧ – ژ. ١١٢٦ هەتا ژ. ١١٣١).

صولّح (واتە: ڕێکەوتن) لە زماندا واتە: چارەسەری کێشەوبەرە، لە عورفی شەرعدا ئەو گرێدانەیە کە کۆتایی دێنێ بە دژایەتیو دوژمنایەتیو کێشەی نێوان چەن هاودژو نەیارو ناحەزێ.

سەربەلگەی ڕەوایی ڕێکەوتن لە شەریعەتدا هەم کیتابەو هەم سوننەتە. یەزدانی پاك دەفەرموێ: {وَالصُّلْحُ خَيْرٌ – سورة النساء – ١٢٨/٤} واتە: ڕێکەوتن باشەو خوا پێی خۆشە، لە فەرموودەیشدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕێکەوتنو چارەسەرکردنی کێشەو بەرە لە نێوان موسوڵماناندا کارێکی ڕەوایە (حاکم گێڕاویەتەوەو دەیشفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەپێی مەرجی بوخاریو موسلیمە) لە گێڕانەوەیەکا دەفەرموێ: هەموو ڕێکەوتنێ ڕەوایە، مەگەر ڕێکەوتنێ کە نارەوا بکا بە ڕەواو، ڕەوا بکا بە نارەوا. (ئیبنو حەببان لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە، تیرمیذیش دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە، واتە: حەدیسێکی حەسەنە.

# ٢١٢) باسی جۆرەکانی ڕێکەوتن (سولّح):

**ڕێکەوتن دوو جۆری هەیە:**

**جۆری یەکەم:** ئازادکردنو ئاڵشت (واتە: إبراء ومعاوضە)

ئازادکردن وەك ئەوە کەسێك بڵێ: ئەوا لە گەڵتارێکەوتم لەسەر ئەوە کە لەو هەزار دینارەی لەسەرتە پێنج سەد دینارم بدەیتەوە، لە پێنج

سەدەکەی تری گەردنت ئازاد بێ. ئەمە پێی دەگوترێ بەخشین‌و گەردن ئازادکردن لە بەشێ لە قەرزەکە، بە گفت (لەفظ)ی رێکەوتن، یا بە لەفظ (گفت)ی صوڵح.

**جۆری دووەم:** کە رێکەوتنی ئاڵشتکرنە ئەوەیە: کە کەسێ شتێکی لەبەرچاوی لەسەر کەسێ بێ، لەگەڵیدا رێ بکەوێ، کە لەجیاتی ئەو شتە شتێکی لەبەرچاوی تری لێ وەربگرێ، شتی لەبەر چاو واتە عەین، وەك ئەوە لەباتی گایێ ئەسپێکی لێ وەربگرێ، ئەوە ئەم جۆرە رێکەوتن‌و سوڵحە دەق حوکم‌و بڕیاری کڕین‌و فرۆشتنی هەیە، ئەوەی لە کڕیندا مەرج بوو لەمیشدا مەرجە، وەك سەرپشکی‌و هاو ئەندازەیی لەکاتی هەبوونی هۆو بایست‌و عیللەتی سوودو رێبادا. بەڵام ئەگەر لەسەر ئەوە رێکەوتن کە لەبەر چاوێ (واتە: عەینێ) لە جیاتی کەڵك‌و مەنفەعەتێ وەربگرێ ئەوە بڕیاری بەکرێدانی هەیە، وەك ئەوە بڵێ: لە جیاتی ئەو دەدینارە قەرزە کە لەسەرتە دوو پێنووسم بدەرێ.

## ٢١٣) کەڵك وەرگرتن لە شەقام‌و کۆڵان:

**بزانن کە رێگە دوو بەشی هەیە:** رێگەی دەرچوو، واتە: طەریقی نافیذ، رێگەی دەرنەچوو، واتە: طەریقی غەیرە نافیز. جا هەر رێگەیێ کە دەربچێ‌و بەری بەرەڵابێ ئەوە رێگەی گشتییەو کەس مافی تایبەتی پێوەی نیە. بەڵکوو هەموو کەسێ وەك یەك مافی هاتوچۆکردنی بەو رێگەیەدا هەیە. وە کەس مافی ئەوەی نیە کە تەصەڕوفێکی وای تیادا بکا، زیان لە هامۆشۆکەرەکان بدات، وەك ئەوە بچێ شانشینێ لەسەر

دیواری قەراخ شەقامەوە دەربکا بۆ سەر هەوای شەقامەکە، یا سەکۆیێ لە کۆلانەکەدا بە قەراخ دیوارەکەی خۆیەوە بکا، یا چوخمێ لەسەر کۆلانێ دروست بکا. چوخم: تاقێکی گەورەیە کە بەسەر کۆلانێکا هاتبێتەوە، سەرێکی لەسەر خانووی ئەم بەری کۆلانەکە بێ‌و ئەو سەرەکەی تری لەسەر خانووەکەی ئەو بەری کۆلانەکە بێ، وە سەرەکەی کرابێ بە ژوور. چونکە هەر ئەو بە تەنها خاوەن ماف نیە لەو جێگەیەدا، بەلام ئەگەر ئەو چوخم‌و شانشینە ئەوەندە بەرزبوون کە زیانیان نەبوو بۆ رێبوارو رێڕەو، نە بۆ پیادە، نەبۆ سوار ئەوە دروستە.

سەر بەلگەی ئەم بابەتە ئەم سەرمەشقەی پێغەمبەر خۆیەتی (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) دەگێڕنەوە: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) بە دەستی پیرۆزی خۆی پلووسکێکی دامەزراند بۆ گوێسەوانەی خانووەکەی عەباسی مامەی، پلووسکەکە دەکەوتە سەر شەقامێ دەچوو بۆ مزکەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جا بە پێودانی ئەم دەقپیادانانە کە لە بارەی پلووسکەوە هەیە، شتی تریش رێگە دەدرێ. دەقپیادانان، واتە: تنصیص.

بەلام مەرجی ئەم پەلهاویشتنە بۆ سەرکۆلان‌و رێگەو شەقام ئەوەیە: کە ماڵەکەی ئەو شتانەی بۆ دروست دەکرێ هی موسولمان بێ، چونکە بۆ کەسانی تر شتی وا دروست نیە، چونکە کردنی ئەو جۆرەشتانە لە رێزەو قەبیلی بەرزەوەکردنی خانووی ناموسولمانانە بەسەر خانووی موسولمانانندا، بگرە لەوەیش خراپترە ئەمە لە کاتێکدا کە هاتو چۆی ناموسولمانان بە رێگەو بانی موسولمانانندا بەپێی

شایستەیی خۆیان نیە بۆ ئەوە، بەڵکوو بەپێی پاشکۆییانە بۆ موسوڵمانان.

بەڵام کۆڵانێ کە دەرنەچێ ئەگەر هاوبەشبوو لە نێوان چەند ماڵێکا، ئەوە دروست نیە نەبۆ خۆیانو نەبۆ کەسانی تر کە هیچ شتێ لەو کۆڵانە بەرپا بکەن، بەبێ رەزاو فەرمانی گشت هاوبەشەکان، چونکە هەموو ملکێکی هاوبەش هەروایە. مەبەست لە هاوبەشو خەڵکی هەر کۆڵانێ ئەو کەسانەیە کە دەرگای ماڵەکانیان لەسەری بێ. مافی ئەو ماڵانەیش کە دەکەونە سەر ئەم جۆرە کۆڵانانە لە دەرگای خانووەکانیانەوەیە هەتا سەری کۆڵانەکە، بەڵام مافیان لە کلکەی کۆڵانەکەدا نیە، چونکە جێگەی هاتوچۆی ئەوان لە دەرگاکانی خۆیانەوە دەست پێدەکا هەتا سەری کۆڵانەکە، نەك لە کلکەو کۆتایی کۆڵانەکەوە، مەگەر دەرگای خاوەن ماڵ لەسەر کۆتایی کۆڵانەکەبێ.

## ٢١٤) هەواڵە: حەواڵە (الحوالە):

**بەرەو رووکردنەوە:**

(**بر: تجرید:** ٢ ل -٨٩- ز. ٤٣ – ژ. ١٠٠٨ **هەتا** ژ. ١٠٠٩).

هەواڵە، یا حەواڵە، وشەیەکی لە بنەڕەتدا عەرەبییە، لە زمانا بە مانا گواستنەوەیە، لە عورفی شەرعیشدا برێتییە لە گواستنەوەی مافێك لە ئەستۆی کەسێکەوە بۆ ئەستۆی کەسێکی تر. راستیەکەی فرۆشتنی قەرزە بە قەرز بەڵام لەبەر پێداویستی رێگەی پێ دراوە. سەربەڵگەی دروست بوونی هەواڵە ئیجماعە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی کە شەیخان

دەیگرێنــەوە کــە پێغەمبــەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفــەرموێ: قــەرز کــوێری دەوڵەمەنــد گــەڵێ ســتەمە! ئەگــەر دنیــابوو کەســێ لــە ئێــوە لەلایــەنی قەرزارەکەی خۆیەوە بەرەو رووی پیاوێکی دەوڵەمەنــد کرایــەوە، کــە ئــەو دەوڵەمەنــدە لــەباتی قەرزارەکــەی خــۆی قەرزەکــەی پــێ بداتــەوە ئــەوە بابچێ قەرزەکەی لەو وەربگرێتەوە. (ئەحمەدو بەیهەقی).

**( مەرجەکانی هەواڵە )**

## ئەم چەند شتە بۆ دامەزراندنی هەواڵە بە مەرج گیراون:

**یەکــەم**: رەزابــوونی حەواڵەکــەر، چــونکە خــۆی سەرپــشکە لــە دانەوەی ئەو مافەی کەوا لە سەری، لەچی رێگەیەکەوە کە خۆی ئـارەزوو بکا.

**دووەم**: رەزابـوونی هەواڵـەکراو چـونکە مافەکـە هـی ئـەوە بـەبێ رەزامەندیی ئەو لە کەسێکەوە ناگوێزرێتەوە بۆ سەر کەسێکی تر.

**سێیەم**: ئەوەیـە کـە هـەردوو قەرزەکـە چەسپاو بـن لـە ئەسـتۆی هەواڵەکەرو هەواڵە بۆ سەرکراودا.

**چـوارەم**: ئەوەیـە هـەر دوو قەرزەکـە رێـك (موتتــەفیق)بـن، واتــە: ئـەو قـەرزەی کـە لەسـەر هەواڵەکـەرە لـەم شـتانەدا رێـك بـێ لەگـەڵ ئـەو قـەرزەی کـەوا لەسـەر هەواڵـە بـۆ سـەرکراو، واتــە مەرجــە کــە هــەردوو حەقەکــە بەقــەد یــەك بــن لــە تــوخم (جیــنس)و ئەنــدازەو حــازری (حولـول)و مـەودا داری (تـەئجیل)و باشـیو خراپـیو نایابیو ئایەخیـدا، ئــەم مەرجــەیش لەســەر رای فەرمایــشتی دروســت بــە مــەرج گیراوە، کــە

بەرابەرەکەی دەفەرموێ: ئەگەر قازانجی هەواڵەکراو لەوەدا بوو کە دوو قەرزەکە لەم شتانەدا وەك یەك نەبن دروستە. جا هەرکاتێ هەواڵەکردنو بەرەو رووکردنەوەکە، لەسەر شێوەیەکی دروست بوو ئەوە هەواڵەکەرەکە رزگاری دەبێو قەرزەکەی سەری کەهی هەواڵەکراوەکەیە پاك دەبێتەوە، هەروا هەواڵە بۆ سەرکراوەکەیش رزگاری دەبێ لە قەرزی هەواڵەکەرەکە، ئیتر مافی هەواڵەکراو دەکەوێتە ئەستۆی هەواڵە بۆ سەرکراو! چونکە ئەم هەواڵە بوونی مافە سوودی بابەتی هەواڵەیەو بەس[1].

---

[1] بسم الله الرحمن الرحيم.. لە بەرگی دووی (رياض الصالحين)دا لە لاپەڕە (٤٦٨)دا، ئەم فەرموودەیە بە نیوە ناچڵ چاپ بووە، دەمەوێ لەم دەرفەتەدا ئەو کرتاویە بە سەربگرمەوە فەرموودەکە بە تەواوی ئاوایە:

خالیدی کوڕی عەمری ئەل – عەدەوی فەرمووی: عوتبەی کوڕی غەزوان، کاتێ فەرمانڕەوای بەصرەبوو وتارێکی بۆماندا، ستایشو سوپاسی خودای گەورەی کردو فەرمووی: پاش سوپاسی خودا، وا جیهان ملی پێوەناوەو نیشانەی کۆتاییو تەواوبوونی دەرکەوتووە، بەزوویی دەبڕێتەوە، ئەوەی ماوە لە دنیا لەچاو ئەوەیدا کە رۆیشتووە وەك خڵتەی بن جام وایە، کە خاوەنەکەی لەهەر چوارلای جامەکەوە کۆی بکاتەوە تا بەتەواوی دایچۆڕێنێ.

بزانن کە ئێوە لەم جیهانە بێ بەقایەوە دەگوێزنەوە بۆ خانەی ئێجگاری، کە بڕای بڕای بڕانەوەی نیە، دەی کەوایە زووکەن هەتا هەل لە کیس نەچووەو دەرفەت ماوە هەرچی چاکەیەکتان لە دەست دێ درێغی لێ مەکەنو لەپێش خۆتانەوە بیکەنو رەتی بکەن بۆ ئەو دنیا، چونکە خانەی ئێجگاریتان ئەوێیە، لەوێ کارتان بە چاکە زۆر زۆرە، لەبەر ئەوەی کە رۆژی رەشی زۆرتان لە پێشەوەیە ورێگەی سەختتان لەبەرە، گەیشتۆتەوە

به ئێمه كه بەردێ لەسەر لێواری دۆزەخەوە خولۆر یا كلێر دەكرێتـەوە، حـەفتا سـاڵ لـە سەریەك بەبێ وەستان هەر گولۆر دەبێتەوە كەچی هێشتا هەر ناگاتەبنی! دە قەسـەم بـە زاتی خودا ئەم دۆزەخە بەم گەورییە پڕپڕ دەبێ! ئەوە وا دیارە كە ئێوە لەم باسە سەرسـام دەبن؟!.

دەسا لەلایەكی تریشەوە باس كراوە بۆمان: كە بەهەشت زۆر زۆر گەورەو پانو پـۆڕو بەرینە، لەم لاشیپانی دەرگاكانیە وە هـەتا ئـەو لاشـیپانەكەی چـل سـاڵەڕێیە، دەی سـا بەخودا ڕۆژێ دەبێ كە هەموو دەرگاكـانی بەهەشـت جمـەیان دێ لەوانـەی كـە لێیانـەوە دەچنە ژوورەوەو لەبەر قەرە باڵغی دەروازەكانی بە هەشت جمەیان دێو مـەردوم بـە پاڵـە پەستۆ دەچنە ژوورەوە كەس بە خۆشیو ناخۆشیی جیهان نـەنازێو دەسـت خـەڕۆ نـەبێ، ڕۆژێ بوو ئێمە حاڵمان وابوو، بەخۆمـەوە حەوت كـەس بـووین، لـە خزمـەت پێغەمبـەردا بووین (درووودی خوای لەسەربێ) ئەوەی پێی بلێی خواردەمەنی نەمان بوو، گەڵای دارو درەختی ئەوبیابانە نەبێ، ئەوەندە گەڵادارمان خوارد بوو لە تاو برسێتی لالغاوەمان تەرەكی بوو، بوو بوو بەرین.

ئەمـەیش حاڵی پۆشتەو پەرداخیمان بوو، رووتو رەجاڵ بووین، عابایەكم پەیدا كرد، كردم بە دوو كەرتەوە، نیوەیم بۆ خۆم لـەباتی دەرپـێ كـرد بـە بـەركۆشو پێـچام بـەلای خوارووەـوە، ئـەو نیوەكـەی تریـشم دا بـە سـەعدی كـوڕی مـالیـك ئـەویش كـردی بـە بەركۆشو پێچای بەخۆیەوە لـە جیـاتی دەرپـێ، ئەوسـاكە ئەمـە حاڵـمان بـوو، وە ئـەوە خواردنەكەمان بوو، ئەوەیش جلی شاییو شینمان بوو، ئـەوەتانێ ئێـستایش هەركەسـێ لە ئێمە دەبینـی یـا فـەرمانڕەوای سـەر شـارێكە، یـا پادشـای سـەر وڵاتێكـە. خودایـە! باییمان ئەكەیو پەنامان بدەی لەوە كە هەوا بكـەینو لـە دڵـی خۆمانـدا خۆمـان بـەزل بزانینو لەلای تۆیش پچووكو بێ وەچ بین!.

بیشزانن كـە هـەموو پـەیامێكی پێغەمبـەران پاش خۆیـان لـە پـاش ماوەیـێ، لـە حاڵێكەوە دەگۆڕێ بۆ حاڵێكی تر، بە تایبەتی حاڵی فەرمانڕەواكانیان تـەواو دەگـۆڕێ،

تەنانەت لە ئەنجامدا دەوڵەتی ئیسلام دەبێ بە پادشایی‌و سەڵتەنەت‌و، ڕەفتاری بەرزی سەردەمی پێغەمبەرایەتی لەناو فەرمانڕەواکاندا بەحاڵ شوێنەواری دەمێنێ. دڵنیام کە بەچاوی خۆتان ئەمەی من دەیڵێم، لە فەرمانڕەواکانی پاش ئێمە دەیبینن! لەپاش ئەوە کە بەتەجرۆبەو ئەزموون لە حاڵی ئێمەو ئەوان بە باشی حاڵی دەبن‌و بە بەراورد ئەمەتان بۆ دەردەکەوێ. (ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیەیە لە صەحیحی موسلیمدا لە بەرگی هەژدەدا، لە (کتاب الزهد)دا، لەپەڕە (١٠١ – ١٠٣). هۆی ئەم پەخشکردنەوەیە لێرەدا ئەمەیە: لە سایەی خوداوە هەموو بەرگەکانی (تاج الاصول)و (ریاض الصالحین) لە ژێرچاپ دان‌و لەلای من نەماون‌و لەکاتی خۆیدا بەهەڵە ئەمە نەکراوە. جا هەر ئەوەندە کە تەرجەمەکە چەسپاو پەخش بۆوە خوا یاربێ لە چاپی ئایندەدا خێرو مەندان ئەم فەرموودەیە لێرەوە نەقڵ دەکەنەوە بۆ ناو ریاضەکە.

هەروا ئەم فەرموودەیەیش بەهەڵە چاپ نەبووە لە بەرگی دووی ریاضەکەدا، زنجیرەی (٥١) لاپەڕە (٤٢٣) فەرموودەی (٢٧) کە دەفەرموێ:

ئەبو نەجیح کوڕی عەبەسەی ئەل – سولەمی – {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: هەر لە سەردەمی نەزانیدا من دەمزانی کە ئەو خەڵکە سەر لێشێواوو کومڕان‌و، ئەوە دین نیە کە ئەوان وان لە سەری کە بتان دەپەرستن‌و دارو بەرد بە خودا دەزانن.

جا زۆری پێ نەچوو کە بەرگوێم کەوت کەوا لە مەککە پیاوێ پەیدا بووە هەواڵی گەورە گەورە دەدا، جا بەسواری وڵاخەکەم چووم بۆ خزمەتی، کە ڕوانیم پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} خۆی شاردۆتەوەو، هۆزەکەی لێی پڕن‌و بە خوێنی سەری تینوون، لەبەر ئەوە زۆر بە نەزاکەت بە دزکە خۆم گەیاندە خزمەتی، کە لەناو مەککەو لەماڵێکا خۆی حەشاردابوو.

عەرزیم کرد: تۆ چیت؟ فەرمووی: (من پێغەمبەرم) گوتم: پێغەمبەر چییە؟ فەرمووی : خودا منی ڕەوانە کردووە. گوتم: ئەو پەیامەی کە خودا بە تۆدا ڕەوانەی کردووە قسە لەچی دەکا؟ فەرمووی: پەیامەکەم ئەوەیە: پەیوەندیی خزمایەتی بکەم‌و

سیلەی رەحم بەجێ بهێنمو بتان بشکێنم: یەزدانی پاك بە تاقە خوای هەقی بێ هاوەڵ بزانم. گوتم: باشە هەتا ئێستا کەسێ باوەڕی پێت هێناوە، وە ئەوانەی کە لەڵتنا چ کارەنو کێن؟ فەرمووی: بەڵێ خەڵکم لەگەڵن تێکەڵن، هەیانە ئازادە، هەیانە کۆیلەیە. فەرمووی: ئەو سەردەمە ئەبو بەکرو بیلال {رەزای خوای لێبێ} موسوڵمان بوو بوون.

عەرزیم کرد: دەی باشە منیش دێمە سەردینت، فەرمووی: باشە، بەلام ئێستا ئەوەت بە ئاشکرا بۆ ناکرێ، نابینی من خۆم حاڵم چۆنە بە دەست ئەو خەڵکەوە؟ بڕۆرەوە بۆ ناوماڵو منالی خۆت، هەرکاتێ بیستت کە من خۆم ئاشکرا کردووە وەرەوە بۆلام، ئیتر منیش رۆیشتمەوە بۆ ناوکەسوکارەکەمو لەوێ مامەوە هەتا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} تەشریفی برد بۆ مەدینە، لەو ماوەیەدا هەر سووسەی هەواڵی ئەوم دەکردو هەر کەسێکم دەدی کە لە مەدینەوە دەهات هەواڵی پێغەمبەرم لێ دەپرسی. هەتا رۆژێ چەن کەسێ لە خەڵکی مەدینە هاتن گوتم: ئەرێ ئەو پیاوەی کە هاتووە بۆ مەدینە چی بەسەرهاتو دەنگوباسی چییە؟ گوتیان: مەردوم زۆر خێرا دەچن بە دەنگیەوەو شوێنی دەکەون، هۆزەکەی ویستبوویان کە بیکوژن، بۆیان نەکوژرابوو، جا منیش چووم بۆ خزمەتی بۆ مەدینەو چوومە خزمەتیو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا دەمناسیتەوە یانا؟ فەرمووی: بەڵێ تۆ ئەو پیاوەی کە لە مەککە یەکمان دی. گوتم: دە قوربان! هەندێ لەو زانستە کە خودا فێری تۆی کردووەو من هیچی لێ نازانم فێرم بکە، بفەرموو هەواڵی چۆنێتیی نوێژم پێ بفەرموو، فەرمووی: نوێژی بەیانی بکە، ئەوجا واز لە نوێژکردن بهێنە هەتا خۆر بە ئەندازەی رمێ لە ئاسۆ بەرز دەبێتەوە، چونکە لەم کاتەدا خۆر لە نێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە هەڵ دێ، واتە: لەم کاتەدا شەیتانو دەستەی شەیتان دەکەونە جرتو فرتو زاڵ دەبن، هەر بۆیەکیش لەو دەمەدا بێبڕواکان سوژدەی بۆ دەبنو خۆردە پەرستن! کەواتە: با کوڕنووشی ئێمەو کوڕنووشی ئەوان یەك نەگرن. لەوەدوا نوێژبکە، نوێژی ئەم دەمە فریشتە دێنە دیاریو شایەتی باش بۆ نوێژ خوێن دەدەن، هەتا ئەو دەمەی کە سێبەری رمی داچەقاو بە قنجی لە شوێنی تەختا لە

کەمییەو سێبەرەکەی لەوە کەمترناکا هەر نوێژ بکە، ئەوجا واز لە نوێژ بێنە، چونکە لەم کاتەدا دۆزەخ وەك تەندوور دادەخرێ، جا کاتێ سێبەری لای ئێوارە داهات‌و خۆربەدیمەن لەناوەراستی ئاسمان لایدا نوێژی نیوەڕۆ بکە، نوێژی ئەم کاتە فریشتە ئامادەی دەبن‌و شایەتی بۆ نوێژکەر دەدەن، هەتا نوێژی عەصریش دەکەی هەروایە، هیچ نوێژێ لەم ماوەیەدا ناباشی نیە، کە نوێژی عەصرت کرد ئیتر نوێژی تر مەکە تا خۆر ئاوا دەبێ چونکە خۆر لە نێوان دوو شاخە ی شەیتانەوە ئاوا دەبێ، ئەوەتا لەو دەمەدا خۆر پەرستەکان کوڕنووشی بۆ دەبەن، فەرمووی: جا گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خوا!دەی بفەرموو باسی دەسنوێژیشم پێ بفەرموو؟ فەرمووی: هەر کەسێکتان ئاوی دەسنوێژەکەی ئامادە بکا، ئەوجا ئاو لە دەمی‌و لە لووتی رابداو هەنگ بکا، ئیتر هەرچی گوناهی دەمووچاوو دەم‌و کونە لووتەکانیەتی هەڵ دەوەرێن‌و بەردەبنە خوارەوە، کاتێ روخساری دەشوا، لەسەر ئەو شێوەیە کە خوا فەرمانی پێکردووە، مسوگەر هەرچی گوناهی دەموچاویەتی، لە نووکی ریشیەوە، لەگەڵ ئاوەچۆڕەکەدا هەڵ دەوەرن‌و دەکەونە خوارەوە، کاتێ دەستەکانی تا ئانیشکەکانی دەشوا هەرچی گوناهی دەستەکانیەتی لە نووکی پەنجەکانیەوە لەگەڵ ئاوە چۆڕەکەدا هەڵ دەوەرێن، کاتێ سەری تەڕ دەکا هەرچی گوناهی سەریەتی لە نووکی مووەکانیەوە لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوەکەدا دادەکەون! کاتێ هەردوو قاچی هەتا هەردوو قاپەرەقەڵەی دەشوا، هەرچی گوناهی قاچەکانیەتی لە نووکی پەنجەکانیەوە لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوەکەدا هەڵدەوەرێن، جا دوا ئەمە ئەگەر هەڵسایەوە نوێژیشی بەو دەستنوێژە کرد، وە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی کردو، بەشێوەیی کە هەرشایستەی خوابێ ستایشی جوانی خوای گەورەی کرد، وەدڵی خاڵی کرد لە پەیوەندی لەگەڵ غەیری خوا داوبەتەواوی دڵی لەلای خودا بوو، ئیتر لەپاش ئەو نوێژە وا لە گوناە پاك دەبێتەوە وەك ئەو رۆژەی کە لەدایك دەبێ! جارێ عەمری کوڕی عەبەسە ئەمەی باسکرد بۆ ئەبو ئومامە، کە ئەویش هاوڕێی پێغەمبەربوو، ئەبو ئومامە فەرمووی: ئەی عەمری کوڕی عەبەسە! بزانە ئەم قسەیە تۆ دەیکەی کوێ دەگرێتەوە؟! چۆن لە یەك جێگەداو بەیەك هەڵوێستی ئاوا، بە

## ٢١٥) دەستەبەریی (الضمان):

بر: تجرید/ ٣ت – ٩١)

**پێناسەکەی:**

دەستەبەریی واتە: لە ئەستۆگرتن، دەگوترێ: بووە بە دەستەبەری ئەو شتە، واتە: ئەو شتەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی. دەستەبەر لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ: ضامنو ضمینو کفیلو زعیمو حمیل.

سەربەلگەی رەوابوونی دەستەبەریی نامەی خواو سوننەتی پێغەمبەرو یەکگرتنی نەتەوەیە. یەزدانی پاك دەفەرموێ: {وَلِمَن جَاء بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَاْ بِهِ زَعِيمٌ – سورة يوسف – ٧٢/١٢} واتە: جارچییەك جاڕی داو بانگەوازی کرد: ئەی کاروانی! جامە زێرینە

---

دەستنوێژێكو دوو رکات نوێژ خودا ئەم هەموو خەلاتە دەدا بە بەندەو لە گوناە پاکی دەکاتەوە، وەك منداڵی ساوای تازە لەدایك بوو؟! عەمریش فەرمووی: ئەی ئەبوو ئومامە! خۆت دەزانی کە پیرو ئیختیار بوومو ئیسکم ناسك بۆتەوەو ئاکامم نزیك بۆتەوە، دیارە کە لەحاڵی وادا هیچ کارێکم بە درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە نیە، دەی ئەم فەرموودەیەم نەك جارو دوو جارو سێ جارو چوار جارو پێنج جارو شەش جارو حەوت جار لە پێغەمبەر بیستووە، بەڵکوو لەمەیش زیاتر لێیم بیستووە بۆیە دەیگێڕمەوە، دەنا هەرگیز نەیم دەگێڕایەوە. (موسلیم – رەزای خوای لێبێ – گێڕاویەتەوە).

**سوپاس بۆ خودا ئەم دەفتەرەیش تەواو بوو.**

**وکتبە بخط یدە مترجمە: نوری فارس حمە خان حسن.**

**٢٧/ رەجەب / ١٣١٤ رێکەوتی ١٥/١٢/١٩٩٥**

ئاوخۆرەکەی پادشاتان دزیوە، هەر کەسێ بیهێنێتەوە باری وشترێ خەڵەی بە خەڵات دەدەینێ، وە من خۆم دەستەبەری ئەوەم. پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (العارية مؤداة والزعيم غارم) واتە: خواستەمەنی دەدرێتەوە بە خاوەنی، دەستەبەر (ضامن)یش بژاردنی لەسەرە، هەرکاتێ قەرزارەکە خۆی نەیبوو دەبێ کەفیلەکەی شتەکە ببژێرێ. (ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە، تیرمیذی بە جوانی داناوە، ئیبنو حببانیش لە صەحیحی خۆیدا گێراویەتەوە). لە بوخاریشدا دەفەرموێ: جارێ تەرمێکیان هێنا، یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا! بفەرموو نوێژی لەسەر بکە، فەرمووی: ئایا ماڵی لە پاش بەجێماوە؟ گوتیان: نەء، فەرمووی: خۆ قەرزی لەسەر نیە؟ گوتیان: با سێ دینار قەرزارە، فەرمووی: دەخۆتان نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن! ئەبو قەتادە فەرمووی: قوربان نوێژی لەسەر بکە، قەرزەکەی لەسەر من، لە گێڕانەوەی نەسائیدا: ئەبو قەتادە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: من کەفیلی قەرزەکەی.

**مەرجەکەی:**

**مەرجی دامەزراندنی دەستەبەریی سێ شتە:**

**یەکەم**: ناسینی دەستەبەرو دە ستەبەری بۆ کراو (مضمون لە) چونکە لەکاتی داواکردنەوەی مافدا خەڵکان چونیەك نین، هەیانە سەر راستو مامەڵە خۆشەو، هەیانە سەرچەوتو گیرو قەرز کوێرە، شتی وایش دەبێ بەهۆی جیایی مەبەست، ئەوەیش دەبێ بەهۆی ئەوە کە دەستەبەری بەبێ مەرجی ناسین، ببێ بەهۆی دەستەشکێنی (غەرەر).

**دووەم:** سامانە دەستەبەرکراوەکە دەبێ مافێکی دامەزراو ثابت) بێ، لەکاتی دەستەبەربوونیدا، کەواتە: ماڵێ کە هێشتا نەبووبێ بە ماڵی خاوەنی دەستەبەربوونی دانامەزرێ، ئەوەیش وەك دەستەبەربوونی ژێواری ژن کە سبەینێ بۆی ببڕێتەوە. (ژیوار: نەفەقە – وەرگێڕ).

**سێیەم:** دەستەبەرکراو (مضمون)ەکە دەبێ زانراوو مەعلوومبێ، زامنیی شتی نەزانراو دانامەزرێ، وەك ئەوە بە کەسێ بڵێ: ئەوەی کە هەتە لەسەر فیسارەکەس من دەبم بە دەستەبەری هەندێکی، چونکە نەزانراوە ئەو هەندە چەندە. جا هەرکاتێ دەستەبەری (بەپێی مەرجی خۆی) دامەزرا، خاوەن مافەکە بۆی هەیە کە داوای هەقەکەی خۆی لە قەرزارەکە بکا، یا لە دەستەبەرەکە بکا، بۆیە دەڵێین: مافی ئەوەی هەیە کە داوای قەرزەکەی لە قەرزارەکە بکا، چونکە قەرزەکە هێشتا هەروا لەسەر ئەو، بۆیە کاتێ ئەبو قەتادە قەرزی مردووەکەی دایەوە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: ئا ئێستا رزگاری بوو، چونکە ئەگەر هەر بەوەندە گەردنی ئازاد ببوایە کە ئەبو قەتادە بوو بە دەستەبەری، پێغەمبەر لە پاش دانەوەی قەرزەکە ئاوای نەدەفەرموو. بۆیە دەڵێین: مافی ئەوەی هەیە کە داوا لە دەستەبەرەکەیش بکا چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: دەستەبەر بژاردنی لەسەرە. مەزهەبی ئیمامی مالیك دەفەرموێ: کاتێ داوا لە دەستەبەر دەکرێ کە دەستەبەری لە باتی کراو (مضمون عنە) نەتوانا بێ.

مەرجی دەستەبەر ئەوەیە کە شیاوی گەردان بێ، واتە: ئەهل بێ بۆ تەصەڕووف. کەواتە دروست نیە منداڵو شێتو حیجر لەسەر دانراو ببن بە دەستەبەر.

## ٢١٦) چی كاتێ دەستەبەر بۆی هەیە بگەڕێتەوە بۆ سەر دەستەبەری لەباتی كراو (مضمون عنه):

ئەگەر كەسێ بوو بە دەستەبەری كەسێ، بە رەزای خۆی، وە بە رەزای خۆشی قەرزەكەی بۆی دایەوە، ئەوە مافی ئەوەی بۆ هەیە كە چەندەی لەباتی ئەو بژاردۆتەوە ئەوەندەی لێ بسێنێتەوە. چونكە ئەو ماڵی خۆی خەرجكردووە بۆ قازانجی ئەو. دیسان بەپێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} موسوڵمانان لەسەر مەرجی خۆیانن‌و هەر مەرجێكی رەوا دابنێن دەبێ جێبەجێی بكەن. (د/ت/ح – س/ص) بەڵام ئەگەر دەستەبەریەكەی، یا دانەوەكەی لەسەر فەرمانی قەرزارەكە نەبوو بۆی نیە كە بگەڕێتەوە بۆ سەری، چونكە شتی وا دادەنرێ بە پیاوەتی رووت. جاهەر كاتێ دەستەبەریبۆكراو داوای هەقەكەی لە دەستەبەركرد، دەستەبەر بۆی هەیە داوا لە دەستەبەری لە باتی كراوبكا، هەتا رزگاری بكا لە دانەوەی قەرزەكە.

## ٢١٧) دەستەبەریی شتی نەزانراوو شتێ كە هێشتا پێویست نەبووبێ:

(ضمان المجهول وما لم يجب):

دەستەبەریی نەزانراو دانامەزرێ، چونكە شتی وا دەستەشكێنییە واتە: غەرەرە، دەستەشكێنیش لە شەرعا رێگەی نادرێ، هەروا دەستەبەربوونی شتێكیش كە هێشتا پێویست نەبووبێ دانامەزرێ، وەك ئەوە زانا ببێ بە دەستەبەری ئەو سەد دینارەی كە لە ئایندەدا دەبێ بە

مـاڵی دانـا لەسـەر کاکـەبرا، چـونکە دەسـتەبەری بـۆ دڵنیـابوونی خـاوەن مافە، کـە مافەکـەی دەسـت دەکەوێتـەوە، کەواتـە: نابـێ لـە پێویـستبوونی ئەو مافە پێش بکەوێ، هەروەك چۆن شایەتی نابێ لە بینینی شایەتی لە سەردراوەکە پێش بکەوێ. ئەمەیش وەك ئـەم وێنەیـە: پیاوێ بـە کەسـێ بڵێ: لاله ئەحە! ئەمە بفرۆشە بە مامە حەمە مـن دەبم بـە دەسـتەبەری بەهاکـەی. چـونکە ئەمـە دەسـتەبەربوونی بەهایەکـە کـە هێـشتا دانەمەزراوە.

لـەم بابەتـە ئـەم مەسـەلەیە چـەرت دەکـرێ، کـە پێـی دەگـوترێ: (ضمان الـدرك) کـە برێتییـە لـەوە ببـێ بـە دەسـتەبەری فرۆشـیار ئەگـەر فرۆشراوەکە عەیبداربوو، یـا ببـێ بـە دەسـتەبەری کڕیـار ئەگـەر بەهاکە قەڵب بوو، یا نەنگدار بوو.

## ٢١٨) دەستەبەربوون (کەفالەت):

(بر: تجريد/ ٣ل - ٩١ ز: ٤٤).

دەسـتەبەربوونیش جۆرێکـە لـە دەسـتەبەری، بـەڵام تایبەتـە بـە جەستەی ئادەمیزادەوە. دەشێ کە بۆ بەڵگەسازی بۆن بنـرێ بـەم ئایەتـە پیرۆزەیەوە، کە باسی راسپێری یەعقووب دەکا بۆ کوڕەکانی (درووددی خوا لەسەر پێغەمبەری خۆمان، لەسەر ئەوانیش بێ) کە دەفەرموێ: {لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ اللّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلاَّ أَن يُحَاطَ بِكُمْ – سورة يوسف – ١٢/٦٦} چونکە ئەوەی تیادایە: کە ئەوە لە ئەستۆ بگرن کە ئەو کەسە ئامادەبکەن لە شوێنی ناوبراودا کـە خزمـەت حـەزرەتی یەعقووبـە (درووددی

خوای لەسەربێ) ئەم جۆرە دەستەبەربوونە کاتێ دروستە کە ئەو مافەی وا لەسەر کەفالەتکراوەکە مافی ئادەمیزادبێ، نەك مافی خوابێ، وەك ئەوە تۆڵەی کوشتنەوەی لەسەر بێ، یا داری حەددی بوختیانی لەسەر بێ، لەم کاتانەدا دروستە دەستەبەربوون بۆ ئامادەکردنی کەسێ کە ئەم تاوانانەی کردبێ، چونکە ئەمە مافێکی چەسپاوەو دەق لە سامان دەچێ. بەلاَم ئەگەر مافەکەی کە لەسەری بوو مافی خوابوو، وەك داری حەددی بادەنۆشیو تۆڵەی دزێتیو تۆڵەی داوێنپیسی ئەوە دەستەبەربوونی ئەم جۆرە کەسانە بە جەستە دروست نیە. چونکە ئێمە لە سەرمانە کە ئەم جۆرە شتانە بپۆشینو هەولَی ئەوە بدەین کە ئەم جۆرە تۆڵەوەرگرتنە بەپێی توانا لە کۆڵ بخەین. جا ئەگەر دەستەبەر شوێنی بە دەستەوەدانی دیاریکرد ئەوە ئەوێ بڕیار دەدرێ، دەنا پێویستە شوێنی بەستنی دەستەبەر بوون واتە: شوێنی عەقدەکە بکرێ بە شوێنی بە دەستەوەدان. جا کاتێ دەستەبەر کەفالەتکراوی لە شوێنی بەدەستەوەداندا، دابەدەستەوە ئیتر لە دەستەبەربوونەکەی رزگاری دەبێ، بەمەجێ لەو جێگەدا پێشگیرێ لە بەدەستەوەدان نەبێ وەك لەو جێگەیەدا زۆرداری هەبێ بەزۆر کەفالەتکراو ببا، لەکاتی وادا دەستەبەر رزگاری نابێ. بەلاَم ئەگەر رێگرێ وا هەبوو، کە سووچی دەستەبەری تیانەبوو، ئەوە لەکاتی وادا بەدەستەوەدان لە شوێنی ناوبراودا پێویست نیە، چونکە یەدانی پاك دەفەرموێ: {إِلاَّ أَن يُحَاطَ بِكُمْ} گریمان کەفالەتکراوەکە دیارنەبوو، دەستەبەرەکە خرایە شوێنیو زێندانی کرا، لە حالَی وادا ناچار ناکرێ کە ئامادەی بکا، چونکە لە ناوزیندانا ئەوەی پێناکرێ، خوای گەورەیش دەفەرموێ: {لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا – سورة البقرة – ٢٨٦/٢} واتە: خوا داوایێ لە کەسێ ناکا کە لە توانایا نەبێ). ئەگەر

کەفالەت کراوەکە مرد داوای ئەو هەقەی لە سەریەتی لە دەستە بەرەکە ناکرێ، چونکە ئەو دەستەبەری زەلامەکەیە، نەك دەستەبەری ماڵەکەی سەری[1].

## ٢١٩) باسی هاوبەشی (شەراکەت):

**بر: تەجریدم ٣ ل – ١٦٥ ز: ٥٢ ).**

**هاوبەشی لە زمانا** واتە: تێکلاویی، لە عورفی شەرعا: چەسپانی مافی چەند کەسێکە لەیەکشتا لەسەرشێوەی هەمووانی (شیوع – تێکراییی). سەر بەلگەی ئەم باسە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەربێ) کە دەفەرموێ: خوای گەورە دەفەرموێ: من سێیەمی هەموو دوو کەسێکم کە هاوبەش بن لە شتێکی رەوادا، پیتو فەڕ دەخەمە کارەکەیانەوە، بەمەرجێك ناپاکیو دزی لەیەکتر نەکەن، بەلام هەر کە دەستیان کرد بەگزیو دزی لەیەکتری ئیتر من بەجێیان دەهێلم. (ئەبو داوودو حاکم گێڕاویانەتەوە). دیارە مەبەست ئەوەیە کە پیتو فەڕی سامانەکەیان دەچێت بەحەوادا.

---

(١) لێرەدا هەڵەیەکی نووسیار – سەهوی قەڵەم – لە عیبارەتی کفایة الأخیارەکەدا هەیە، دانەری فیقهولویەسەکەیش بەبێ راست کردنەوە بەسەریدا رۆیشتووە، بەپێی موغنیو شەریعەتی ئیسلام هەڵەکەم راست کردەوە. چونکە خۆی (لومات المکفول)وە، نەك وەك نووسراوە (لومات المکفول له).

– وەرگێر –

## ٢٢٠) جۆرەكانی هاوبەشی:

**هاوبەشی دوو جۆری هەیە:**

**یەكەم**: هاوبەشایەتییە بەلەش (شەریكایەتییە بە لەش)، ئەم جۆرەیان پووچو بەتاڵە، ئەمەش وەك هاوبەشایەتیی دارتاشو ئاسنگەرو حەماڵو كۆڵكێشو پیشە گەرانی تر، كە لەناو خۆیانا لەسەر ئەوە رێك بكەون كە هەموویان ئیش بكەنو دەستكەوتەكەیان هاوبەش بێ لە نێوانیاندا، خوا كاسپییەكەیان ئەوەندەی یەكبێ، یاكەمو زیادی هەبێ، وە پیشەكەیان یەك جۆربێ وەك دوو دارتاش، یا دوو ئاسنگەر، یا چەند جۆرێ بێ وەك بەرگدروو، لەگەڵ بەرگچندا، هۆی پووچی ئەم جۆرەیش ئەوەیە كە هەر كەسەیان بگری، بەلەشو بەكارو بە دەسكەوت، جیایە لەوی تریان، كەواتە: دەبێ هەركەسێ قازانجی خۆی هەر بۆ خۆی بێ، نەك بۆ كەسێكی تر، دەنا كارەكە سەر دەكێشێ بۆ كێشەو بەرە لە نێوانیانداو لەسەر قەبلاندنی پشك لە قازانجا رێك ناكەون. ئەوەندە هەیە ئیمامی مالیك رێگەی هاوبەشایەتی بە لەشی داوە بەمەرجێ پیشەكەیان یەك بێ، ئیمامی ئەبو حەنیفەش بەبێ قەیدو بەند ئەم جۆرە هاوبەشییە بە دروست دەزانێ.

**جۆری دووەم**: هاوبەشایەتی جڵەوە (شَراكة القَنَان)، بۆیەیش وای پێ دەگوترێ چونكە هەردوو هاوبەشەكە بۆ ئەم شتانە چون یەكن: بۆ هەڵوەشاندنەوەو تەصەرووف كردنو دەستكەوتنی قازانج بەپێی ئەندازەیماڵەكە، دەق وەك چۆن هەردوو لای دەستەجڵەوی ولاخ وەك یەكن بۆ جڵەوكێشیی ولاخەكە (دەستە جڵەوی لغاو مەبەستە كە دوولای

هەیـە – وەرگێـڕ) ئـەم جۆرەیـان دروسـتە، بـەپێی فەرموودەکـەی لـە سەرەتای باسەکەوە رابورد، یەکگرتنیش هەیە لەسەر دروست بوونی.

**مەرجەکانی:**

**یەکەم مەرج:** ئەوەیە هاوبەشییەکە لـە مـاڵێکی نـەخت (نەقد)دا، یا وێنەدار (مثلی) دابێ. چونکە وێنـەدار کـە لەگەڵ (تـوخم - جنس)ی خۆیدا تێکەل بوو ئیتر لەیەك جیاناکرێنەوە، رێك وەك پارەی نـەختی لێ دێ، مـاڵی وێنـەدار (کـە هاوبەشـایەتی تیـادا دروسـتە) وەك گـەنمو جـۆو رۆنو ئـەم جـۆرە شـتانە، پـارەی نـەخت لـە بەرچـاوترین نموونـەی مـاڵی وێنەدارە، بەڵام لەماڵی نرخ بۆ دانراودا، کەپێی دەگوترێ: مـاڵی (متقـوَم) وەك زەویو زارو خانوبـەرە، هاوبەشـایەتی دانامـەزرێ، چـونکە تێکـەل بـوونێکی وا کـەببێ بـەهۆی ئـەوە ماڵـەکان فـەرقیان نـەخرێ، شـتی وا هۆشو ئەقڵ نایگرێ،

**دووەم مەرج:** ئەوەیە کـە لەیـەك تـوخمو جـۆربن، وە لەصـیفەتو نیشانەیشدا هەر یەکبن، وەك گەنم لەگەڵ گەنمدا، جۆ لەگەڵ جـۆدا، سـاخ لەگەڵ ساخدا، شکاو لەگەڵ شاکاودا، دەنا دانامەزرێ چونکە لـە حـاڵی وادا بەئاسانی جوێ دەکرێنەوە، سروشتی هاوبەشیش ئـەوە دەخـوازێ کـە دوو ماڵەکـە لەیـەك جیانەکرێنـەوە، چـونکە ئەگـەر فـەوتانێ روویـدا، سـوور دەزانـرا کە ئەو فـەوتاوە مـاڵی یـەکێ لـە دوو هاوبەشـەکەیە، ئـیتر کـابرای مـاڵ فـەوتاو بەچـی هـەقێ دەبـێ بـە هاوبـەش لـە مـاڵی هاوبەشـەکەیدا، کەفرێ ئەوی پێوە نیە.

**سێیەم مەرج**: ئەوەیە دەبێ ماڵەکان وەها ئامێتە بکرێن کە بەهیچ جۆرێ فەرق نەخرێن و لە یەك جیانەکرێنەوە، ئەمە بۆ ماڵێکە کە لە بنچینەدا جیا بن، دەنا ماڵێ کە لە بنچینەدا تێکەڵ بن وەك چەند کەسێ بە تێکەڵی شتێ بکڕن، یا ماڵێ بە کەلەپوور بگاتەوە پێیان، ئەوە بۆ مەبەستی جیانەبوونەوە ئەم ئەندازەیە بەسەو دەتوانن لە سامانی وادا هاوبەشی ئەنجام بدەن.

**چوارەم مەرج**: ئەوەیە کە هاوبەشەکان هەموویان ڕێگەی گەردان و تەصەڕوفیان پێبدرێ. ئەوەندە هەیە تەصەڕوفی هاوبەش وەك تەصەڕوفی جێدار (وەکیل) وایە، گەرەکە بەرژەوەندی هاوبەشایەتی ڕەچاو بکرێ، کەواتە مامەڵە بەقەرز، یا بەزەرەر، یا سەفەرکرن بەوماڵەوە بەبێ ڕێگەدانی هەموو هاوبەشەکان دروست نیە.

**پێنجەم مەرج**: کاتێ هاوبەشەکان مامەڵەیان کردو قازانج پەیدا بوو، دەبێ ئەو قازانجە دابەشبکرێ لە نێوانیانا بەپێی ئەندازەی سەرمایەکەیان، خواە هاوبەشەکان ئەوەندەی یەك ئیشیان کردبێ یانە. چونکە ئەگەر برێ لە قازانجەکە بخەینە بری ئیشکردن، ئەوە مامەڵەی هاوبەشی تێکەڵ و پێکەڵ دەبێ لەگەڵ مامەڵەی قازانج بە هاوبەشی، کەپێی دەگوترێ (قیراض) ئەمەیش قەدەغەیە. دەی ئەگەر مەرجی ئەوەیان کرد کە قازانج بەپێی ماڵەکەیان نەبێ، یا زیان بەپێی ماڵەکەیان نەبێ، ئەوە هاوبەشییەکەیان بەتاڵە. وەك گوتمان هاوبەشایەتی گرێدانێکی دروستە، هەرکام لە هاوبەشەکان مافی ئەوەیان هەیە هاوبەشییەکە هەڵوەشێنێتەوە، هەرکاتێ ئارەزوو بکا، چونکە

هاوبەشی عەقدی ئیرفاقە، کەواتە: وەك جێداریو وەکالەت دروستە، هەروا مافی ئەوەی هەیە کە هاوبەشەکەی لە کاربخاو عەزلی بکا، هاوبەشی هەڵ دەوەشێتەوە بە مردن، یا بەشێتی یا بەبێ هۆشیی هەموویان، یا هەندێکیان. بزانن دەستی هاوبەش لە سەرسامانی هاوبەشەکەی دەستی ئەمانەتو دەستپاکییە.

## ٢٢١) هاوبەشی لە پشكو سەنەداتا:

**ئەم جۆرە هاوبەشییە یا لە چەند پشکێکدایە، یا لەچەند سەنەدێکدایە،**

**جۆری یەکەم دروستە،** چونکە قازانجو زیان لەم جۆرەدا بەپێی ئەندازەی ماڵەکانە، هەرکەسەیان، بەشی خۆی لە قازانج وەردەگرێ هەروا بەشە زیانی خۆشی قەبووڵ دەکا.

**بەلام جۆری دووەم:** کە برێتییە لە هاوبەشی لە سەنەداتا دروست نیە، چونکە بنچینەکەی لەسەر ئەوەیە: کە خاوەن کومپیالەکە هەر لەسەر کومپیالەکەی خۆیەتیو لە هەموو حالێکا مامەڵەکەی خۆی بە تەواوی دەوێتەوە، لە هەمان کاتدا قازانجی بڕیاردراوی خۆشی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا دەوێ، بەپێی کورتیو درێژیی مەودای دیاریکراو، ئیتر هەقی نیە بەسەر ئەوەوە کە ئەو کومپانییە قازانج دەکا یا زیان، دەی شتی وایش هەق سوودەو بەر ئەو یاسایە دەکەوێ کە دەڵێ: هەر قەرزێ قازانج بگەیەنێ بە خاوەن قەرزەکە ئەوە دادەنرێ بەسوو (ربا).

## ٢٢٢) باسی جێداریی، (واتە وەكالەت):

**بر: تەجرید/ ٣/ ل ٩٣ ز: ٤٥).**

جێداریی لە زمانا بەوە دەگوترێ كە كاری خۆت بسپێری بە كەسێ تا ئاگاداریو چاودێری بكا، ئەم ئایەتە بەم واتەیە كە دەفەرموێ: {حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ – سورة آل عمران – ١٧٣/٣} واتە: بەس خودامان بەسەو خۆی پشتو پەناو ئاگاداری چاكە. لە عورفی شەرعیشدا ئەوەیە: كەسێ لە ماوەی ژیانیدا ئیشێ بداتە دەستی كەسێكی تر لە جیاتی ئەو بیكا لە ماوەی ژیانیدا، دەبێ ئیشەكە لەوانەبێ كە جێدار بتوانێ جێبەجێی بكا. سەر بەلگەی جێداریی ئەم ئایەتەیە: {فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ – سورة الكهف – ١٩/١٨} واتە: یەكێ لە خۆتان بەم پارەی زیوینەتانەوە بنێرن بۆ ناوشار هەتا خۆراكتان بۆ بكرێ. تا كۆتایی ئایەتەكە، هەروا ئەو فەرموودەیەشە، كە عەمری كوڕی ئومەییەی ئەل‌صەخری دەیگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كردی بە جێدار (وەكیل)ی خۆی هەتا قەبووڵی نیكاحی ئوممو حەبیبەی كچی ئەبو سوفیانی بۆ بكا، وە بەلگەی تریش لەم بابەتە هەیە، یەكێ لەوانە یەكدەنگیو یەكگرتنو ئیجماعی موسوڵمانانە لەسەر دروستبوونی جێداریی.

**مەرجەكانی:**

مەرجی جێدارگر (موكل) ئەوەیە كە تەصەڕووفی خۆی دروست بێ لەو ئیشەدا كە جێداری بۆ دەگرێ، بەهۆی ئەوەوە كە بەخودی خۆی خاوەن ماڵ بێ، یاخود بەهۆی هەقداری (ویلایەت)ی شەرعییەوە بە

سەرماڵی منداڵی خۆیەوە وەك باوكو باپیر، كەواتە: دروست نیە منداڵو شێتو نەفام بەبێ فەرمانی هەقداریان جیدار بگرن لە هیچ سەودایەكا، هەروا بۆ كەسێ لە ئیحرامدا بێ دروست نیە جێدار بگرێ، ژنی بۆ مارە بكا، یا كچی بۆبدا بەشوو لەكاتی ئیحرامەكەدا، مەرجی جێداریش ئەوەیە كە بتوانێ بە خودی خۆی ئەو ئیشە ئەنجامبدا كە تیایدا كراوە بە جێدار، كەواتە: دروست نیە منداڵو شێتو نەفامو حیجر لەسەر دانراو بكرێن بە جێدار، یاسای كۆگر (ضابطە) لەم بارەیەوە ئاوایە: هەرچی مرۆڤ بۆ خۆی دروست بێ تەصەڕوفی تیادا بكا، دروستە بۆشی كەلەو كارەدا ببێ بە جێدار، یا بە جێدارگر. مەرجی ئیشە جێدار تیاگیراوەكەیش – كە پێی دەگوترێ مووەككەلوفیهی – چەند شتێكە:

**یەكەم:** ئەوەیە كە ئەو شتەی كە جێداری تیا دەگرێ لە ژێر تەصەڕوفی جێدار گرەكەدابێ،

**دووەم:** ئەوەیە ئەو ئیشە قابیل بێ بۆ ئەوە جینشینی تیادا بگیرێ. كەواتە: دروست نیە جێدارگرتن بۆ بەندە گییەك (عبادتێك) كە بە لەشبكرێ، واتە: پەرستش بە لەش، یا عیبادەتی بەدەنی، وەك نوێژو رۆژوو شتی تری وا، چونكە مەبەست لەم جۆرە پەرستشە ئەزموونو تافیكردنەوەیە، شتی وایش دەبێ بەندەخۆی پێی هەڵسێ، بەكردنی كەسێكی تر نایەتەجێ، بەلاّم دروستە جێدار گرتن لە حەجدا بۆ كەسێ خۆی پەكی كەوتبێ، یا بۆ سەربڕینی ئاژەڵی قوربانیو حەوتم، هەروا دروستە وەكیلگرتن لە زەكاتدانو زەكات وەرگرتندا، هەروا لە گرتنی رۆژووی كەفارەتدا، چونكە ئەم چەند مەسەلەیە دەق هەیە لە سەیارن كە دروستە جێداریان بۆ بگیرێ.

**سێیەم:** ئەوەیە ئەو ئیشە لە هەندێ رووەوە زانراوبێ (واتە: مەعلوومبێ) چونکە جێداری لە شتی نەزانراودا دانامەزرێ.

## بڕیاری جێداری: حوکمی وەکالەت:

جێداریی کارێکی ئیختیاریو خۆسەرپشکییە لە هەردوو لاوە. کەواتە: هەموو کاتێ هەردوولا (واتە: جێدارو جێدارگر) بۆیان هەیە جێداری هەڵوەشێننەوە، چونکە هەر کەسەیان قازانجی خۆیان بە باشی دەزانن‌و خۆیان سەرپشکن لە پاراستنی بەرژەوەندی خۆیاندا کەواتە: ناچار ناکرێن کە بەپێچەوانەی حەزو مەبەستی رەوای خۆیانەوە کار بکەن، دەنا تووشی زیانێکی ئاشکرا دەبن، یاسای شەرعیش کە سەرچاوەی لە سوننەتی حەزرەت هەلگرتووە دەفەرموێ: (نە زیان نە وەڵامی زیان بە زیان!).

گرێدانی جێداری (واتە: عەقدی وەکالەت) بە مردنی یەکێکیان تێك دەچێ‌و هەڵ دەوەشێتەوە، چونکە گرێدانە دروستەکان، کە لەعورفی شەرعدا پێیان دەگوترێ (العقود الجائزە) هەموویان ئەمە حاڵیانە، جا هەر کاتێ لایێ لە دوو لای گرێدانەکە ئەهلییەتی تەصەڕوفو شیاویی گەردان پێکردنی نەما، خوای بەهۆی مردنەوەبێ، یا بەهۆی هەرشتێکی ترەوەبێ، ئیتر ئەو گرێدانە تێك دەچێ، کەواتە: جێداریی (واتە: وەکالەت) هەڵ دەوەشێتەوە بەشێتبوونی یەکێ لە دوولایەنی گرێدانەکە، کە بریتین لە جێدارو لە جێدارگر، هەروا بەوەیش تێك دەچێ کە ماڵەکەی جێداریی تیا گیراوە لە موڵکی جێدارگر دەربچێ‌و ببێ بەهینی لایەنێکی تر، وەك ئەوە بیفرۆشێ، یا بیکا بە وەقف.

**جێدار ئەمینداره:**

جێدار دادەنرێ بە ئەمیندار لەو شتەدا کە تیادا کراوه بە جێدار. کەواته: هەروەك چۆن ئەمیندار نابێ بە دەستەبەری ماڵی سپاردە، جێداریش نابێ بە دەستەبەری ماڵەکە، ئەگەر بەبێ کەمتەرخەمی جێدار ماڵەکە فەوتا، چونکە جێدارگر ئەوی کردووە بە ئەمینداری خۆی، ئەمینداریش دەستەبەر نیە، لە بابەت فەوتانی ماڵەکەیشەوە قسەی جێدار دەخوات، هەروا لە بابەت ئەوەیشەوە کە بڵێ: ماڵەکەم داوەتەوە بە خاوەنی!.

**ئەمانە نموونەن بۆ کەمتەرخەمی:** ماڵەکە بفرۆشێو بەر لەوەرگرتنی بەهاکەی بیداتە دەست کڕیار، یا بەبێ ڕێگەپێدان شتەکە بەکار بهێنێ، یا لە جێگەی نائەمیندا دایبنێ، کە حیرزی میسل نەبێ واتە: جێگەی پاراستنی ئاسایی وێنەی خۆی نەبێ.

**کڕین و فرۆشتنی جێدار:**

کەسێ جێداری کەسێ بێ بۆ فرۆشتنی ماڵ، جێدارییەکەی بێ بەندو مەرج بێ، دروست نیە بۆی کەماڵ بفرۆشێ بە غەیری پارەی نەختینەی ئەو وڵاتە، یا بەقەرز، یا بەزەرەری زۆر (واتە: بەغوبنی فاحیش) زەرەری زۆر ئەوەیە کە ئەو جۆرە زیانە لەبەر ئەوەی زیانێکی قورسی ناقۆڵایە، بە زۆری لە توانادا نیە. بۆیە دەڵێین دەبێ ئاوا بیفرۆشێ، چونکە عورف ئەوە دەگەیەنێ، دەی هەرشتێکیش کە عورف بەڵگە بێ، با بەگوتنیش نە گوترێ، دەلالەتی عورف لەسەری، لە جێگەی

گوتنیەتی بەدەم! ئایا نابینی هەرکاتێ کڕیارو فرۆشیار گرێدانێکی بێ مەرج و بەندیان ئەنجامدا دەبڕدرێ بەسەر بەهای نەختو نەختی (نەقدی) ئەو وڵاتەدا.

## ( فرۆشتن بە بە جێدار خۆیو بڕیاردان ( اقرار ) لەسەر ئەو کەسەی کردوویەتی بە جێداری خۆی ):

دروست نیە بۆ ئەو کەسەی کە کراوە بە جێدار بۆ فرۆشتنی ماڵێ، ئەو ماڵە بفرۆشێ بەخۆی، یا بەمنداڵی نا باڵغی خۆی، لەبەر ئەم دوو هۆیە.

**یەکەم**: بەپێی عورفو باوی پەسەندی ناو کۆمەڵ، جێدار مافی ئەوەی نیە ئەو شتە بکڕێ بۆ خۆی.

**دووەم**: هەموو کەسێ بە سروشت حەزدەکا شت بە هەرزان بکڕێ بۆ خۆی، ئەمەیش بە پێچەوانەی مەبەستی جێدارگرە، چونکە ئەو دەیەوێ بەو پەڕی قازانجەوە ماڵەکەی بفرۆشێ، دەی ئەم دوو مەبەستو ئارەزووەیش دژی یەکترن، بەهیچ جۆرێ یەك ناگرن. ئیقرارکردنیش لەسەر جێدارگرەکەی لەبەر ئەوە دانامەزرێ، چونکە شتی وا ئیقرارە بە شتێ کەهی ئەو نیە، ماڵی خەڵکیش بە بڕیاردانی غەیری خاوەنەکەی نابێ بەهی کەس، لە ئیقراریشدا کڕینو فرۆشتن لەم بارەیەوە یەکسانن و بڕیاردانی جێدار لەسەر جێدارگر لە هیچیاندا بایەخی نیە.

## ٢٢٣) باسی پێلێنان (اقرار):

پێ لێنان لە زمانی عەرەبدا پێی دەگوترێ ئیقرار، ئیقراریش واتە: دیان پیادانان‌و چەسپاندن‌و بڕیار لە سەردان، لە شەرعی شەریفیشدا بریتییە لەوە کەسێ پێ لە مافی کەسێکی تر بنێ‌و ددانی پیابنێ کە ئەو هەقە لە سەریەتی. سەربەڵگە لەم بابەتەدا نامەی خواو ڕێبازی ڕەهبەرو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلامە. زاتی پاك‌و پیرۆز دەفەرموێ: {كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ - سورة النساء – ٤/١٣٥} واتە: ئەی كۆمەڵی بڕواداران! زۆر بە باشی پابەندی ڕەفتارکردن بە عەدالەت بن، کە بریتییە لەوە بە موو لە حەق لانەدەن، هەموو کاتێ شایەتی حەق بدەن، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، تەنانەت ئەگەر شایەتی لە خۆشتان بدەن دەبێ شایەتی حەق بدەن. دەی شایەتی لە خۆدان بریتییە لە پێلێنان‌و ددانان بەو هەقەی کەوا لەسەرت. لە ڕێبازی ڕەهبەریشدا دەفەرموێ: پیاوێ چوو بۆ خزمەتی حەزرەت پرسیاری هەبوو، بەشێ لە وەڵامەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو مەسەلەیەدا ئەمەبوو: کوڕەکەت سەد داری حەددی لێ دەدرێ‌و ساڵێکیش دوور دەخرێتەوەو ڕەهەندەدەکرێ. ئەی ئونەیس! تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆلای ژنەکەی ئەم پیاوە کە دەڵێن لەگەڵ کوڕی ئەم پیاوەی تردا داوێن پیسییان کردووە، ئەگەر هاتوو چووە ژێری‌و دانینا بە ئیشەکەداو پێی لە تاوانی خۆی نا ئەوا بەردەبارانی بکە. (ئەم فەرموودەیە بە دوورو درێژی شەیخان گێڕاویانەتەوە) ئەمانە بەڵگەی نەقڵی بوون بۆ باسەکە، بەڵگەی عەقڵیش لەسەری هەیە کە ئەمەیە: لە

شوێنێ شایەتیدان لەسەر پێلێنان دروست بێ، دەبێ پێلێنان خۆی باشتر دروست بێ[1].

## بەشەکانی پێلێنان:

پێلێنان دوو چەشنی هەیە یەکەمیان ئەوەیە کە ددان بنێ بەوەدا کە حەقێکی خوای لەسەرە، وەك بچێتە ژێر ئەوە کە شایستەی داری حەددە، لەبەر ئەوە کە داوێنپیسی کردووە، یا بادەی نۆشیوە، یا دزی کردووەو شایستەی تۆڵەی دزییە. لەم چەشنەیانا ئەگەر لە پێش تۆڵە لێوەرگرتندا پەشیمان بۆوە ئەوە پەشیمانبوونەوەکەی دروستەو تۆڵەو سزاکەی لە کۆڵ دەکەوێ، بەپێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): هەتا بۆتان دەکرێ، ئەگەر بەکۆلکە مەهانەیەکیش بووە، یا بەبۆرە گۆمانێك بووە حەددی شەرعی، هەر حەددێ بێ، لە کۆڵ موسوڵمانان بکەنەوە. دەی پەشیمانبوونەوەی لە پێلێنان دادەنرێ بە شوبهەو گومانکردن لە راستیی پێلێنانەکەی، چونکە هەڵ دەگرێ پێلێنانەکەی درۆبێ‌و پەشیمانبوونەوەکەی راستبێ. بەپێی ئەم فەرموودەیەی تریش: ماعیز هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) عەرزیکرد: کە داوێنپیسیی کردووە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەڵامی نەدایەوە. فەرموودەکە درێژە، لە دواییدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ویستی کە بیانووی بۆ بدۆزێتەوەو واز لەو قسانە بهێنێ کە دەیانکا، لەبەر ئەوە پێی فەرموو: ئەوە شێت بووی؟ لە گێڕانەوەیەکا: رەنگە هەر ماچت کردبێ، یا نوقورچت لێگرتبێ یا تەماشایت کردبێ؟ دەی بە پێی ئەم فەرموودەیە ئەگەر پەشیمان بوونەوە لە قسەی خۆی لە پاش

پێلێنان سوودی نەبوایە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بەبێ هوودە چۆن ڕێگەی بۆ خۆش دەکرد، هەتا لەفظ بگۆڕێو لە تۆڵەکە خۆی رزگار بکا! وەلێ بزانن پەشیمان بوونەوە لە پێلێنان لە دزێتی سوودەکەی ئەوەیە دەست بڕین لە کۆڵ دەخا کە مافی خوایە، بەلام گەڕانەوەی ماڵەکە بۆ خاوەنی لە کۆڵ ناخا، چونکە ئەویان مافی مرۆڤە، حەقی ئادەمییە.
چەشنی دووەمی پێلێنان: پێلێنانە لە مافی ئادەمیزادێ بەسەر پێلێنەرەوە، لەم جۆرەیانا لەپاش پێلێنان پەشیمان بوونەوە لێی بێهوودەیەو سوودی نیە، وەك پێلێنان لە بوختانکردنو شتی وا، جیاوازی نێوانی ئەم دوو مافە بەمەیە: مافی خوا لەسەر بناغەی چاو لێپۆشی دامەزراوە، بە پێچەوانەی مافی ئادەمییەوە، چونکە ئەم بناغەکەی لەسەر گیری و رژدییە، خەڵك سوورن لەسەر مافی خۆیان.

## مەرجەکانی پێلێنان:

### پێلێنان بەم چوار مەرجە دادەمەزرێ:

**یەکەم:** ڕەسیدەبوون، واتە: باڵقبوون.

**دووەم:** هۆش، بەم پێیە پێلێنانی منالو شێت دانامەزرێ، چونکە مافی تەصەڕوفیان نیە، کەسێکیش بوورابێتەوە یا بەهۆی مەهانەیەکی ڕەواوە هۆشی نەمابێ لە ریزی شێت دادەنرێ.

**سێیەم:** دەبێ پێلێنان بە ئارەزووی پێلێنەر خۆی بێ، نەك بە زۆرە ملێ بێ، کەواتە پێلێنانی زۆرلێکراو دانامەزرێ، چونکە لە شوێنی پێلێنان لە کفرو کفرکردن لە ژێر زەبری زۆرلێکردندا دانەمەزرێو

بایەخی نەبێ، بە مەرجێ لە دڵەوە باوەڕی دامەزراوبێ، ئیتر چۆن پێلێنان لەشتی تر، کە لە کفرکردن بێ گرنگی ترە، دادەمەزرێ.

**چوارەم**: فامیدەیی (روشد) ئەگەر پێلێنانەکە لەسەر ماڵ بوو، ئەوە پێلێنانی نەفام (سەفیە) لەماڵ دانامەزرێ، دەنا حیجر نانەسەر سوودی نامێنێ. ئەمە بەپێی رواڵەتی بڕیاری شەرع وایە، کە پێلێنانی حیجر لەسەر دانراو، بە ظاهیری شەرع، دانامەزرێ دەنا لەلای خوا بەرپرسیارە، ئەگەر لەراستیا پێلێنانەکەی تەواو بوو ئەوە لەسەریەتی کە حیجرەکەی لەسەر نەما ئەو مافە جێبەجێ بکا. وەکی تر ئەم جۆرە پێلێنانەی لێ وەردەگیرێ: پێلێنان لە شیاوی بۆ حەددی شەرعی، یا پێلێنان لە تەلاقو ژن خولعکردنو ظیهارکردن لەگەڵ ژندا، چونکە ئەم جۆرە شتە پەیوەندی بە سامانەوە نیە، هەروا بڕیاری پێلێنانی کەسێ حیجری لەسەربێ لە عیباداتدا وەك بڕیاری فامیدە (رەشید) وایە دادەمەزرێ.

## پێلێنان لە شتی نامەعلووم:

پێلێنان لەشتی دیارینەکراو (مەجهوول) دادەمەزرێ، بۆ روونکردنەوەی ئەو شتە قسەی پێلێنەر وەردەگیرێ، وە بەهەرچی مانای لێبداتەوە، بە مەرجێ دابنرێ بەماڵ (هەر چەندە کەمیشبێ) لێی قەبووڵ دەکرێ، هەروا ئەگەر مەعنایشی لێبداتەوە بەشتێکی پیسی وا کە لە چەشنی ماڵ نەبێ، بەڵام راگرتنی دروستبێ، وەك سەگی پاس یا وەك تەپاڵەو پەین، چونکە ئەم جۆرە شتانەیش بردنیان بە بەلاش دروست نیە بەڵام قوبووڵ ناکرێ کە واتای لێ بداتەوە بەشتێکی پیسی وا

که راگرتنی دروست نەبێ، وەك بەرازو سەگی بێ سوود، کە بەکەڵکی راووپاسکردن نەیەت، گوتراویشە: ئەم روونکردنەوەی دواوەیشی لێ وەردەگیرێ، چونکە بەرازو سەگی بێ سوودیش بەشت حلێبن.

**چەرتکردن لە پیلێنان:**

دروستە جیاکردنەوەو چەرتکردن لەو شتەی کە پێی لێناوە، هەروا چەرتکردن (واتە: ئیستیسنا) لە غەیری پیلێنانیشدا دروستە، چونکە چەرتکردن لە قورئانو لە زماندا زۆر رووی داوە، جا ئەگەر چەرتکردنەکە بەوشەی پیرۆزی (ان شاء الله) بێ ئەوە بەوە نابێ بە پیلێنەر، وەك ئەوە بلێ: خوا حەزکا سەد دیناری فیسارەکەسم لەسەرە چونکە ئەمە پیلێنانی تەواو نیە، سەرەڕای ئەوەیش ئەم جۆرە گوتەیە پێویستکردنی شتە لە ئایندەدا، پیلێنانیش هەواڵدانە لە کارێکی رابووردوو، کەواتە ئەم دوو شتە بە پێچەوانەی یەکترەوەنو یەك ناگرن. هەموو کاتێ بناغەی کاریش لەسەر ئەوەیە کە ئەستۆ خاڵییە لە مافی ئەمو ئەو هەتا بەڵگە راست دەکرێتەوە. مەرجی چەرتکردنیش ئەوەیە کە بلکێ (واتە متصل بێ) بە پیلێنانەکەوە، بەپێی عادەت، کەواتە بەینکەوتن بەهۆی ئەم شتانەوە زیانی نیە: بە راوەستانی هەناسەدانو بەگرتنی زمان، کە کابرا زمان بگرێو قسەی بە ئاسانی بۆ نەکرێ، یا زمانی تەتەڵە بکا، یا بەباشی گۆنەکا، یا بەهۆی کۆکەو پژمەوە بەینی بکەوێ، پیلێنان لەکاتی ساخیو لەکاتی نەخۆشیدا چۆنیەکە لەکاتی تەندروستیدا دامەزرانەکەی دیارەو ئاشکرایەو بەڵگەی رۆشنی لەسەرە، لەکاتی نەخۆشیشدا دەڵێین: ئەگەر پیلێنانەکەی قازانجی بیانی تیادا بوو،

ئـەوە وەك كـاتی لـەش سـاغی دادەمـەزری، بـۆ بەرژەوەنـدی كەلـەپوور گربوو، ئەویش هەردادەمەزری، چونكە ئەگـەر لـەكاتی وادا درۆزنـیش واز لە درۆ دێنیو قسەی راست دەكـا، بـەدكاریش تەوبـە دەكـاو دەگەڕێتـەوەو لایەنی حەق دەگری، ئیتر چۆن ئـەم كـابرای پێلێنـەرە لـەم كاتـە ناسـكەدا ناهەقی دەكا؟ هەیشە دەڵێ: پێلێنانی كاتی نەخۆشـی دانامـەزری، چـونكە رێی تێ دەچێ كە مەبەستی بێ بەشكردنی هەندێ لە كەلەپووربـەرەكان بێ!.

## ٢٢٤) باسی خواستەمەنی (عاریە):

لـە زمانـدا برێتییـە لـەوە كـە بەبـەلاش كەسـێ ببـێ بـە خـاوەنی قازانجێ، لە شەرعدا برێتییە لە گرێـدانێ كـە دەبـێ بـەهۆی ئـەوە كەسـێ سوود لە شتێكی حـەڵاڵ وەربگـرێ بـۆ ماوەیـێ، بـە مـەرجێ شـتەكە وەك خۆی بمێنێ، وە لەكاتی پێویستدا شتەكە بداتەوە بە خاوەنی!.

سەربەڵگەكەی ئەم ئایەتەیە: (**ویمنعون الماعون**) مەبەست لەم ئایەتە هەڕەشەكردنە لەو كەسانە كە ئەو جـۆرە شـتانە لـە دەرو دراوسـێ قەدەغە دەكەن، كـە بـووە بـە بـاو دەرو دراوسـێ ئـەو جـۆرە شـتانە لـەناو خۆیاندا لەیـەكتری دەخـوازن بـۆ ماوەیـێ. لـە رێبـازی رەهبەریـشدا هەیـە دەفەرموێ: لە رۆژی غەزای خەیبەردا پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەربێ) زریەیەكی خواست لە صـەفوانی كـوڕی ئومەییـە، كەچـی صـەفوان گـوتی: ئـەوە لـێم زەوت دەكـەی ئـەی موحەممـەد؟ فـەرمووی: نـەخێر مـن چـۆن شت زەوت دەكەم، بەڵكوو بـە خواسـتەمەنی وەری دەگـرم، دەستەبەریـشی

دەکەم کە وەك خۆی بیگێڕمەوە بۆت. (ئەبو داوودو نەسائیو حاکم گێڕاویانەتەوە). ئیبنو صەبباغ یەك دەنگیو یەکگرتنی لەسەر ئەوە: کە خواستەمەنی سوننەتە راگوێز (نەقڵ) کردووە.

## مەرجەکانی دامەزرانی:

### خواستن بەم مەرجانە دادەمەزرێ:

**یەکەم**: ئەوەیە کە ماڵ لێ خوازراو شایستەییو ئەهلییەتی هەبێ بۆ شت بەخشینو پیاوەتیکردن، کەواتە دروست نیە منداڵو شێتو نەفامی حیجر لە سەردانراو ماڵ بدەن بە کەسێ بەخواستەمەنی.

**دووەم**: ئەوەیە کە قازانجی شتەخوازراوەکە هی ماڵ لێخوازراوەکەبێ، کەواتە: دروستە بەکرێگر بە کرێگیراوەکە بدا بەکەسێ بە خواستەمەنی، چونکە خۆی خاوەنی قازانجەکەیەتی، بەڵام ماڵ خواز ئەو مافەی بۆ نیە، چونکە ئەم خاوەنی قازانجی ماڵکە نیە، تەنیا بۆ ئەم رەواکراوە کە قازانج لەو ماڵە وەربگرێو بەس، لەحاڵی وایشدا هەقی ئەوەی نیە کە ئەویش قازانجی ماڵەکە بۆ کەسێکی تر رەوا بکا، بەپێی ئەم بەڵگەیە: میوان مافی ئەوەی نیە کە ئەو شتەی دانراوە بۆ ئەو رەوای بکا بۆ کەسێکی تر، هەتا هەقی ئەوەی نیە کە هەندێکی دەرخواردی پشیلەو شتی وا بدا.

**سێیەم**: ئەوەیە شتە خوازراوەکە بە سوودبێ، کەواتە شتی بێ سوود نادرێ بە خواستن، وەك بە عاریەدانی جاشێکی تۆڕ کە هێشتا نەخرابێتە ژێر بار، چونکە لەکاتی وادا مەبەست لە خواستن کە قازانج وەرگرتنە لە خوازراوەکە دەفەوتێ!.

**چوارەم:** ئەوەیە کە دەبێ ماڵە خوازراوەکە لەبەرچاوە واتە: عەینەکەی بمێنێتەوە لە پاش سوود لێ وەرگرتن، وەك چەرخ و دەستارو جل و بەرگ و ئامرازو کەرەستەو ئامێر، کەواتە: شتێ قازانجەکەی بەسرابێ بە فەوتانیەوە، وەك مۆم بۆ سووتان و نان و چێشت و بۆ خواردن و سابوون بۆ شت پێشۆردن، شتی وا خواستنی دروست نیەو دانامەزرێ، هەروا هەرشتێ لەم بابەتەبێ، چونکە خوازراو دەبێ عەینەکەی بمێنێ و لەپاش قازانجی شەرعی لێ وەرگتن بدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

## خواستەمەنی بەبێ مەرج و بەندو بە مەرج و بەندیش دروستە :

ماڵ لێ خوازراو بۆی هەیە کە خوازراوەکە رەوا ببینێ بۆ ماڵخواز بەبێ مەرج و بەند، وە کاتی بۆ دیاری نەکا، هەروا بۆی هەیە کە کاتی بۆ دیاری بکا، هەر وەك بۆی هەیە لە هەموو کاتێکا داوای خوازراوەکە بکاتەوەو وەری بگرێتەوە، چونکە خواستەمەنی گرێدانی دروستە، ئەم جۆرە گرێدانەیش وەك لە پێشەوە گوتمان بۆی هەیە هەرکاتێ ئارەزوو بکا کۆتایی پێبهێنێ. لە راستیدا ئەگەر رێگەی خاوەنەکەی نەدەین کە هەرکاتێ ویستی ماڵەکەی وەربگرێتەوە کار سەردەکێشێ بۆ ئەوە کە مەردووم خۆ لەم جۆرە پیاوەتیی و یارمەتییە جوانە بەدزنەوە، لەم کاتانەیشدا خواستن بەتاڵ دەبێتەوە: بە مردنی لێخوازراو، یا بە شێتبوونی، یا بە حیجر لە سەردانانی، هەروا بە مردنی خوازەر (مستعیر: ماڵخواز) میراتبەرەکانی ماڵخواز مافی ئەوەیان نیە خواستەمەنییەکە بەکار بهێنن، دەنا کرێی عادەتی یان دەکەوێتە سەر لەگەڵ مەسرەفی بردنەوەیدا، زیاد لەوە کوناهباریش دەبن.

**دەستەبەریی خواستەمەنی:**

خودیماڵەخوازراوەکە، ئەگەر بەهۆی کارپێکردنێکی واوە کە ڕێگەی پێ نەدرابوو فەوتا، ئەوە ماڵخواز دەبێ بە دەستەبەرو دەبێ بیبژێرێ، بەپێی فەرموودەکەی صەفوان کە لە سەرەتای باسەکەوە رابورد، لەبەر ئەوەیش چونکە ماڵەو ماڵیش دەبێ بدرێتەوە بە خاوەنی، جا لەکاتی فەوتانەکەیدا بەهاکەی چەندبێ بەپێی نرخی ڕۆژی فەوتانی دەبێ ئەوەندە بدرێ بە خاوەنەکەی بەڵام ئەگەر بەهۆی کارپێکرنی ڕێی پێ دراوەوە فەوتا، ئەوە نابێ بە جەستەبەر، وەك ئەوە جل و بەرگ بەهۆی لەبەرکردنەوە بدڕێ و بپروێ، یا وەك ئەوە وڵاخ بەهۆی سواریی پێکردنەوە عەیبداربێ.

## ٢٢٥) زەوتکردن (غەصب):

زەوتکردن تاوانێکی گەلی گەورەیە، لە گوناهە هەرە گەورەکانەو دەبێ بەهۆی ڕق و تووڕەبوونی خوا. سەربەڵگەی حەرامکردنی ئەم فەرمایشتەی یەزدانی پاکە: {وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ - سورة البقرة - ١٨٨/٢} واتە: لەناو خۆتاندا ماڵی یەکتری بەناهەق مەخۆن. هەروا ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: {وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ - سورة المطففين - ٨٣/ ١-٣}. سەر بەڵگەی حەراکردنیشی لە ڕێبازی ڕەهبەردا ئەم فەرموودەیەتی (درودی خوای لەسەربێ): سەرو ماڵ و نامووستان بەبێ حەقێکی شەرعی بە یەکتری حەرامە، وەك

چۆن ڕێزشکاندنی ئەم ڕۆژە پیرۆزەتان، کە ڕۆژی عەرەفەیە، لەم مانگە پیرۆزەتانا، کە مانگی قوربانە، بە تایبەتی لەم شارە پیرۆزەیشتانا، کەشاری مەککەیە زۆر زۆر حەرامە ئاوا خوێن‌و ماڵ‌و نامووسیشتان، بەبێ حەقێکی شەرعی بەیەکتری حەرامە (شەیخان)

زەوتکردن لە شەرعدا بریتییە لەوە کەسێ بە زەبری زۆر، بە ناهەق مافی کەسێکی تر داگیر بکا، لەسەر شێوەی دەسدرێژی، وەك ئەوە کە نەهێڵێ کەسێ لە شوێنێکا دابنیشێ کە مافی خۆی بێ لەو شوێنەدا دابنیشێ، وەك دانیشتنی قەراخ ڕێگەو ناو مزگەوت، یا وەك ئەوە دەست بگرێ بەسەر زەوی‌و زاریدا، یا بەسەر سامانیدا بە ناهەق. ئەوەندە هەیە ئەگەر ماڵی موسوڵمانێ لەلای کافرێکی جەنگی بوو، یا لەلای موسوڵمانێکی زەوت کەربوو، ئەم بەزەبر لێی سەندەوەو دایەوە بە خاوەنی ئەوە بە زەوتکردن دانانرێ. زەوتکردن لە زماندا بریتییە لە بردنی شتێ، بە ئاشکرا بە زەبری زۆر، چونکە ئەگەر بەنهێنی بیبا ئەوە دزییە، بە مەرجێ لە جێگەی ئاسایی وێنەی خۆیدا دانرابێ، ئەگەر لەسەر شێوەی ڕقەبەری‌و وجوود نەزانین بردی ئەوە شەڕ پێفرۆشتنە، ئەگەر لەسەر شێوەی دەست بەسەرداگرتن‌و داگیرکردن بردی ئەوە لێفڕاندن (اختلاس)ە. ئەگەر بە دەست پیسی بردی ئەوە گەندەکاری‌و ناپاکییە لە سپاردەو ئەمانەت. داگیرکردنی هەرشتێ بەپێی ئەو شتە خۆیەتی. دەی ئەگەر کەسێ بەبێ ڕێگەپێدانی خاوەنی، لەسەر بەڕەی کەسێ دابنیشێ ئەوە زەوتکەرە، یا کەسێ بڕواتە ناو ماڵێ‌و خاوەنەکەی لێ دەربکا ئەوە زەوتکەرە، هەتا ئەگەر بچێتە ناو خانوویەکی چۆڵیش بە

نیازی داگیرکردنی هەر زەوتکەرە، یا کەسێ سواری ولاخی کەسێ بێ، یا نەهێڵێ خۆی سوودی لێ وەربگرێ هەرزەوتکەرە.

هەرکاتێکیش زەوتکردن چەسپاوو ئیسپات بوو دەبێ دەسبەجێ رەتی بکاتەوە بۆ خاوەنی، ئەگەرچی بە چەند قاتی نرخی زەوتکراوەکە زیانی لێ کەوتووە بەهۆی پێبژاردنەوە، وە مەسرەفی دانەوەیش لەسەر زەوتکەرە، با زۆر زۆریشی تێبچێ، هەروەها پێویستە تۆڵەی ناتەواویو عەیبداریی زەوتکراو بدا، واتە: ئەرشو زەدەبژێری لەسەر زەوتکەرە. زەدەبژێری (کە بەعەرەبی پێی دەڵێن: ئەرش) بریتییە لە بەهای فەرقی نێوانی ئەو شتە بە ساغیو ئەو شتە بە نەنگداری تۆڵەی ناتەواویشی پێ دەگوترێ.

جا خوای ئەو ناتەواوییە لە سیفەتدا بێ، وەك ئەوە ئاژەڵەکە لە کاتی زەوتکردنا قەڵەوبووەو ئێستا لە ڕبووە، یا لەزاتو خودی زەوتکراوەکەدابێ، وەك ئەوە لەکاتی زەوتکردندا ساغ بێو لەوەدوا شکابێ.

## ٢٢٦) باسی هەڵگرتنەوە (شوفعە):

**بر: تەجرید/ل٣ – ٧٢ – ز: ٤١.**

شوفعە لە زمانی عەرەبدا بە مانا خۆ بەهێزکردنو کۆمەکی کردنە، چونکە بەو وەرگرتنە خۆ بەهێز دەکا، لە کوردیدا پێی دەگوترێ بەش هەڵگرتنەوە، لە شەرعی شەریفدا بریتییە لەوە – بەشە موڵکی هاوبەشێکی کۆن کە بەرابەر بەشتێ دایبێتی بە کەسێکی تازە بە زۆر

نەهێڵرێ کە ببێ بەهی ئەم کەسە تازەیەو بکری بە مولکی هاوبەشی خاوەنە پێشووەکەی، لەبەر نەهێشتنی رووداني ئەو زیانەی کە لەم هاوبەشییە تازەیەوە پەیدا دەبێ، بەو مەرجە کە ئەو ملکە قابیلی دابەشکردن بێ، بەلاّم قابیلی گواستنەوە نەبێ. سەر بەلگەی چەسپبوونو سوبووتی بەشهەلگرتنەوە ئەم فەرموودەی شەیخەینە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} شوفعە (بەشی هاوبەش هەلگرتنەوە)ی داناوە، لە هەموو شتێکا کە هاوبەش بێو هێشتا دابەش نەکرابێ، بەلاّم ئەگەر شتەکە جیاکرایەوەو سنوور دانراو توخوب نیشانەکراو رێگەو بان دیاری کرا ئیتر هەقی شوفعەی بە سەرەوە نامێنێ) لە گێڕانەوەیەکا دەفەرموێ: (لە زەویو زاردا، یا لە جێگەو شوێندا، یا لە باخدا).

## مەرجی دامەزراندی – بەش هەلگرتنەوە – شوفعە :

**یەکەم:** دەبێ مولکەکە هاوبەشی تەواو بێ، لەسەر شێوەی تێکڕایی، واتە: تێکڕای مولکەکە هی تێکڕای هاوبەشەکان بێ. بەم وەزعە لە عەرەبیدا دەگوترێ: (علی وجه الشیوع) کە واتە: شوفعە بۆ دراوسێ نیە، گەرچی لەوەپێش هاوبەشیش بوو بێ لەو مولکەدا، بەپێی فەرموودەکەی پێشەوەی بوخاری کە ئەوەی تیادابوو: ئەگەر جیاکرایەوەو سنوور دیاریکرا.. ئیتر هەقی شوفعەی بە سەرەوە نامێنێ.

**دووەم:** دەبێ مولکێ بێ قوبووڵی دابەشکردن بکا، وەك پارچە زەوییەك، یا خانوویەك، بەلاّم شتێ کە قابیلی دابەشکردن نەبێ، وەك شمشێرو شتی وا، شوفعە هەڵ ناگرێ.

**سێیەم**: ملکێکی وا نەبێ ئەگەر دابەش کرا قازانجەکەی هەڵوەشێتەوە، وەك دووکانێکی بچکۆلە، یا گەرماوێ کە بەش نەکا کە بکرێ بەدوو گەرماو.

**چوارەم**: دەبێ مولکێکی وابێ کە نەگوێزرێتەوە، وەك زەویو خانوو، شوفعە نیە لەشتی گوێزراوەدا، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: شوفعە بەس لە جێگەو شوێنو باخدا هەیە. دارو درەختو دیواریش پاشکۆی زەویو جێگەو شوێنن. چونکە فەرموودەکە وشەی جێگەو شوێنو وشەی باخی تیادایە، بە وشەی جێگەو شوێن خانوو شتی وا بەدەرگەوێ، بە وشەی باخیش دارو درەخت بەر دەکەوێ، هەرشتێکیش لەکاتی فرۆشتندا بەبێ ناو هێنان بەر فرۆشتنەکە بکەوێ هەروا، وەك دەرگاو رەفەو پەنجەرەو شتی تری لەم بابەتە. بەلام ئەگەر دارو پەردوو و درەخت بە تەنها خۆیان فرۆشران ئەوە شوفعەیان تیادا نیە، چونکە لەم کاتەدا گوێزراوەن.

**پێنجەم**: دەبێ مولکەکە هێشتا بەش نەکرابێو سنووری بۆ دیاری نەکرابێ، دەنا بەپێی فەرموودەکەی پێشوو مافی هەڵگرتنەوەی تیادا نامێنێ.

جا هەر کاتێ مافی بەشهەڵگرتنەوە بۆ کەسێ دامەزرا ئەوە هاوبەشی شوفعە وەرگرەو دەتوانێ فرۆشراوەکە بەو بەهایەی کە پێی فرۆشراوە هەڵبگرێتەوە، جا خوا ئەو بەهایە قەرزبێ، یا نەخت بێ. داواکردنی مافی هەڵگرتنەوە (واتە: حەقی شوفعە) دەبێ دەسبەجێ بێ، بەپێی ئەم فەرموودەیەی خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ}: (**الشفعة كحل**

العقال). (**رواه ابن ماجه بسند ضعیف**). واته: وەك چۆن وشتری تەرا ئەشكیلەكەی بكرێتەوە، ئەگەر گورج جڵەوی نەگیرێ دەڕواو لە دەست دەردەچێ شوفعەیش ئاوایە. بەبێ سەنەدو رشتەیش لە كتێبەكانی فیقهدا حەدیسێ هەیە دەڵێ: شوفعە حەقێكی رەوای ئەو كسەیە كە بەزوویی پەلاماری بداو بیقۆزێتەوە. ئەم فەرموودەیە دەقەكەی ئاوایە: (**الشفعة لمن واثبها**) لەبەر ئەم بەڵگەیەیش: شوفعە مافێكە بۆ نەهێشتنی ئەگەری زیان پەیدا بووە، كەواتە دەبێ دەسبەجێ بێ، رێك وەك گەڕانەوەی فرۆشراو بۆ سەر خاوەنی بەهۆی دەركەوتنی نەنگیەوە. گوتراویشە: ئەگەر پەلەیشی لێ نەكا مافی نافەوتێ. حەدیسی یەكەمیش ئەم قسانەی لەبارەوە كراوە: ئیبنو حیببان دەفەرموێ: بێ سەرچاوەیە، ئەبو زورعە دەفەرموێ: مونكەرە، بەیهەقی دەفەرموێ: سابت نەبووە كە حەدیسە یانا. ئەگەر هەر بەشێك لەماڵی هاوبەش درا لە مارەیی ژندا، ئەو پشكە بە شوفعە وەردەگیرێتەوە، لە باتی ئەوە (مةهرولمیثل) دەدرێ بە ژنەمارەبڕاوەكە لەسەر ئەوپشكە، ئەگەر كۆمەڵێك هاو بەش بوون لە ماڵێكا، هاوبەشێكیان بەشی خۆی فرۆشت، ئەوە هاوبەشەكانی تر هەر كەسەیان بۆی هەیە كە بەپێی ئەندازەی بەشی خۆی لە پشكە فرۆشراوەكە شوفعە وەربگرێ.

## ٢٢٧) باسی قازانج بە هاوبەشی (قراض):

قازانج بەهاوبەشی، یا قازانج بە شەراكەت لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ (قراض) یا (مضاربة) ئەم دوو زاراوە لەم شوێنەدا بە یەك

واتان. (قراض) له (قەرض)دا ڕێژراوه، كه بهمانا لێكرتاندنو لێبڕینه، چونكه خاوەن ماڵ پارچەیێ له ماڵەكەی دادەبڕیٚو جیای دەكاتەوەو بازرگانیو مامەڵەی پێوه دەكا، له هەمان كاتدا پارچەیەكیش له قازانجەكەی دادەبڕیٚ.

**له شەرعیشدا:** عەقدێكه لەسەر نەقد، ئیشكەرەكه بەو پارەیەوه سەوداو مامەڵەو بازرگانی دەكاو، قازانج بەپێی مەرج ناوكۆیی دەبیٚ له نێوانی ئێشكەرو خاوەن ماڵەكەدا. سەر بەڵگەی ئەم باسی قازانج بەهاوبەشییه ئەم فەرموودەیەیه: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} ماڵی له خەدیجه وەرگرتو به قازانج بەشەراكەت ئیشی پێوه كردو بردی بۆ شام بۆ بازرگانی. هاوڕێیانی پێغەمبەر {دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا له یارانی} لەسەر ڕەوایی قازانج به هاوبەشی یەكیان گرتووه.

## مەرجەكانی:

### چەند مەرجیٚ هەیه بۆ دامەزرانی قازانج به هاوبەشی:

**یەكەم:** دەبیٚ ماڵەكه پارەی سكه لێدراوبیٚ، كەواته قازانج به هاوبەشی دروست نیه لەسەر شووشی زێڕو زیو، یا بەخشڵی ژنان، یا لەسەر سامانی بازرگانی.

**دووەم:** دەبیٚ ئیشكەرەكه (واته: عامیلەكه) ڕێگەی دەستی له ئیشكردندا نەگیریٚو بەری تەصەڕوفی بەرەڵلابیٚ، سەوداو مامەڵه به ئازادی بكا، چونكه ئەگەر ڕێگەی ئەوەی لیٚ بگیریٚ مەبەستی سەرەكی له

هاوبەشییەکە دەفەوتێ. چونکە ئیشکەر ئەگەر هەموو جارێ پرس‌وڕا بەخاوەن ماڵ بکا ئەوە دەستی دەبەستێ‌و سەودا بەو شێوەیە قازانج ناکا.

**سێیەم**: دەبێ قازانجەکە هاوبەشبێ لە نێوانی ئیشکەرو خاوەن ماڵدا، ئەمیان لەباتی ئیشەکەی‌و ئەویان بەهۆی سەرمایەکەیەوە قازانج وەردەگرن.

**چوارەم**: دەبێ پشکە قازانج دیاری بکرێ، وەك نیوەو چواریەك‌و سێیەك‌و شەشیەك. کەواتە: ئەگەر وتی: بەشێ یا پشکێ بۆ تۆ ئەوە دانەمەزراوە چونکە وەجەڵەکە نەزانراوە، بەڵام ئەگەر وتی: قازانج ناو کۆییمان بێ ئەوە دادەمەزرێ‌و قازانجەکە بەنیوەیی دەبێ. بەڵام ئەگەر ئیشکەرەکە مەرجی گرت ئەگەر ئەندازەیەکی دیاریکراو بۆ خۆی وەك سەد، یا ژمارەیەکی تر، مەرجی گرت قازانجی جۆرێکی تایبەت بۆ خۆی بێ ئەوە سەوداکە بەتاڵ دەبێ، چونکە لەوانەیە کە قازانجەکە هەر سەدبێ‌و بەس، یا هەر ئەو جۆرەی ئەو دەڵێ قازانج بکاو بەس، یا ئەو جۆرە قازانج نەکاو جۆرەکانی تر قازانج بکا، کە بەشی ئەوی پێوە نیە، لەم کاتەیشدا ئیشکەرەکە رەنجەڕۆ دەبێ، ئەوەیش پێچەوانەی مەبەستی ئەم سەودایەیە.

**پێنجەم**: نابێ ماوە (مدە) دیاری بکرێ بۆ گرێدانی قازانج بە هاوبەشی، چونکە قازانج کاتی دیاریکراوی بۆ نیە، رێی تێ دەچێ ئەگەر ماوەیێ دیاری بکرێ لەو ماوەدا ئیشکەر هیچ قازانجێ نەکا، وەکی تریش ئەمیش یەکێکە لە گرێدانە دروستەکان، کە کارێکی ئاسایيە هەموو کاتێ

هەردوو گرێدەرەکان مافی ئەوەیان بۆ هەیە کە سەوداکە هەڵوەشێننەوە.

**شەشەم:** نابێ قازانج ببەسترێ بە ماوەیەکی دیاریکراوەوە وەك ئەوە بڵێ: قازانجی ئەم ساڵ ناوکۆییمان بێ‌و قازانجی ساڵی ئایندە بۆ من بێ بەتەنیا، چونکە بەم شێوە قازانج بە عەدالەت دابەش ناکرێ.

بزانن کە دروست نیە کە ئیشکەر لە دەسمایە کە خەرج بکا، چونکە ئەو پشکی دیاریکراوی خۆی بۆ دادەنرێ، ئیتر لەوە زیاتر هیچی تری ناکەوێ، ئیشکەر بەبێ رێگە پێدانی خاوەن ماڵ بۆی نیە لەگەڵ خۆی ماڵەکە ببا بۆ سەفەر.

## ٢٢٨) دەتەبەریی لەسەر ئیشکەر نیە:

ئیشکەری قازانج بە هاوبەشی ئەمینداره، چونکە دەسمایەکەی بە رەزامەندیی خاوەنەکەی وەرگرتووە، لەبەر ئەوە ئەمیش دەق لە هەموو ئەمیندارێکی تر دەچێ، کەواتە: مەگەر بەهۆی کەمتەرخەمییەوە بە سووچبار دابنرێ، دەنا دانانرێ بە دەستەبەر.

جا ئەگەر خاوەن ماڵەکە تۆمەتی ناپاکی‌و گزیکاری لە ئیشکەرکا، ئەوە قسەی ئەو ناخوات، بەڵکوو قسەی ئیشکەر دەخوات، چونکە بنەڕەت نەبوونی گزیکارییە، هەروا لە ئەندازەی سەرمایەکەدا باوەڕ بە قسەی ئیشکەر دەکرێ، چونکە بنەڕەت نەبوونی ئەو زیادەیەیە کە خاوەن ماڵ داوای دەکا، هەروا بۆ ئەندازەی قازانجیش باوەڕی پێدەکرێ، هەروا بۆ ئەوەیش کە بڵێ: ئەو شتەم بۆ قازانج بە هاوبەشی کڕیوە، چونکە خۆی

باشتر ئاگای له نیازی خۆیەتی، هەروا له وەیشا باوەڕی پێدەکرێ کە بڵێ: ئـەو شـتە فـەوتاوە، لەوەیـشدا کـە بڵـێ: سـەرمایەکەم گەڕاندۆتـەوە بـۆ خاوەنی، چونکە ئەمینـدارەو ڕێـك لـە مـرۆی پێسپێردراو دەچـێ، ئەگـەر ئیشکەرو خاوەن ماڵ لەسەر توخمو چەشنو جۆری ماڵەکە قسەیان جیـا بوو باوەڕ بـە قـسەی ئیشکەر دەکرێ، ئەگـەر لـە ئەنـدازەی بەشـی بڕیـار دراوی نێوانیان قسەیان لەیەك جوێ بوو سوێند دەدرێـن، جـا لـەم کاتـەدا (لـەپاش سـوێندخواردن یەکـسەر) قـازانج بەهاوبەشـییەکە هـەڵ دەوەشێتەوەو لەسەر ئەم شێوەیە کار دەکرێ: ئیشکەر کرێی وێنەی خـۆی بۆ ئەو ماوەیە کـەم بـێ یـا زۆر وەردەگـرێ، هـەموو قازانجەکـەیش دەدرێ بە خاوەن سەرمایەکە. ئەمە بەراشکاری فەرمایشتی نەوەوی‌و ڕەویانییـە، فەرموودەی مینهاجیش هەر ئەمە دەخوازێ.

## ٢٢٩) زیان له قازانج پڕدەکرێتەوە:

یاسایەکی ڕەساو دامەزراوە لە مامەڵەی قازانج بـە هاوبەشـیدا بـە دەق دەڵێ: (قازانج قەڵغانە بۆ سـەرمایە). جـا لەسـەر ئـەم بنیاتـە ئەگـەر خاوەن ماڵ دوو سەد لیرەی دایە دەست ئیشکەرو پێی گوت: ئیـشیان پێوە بکە، وە لەپێش ئەوەدا دەست بکا بە ئیش سەدیان فەوتا، ئەوە ئەو سەدە فەوتاوە لـە سـەرمایەکە دادەشـکێنرێ‌و دەمێنێتـەوە سـەد لـیرەی، چـونکە هێشتا پارەکە نەکەوتۆتە ئیش!.

**بـەڵام هەیـشە دەڵـێ:** شـتی وا نابـێ، بـەڵکوو ئـەو سـەدە فـەوتاوە دادەنرێ بە زیان، سەرمایەکە هەر لـە شوێنی خۆیـەتی دادەنـرێ بـە دوو

سەد، ئەو سەدە لە قازانج پڕ دەکرێتەوە، چونکە بە وەرگرتنی ئەو دوو سەدە لە لایەنی ئیشکەرەوە سەرمایەکە دادەنرێ بە دوو سەد، لەبەر ئەوە پێش تەصەروفو پاش تەصەڕوف لە فەوتانا جیاوازی نیە. بەلام لەسەر هەردوو فەرمایشتەکان ئەگەر سەدەکە لەپاش تەصەڕوف فەوتا ئەوە دادەنرێ بە زیانو لە قازانج پڕ دەکرێتەوە، هەموو کاتێکیش هەتا هەموو زیانێ لە قازانج پڕ نەکرێتەوە ئیشکەر قازانجی بەرناکەوێ.

## گرێدانی قازانج بە هاوبەشی لە گرێ بەندە دروستەکانە، کە پێیان دەگوترێ (عقود جائزة):

لەهەر دووسەرەوە، چونکە لەسەرەتاوە جێداریو وەکالەتە، کە قازانجیش پەیدابوو دەبێ بە هاوبەشی، ئەم دوو مامەڵەیەیش بەپێی شەرع لە گرێبەنە دروستەکانن، هەردوو لایش (واتە: هەم خاوەن ماڵو هەم ئیشکەر) مافی هەڵوەشاندنەوەیان هەیە، جا هەر کاتێ کە لایەکیان مامەڵەکەی تێك دا، ئیتر قازانج بە هاوبەشی نامێنێ، هەروەها ئەگەر لایەکیان بمرێ یا شێت ببێ سەوداکە تێك دەچێ. جا لەم کاتانەدا ئەگەر سەرمایەکە بوو بوو بە قەرز، پێویستە لەسەر ئیشکەر وەری بگرێتەوە، خواە قازانج دەرکەوتبێ یانا، چونکە قەرز ملکی ناتەواوە، کە لە خاوەن ماڵەکەیش وەرگیراوە ملکی تەواو بووە، دەی کەواتە لەسەریەتی کە وەك خۆی بیداتەوە دەست خاوەنی. بەلام ئەگەر قەرز نەبوو، تێدەفکرین ئەگەر لە جۆری سەرمایەکە خۆی بوو، وە قازانجیش لە ئارادا نەبوو، ئەوە خاوەن ماڵ وەری دەگرێتەوە، ئەگەر قازانجیش هەبوو بەپێی مەرجەکە دابەشی دەکەن. خۆ ئەگەر زیان هەبوو ئەوە هەمووی

دەکەوێتە سەر خاوەن سەرمایەکە، ئیشکەر هیچ زیانی بەر ناکەوێ، ئەوەندە هەیە ئەویش ئەوماوەیە کاری بە خۆڕیی کردووە.

## ٢٣٠) باسی باخەوانی (موساقات):

**بر: تەجرید/ ٣ ل – ١٢٣ ز: ٤٧.**

باخەوانی لە شەرعا ئەوەیە کەسێ مامەڵەیێ لەگەڵ کەسێکی تردا بکا، لەسەر خزمەتکردنو بەخێوکردنی باخی دارو دەرخت، بە ئاودانو کێلانو باسکردنو شتی تری وا، بەرامبەر بە بەشێکی دیاری لە بەرو مێوەی ئەو باخە. سەر بەلگەی دروستبوونی ئەم بابەتی باخەوانییە، ئەم فەرموودەی موسلیمە، کە لەئیبنو عومەرەوەیە: دەڵێ: پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} کاتێ خەیبەری گرتدایەوە بە خەڵکی خەیبەر کە بەنیوەیی بەرهەمی بێنن، چ بەرو بووم چ شینایی بە نیوەیی.

راجیایی نیە لەوەدا کە باخەوانی لە باخەخورمادا دروستە چونکە سەرچاوگەی دەقەکە لەبارەی ئەوە وەیە، ئیمامی شافیعی {رەزای خودای گەورەی لێبێ} رەزە مێوی قیاس کردووە لەسەر باخە خورما، بە جامعی زەکات لە نێوانیاندا، هەردوولاشیان خەمڵ دەکرێن.

**هەندێ دەڵێن:** شافیعی رەزەمێویشی لە دەق (واتە: لە نەص) وەرگرتووە، کە ئەم دەقەیە: پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} کاتێ خەیبەری گرت دایەوە بە خەڵکی خەیبەر، بەرابەر بەوە کە بە نیوەیی بەرهەمی بهێنن، چی بەری باخە خورماکانی، وەچی بەری رەزەمێوەکانی.

بەلاَم درختی تر وەك هەنجیرو قەیسیو داری بەری تر، رای زاناكان لە بارەیانەوە جیاجیایە، زانا هەیە دەڵێ: باخەوانی لە باخی ئەم جۆرە درەختانەدا دروست نیە، چونكە زەكاتیان لێ ناكەوێ. هەیشە دەڵێ: لەم جۆرە باخانەیشدا باخەوانی دروستە چونكە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خەیبەری دایەوە بە خەڵكی خەیبەر كە بە نیوەیی بەرهەمی بهێنن، خواه لە باخە خورماكانی، خواه باخی داری تربێ. ئەمەیش كە باخی دارو درەخت، هەر جۆرێ بێ دەدرێ بە باخەوانی دروستترین فەرمایشتەو پەسەندی ئیمامی نەوەویشە.

## مەرجەكانی باخەوانی:

**یەكەم**: دەبێ كاتی باخەوانی دیاری بێ، ماوەكەی زانراو بێ، لە كەیەوە بۆ كەیە، چونكە باخەوانی گرێدانێكی (لازم)ە لە عوقودە لازیمەكانە. واتە: خزمەتی باخەكە پێویستو ئەركی سەرشانی باخەوانەكەیە، بەرابەر بەوە پشكی دیاریكراوی بەروبوومیش پێوست دەبێ بۆ ئەو.

وەكی تریش پێگەیشتنی مێوەو بەریش ماوەیەكی دیاری تایبەتی هەیە، بە ئاسانی دەزانرێو سەرەتاو بنەتای بۆ دادەنرێ.

**دووەم**: دەبێ هەر خزمەتو ئیشێ كە پەیوەندی بە بەخێوكردنو بەرهەمهێنانی باخەكەوە بێ لەسەر باخەوانەكەبێ، وە خۆی بەتەنها بیكا، چونكە ئەمە بابەتی ئەم باسەیە، بۆیە ئەگەر باخەوان مەرجی گرت كە خاوەن باخەكە دەبێ لەگەڵیدا ئیش بكا گرێدانەكە دانامەزرێ،

چونکە یاسای دامەزراو لەم بابەتەدا دەڵێ: ئەوەی ئەرکی سەرشانی باخەوانە ئەگەر بە مەرج گیرا کە ئەوە لەسەر خاوەن ماڵ بێ، گرێدانەکە پووچ دەبێ.

**سێیەم**: دەبێ پشکێکی دیاریکراو لە میوەو بەرو بوومی باخەکە بدرێ بەباخەوان، وەك نیوەو سێیەكو چواریەكو.. تاد، چونکە دەقی چەند نموونەیێ لەم بابەتە لە سوننەتدا هەیە، جا ئەگەر باخەوان مەرجی کرد کە بەری چەند دار خورمایەکی تایبەت بۆ ئەو بێ ئەوە دانامەزرێ، چونکە رێی تێدەچێ کە ئەو درەختانە بەنەگرنو باخەوان رەنجەڕۆ بێ، یا درەختەکانی تری باخەکە بەرنەگرنو لەم بارەدا خاوەن باخ نائومێدبێ. شتی وایش دادەنرێ بە زیانی زۆر، گرێدانی باخەوانیش خۆی لە خۆیدا زەرەرێکی زۆری ترە، کە رێگەی پێدراوە لەبەر پێداویستییە، بەلآم دووزیانی زۆر (واتە: دوو غەرەر) لەیەك مامەڵەدا دەبن بەهۆی قەدەغەبوونی!.

**ئەگەرگوتی**: خودا چی دا بە ناوکۆییمان، ئەوە دادەمەزرێ، وە دەبڕدرێ بەسەر نیوەییدا.

**چوارەم**: چاوپێکەوتنی باخەکەو دارەکانی مەرجە بۆ دامەزراندنی باخەوانی، باخەوانی لەسەر شتی نەزانراو دانامەزرێ.

## کارونیشی باخەوانی: ئیش لە باخەوانیدا لەسەر دوو جۆرە:

**یەکەم**: هەرکارێ کە بۆ چاکبوونو زیادبوونی میوە پێویستەو سوودی هەیە بۆ بەری باخەکە، ئەو جۆرە کارانە لەسەر باخەوانەکەیە،

واتــه: ئــەو کارانــەی کــە گـشت ســالێ دووبــارە دەبنــەوە، وەك ئــاودانو پێداویــستییەکانی ئــاودان، لــە جۆمــاڵو مــیرازو مــشتومالکردنی بــیرو خستنەگەڕی ئامێرەکان، وەك هەر ئیشێکی تر کە بە عادەت پێویست بێ بــۆ پاراســتنو گەشــەکردنو وشــك کردنــەوەی بــەری باخەکــە، وەك ئامادەکردنی جێگەخەرمان.

## ٢٣١) باسی بەکرێدان (اجارە):

**تجرید/** ٣ ل ٧٥ – ز: ٤٢.

بەکرێدان لە شەرعی شەریفا برێتییە لەوە: کەسێ قازانجی شتێ بکا بەموڵکی یەکێ بەرابەر بەوەجەڵ (عیوەز)ێ، بەپێی ئەو مەرجانەی لە مەولا باسیان دەکەین، بەکرێدان (إجارە) بەپێی نامەی خوداو ڕێبازی ڕەهبەرو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلام دامەزراوە، خودای گەورە دەفەرموێ: {قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ – سورة القصص – ٢٦/٢٨} دیسان دەفەرموێ: {فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ – سورة الطلاق – ٦/٦٥}. ئەوەتا لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا بەکرێدان بە ڕەوا دانراوە. ئیمامی بوخاریش (ڕەزای خوای لێبێ) ئەم فەرموودە قودسییەی گێڕاوەتەوە: خودای گەرە دەفەرموێ: ئەم سێ کەسەیە لە ڕۆژی قیامەتدا خوم داواچیم لە سەریان: ئەو کەسەی کە بەهۆی ناوی منەوە پەیمان دەدا بە کەسێكو بەوە هێمنی دەکاتەوە، یا تەماداری دەکا، کەچی لە پاشا دەسخەڕۆی دەکاو پەیمانەکەی ناباتە سەروناپاك دەردەچێ لەگەڵی.

**دووەم:** پیاوێ ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشێو بەهاکەی بخوا.

**سێیەم:** پیاوێ کرێکارێ بەکرێ بگرێو کاری خۆیی پێ تەواو بکاو کەچی کرێکەیی نەداتێ.

لە ئەحکامدا ئیبنو ماجەیش لە ئیبنو عومەرەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە: لە پێش ئەوەدا کە کرێکار ئارەقەکەی وشك ببێتەوە کرێکەیی پێ بدەن.

## مەرجەکانی بەکرێدان:

### بۆ دامەزراندنی بەکرێدان چەند مەرجێ هەیە:

**یەکەم:** بەکرێدان بەسەر کەڵك (مەنفەعەت)دا دەڕوا، نەك بەسەر زات (عەین)دا، کەواتە: بەکرێدان دانامەزرێ ئەگەر بەسەر زاتدا بڕوات، وەك بەکرێگرتنی باخ بۆ بەرەکەی، یامەڕ بۆ شیرەکەی، یا بزن بۆ مووەکەی، چونکە بەرو شیرو موو زاتن نەك کەڵك!.

بەڵام ئەگەر زات دەبوو بە پاشکۆی کەڵك ئەوە دروستە، وەك بەکرێگرتنی ژنێ بۆ مەمکدان بەمنداڵ، وەك لەم ئایەتەدا دەفەموێ: (فان ارضعن لكم فآتوهن اجورهن). ئەوەتا لەم ئایەتەدا کرێ بەستراوە بە کرداری مەمکدانەوە، نەك بە شیرەکەوە، شیرەکە دەبێ بە پاشکۆی کرداری مەمکدان، یا وەك ئەوە یەکێ خانوویەك بە کرێ بگرێ، بیرێکی تیادابێ، دروستە ئاو لە بیرەکە بخواتەوە، چونکە لەم کاتەدا ئاوی بیرەکە، کە زاتە واتە: عەینە، دەبێ بە پاشکۆی خانووەکە، کە بۆ کەڵکی تیادانیشتن بە کرێگیراوە.

**دووەم**: مەرجی دامەزراندنی بەکرێدان ئەوەیە: ئەو کەڵکە بەکرێ گیراوە نرخێکی بایەخداری هەبێ، وەك کەڵك وەرگتن لە زەوی‌و زارو خانوو شتی تری وا، چونکە کشتوکاڵ‌و تیادا دانیشتن دادەنرێن بە دوو مەبەستی بایەخدار، کەواتە: دروست نیە سێوێ بەکرێ بگیرێ بۆ ئەوەی بۆنی پێوە بکرێ! چونکە بەپێی باوی ناو کۆمەڵ شتی وا بێ بایەخە. هەروا دروست نیە خۆراك بەکرێ بگیری بۆ ئارایشت‌و رازانەوەی چێشتخانەو حانووت، چونکە شتی وایش دیسان هەربێ بایەخە.

**سێیەم مەرج**: دەبێ کەڵکەکە دیاری بێ، کەواتە: بەکرێدان لەسەر کەڵکی نەزانراو دانامەزرێ، چونکە شتی وا زێدەزیانە، کە پێی دەگوترێ غەرەر. گوتەی پوخت لەم شوێنەدا ئەمەیە: دەبێ ئەندازەو چۆنێتی کەڵك زانراوبێ.

**چوارەم**: دەبێ کەڵکەکە رەوابێ، کەواتە: دروست نیە کە شتی حەرام بدرێ بەکرێ، وەك ئامێری رابواردنی ناڕەوا، لە وێنەی هۆکاری بەزم‌و رەزم، یا وەك بەکرێگرتنی گۆرانیبێژ بۆ گۆڕانی گوتنی نارەوا. یا بەکرێ گرتنی کەسێ بۆ هەڵگرتن‌و دروستکردنی مەی‌و بادە.

**پێنجەم**: دەبێ کرێکە وەجەڵێکی دیاری بێ، وەك دیناری لە کرێی رۆژێ درەودا، یا مەنێ گەنم لە کرێی رۆژێ گۆلبڕین دا چونکە نەزانینی کرێ دادەنرێ بە زێدەزیان (غەرە).

**شەشەم**: مان (واتە: بەقا)ی زاتە بەکرێگیراوەکە مەرجە. لەبەر ئەوە دروست نیە مۆم بدرێ بە کرێ بۆ سووتان! چونکە مۆم کە سووتا زاتەکەی نامێنێ، هەروا هەرشتێکی تر کە لەم بابەتە بێ، وەك رۆن بۆ کردنە ناو چێشت.

**حەوتەم**: دەبێ کەڵك بە یەکێ لەم دوو شتە یا بەهەر دوکیان ئەندازەی بۆ دابنرێ: بە کات، یا بەکار، کە پێشیان دەگوترێ: (وەختو ئیش: المدة والعمل).

جا دەرکەوتنی کەڵکی ماڵی بەکرێدراو، وا ئەبێ بە (وەخت) دەبێو بە (ئیش) زەبت ناکرێ، وەك بەکرێدانی خانوو و دووکانو بەکرێگرتنی ژن بۆ مەمکدانو وێنەی ئەمانە بۆ ماوەی ساڵێ، یا کەمتر یا زیاتر، جاری وایش دەبێ بە ئیشیش زەبت دەکرێ، وەك بە کرێدانی وڵاخێ بۆ سواربوونی لە ماوەی دەرۆژدا. ئەگەر شتێ بە وەختو بە ئیشیش کەڵکەکەی دیاری دەکرا، وەك دروومانو خانووکردن، ئەوە دەبێ هەربەیەکێکیان دیاری بکرێ، بەڵام ئەگەر وەختوئیشی تیا دیاری بکرێ، وەك ئەوە پێی بڵێ: تۆ بەکرێ دەگرم بۆ دوورینی ئەم کەوایە لە ماوەی ئەمرۆدا، ئەوە بەتاڵە چونکە ئەگەر بە کەمتر لە رۆژێ تەواوی بکاو، داوای لێبکا کە ماوەی ئەو رۆژە کاری بۆبکا، ئەوە زیان بە مەرجی کار دەگەیەنێ، دەنا زیان بە مەرجی کات دەگەیەنێ.

تێکرِا هەر زاتێ مەرجی فرۆشتنی تیا هەبێ، دروستە کە کەڵکەکەی بدرێ بەکرێ، وەك خانوو بۆ دانیشتنو زەوی بۆ داچانو ولاخ بۆ سواریو کەژاوە بۆ حەجکردن، چونکە ئەم زاتانە هەموو مەرجێکی پێویست بۆ دامەزراندنی فرۆتنیان تیادایە، کەواتە کەڵکەکانیشیان دروستە بدرێن بەکرێ [1].

---

[1] ئەمە تەرجەمەو راستکردنەوەی ئەم عیبارەتەی فیقهولمویەسەرە، کە بەبێ ساخکردنەوە بە هەڵەو بە پچرِ پچرِی لە (کفایة الاخبار) نەقلّ کراوە، کە دەڵێ: (وبالجملة فكل عين وجد في منفعتها شروط الصحة!؟ صح استئجارها كاستئجار الدار

**ئەوەی دەبێ بەهۆی پێویستبوونی کرێ:**

بە گرێدانی بەکرێدان، کرێ پێشخراوبێ یا پاشخراو، بەپێی مەرجی ناوبراو، پێویست دەبێ‌و، بەهرەوەر گرتنی تەواو لە کەڵك حەڵاڵ دەبێ، چونکە یاسایەکی چەسپاوە لە شەرعی خوادا: موسوڵمانان پابەندی ئەو مەرجە رەوایانەن کە لە ناوخۆیاندا بە مەرجی دەگرن!.

بەڵام ئەگەر کرێ بەرەهایی بەبێ قەیدو بەند ناوبرا دەبڕدرێ بەسەر کرێی پێشخراودا، ئەمە تەنها لە بەکرێدانی زاتدا وایە، وەك ئەوە بڵێ: ئەوا ئەم پارچە زەوییەم لەتۆ بەکرێ گرت ساڵی بەسەد دینار، چونکە لە بەکرێدانی لە ئەستۆدا دەبێ لە هەموو حاڵێکا کرێکە حازربێ، دەنا دەبێ بەفرۆشتنی قەرز بە قەرز، پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} رێگەی شتی وای نەداوە، وەك ئەوە بڵێ: ئەوا کردمە ئەستۆت کە لە ئاییندەدا بە دە دیناری حازر ئەم بارەم بۆ بەری بۆ ئەو شوێنە!.

**بەکرێدان کەی پووچ دەبێتەوە:**

کاتێ یەکێ لە دوو گرێدەرەکان مرد، وەزاتە بەکرێداوەکەیش مابوو، ئەوە بەکرێدانەکە لەم کاتەدا پووچ نابێتەوە، چونکە بەکرێدان گرێدانی ئاڵشتکردنی شتە بەشت، لەسەر شێوەیێ کە قابیل بێ بۆ

---

للسكنى والارض للزرع والدابة للركوب وألرحل للحج والبيع والشراء ونحو ذلك)
تەماشای شەریعەتی ئیسلام بەرگی دووهەم، چاپی یەکەم لاپەڕە (٢٤٨) بکە هەروا لاپەڕە (١٠)و (١١) لە هەمان بەرگ.

- وەرگێڕ -

گواستنەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، لەبەر ئەوە بە مردنی یەکێ لە دوو گرێدەرەکان پووچ نابێتەوە، دەق وەك فرۆشتن!.

جا ئەگەر بەکرێگر (موستە ئجیر) مرد میراتبەرەکەی جێگەی دەگرێتەوەو بەتەواوی بەهرە لە کەلکەکە وەردەگرێ، ئەگەر بکرێدەریش واتە: (مؤجریش) مرد زاتەکە لە دەستی بەکرێگردا دەمێنێ هەتا ماوەکەی تەواو دەبێ. جا ئەگەر زاتە بەکرێدراوەکە لەناوچوو، وەك ئەوە وڵاخ بێ و بمرێ، یا جل بێ و بسووتێ، یا زەوی بێ و رۆبچێ، ئەوە تەماشا دەکەین ئەگەر لەپێش وەرگرتندا بوو، یا لەپاشی بوو بەڵام ماوەیەکی وا بە سەریدا تێنەپەڕیبو کە لە وێنەی ئەو ماوەیەدا کرێی هەبێ، ئەوە بەکرێدانەکە هەڵ دەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر لەپاش وەرگرتن فەوتا، وە ماوەیەکی وەهایشی بەسەردا تێپەڕی کە لە وێنەی ئەوماوەیەدا کرێی بکەوێ، ئەوە بەکرێدانەکە بۆ ئایندە هەڵ دەوەشێتەوە، چونکە گرێ لەسەر کراو (واتە: معقود علیە) نەماوەو فەوتاوە، بۆ رابووردوویش کرێی ئەو ماوەیەی دەکەوێ و بەس ئەمە لە بەکرێدانی زاتدا وایە، بەڵام لە بەکرێدان لە ئەستۆدا بە فەوتانی بەکرێگیراو گرێدانەکە هەڵ ناوەشێتەوە، چونکە بەکرێدەر دەتوانێ بیگۆڕێ بە بەکرێگیراوێکی تری وەك فەوتاوەکە، بە وێنە: بەکرێگیراو ماین بوو، تۆپی بەکرێدەر دەتوانێ ماینێ تر بخاتەوە جێگەی تۆپیوەکە.

## بەکرێگر دەستەبەر نیە :

بەکرێگر ئەمینداره لەسەر ئەو شتەی کە وا لە دەستیدا، بەهۆی کەمتەرخەمییەوە نەبێ نابێ بە دەستەبەر. وەك ئەوە بەکرێی بگرێ بۆ نانکردن، وە زیاد لە پێویست ئاگرەکە خۆش بکا، یا نانەکە بە

تەندوورەكەوە بەجێ بهێڵێ هەتا دەسوتێ، بەكرێگریش رێك وەك بەكرێگیراو وایە، ئەگەر زاتەكە لە دەستیدا، بەبێ سووچی خۆی لە ناوچوو نابێ بە دەستەبەر، وەك ئەوە بارێ بنێ لە وڵاخەكە كە لە توانایدا نەبێ، یا بارێ بنێ لە خۆشرۆكە(واتە: سَیَّارة) كە لە وزەو كێشیدا نەبێو بەهۆی ئەوەوە بفەوتێ!.

## ٢٣٢) باسی دەتسخۆشانەو سەرقەڵەمانەو وەڵیفەتانە كە مەشهوورن بە (جَعَالە)(١):

جوعالە (یا دەستخۆشانە) لە شەرعا برێتییە لەوە كە كەسێ ماڵێكی دیاری بڕیاربدا بۆ كەسێ كە ئیشێكی تایبەتیی بۆ بكا، وەك بڵێ: هەر كەسێ وشترە بزربووەكەمم بۆ بهێنێتەوە دە دیناری دەسخۆشانە دەدەمێ، سەر بەڵگەی ئەم باسە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە كە

---

(١) ئەم زاراوانە لە كوردیدا هەر كامەیان بگری دەست دەدا بۆ بەكوردیكردنی وشەی جوعالەی عەرەبی: دەستخۆشانە، وەڵیفەت، شاباش، خەڵات، بەخشیش، سەرقەڵەمانە. گرنگ ئەوەیە لە مەولا وەرگێرەكان چاو لە یەك بكەنو شوێن پێی یەك هەڵگرنو برەو بەوشەی پێشنیاری پێش خۆیان بدەن، نەك هەر نووسەرێ ببێ بەكلكی حیزبێو رستەو وشەو زاراوەكانی ئەو پەسەند بكاو بەس. ئەم حاڵەی ئێستا لەناو پارتەكاندا پەیدا بووە، كە هەر حیزبە زاراوەی خۆی هەیە موصیبەتێكی زۆر گەورەیە لە شەڕی برا كوژیەكە زۆر خراپترە. بەڵام هەتا كلاشینكۆف ئاغای مەیدان بێ، خامەی قوڕ بەسەر مەگەر هەر فرمیسكی شینو سوور هەڵڕێژێ!.

- وەرگێڕ -

دەفەرموێ: {وَلِمَن جَاء بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ}. بۆزانینی راڤەکەی تەماشای سەرەتای باسی دەستەبەری (الضمان) بکە. لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمدا داستانی سەرەك خێڵێ هەیە، کەشت پێوەی دەدا، شپرزەی دەکا، هەتا لەگەڵ یەکێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەردا رێك دەکەون کە بەرابەر بە بڕکەیێ ران نووشتوویان بۆ بکا، وە لە ئەنجاما کابرا چاك دەبێتەوەو بڕکە رانەکە دەدا بە دووعا خوێنەکە. وەکی تریش گەلێ جار ناچارییش شتی وا دەخوازێ.

**مەرجەکانی دەستخۆشانە**: کاتێ ئیشکەرەکە شایانی خەڵاتەکە دەبێ کە خاوەن ئیشەکە خۆی بەڵێنی ئەوەی دابێ، وەك ئەوە بڵێ: قەڵەمە کەم گوم بووە هەرکەسێ دۆزییەوەو هێنایەوە بۆم دینارێکی دەدەمێ. بەڵام ئەگەر کەسێ بە پیاوەتی هێنایەوە هیچی ناکەوێ، دروستە کە خەڵات بۆ دانراوەکە کەسێکی دیاری بێ وەك ئەوە بڵێ: ئەگەر زەید گومبووەکەی هێنایەوە بۆم نیو دیناری پێ دەدەم، یا نادیارێ بێ، وەك ئەوە بڵێ: هەرکەسێ شتە ونبووەکەمم بۆ بدۆزێتەوە نیو دیناری پێ دەدەم، ئیتر لەم دوو حاڵەدا کەسی مەبەست ئەگەر ونبووەکەی بۆی هێنایەوە شایانی خەڵاتو وەڵیفەتە ناوبراوەکە دەبێ!.

سەر بەڵگەی ئەمەیش ئەم فەرموودەیەی خۆشەویستە {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: موسوڵمانان پایەندی مەرجی رەوای خۆیانن!.

مەرجی سەرقەڵەمانەکەیش ئەوەیە کە دیاریبێ، چونکە وەجەڵە، هەموو وەجەڵێکیش دەبێ ئەندازەکەی زانراوو دیاری بێ، دەق وەك کرێ وایە، کەواتە نابێ نەزانراوو نادیاریبێ، وەك ئەوە بڵێ:

هەرکەسێ گومبووەکەمم بۆ بهێنێتەوە جلێکی پێ دەدەم، یا لەسەرم بێ کە رازی بکەم، یا شتێکی پێ بدەم، شتی وا مەرجی بەتاڵە، لەکاتی وادا هەرکەسێ هێنایەوە کرێی وێنەی خۆیی دەکەوێ، ئەگەر کۆمەڵێ بەهاوبەشی ئیشەکەیان کرد خەڵاتەکە ناوکۆیی یانەو، بە یەکسانی وەك یەك لەناو خۆیاندا دابەشی دەکەن، با ئەندازەی ئیشەکانیشیان زیادو کەمی هەبێ، چونکە کارەکە لە بنەڕەتدا نەزانراوە، لەبەر ئەوە لە تواناداد نیە کە ئەندازەکەی بە وردی رەچاو بکرێ.

## ۲۳۳) باسی مڵکانەو بنەتۆو، مەبەست موزارەعەو موخابەرەیە:

( بڕ: تەجرید/ ۳ل – ۱۲۳ ز: ٤٧ ).

زەوی بدرێ بە موڵکانە دروستە بەپێی ئەم درێژە پێدانەی دواوە، موزارەعەو موخابەرە هەر دوو لە مەعنادا یەکن کە ئەوەیە: خاوەن زەوی زەوییەکەی بدا بە ئیشکەرێ کە بەنیوەیی یا بە کەمتر یا بە زیاتر دایچێنێو بەرهەمی بهێنێ. بەڵام رافیعیو نەوەوی (رەزای خوایان لێبێ) دەفەرموون: لە موزارەعەدا بنەتۆو لەسەر خاوەن زەوییە، لەموخابەرەیشدا بنەتۆو لەسەر ئیشکەرە، ئەمە جیایی نێوانیانە.

**بڕیارەکەیان:**

شەرعزانەکان لە بارەی ئەم دوو مامەڵەیەوە رایان جیایە، گوتراوە: کە هەردوو مامەڵەکە بەتاڵن، چونکە حەدیثی صەحیح لە بوخاریو موسلیمدا هەیە کە نەهی لە موخابەرە دەکا، لە صەحیحی

موسلیمیشدا هەیە: کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێت} نەهی کردووە لە موزارەعە بەڵام فەرمانی کردووە بەوە: خاوەن زەوی دەتوانێ لەباتی ملکانە، کرێی زەوییەکەی وەربگرێ.

هۆی نەییشس لەدانی زەوی بە ملکانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بۆچوونە: گوایە بەهۆی بەکرێدانەوە دەتوانرێ کەڵكو بەهرە لە زەوی وەربگیرێ، کەواتە: ئەوەیش وەك ئاژەڵو مالات دروست نیە بەرابەر بە هەندێ لە دەرامەتی خۆی بدرێ بە ملکانە.

ئیبنو شورەیحیش دەفەرموێ: موزارەعە دروستە. ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو لمونزیرو خەطابیش هەروا دەفەرموون: ئیبنو خوزەیمە جزمێکی لە بارەیەوە نووسیوەو، ڕێگە چارەی کارکردن بە کۆی ئەو فەرموودانەی دۆزیوەتەوە، کە لەم بارەیەوە هاتوون، کە هەندێ لەو فەرموودانە ڕێگەی موزارەعەیان داوەو هەندێکی تریان ڕێگەی نادەن. خەطابیش پەیڕەوی ئەوی کردووە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش فەرموودەی قەدەغەکردنی ملکانەی بەلاواز داناوە، خەطابی دەفەرموێ: بۆیە مالیكو ئەبو حەنیفەو شافیعی {رەحمەتی خوایان لێبێت} ڕێگەی ملکانەیان نەداوەو بە پووچەڵی دادەنێن، چونکە ئاگایان لەوە نەبووە کە فەرموودەی قەدەغە کردنەکە لاوازو بێهێزە، کەواتە: موزارەعە (واتە: ملکانە) دروستە، چونکە لە هەموو ولاتە موسوڵمانەکاندا کاری پێدەکرێو کەسیش ئەم کارپێکردنەی بە پووچەڵ دانەناوە. هەتا ئێرە فەرمایشتی خەطابی بوو. نەوەویش لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: دروستبوونی مامەڵەی ملکانە رای ئاشکراو پەسەندە، بەپێی

فەرموودەکەی خەیبەر (کە لەسەرەتای باسی باخەوانیدا، کە باسی ژمارە (٢٢٨) بوو رابورد – وەرگێڕ).

لافی ئەوەیش کە دروستبوونی ملکانە لە خەیبەردا پاشکۆ بووە بۆ دروستبوونی باخەوانی قەبوول نیە، چونکە ئەو مەبەستەی کە بووە بەهۆی دروستبوونی باخەوانی لە مولکانەیشدا هەمان مەبەست هەیە، بە قیاسیش لەسەر مامەڵەی قازانج بە هاوبەش، کە بە یەکگرتنی راکان دروستە، دەبێ ملکانەیش دروستبێ، چونکە ئەمیش دەق وەك ملکانە وایە لە هەموو شتێکا، وە لەبەر ئەوەیش کە موسوڵمانان لە گشت وڵاتو لە هەموو سەردەمێکا بەردەوام کار بە ملکانە دەکەن. ئەبو یووسفو موحەممەدو ئیبنو ئەبو لەیلاو زانا کووفییەکانی ترو، شەریعەتزانەکانی فەرموودە زانەکانیش حوکم بە دروستبوونی ملکانە (موزارەعە) دەکەن. فەرمایشتی نەوەوی تەواو.

# ٢٣٤) ئاوەدان کردنەوەی وێرانە (احیاو الموات)

(بڕ: تەجرید/ ٣ ل – ١١٧ – ژ: ١٠٢٨ هەتا ژ: ١٠٣٢ ):

لە عورفی شەرعی شەریفدا: بریتییە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی بێ خاوەن. وێرانە لە شەرعا ئەو زەوییەبێ خاوەنەیە کە هەرگیز ئاوەدان نەکرابێتەوە. سەر بەڵگەی دروستبوونی ئەم بابەتە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە {درودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: کەسێ زەوییەکی بێخاوەن ئاوەدان بکاتەوە دەبێ بەهی خۆی، گەڕی زۆرداریش لەو زەوییەدا هیچی لێ سەوز نابێ! (ئەبو داوود، نەسائی، تیرمیذی)

تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە، واتە: حەسەنە. زۆردار لێرەدا ئەو کەسەیە کە بە زۆری زۆرداریی، بە نیازی داگیرکردن، دارو نەمامو شتی وا لەناو زەوییەکا دەڕوێنێ، کە کەسێکی تر ئاوەدانی کردبێتەوە، بۆ ئەوەی کە بیکا بەهی خۆی، گەڕی وا دەبێ ڕێگەی نەدرێ، خۆشی بێو ترشی بێ دەبێ ئەوەی لێ بسەنرێتەوە، ئەم جۆرە گەڕە بەم شێوانە دروست دەکرێ: لە زەوییەکی کەسێکی تردا نەمام بنێژێ، یا خانوو بکا، یا جۆگەی بۆ رابکێشێ، یا بیرێکی تیادا هەڵ بکەنێ.

## ٢٣٥) بڕیار (حوکم)ی ئاوەدانکردنەوە:

وێرانە ئاوەدانکردنەوە زۆر سوننەتە، بەپێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}: کەسێ پارچەیێ زەوی بێخاوەن ئاوەدان بکاتەوە خێرێکی چاکی دەگات، هەرچی لەبەرو بوومی ئەو زەوییە، کە مرۆڤێ بیخوات، یا باڵندەو دڕندەو ماڵاتی مڵوو مووشەکەر بیخوات، یا هەریەکێ لەمانە سوودێکی لێ وەربگرێ، ئەوەی بۆ دەبێ بەخێرو صەدەقە. (نەسائی گێڕاویەتەوە، ئیبنو حیببان بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە).

هەر کەسێ مافی ئەوەی هەبێ کە ببێ بە خاوەنی ماڵ، بۆشی هەیە کە وێرانە بۆ خۆی ئاوەدان بکاتەوە، هەر بەخودی ئاوەدانکردنەوەکە دەبێ بە خاوەنی ئەوەی کە ئاوەدانی کردۆتەوە، چونکە ئاوەدانکردنەوە هۆی ملکایەتیە بەهۆی کردارێکەوە، دەق لە راوکردنو داروچیلەکە کۆکردنەوەی دەشتو دەر دەکا.

بەپێی ئەم فەرمانەی سەروەری پێشینان‌و پاشینان، سەروەرمان حەزرەتی موحەممەد، {درودو سڵاوی خوای لەسەربێ}، کە ئێستا رابورد، بۆ پەیدابوونی خاوەنداریی بەهۆی ئاوەدانکردنەوەوە، پێویست بە فەرمانی پیشەوای موسوڵمانان ناکات، ئەگەر بوو چاکتر، ئەگەر نەیشبوو قەیناکا.

## مەرجەکانی دامەزرانی ئاوەدانکردنەوە:

### ئاوەدانکردنەوەی وێرانە بەم دوو مەرجە دادەمەزرێ:

**یەکەم**: نابێ ئەو وێرانەیە بەهیچ شێوەیێ ملکی موسوڵمانێکی تربێ، ئەگەر وابوو ئەوە دروست نیە، توخنی بکەوێ، نە بە ئاوەدانکردنەوەو نە بەشتێکی تر، مەگەر بەپێی فەرمانی شەرع. لە فەرموودەیەکی شەیخەیندا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ بە زۆرو ستەم بستێ زەوی داگیر بکا، لە رۆژی قیامەتدا بەهەر حەوت چینەی زەمینەوە، وەك کەڵەمە لە ملی گادا، ئاوا دەکرێ بە تەوق‌و دەکرێتە ئەستۆی!.

بزانن حەریمی ئاوەدانی بە ئاوەدانکردنەوە نابێ بە موڵك، چونکە خاوەنی ملکە ئاوەدانەکە ئەو لە پێشترە بەو حەریمە، حەرێم ئەو شوێنانەیە کە پێویستن بۆ بەهرە وەرگرتنی تەواو لە ملکی ئاوەدان، وەك رێگەو سەلوێنك‌و ئاوەڕۆو شتی وا.

**دووەم**: دەبێ ئاوەدانکەرەکە موسوڵمانبێ، لەبەر ئەوە دروست نیە بۆ بێبڕوا لە ولاتی ئیسلامدا زەوی بێخاوەن ئاوەدان بکاتەوە بۆ خۆی، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: وێرانەی بێخاوەن کە

هەیانە هی سەردەمی عادن، لە بنەڕەتدا هی خواو پێغەمبەری خوان، دەی لە ئێستاوە ئەوا من کردم بەهی ئێوە ئەی کۆمەڵەی موسوڵمانان! شافیعی گێڕاویەتەوە، بەیهەقی جارێ بە مەقووفی هەتا سەر ئیبنو عەبباس گێڕاویەتەوە، جارێکیش بە مەرفووعی هەتا سەر پێغەمبەر. ئەوەتا لەم فەرموودەدا رووی دەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە هەموو موسوڵمانێکەو بەس، هەتا بزانرێ کە مەرجی ئاوەدانکەرەوە لە خاکی ئیسلاما ئەوەیە کە موسوڵمان بێ، بۆ ناموسوڵمان دروست نیە، ئەگەر کەسێ بڵێ: ئەی بۆ خاوەن پەیمان، لە دەستەی خاوەن نامەکان، لەناو وڵاتی ئیسلامدا بۆیان هەیە دارو چیلکەو پووش‌و گیای بێ خاوەنی ئەو کەژە بۆ خۆیان کۆبکەنەوە، کەچی ئەمەیان بۆ دروست نیە؟ لە وەڵاما دەڵێین: چونکە دارو چیلکەکردن‌و پووش‌و گیاکۆکردنەوە جێگەیان پڕ دەبێتەوەو جارێ تر هەڵ دەدەنەوەو دروست دەبنەوە، لەبەر ئەوە بەوە هەتا سەر لە کیس موسوڵمانان ناچن، بەپێچەوانەی ئاوەدانکردنەوەی وێرانەوە، چونکە وێرانە کە ئاوەدان کرایەوە ئیتر دەبێ بەهی خاوەنی‌و جێگەی پڕ نابێتەوە، دەی ئەگەر ناموسوڵمان بیکا بەهی خۆی هەتا سەر لەکیس موسوڵمانان دەچێ.

## نیشانەکردنی ئاوەدانکردنەوەی رەوا چۆنەو چییە؟:

ئاوەدانکردنەوە بریتییە لە ئامادەکردنی شتەکە بەپێی مەبەستی ئاوەدانکەرەوە. چونکە یاسادانەری ئیسلام، پێغەمبەری خوا، ئاوا بەبێ قەیدو بەند، بەرەهایی فەرموویەتی، کەواتە: بۆ دیاریکردنی نیشانەکانی دەگەڕێینەوە بۆ سەرعورف ( کە بریتییە لە باوی رەوای

دامــەزراوی ناوکۆمەڵــەی موســوڵمانان) چــۆنێتیی عــورفیش لــە زمانــا سنوورو پێناسەی بۆ دانەنراوە کە دەبێ چۆن بێ‌و چۆن نـەبێ، کەواتـە: ئاوەدانکردنــەوەی هــەر شــوێنێ بــەپێی مەبەســت لێــی دەگــۆڕێ، ئەگــەر کردنی خانوو بوو، دەبێ بەپێی عادەتی دامەزراو، بـە بەرد، یا بەخشت، یا بەمووره قوڕ دیـواری بـۆ بکـا، یا بەچیلکەو قیسپ تـەیمانی بـۆ بکاو، سەری هەندێکیشی بگرێ‌و دەرگاو پەنجەرەی تێبخا، وە ئەگـەر مەبەستی باخ ناشتن بوو، ئەبێ بە پێی دەستووری دامەزراو، حەساری بـەدەورا بکـا، جا ئەگەر دەستووری ئەو شارە وا بوو بە دیوار حەساریان دروست دەکـرد بۆ ئەو جـۆرە شـتە ئـەوە دیـوار مەرجـە، دەنـا ئەگـەر بەشـتێکی تـر بـوو، وەك تەیمان. تەلبەنـد، ئەوە پەیڕەوی ئەوە دەکرێ کە لەو جێگەیـە بـووە بە عادەت.

## ٢٣٦) بەخشینی ئاو کەی پێویست دەبێ؟

**ئاو لەسەر دوو بەشە :**

**یەکــەم**: ئەوەیــە کــە لــە خۆیــەوە لــە شــوێنێ هــەڵبقوڵێ، کــە ئەوشوێنە پەیوەندی تایبەتی بە کەسەوە نەبێ، هەروا هیچ ئـادەمیزادێ دەسـتی نـەبێ لـە دەرهێنـان‌و ڕەوانکردنیـدا، وەك ئـاوی چـەم‌و کانیـاوی دەشـت‌و دەرو شـاخەکان‌و لافـاوو بارانـاو، کـە بـۆ قـازانجی گشتین‌و ئـاوی بەرەڵلای بێخاوەنن، خوا نەبێ کەس خاوەنیان نیە.

جا ئەم جۆرە ئاوە ئەگەر کەم بوو، یا ڕێگـەی سوود لێـوەرگرتنی تەنگەبـەر بـوو، ئـەوە کـێ زووتـر ڕۆیـشتە سـەری‌و گرتـی بـۆ خـۆی ئـەوە

دەبێ بەهی ئەو، با ئەو کەسە بێهێزیش بێ، چونکە بڕیاری شەرع لەسەر ئەمەیە، عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە: لە بارەی ئاوی لافاوی شیوی مەهزوورەوە، کەوا لە مەدینە، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} ئاوا بڕیاری داوە: کێ یەکەم بوو ئاوەکە دەگرێ هەتا دەگاتە هەردوو قولەپێ، ئەوجا بەری دەداتەوە بۆ ئەوەی خوارترا. (ئەبو داوودو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە. ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: ڕشتەکەی دەگاتە پلەی جوانی، حاکمیش لە (المستدرك)دا گێڕاویەتەوە)[1].

ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە کە بەرو دوا دەگەنە سەری، بەڵام ئەگەر بەیەکەوە چوونە سەری و ئاوەکەیش بەشی هەموویانی نەدەکرد ئەوە تیرو پشك لە نێوانیاندا دەکەن، ئەگەر کەسێ لە پیشدا هات دەیویست

---

[1] لەم فەرموودەدا ئەم دوو تێبینییە هەیە:

یەکەم: لە ئەصڵەکەدا نووسراوە: (فی سبیل مهزور، ڕاستیەکەی (فی سیل مهزور)ە. سەبیل ڕێگەیە، سەیل لافاوە.

دووەم: ئەعلاو ئەسفەل بەمەعنا لای سەروو ترو لای خوارووتر نیە، بەڵکوو بە مەعنا ئەوەیە کێ یەکەم بوو لە گرتنی ئاوەکە داو زوو گەیشتە سەری ئەوەپێش دەخرێ، دوا ئەو دووەم پێش دەخرێ ئیتر هەروا، تەماشای ماددەی (هزر) بکە لە (النهایة في غریب الحدیث والاثر)دا لەگەڵ مغنی المحتاج ج/٢ ص ٣٧٤، لەگەڵ (عمدة القاری ج/١٢ ص ٢٠٣) ئەم ساخکردنەوەو، وردەکارییە زۆر پێویستە چونکە هەڵە بژێری ئەصڵەکەیشی پێ دەکرێ.

- وەرگێڕ -

مالآت ئاوبدات، کەسێکی تر دوا ئەو هات بەلآم خۆی پێویستی بە ئاو خواردنەوەبوو، ئەوە ئەوەیان وەپێش دەخرێ کە خۆی ئاو دەخواتەوە، هەر کەسێ ئەندازەیەك لەو ئاوە بەرەللآیە بکاتە قاپێکەوە دەبێ بەهی خۆی، هەروەها ئەگەر بەجۆلەیەکدا بیهێنیو بیکاتە ناو حەزێکەوە کە لەبەری نەڕوا ئەویش دەبێ بە مالّی تایبەتی خۆی.

**دووەم:** ئاوە تایبەتەکانە، وەك بیرو کارێزو جۆگە، جا ئەگەر کەسێ بیرێ لە ملکی خۆیدا هەلّ بکەنێ، ئاوەکەی دەبێ بەهی خۆی، چونکە بەشێکە لە بەهرەی ملکەکەی، دەق وەك بەری داری باخەکەی، وەرێك وەکوو ئەو کانی زێڕو زیوەی کە لەناو ملکەکەیدا دەردەکەوێ، کەواتە: کەس مافی ئەوەی نیە کە بەبێ رەزای خۆی لێی ببات. گوتراویشە: کە ئاو نابێ بە ملکی کەس، چونکە پێغەمبەر {دروودو سلآوی لەسەربێ} فەرموویەتی: موسولّمانان لەم سێ شتەدا هاوبەشن: لە ئاوو لەوەڕو ئاگردا. (ئەبو داوود گێڕاویەتەوە) قسەی ئەم قیلە بەرپەرچ دراوەتەوە بەوە: کە ئەم فەرموودەیە لاوازە لەبەر ئەوە دەست نادا بۆ بەلّگە. بەهەر حالّ لەسەر هەردوو فەرمایشتەکان، پێویست نیە لەسەر خاوەن بیرەکە، کە ئەو ئاوەی لە پێداویستی خۆی زیاد بێ، بیبەخشێ بە کەسێ کە کشتوکالّی پێ ئاوبدا، بەلآم ئەگەر بۆ ئاودانی گیانلەبەرو مالآت بوو ئەوە پێویستە لەسەری کە بیبەخشێ چونکە شافیعی لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: {درودی خوای لەسەربێ}: کەسێ زیادە ئاوی هەبێو قەدەغەی بکا لە مالآتی موسولّمانان، هەتا ببێ بەهۆی قەدەغەبوونی زیادە لەوەڕی دەورو بەری ئاوەکە، چونکە لەوەڕگای دوورە ئاو بە کەلّکی لەوەڕانی ئاژەلّ نایەت، کەسێ ئەم تاوانە بکا خودای گەورە لە رۆژی قیامەتدا لە بەهرەی میهرەبانی خۆی بێ

بەشی دەکا. لە بوخاری‌و موسلیمیشدا دەفەرموێ: ئاوێ زیادبێ لە خۆتان، لە خەڵکی تری قەدەغە مەکەن، هەتا بەم تەگەرەیە زیادە لەوەڕی دەوری ئاوەکەی پێقەدەغە بکەن. جیاوازیی ئاژەڵ‌و کشتوکاڵ لەوەدایە، گیان ڕێزی هەیە، بە بەڵگەی ئەوە کە ئاودانی گیانلەبەر پێویستەو ئەرکێکی ئایینییە بەڵام کشتوکاڵ مەرج نیە وابێ.

## مەرجەکانی پێویستبوونی بەخشینی ئاو:

**یەکەم**: دەبێ لە پێداویستیی خۆی زیاتربێ، دەنا پێویست نیە، چونکە لە خودی خۆیەوە دەست پێ دەکا بە بەکار هێنان‌و بەخشینی.

**دووەم**: خاوەن ئاژەڵەکەیش ئاتاجێی بەو ئاوە هەبێ، بەم ڕەنگە: ئاوی بەرەڵڵای گشتی لەو ئاقارەدا نەبێ.

**سێیەم**: لەو ئاقارە لەوەڕ هەبێ، بەبێ ئاو خواردنەوە ئاژەڵ نەتوانی لێی بلەوەڕێ.

**چوارەم**: دەبێ ئاوەکە لە جێ وەستانی ئاسایی خۆیدابێ، لەو جۆرەیش بێ کاتێ لێت هەلگۆزی بێتەوە جێی. بەڵام ئەگەر کردیە ناو دەفرەوە، لەسەر فەرمایشتی دروست (قەولی صەحیح) ئیتر پێویست نیە لە سەری کە بەخۆڕایی بیبەخشێ. ئەوەنە هەیە هەر کاتێ بڕیاردرا کە پێویستە لە سەری کە بیبەخشێ، نابێ لەباتی ئەو ئاوە وەجەڵ‌و بەها وەربگرێ، دەبێ بەخۆڕایی بیبەخشێ، ئەمەیش بەپێی ئەم فەرموودە ساغە کە دەفەرموێ: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەربێ) نەیی کردووە لە فرۆشتنی ئاوی زیادە. هەرکاتێکیش بەخشینی ئاو واجب نەبوو لەسەر خاوەنەکەی، ئەوە دروستە بۆی کە بەکێشانە یا بە پێوانە بیفرۆشێ بۆ خۆی.

## ٢٣٧) وەقف: شت تەرخانکردن بۆ خێری نەبڕاوە:

وەقف لە زمانی عەرەبیدا ڕاگرتن و حەپس و گل دانەوەو بەندکردنە، لە عورفی شەرعیشدا: تەرخانکردنی سامانە بۆ خێری نەبڕاوە لە ڕێگەی خودادا، بە مەرجێ لەو جۆرە سامانانە بێ کەڵك و قازانج لێ وەرگرتنی مومکین بێ و زاتەکەی بمێنێ! سەر بەڵگەکەی ئەم ئایەتەیە کەوا لە سوورەتی حەجدا، کە ژمارەکەی (٧٧)ە کە دەفەرموێ: {وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} واتە: لە کرنی هەموو جۆرە چاکەیێ درێغی مەکەن، سابەشکوو شادبن بە مایەی ڕەزابوونی خوا. وە ئەم فەرموودەیشە کە دەفەرموێ: کاتێ ئادەمیزاد دەمرێ، هەموو کردەوەیەکی کۆتایی دێ، ئەم سێ شتە نەبێ:

**یەکەم**: خێرێکی نەبڕاوە (وەك بیرو مزگەوت..).

**دووەم**: زانست و زانینی بە سوود (وەك دانانی کتێبی باش و پێگەیاندنی فەقێ و قوتابی و شاگردو هونەری بەکەڵك و بە سوود بۆ گەلی ئیسلام).

**سێیەم**: منداڵ و وەچەیەکی باش کە دووعای خێرو نزای باشی بۆ بکا (موسلیم و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە).

زاناکان دەفەرموون: وەقف بەشێکە لە خێری نەبڕاوە. جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: کەس نەما لە هاوڕێیانی پێغەمبەر {دروودی خوا لەسەر پێغەمبەر بێ و ڕەزای خوا ە هاوڕێیانی} کەشتێکی نەکرد بێ بە وەقف، مەگەر ئەوانەیان کە توانای سامانییان نەبووبێ!.

**مەرجەکانی:**

**بۆ دروستبوونی وەقف ئەم سێ مەرجە بە مەرج گیراون.**

**یەکەم**: دەبێ وەقف کراو لەو جۆرە سامانانەبێ، کە دەست بدا بۆ کەڵك لێ وەرگرتن‌و لە هەمان کاتدا زاتەکەی بمێنێ. کەواتە: وەقفی ئەو شتە دانامەزرێ، کە هەتا زاتەکەی بمێنێ کەڵکی لێ وەرناگیرێ، وەك بەرو میوەو خۆراك‌و بۆنپێوەکراو، چونکە میوەو بەرو خۆراك دەخورێن، کەڵکەکەیان لە خواردنیان دایە، دەی کاتێ دەخورێن زاتەکەیان نامێنێ. بۆنپێوەکراویش ئەوەندە ناخایەنێ، بەڵام ئەگەر دارو درەختی کرد بە وەقف بۆ بەرەکەی، یا ئاژەڵ بۆ شیرەکەی، یا بۆ خوری‌و کۆڵك‌و مووەکەی، یا نێری بۆ پەڕین لە ئاژەڵی شار، ئەوە دروستە، چونکە لەکاتی وادا وەقف کراوەکە زاتەکانە، بەروکۆڵك‌و پەڕین کەڵکیانن، وە سوودەکانی تری ئەم زاتانە بۆ وەقفکەرە، بۆ نموونە: ئەگەر مەڕێکی کرد بە وەقف، تەنیا بۆ ئەوە کە شیرەکەی بۆ هەژاران بێ، ئەوە خوری‌و بەچکەو کەوڵ‌و گۆشتەکەی بۆ وەقفکەرەکەیە.

**دووەم**: دەبێ وەقف کردنەکە لەسەر شتێکی وابێ کە هەبوونێکی نەبڕاوەی هەبێ، وەك ئەم بنەچە لە ئێستاداو وەچەی بەرودوای بەردەوام لە ئایندەدا چونکە وەقف خێری بەردەوامی نەبڕاوەیە، سەرەڕای ئەوەیش وەقف لە زاتی خۆیدا راگوێزکردنی ملکایەتیی قازانجە، کە وەقفکەرەوە بۆ وەقف لە سەرکراو، دەی شتێ کە وجوودی نەبێ‌و هیچ (مەعدووم) بێ ناکرێ بە خاوەنی شت، هەروا کەسێکیش کە شیاوی خاوەنێتی نەبێ ناکرێ بە خاوەن شت.

**نموونەی یەکەم:** کە نەبووە ( واتە: معدوم)ە نابێ بەوەقف لەسەر کراو، وەکوو وەقفکردن لەسەر کەسێ کە هێشتا لەدایك نەبووبێو لەمەولا بکەوێتە سکی دایکیو لە دایك ببێ، جا لە دوا ئەو بۆ هەژاران بێ.

**نموونەی دووەم:** کە کەسێ شیاوی خاوەنێتی نەبێ نابێ بە وەقف لە سەرکراو، وەکوو منداڵ لە سکی دایکدا، جا ئەم جۆرە وەقفانە پووچەڵن، چونکە وەقف بە ملککردنی حازری دەس بەجێیە کەواتە لەسەرکەسێ کە نەبوو (مەعدووم) بێو لەسەر کەسێ کە شیاوی خاوەنێتی نەبێ دانامەزرێ.

**سێیەم:** نابێ بۆ شتی ناڕەوابێ، چونکە وەقف خێرێکە مەبەست لێی نزیکبوونەوەیە لە خوا، گوناهیش پێچەوانەی ئەم مەبەستەیە، کەواتە: شت وەقفکردن بۆ کڕینی ئامێری ڕێگریو چەتەگەری دروست نیە، هەروا بۆ کڕینی ئامێری بەزمو ڕەزم، هەروا دروست نیە شت وەقف بکرێ بۆ کنیشتەی جوولەکەو کڵێسای گاوور ئەم جۆرە جێگایانە.

## پەیڕەوی مەرجی وەقفکەر دەکرێ:

جا هەر کاتێ وەقف دامەزراو هەموو مەرجێکی هاتە جێ، ئیتر یەکسەر وەقف لەسەرکراو شایانی بەرووبوومەکەی دەبێ، خواە کەڵك بێ وەك تیادانیشتنو خوێندنەوەی پەڕاو، خواە زات بێ وەك مێوەو خوریو موو وشیر، لە هەمان کاتدا دەبێ ئەم قازانجانە ڕێك بەپێی مەرجی وەقفکەر بدرێن بە خاوەنیان، وەقفکار کێی پێشخست ئەو کەسە پێش دەخرێ، وەکێی دواخست ئەو کەسە دوا دەخرێ، ئەگەر گوتی: بە یەکسانی دابەشبکرێ بە سەریانا بە یەکسانی دابەش دەکرێ، ئەگەر

گوتی: هەندێ بەش زیاتر بێ، چۆن دەڵێ بەپێی مەرجەکەی ئەو دابەش دەکرێ لێیان. نموونەی پێشخستن وەك ئەوە بڵێ: ئەمەم لەسەر منداڵەکانم وەقفکرد، لە پێشدا بۆ زاناو خاوەن وەرعەکانیان، نموونەی دواخستن وەك ئەوە بڵێ: ئەمەم لەسەر منداڵەکانم وەقفکرد، کە ئەوان نەمان ئەوجا بۆ منداڵی ئەوان، یا وەك ئەوە بڵێ: دەرامەتی ساڵی یەکەم بۆ مێیینەکانو دەرامەتی ساڵی دووەم بۆ نێرینەکان، نموونەی یەکسانی وەك ئەوە بڵێ: ئەمەم وەقفکرد لەسەر منداڵەکانم، بە مەرجێ نێرو مێ وەك یەك بەشیان بۆ دابنرێ، نموونەی باودانی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریانا وەك ئەوە بڵێ: ئەمەم کرد بە وەقف لەسەر منالەکانم بەمەرجێ بەشی نێرینە دوو ئەوەندەی بەشی مێیینە بێ.

## ٢٣٨) باسی بەخشین (هبە):

بڕ: تجريد/ ٣ ل ١٨٦ ز: ٥٥).

بەخشینو دیاری لە زمانو لە شەرعا بە یەك واتان تەنیا ئەم جیاوازییانەیان لە نێوانا هەیە: ئەگەر بۆ ڕێزگرتن لەو کەسەی کە دەبێ بە خاوەنی برا بۆی ئەوە دیارییە، دەنا بەخشینە. بەخشین سوننەتە بەپێی نامەی خواو ڕێبازی ڕەهبەرو یەکگرتنی نەتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى – سورة المائدة – ٢/٥} واتە: هاوکاری یەکتری لەسەر کاری چاکەو لە خوا ترسی بکەن. دیارە کە بەخشین کارێکی باشو پەسەندە، لە ڕێبازی ڕەهبەردا (واتە: لە سوننەتی پێغەمبەردا {درودی خوای لەسەربێ} نموونە زۆر زۆرە لەسەر سوننەتیی بەخشین، عائیشە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد ئەم

گۆشته به زەکات داویانـه بـه بـەریرەی کارەکـەرم، ئایا تـۆ لێـی دەخـۆی؟ فـەرمووی: ئەمـە بـۆ ئـەو زەکاتـە، بـەڵام بـۆ ئێمـە دەبـێ بـە دیـاری و لـە زەکاتی دەردەچێ (ش/د/ن). ئەبو هورەیرەیش {رەزای خوای لێبێ} دەفـەرموێ: جاران که نانیـان بـۆ پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} دادەنـا دەیپرسـی، کاتـێ دەیانگوت: هی دیارییە، لێی دەخوارد، بەڵام ئەگەر بگوترایە: هـی زەکاتـە لێی نەدەخوارد.

## مەرجی بەخشراو:

هەرچی فرۆشتنی دروست بێ بەخشینیشی دروستـە، وە ئـەوەی فرۆشتنی دروست نـەبێ بەخشینیـشی دروست نیـە، وەك شـتی نـەزانراو، وەك ئەوە بڵێ: ئەوە یەکێ لەو بڕگە مەڕەم بەخشی بە تۆ،

هەروا بەخشینی بارمتـە سـەگی مەشـق نـەکردوو و بـەرازو شـتی بزربـوو دروسـت نیـە، چـونکە فرۆشـتنی ئەمانـە دروسـت نیـە، دروسـتە زەوت کراو بفرۆشرێ بە کەسێ کە بتوانێ بیسەنێتەوە لە زەوتکەر، شـتی هاوبـەش و نـاو کـۆیی بەخـشینی دروسـتـە، چ بفرۆشـرێ بـە هاوبـەش، چ بفرۆشرێ بە کەسێکی تر.

## بەخشراو تا وەرنەگیرێ نابێ بە ماڵ:

بەخشراو نـەپێویست دەبێ و نـە دەبـێ بـە مـاڵ هـەتا وەرنـەگیرێ، عائیـشه {رەزای خـوای لێبـێ} فـەرمووی: بـاوکم لـە باخەکـەی غابـەی، بیـست وەسقی پـێم دا کـە بـیڕنم بـۆ خـۆم، لـە نەخۆشـینی سـەرەمەرگا پێـی فەرمووم: کچی خۆم من لەبەری باخەکەی غابـەم بیـست وەسقم دا بـوو بـەتۆ، کـە بـۆ خـۆت بیڕنـی، بریـا دەتڕنـی و دەتـبرد بـۆ لای خـۆت، ئێـستا

دەبوو بەهی خۆت، بەڵام مادام هەتا ئێستا وەرت نەگرتووە تازە بوو بە ماڵی میراتبەر![1].

دەی ئەگەر لە شت بەخشیندا بوون بە ماڵ نەبەسرایە بەوەرگرتنەوە ئەبو بەکری صدیق بە عائیشەی نەدەفەرموو: تازەبوو بە ماڵی میراتبەر لەهی تۆ دەرچووو!.

عومەریش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: بەخشراو نابێ بەماڵی تەواو هەتا پێبەخشراو وەری نەگرێ، هەمان را لە عوسمانو ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباسو ئەنەسو عائیشە {رەزای خوایان لێبێ} گێڕدراوەتەوە، رای تر نەبیستراوە کە پێچەوانەی رای ئەمان بێ.

بەبێ فەرمانی ماڵبەخش وەرگرتنی بەخشراو دانامەزرێ چونکە وەرگرتن دەبێ بەهۆی گواستنەوەی خاوەنێتی. جا هەر کاتێ وەرگرتن رووی دا بەخشراو دەبێ بە ماڵ، ئیتر ماڵبەخش مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نیە، مەگەر لە یەك حاڵدا ئەویش ئەوەیە کە بەخشندەکە باوك بێ، یا دایك بێ، یا باپیر بێ یا نەنك بێ، سەربەڵگەی ئەمەیش ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە {درودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ شتێ ببەخشێ، یا دەسەنەیێ بدا بەکەسێ، دروست نیە بۆی کە پەشیمان ببێتەوەو بیسەنێتەوە لە پێبەخشراو، مەگەر باوكو دایك، بۆ ئەوان دروستە لەو

---

[1] بۆ راستکردنەوەی وشەی (جذاذ) بە (جداد) لەم ئەسەرەدا، تەماشای ماددەی (جدد) لە (النهاية في غريب الحديث والاثر)ی و ج/١٣ چ ١٤٧ و ص ١٥٦ لە (عمدة القاری شرح صحيح البخاری) بکە.

— وەرگێڕ —

بەخشینەی داویانە بە منالّی خۆیان پەشیمان ببنەوە. (ئەبو داوودو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە) تیرمیذی فەرموویەتی: فەرموودەیەکی جوانی ساغە. لە دەقی فەرموودەکەدا ناوی باوكو دایك هاتووە، باپیریش بەر ناوی باب دەکەوێو نەنکیش بەر ناوی دایك دەکەوێ.

## ٢٣٩) باسی عومراو روقبا: با بە کوردی ناویان بنێین: ژێنەبەخشو تەمابەخش:

عومرا لە عومر وەرگیراوە، کە بەواتا تەمەنو مانو ژیانە، بۆیە وای پێدەگوترێ چونکە لە سەردەمی نەزانیدا دەیانگوت: ئەم شتە بۆ تۆ هەتا ماویت، واتە: لە ماوەی تەمەنتا، هەتا لە ژیاندابیت بۆ خۆت، روقبایش کە لەسەر کێشی عومڕایە، لە ماددەی (موراقەبە) وەرگیراوە، کە بەواتا چاوەنوارییە، وەك ئەوە پێی بلّێ: ئەمەم بەخشی بەتۆ هەتا خۆت ماویت بۆ خۆت، بەلاّم ئەگەر من لە پێش تۆدا مردم ئەوا بە یەکجاری بۆ خۆت، ئەگەر تۆیش لە پێش مندا مردیت ئەوا ببێتەوە بەهی خۆم، دەی بەم شێوەیە هەردوولا چاوەڕوانی مردنی یەك دەکەن.

**گوتەی کورتو پوخت:** گەرچی ئەم باسە درێژەپێدانی تیادایە، بەلاّم ئەمە کاکلّەی ئەم بابەتەیە: گوتەی دامەزران کەپێی دەگوترێ صیغە، لە عومرادا وەك: (أعمرتك هذه الدار حیاتك) ئەم خانووەم بەخشی بەتۆ هەتا ماویت، یا پێی بلّێ: (ما حَییتَ: هەتا لە ژیاندا بیت) یا پێی بلّێ: (ما عشت: هەتا کۆتایی تەمەنت) یا پێی بلّێ: (أعمرتك هذه الدار حیاتك ولعقبك من بعدك: ئەوا ئەم خانووەم

بەخشی بەتۆ هەتا تەمەن تەواو دەبێ، وە لەپاش مردنی خۆت بۆ وەچەو نەوەت) لەروقبایشدا گوتەی دامەزران وەك: (أرقبتك الدار حياتك) واتە: ئەم خاووەم دا بەتۆ هەتا ماویت بۆ خۆت، هەردوولامان چاوەنوارڕ دەکەین، ئەگەر من لەپێش تۆ دامردم بە ئێکجاری ببێ بەهی خۆت، ئەگەر تۆیش لە پێش مندا مردیت ببێتەوە بەهی خۆم. جا هەر کاتێ عومراو روقبا لەسەر شێوەی شەرعی دامەزران، ئیتر شتە بەخشراوەکە هەتا هەتایە دەبێ بەهی پێبەخشراو، وە بە هێچ جۆرێ نابێتەوە بەهی بەخشندە، کە بەعرەبی پێی دەگوترێ: موعمیر، یا مورقیب. چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: عومرا دروستەو روقبایش دروستە، وەدەبن بەهی ئەو کەسە کە پێی بەخشراوە. (ئەبو داوودو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە) تیرمیزی فەرموویەتی: فەرموودەیەکی جوانە. هەروا خۆشەویست {درووودو سەلاوی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ شتێ لەسەر شێوەی عومرا ببەخشێ بە کەسێ ئەوە هەم لە حاڵی ژیانو هەم لە حاڵی مردندا دەبێ بە ماڵی پێ بەخشراو، وە لە پاش خۆشی دەبێ بەهی وەچەی (موسلیم — {رەزای خوای لێبێ} گێڕاوەیەتەوە).

## ٢٤٠) باسی هەڵگرتنی شتی داکەوتوو (لقطة):

(بڕ: تەجرید/ ٣ت – ١٤٩ – ز: ٥٠).

داکەوتە لە زمانا بەشتێ دەگوترێ کە لە کەسێ داکەوتبێ لە عورفی شەرعی شەریفدا برێتییە لە ماڵێ، یا لە تایبەتمەندێ (ئیختیصاصێ) کە خاوەن ڕێزو بایەخو نرخدار بێ، کە بەهۆی

بێئاگاییەوە لە شوێنێکا بەجێ مابێ کە شوێنی ئاسایی ئەوشتە نەبێ، بەو مەرجە ئەو کەسە کە شتەکە دەدۆزێتەوە خاوەنەکەی نەناسێو شتەکەیش بەهێز خۆی پێ ناپارێزێو بۆیەکێ لەم دوو مەبەستەیش هەڵی بگرێتەوە: یا بۆ پاراستنی یا بۆ کردنی بە ماڵ بۆ خۆی، بەڵام لەپاش جاڕدانی ناونیشانی بەشێوەی شەرعی.

سەر بەڵگەی ئەم باسە چەند فەرموودەیەکی ساغە. لە زەیدی کوڕی خالیدی ئەل – جوهەنییەوە – {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: هەر کەسێ گومبوویێ بدۆزێتەوەو حەشاری بداو ناونیشانی وەك شەریعەت دەفەرموێ: هەڵ نەدا، ئەوە خۆشی ڕێی ڕاستی گوم کردووە (موسلیم/ ئەحمەد) دیسان زەید فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەت حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} عەرزی کرد: حوکمی ماڵی دۆزراوە، وەك زێڕو زیو چییە؟ فەرمووی: پڕیاسکەو بوخچەو دەمبینەکەی نیشانە بکە. وە هەتا ساڵێ ناونیشانی هەڵبدە، جا ئەگەر لەو ماوەیەدا خاوەنەکەی پەیدابوو ئەوە بیدەرەوە پێی، ئەگینا چی لێ دەکەی بیکە، بەڵام ئەگەر ناونیشانیت هەڵ نەدا ئەوا لەلای خۆت بیهێڵەرەوە، وە داینێ بە سپاردە لەلای خۆت، ئیتر هەرکاتێ ڕۆژێ لە ڕۆژان خاوەنی هاتو داوای کردەوە بیدەرەوە پێی. پیاوەکە گوتی: ئەی بڕیاری وشتری بزربوو چییە؟ فەرمووی: دەخڵت نەبێ بەسەریەوەو دەخلی مەکە، ئەو کوندەو پێڵاوی خۆی پێیە، بۆ خۆی ئاوی دەخواتەوەو دەلەوەڕێ، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە! پرسیار کەرەکە لیشی پرسیو گوتی: ئەی بڕیاری بزنو مەڕی ونبوو چییە؟ فەرمووی: ئەگەر تۆ نەیبەیتو خاوەنەکەی نەیدۆزێتەوە دیارە گورگ دەیخوا! (شەیخان).

**بڕیارەکەی:**

موسـولمانان بـه یـەکرا دەفـەرموون: هەلگرتنـەوەی دۆزراوە دروستە. بەلام ئایا سوننەتە یا پێویستە؟ تەماشا دەکرێ: ئەگەر ماڵ دۆزەرەوە بەدکار بوو قەدەغە دەکرێ لە هەلگرتنی، تەنانەت ئەگەر بەدکار (فاسق) دۆزراوەیەکی هەلگرتەوە قازی لێی دەستێنێتەوە، وەك ماڵی منالی خۆیشی لێ دەستێنێتەوە: بەلام ئەگەر ماڵ دۆزەرەوە ئازادو فامیدە بوو، وە لەخۆی دلنیابوو کە ناپاکی لێ ناکاو حەشاری نادا، ئەوە لەم حالەدا حوکمەکەی ئاوایە:

**یەکەم**: ئەگەر لە شوێنێکی ئەمینا دۆزییەوە، کە مەترسی فەوتانی نەبوو، چونکە خەلکەکەی دەسپاكو ئەمیندار بوون، لە هەمانکاتدا ئەو جێگەیە نە ملکی کەسێ بوو، وە نە خاکی دوژمنی ئیسلام بوو، کە پێی دەگوترێ داری حەرب، ئەوە وا باشە بۆی کە هەلی بگرێ بەپێی ئەم حەدیثە (خوا لە پشتی ئەو بەندەیە کە پشتی برای دەگرێ).

**دووەم**: ئەگەر لە جێگەیەکی وادا دۆزییەوە کە دلنیانەبوو لە نەفەوتانی، ئەوە پێویستە لەسەری کە هەلی بگرێ، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: {وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – سورة التوبة – ٧١/٩} واتە: بڕواداران، نێرو مێیان، لەناو خۆیانا، پشتو پەنای یەکترین، دەشێ چاو دێری بەرژەوەندی یەکتری بکەن). لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەم راستەقینەیە دەردەکەوێ: هەروەکوو چۆن پێویستە لەسەر هەقداری هەتیو ماڵو سامانی بە جوانی بپارێزێ ئاوایش

پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە سەرو ماڵو نامووسی هەموو موسوڵمانێکی تر بپارێزێ، چونکە موسوڵمان هەقداری موسوڵمانە، هەرکامیان حازر نەبوون ئەوی تریان پاسەوانی سەرو ماڵو نامووسیەتی.

سەرەڕای ئەوەیش دەبێ ماڵ دۆزەرەوە لە خۆی دڵنیا بێ کە هەرکاتێ خاوەنەکەی پەیدابوو بیداتەوە دەستی، بە مەرجێ بیناسێتەوەو ناونیشانی هەڵبدا، دەنا نابێ هەڵی بگرێتەوە. گوتراویشە: لە سەری نیە لە هیچ بارێکا کە هەڵی بگرێ، ئەوپەڕەکەی ئەوەیە کە هەڵگرتنەوە سوننەتە، چونکە هەڵگرتنەوەی دۆزراو یا ئەمانەتە، یا کاسپییە، ئەو دووەیش هیچ کامیان واجیبو پێویست نین. ئەمە قسەمان لەوەیە کە لە چۆڵەوانیو وێرانەو سەرە ڕێشت بدۆزێتەوە ئەمە حوکمەکەی بوو، دەنا ئەگەر لەناو ملکی کەسێکا دۆزییەوە ئەوە دروست نیە بۆی هەڵی بگرێ، چونکە وادەردەکەوێ کەهی خاوەن ملکەکە بێ.

## ئەو زانیارییەی لە بارەی داکەوتەوە پێویستە :

پێویستە لەسەر ئەو کەسە کە شتێ دەدۆزێتەوە دەفرو پریاسکەو دەرگا بێنو جۆرو ژمارەو کێشی بزانێو ئەوجا لە جێگەی ئاسایی خۆیا هەڵی بگرێ. زانینی پریاسکەو دەرگابێنەکەی بەپێی ئەو فەرموودەی کە رابورد لە سەرەتای باسەکەوە، زانینی ژمارەکەی بەپێی ئەم فەرموودەیەی بوخارییە کە ئەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پریاسکەیەکم دۆزییەوە سەد دیناری زێڕی تیادا بوو. بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: یەك ساڵ ناوو نیشانی هەڵدە. جا

یەك ساڵ ناونیشانیم هەڵدا، ئەوجا چوومەوە خزمەتی، فەرموویەوە: ساڵێکی تریش ناونیشانی هەڵدە. منیش وامکردو دیسان چوومەوە خزمەتی، فەرموویەوە: ساڵێکی تریش ناونیشانی هەڵبدە. منیش وامکرد لە جاری چوارەما فەرمووی: ژمارەکەی بزانەو دەرگابێنەکەی نیشانە بکە، جا ئەگەر خاوەنەکەی پەیدابوو ئەوە هی خۆیەتی دەنا بیکە بە هی خۆت. زانینی نیشانەکانی تریشی بەقیاس لەسەر ئەم نیشانانە، چونکە بەوانیش دەق وەك ئەمان شتەکە دەناسرێتەوە، بۆیەیش دەبێ لە جێگەی ئاسایی پاراستنی وێنەی خۆیدا هەڵبگیرێ چونکە سپاردەیە، هەموو سپاردەیەکیش ئاوایە.

## ئەگەر ویستی بیکا بە ماڵی خۆی:

شت دۆزەرەوە ئەگەر مەبەستی ئەوەبوو کە شتەکە ئاگاداری بکا بۆ خاوەنی هەتا پەیدا دەبێ ئەوە پێویست نیە لەسەری بانگەوازی بۆ بکا، بەڵام ئەگەر نیازی هەبوو کە بیکا بەهی خۆی ئەوە دەبێ بە لایەنی کەمەوە یەك ساڵ ناونیشانی هەڵبدا، بەپێی فەرموودەکەی پێشەوە. جاڕدانیش دەبێ لە بەردەرگای مزگەوتدا بێ، لەکاتی هاتنەدەرەوەی خەڵکەکەدا، وە لەناو بازاڕدا، کەجێ گومانی کۆبوونەوەیە، وە لەو شوێنەدا کە تیادا دۆزراوەتەوە، چونکە خاوەنەکەی ئەوێی بۆ دەگەڕێ. چونێتی جاڕدانیش لەسەر ئەم شێوەیە: بڵێ: کێ شتی لێ بزربووە؟ وا سونەتە هەندێ نیشانەی بڵێ، بەڵام نابێ گشت نیشانەکانی هەڵبدا، دەنا ئەگەر دروزنێ کردی بەهی خۆی ئەوە دەبێ بە دەستەبەری، مەرج نیە سەرومڕ ساڵەکە هەر جاڕبدا، بەڵکوو لە سەرەتاوە هەموو ڕۆژێ سێ جار

بانگەواز هەڵ بدا لەپاشا هەموو رۆژێ یەکجار، لە پاشا هەموو حەفتەیێ یەك جا، لەپاشا لە گشت مانگێکا یەك جار، لەسەر شێوەیەکی وا دووبارەی بکاتەوە کە لەبیر نەچێتەوە هەتا ساڵەکە تەواو دەبێ.

بەڵام ئەگەر شتێکی وای درۆزییەوە کە نەدەکرا بەماڵ ئەوە جارِی بۆ هەڵنادا، ئەگەر دەکرا بەماڵ، بەڵام کەمبوو، ئەوە ئەوەندە ناونیشانی هەڵدەدا کە بەزەینی زوربەی کات خاوەنی لەوەدوا بۆیناگەرِێ، کە ئەوەیە خاوەنەکەی زۆر بۆی پەرۆش نەبێو زۆر بە دوایا نەگەرِێ. جا پاش ئەوە کە بانگەوازی بایەخداری بۆ کرد، وەخاوەنەکەی پەیدانەبوو، وە ویستی بیکا بەهی خۆی دەبێ بەهی خۆی، کە کردی بەهی خۆی دەبێ بە قەرز بەسەریەوە، ئەگەر دنیا بوو خاوەنەکەی پەیدابوو، ئەگەر دۆزراوەکە وێنەدار بوو بلاّم نەمابوو ئەوە، دەبێ بەدەستەبەری وێنەکەی، دەنا دەبێ بە دەستەبەری نرخەکەی بەپێی نرخی ئەو رۆژەی کە تیادا کردوویەتی بە ماڵی خۆی، ئەگەر خودی دۆزراوەکە مابوو، وە نەنگداریش نەبوو بوو ئەوە دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

## بەشەکانی داکەوتوو:

### داکەوتوو دەبێ بە چوار بەشەوە:

**یەکەم**: ئەوەیە کە هەمیشە دەمێنێ، وەك زێرِو زیوو شتی تری وا، حوکمەکەی ئەوەیە یەك ساڵ ناونیشانی لەسەر شێوەی پێشەوە هەڵبدا.

**دووەم:** ئەوەیە ئەگەر دۆزراوەكە زۆر نەدەمایەوە سەرنج دەدەین: ئەگەر زوو خراپ دەبوو، وەك كەبابو تكەو شووتیو كاڵەكو سەوزەوات و فەریكە خورمایێ كە نەكرێ بە خورما، ئەوە دۆزەرەوەكەی دەكرێ بە سەپشك لە نێوانی ئەوەدا كە بیخوات و بەهاكەی دەستەبەربێ، یا بیفرۆشێو بەهاكەی وەربگرێو لە پاش ناونیشان هەڵدانی ئاسایی بەپێی حاڵ تەصەروفی تیادا بكا، چونكە بەهاكەی لە شوێنی دۆزراوەكەیە، ئەگەر نیشانی هەڵنەدات دەبێ بە دەستەبەریو، ئەمانەت دەبێ لە دەستیدا. بەلاّم ئەگەر دۆزراوەكە زووخراپ نەدەبوو، وە قابیلی ئەوە بوو كە چاك بكرێ، وەك رووتابێ كە بكرێ بە خورما، یا ترێیەك بكرێ بە مێووژ، یا شیرێ بكرێ بە پەنیر، یا شتی تری وا، ئەوە لەكاتی وادا سەیری بەرژەوەندی خاوەنەكەی دەكرێ، ئەگەر بەرژەوەندی خاوەنەكەی لە فرۆشتنیدابوو ئەوە دەفرۆشرێ، ئەگەر لە وشك كردنەوەدا بوو ئەوە وشك دەكرێتەوە. جا ئەگەر دۆزەرەوەكەی بە پیاوەتی وشكی كردەوە ئەوا باشە، دەنا دەبێ هەندێكی لێ بفرۆشێ بۆ مەسرەفی وشك كردنەوەكەی چونكە بەرژەوەندی خاوەنەكەی لەوەدایە. بەلاّم ئەم درێژەپێدانە بۆ غەیری ئاژەڵو گیانلەبەرانە، چونكە وڵساتو مالاّت دەبێ هەمووی بفرۆشرێ لەبەر ئەوەی مەسرەفی حەیوانات پەیتاپەیتا دووبارە دەبێتەوە، ئەوەیش دەبێ بەهۆی ئەوەكە ماڵەكە بە مەسرەف لێكردنی تەواو بێ.

**سێیەم:** دۆزراوی وا هەیە پێویستی بە مەسرەف هەیە وەك وڵسو مالاّت (حەیوان) حەیوانیش لەسەر دووجۆرە:

۱) **جۆری یەکەم بێهێزە**: ئەوەندە هێزی نیە کە خۆی پێ رزگار بکا لە وردە دڕندە، وەك مەڕو بزن و گوێرەکەو بەچکە وشتر، وشترو رەشەوڵاخ ئەگەر سەقەت بوون باگەورەیش بن لە ریزی بێهێزن، ئەم جۆرە بۆی هەیە دەستی بەسەردا بگرێ، بە نیازی گردن بە ماڵ، چونکە ئەگەر هەڵی نەگرێتەوە، لە نێوانی ئێمەو دڕندەدا دەفەوتێ، دووریش نیە دەسپیسێ بیبا بۆ خۆی، لەبەر ئەم مەبەستەیە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بزن و مەڕی گومبوو یا بۆ تۆیە کە دەیدۆزێتەوە، یا بۆ خاوەنەکەیەتی کە برای تۆیە، یا بۆ گورگە. جا ئەو کەسەی ئەم جۆرە گیانلەبەرە هەڵ دەگرێ خۆی سەرپشکە کە یەکێ لەم سێ شتە بکا:

**یەکەم**: دەست بەجێ بیخواو هەرکاتێ خاوەنەکەی دەرکەوت قیمەتەکەی ببژێرێ بۆی.

**دووەم**: رای بگرێو بە پیاوەتی بە خێوی بکاو مەسرەفی بکێشێ.

**سێیەم**: دەس بەجێ بیفرۆشێو بەهاکەی هەڵبگرێ.

۲) **جۆری دووەم**: ئەوەیە کە ئەوەندە هێزو توانای هەبێ خۆی پێ بپارێزێ لەوردە دڕندە، خواە بە هێز خۆی بپارێزێ وەك وشتر، یا بە راکردن خۆی قوتار بکا وەك ولاخی بەرزە، هێسترو گوێدرێژیش هەروا، یا بەفڕین خۆی دەرباز بکا، وەك کۆترو شتی وا. جا ئەگەر لە جۆڵەوانی ئەم جۆرە گیانلەبەرەی دۆزییەوە. بۆی نیە بە نیازی کردن بە موڵك هەڵی بگرێ، بەس دروستە بە نیازی پاراستن هەڵی بگرێ، چونکە پێغەبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە بارەی هەلگرتنەوەی وشتری گومبووەوە بە

پرسـیار کەرەکـەی فـەرموو: هـەقت نـەبێ بەسـەریەوە، ئـەو پـیلاوو جەوەنـدەی خـۆی پێیـە هـەتا کۆتـایی فەرموودەکـە. فەرموودەکـە دەقـە لەسەر وشتر، ئەوەیش لە ریزی وشتردایە بە قیاس لەسەر ئەو.

**کەواتە**: ئەگەر بە نیـازی کـردن بـە مـاڵ هـەڵی گـرت، هـەر کاتـێ فـەوتا دەبـێ بـە دەسـتەبەر، چـونکە پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) نـەیی کـردووە لـە هەڵگرتنـەوە لـەکاتی وادا، ئـەوەتا دەفـەرموێ: هـەقت نـەبێ بەسـەریەوە.. تـا دوایـی، کەواتـە هەڵگرتنـەوە لـەکاتی وادا دادەنـرێ بـە کەمتەرخـەمی، کەمتەرخـەمیش دەبـێ بـەهۆی دەسـتەبەربوون، بـەڵام ئەگـەر لـەناو ئاوەدانیـدا ئـەم جـۆرە گیانلەبـەرەی دۆزییـەوە، ئـەوە بـە ئـارەزووی خۆیـەتی، دەتوانـێ بـە نیـازی کـردن بـە مـاڵ هـەڵی بگـرێ، وەدەتوانـێ بـە نیـازی پاراسـتن هـەڵی بگـرێ، جیـایی لـە نێـوانی بیابـانو ئاوەدانیـدا ئەوەیـە: ئـەم جـۆرە ئاژەڵـە لـەناو ئاوەدانیـدا دەسـتی گـشت کەسێکی پێدەگا، لەبەر ئەوە لە وەزەنی دەستپیس رزگـاری نابـێ، کەواتـە هـەتا زووە بەرژەوەنـدی خاوەنەکـەی وادەخـوازێ کـە لـە دەسـتێکی ئەمیندابێ باشترە، بە پێچەوانەی بیابانـەوە، چونکە کـەمتر خـەڵك رێـی تێدەکـەوێ، سـەرەرای ئـەوەیش ئـەم جـۆرە گیانلەبـەرە لـە چـۆڵەوانی هـەوەجێی بەکـەس نیـە، خـۆی خـۆی بـەخێو دەکـا، لـەوەڕ دەخـواو ئـاو دەخواتەوە. ئەوەندە هەیە ئەم راجیاییە کاتێ جێگەی خۆیـەتی کـە دنیـا ئەمنو ئاسایش بێ، بەڵام ئەگەر کات کـاتی تـاڵانو بـڕۆ راوو رووت بـوو ئەوە جیـایی نیـە لـە نێـوانی چۆڵەوانیو ئاوەدانیـدا، لەهـەر دووڵادا وەك یەك هەڵگرتنەوە بەهەر دوو نیازەکە دروستە.

ئەگەر دنیابوو دووکەس داکەوتەیەکیان بە یەکەوە دۆزییەوە، ئەوە هەردووکیان ناونیشانی هەڵدەدەن، وە دەیکەن بە ماڵی خۆیان، کەسیشیان مافی ئەوەی نیە کە مافەکەی خۆی نەقڵ بکا بۆ هاوڕێکەی یا بۆ کەسێکی تر.

**لاباسێ:**

لەکاتی درەوکردندا گوڵەوەچینیو هێشووکردن لەم حاڵانەدا دروستە: ئەگەر خاوەنەکەی رەزای لەسەر بوو، یا ئەندازەیەکی وابوو کە خاوەنەکەی بۆی سەخڵەت نەدەبوو، یا خاوەنەکەی نەیدەچنییەوەو دەس بەرداری بوو بوو، بەڵام ئەگەر ئەندازەیەکی وابوو کە خاوەنەکەی بۆی سەخڵەت دەبوو، یا خۆی دەیچنییەوە ئەوە دروست نیە بۆ بێگانە کە بیچنێتەوە[1]!.

---

(١) لە عیبارەتی ئەصڵەکەدا ئاڵۆزیو هەڵەی چاپ هەبوو، سەرەڕای ئیهامی پێچەوانەی مەبەست ئەمە تەرجەمەی دەقی (كفاية الاخيار)ەکەیە. ئەمە عیبارەتی ئەصڵەکەیە: (ولا يجوز التقاط السنابل وقت الحصاد اذا يأذن فيها مالكها، أو كان قادرا؟ يشق عليه التقاطه، أو كان يلتقطه بنفسه. فاذا أذن مالكها بالالتقاط جاز) دیارە کەخۆی: (أو كان قدرا يشق عليه التقاطه) وە، بەپێی (كفاية) کە لەم سێ کاتەدا گۆڵە وەچنی دروستە: کەم بێ، با ئیزنی صەریحیش نەبێ، کەم بێ یا زۆر بێ، بەڵام خاوەنەکەی دەست بەرداری بووبێ، با رێگەپێدانی ئاشکرایش نەبێ، کەم بێ یا زۆربێ بە مەرجێ خاوەنەکەی رازی لەسەر بێ، لەم دوو کاتەیشا دروست نیە، کەم بێ یا زۆر بێ وە خۆی بیچنێتەوە، زۆر بێ یا کەم بێ وەخاوەنەکەی رەزای لەسەر نەبێ. دەی دەقی ئەصڵەکە نەمانیعەو نە جامیعە بۆ ئەم بەشانە، چونکە پوختەکەی ئەمەیە:

## ٢٤١) منالّی فڕێدراو (لقيط):

منالّی هەلگیراوە، یا منداڵی دۆزراوە، بە هەموو منداڵێکی فڕێدراو دەگوترێ، کە سەرپەرشتیارێکی نەبێ، کە ببێ بەدەستەبەری گوزەرانی، جا خواە فامیدەبێ یانا، چونکە فامیدەیش وەك نافامیدە هەوەجێی بەسەر پەرشتیکردن هەیە، بە وشەی منداڵ رەسیدە دەردەچێ، چونکە پێویستی بە پەروەردەو سەرپەرشتیکردن نیە، بە وشەی دۆزراوە منالّی تری بێ باوكو بێ باپیرو بێ سەرپەرشتیار دەردەچێ، چونکە ئاگاداری منداڵی وا لە پیشەی قازییە، چونکە قازی بەپێی نامەی خوای داناو زاناو، بەپێی سوننەتی پێغەمبەرە نازدرەکەی مەودای ئەوەی هەیە کە بۆ ئەم جۆرە منالّەو بۆ هەموو کەسێکی نەتوانای زەبوون مایەی بەخێوکردنیان بۆ فەراهەم بێنێ، مەبەست لە سەرپەرشتیکار باوكو باپیرەو ئەو کەسەیە کە شوێنی باوكو باپیرە بگرێتەوە.

**بڕیارەکەی:**

هەلگرتنی منداڵی فڕێدراو فەرزی کیفایەیە، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى - سورة المائدة - ٥/٢ ➡}

---

گوڵەوەچنی دروست نییە ئەگەر خۆی دەیچنییەوە، ئەگەر رەزای لەسەر نەبوو، بەلاّم دروستە ئەگەر خاوەنەکەی رەزای لەسەربوو، مەبەست لەم جۆرە شیکردنەوەیە ئەمەیە: (عیبارەتی پەڕاوی شەرع، کاتێ جێگەی متمانە دەبێ، کە کەمو کوڕی زۆرو پەلەپەلی پێوە دیار نەبێ). - وەرگێڕ-

وە لەبەر ئەوەیش کە هیچ نەبێ ئادەمیزادەو قەدرو ڕێزی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە پێویستە بەهۆی پەروەردەکردنەوە گیانی بپارێزرێ‌و چارەسەری حاڵی بکرێ، دەق وەك ناچاری لێقەوماو، بگرە ئەم شیاوترە بە چاودێری، چونکە ناچاری ڕەسیدە ڕەنگە بە فێڵێ خۆی دەرباز بکا، بەڵام مناڵ سەر بەهیچ لایەکا دەرناکا.

جا هەرکاتێ کەسێ کە مەرجی بەخێوکردنی تیادا بوو، منداڵێکی ئاوای هەڵگرت، ئەوە خێرێکی گەورەی دەگاو، گوناهی سەرتیاچوونی ئەو منداڵە لە کۆڵ هەموان دەکەوێ، دەنا هەم ئەوو هەم گشت کەسێ کە پێی بزانێ لە خەڵکی ئەو ناوچەیە تاوانبار دەبن بەهۆی سەرتیاچوونی کەسێکی ڕێزدارەوە.

**مەرجی ئەو کەسەی کە مافی هەیە هەڵی بگرێ:**

**مناڵ هەڵگر دەبێ ئەم چەند مەرجەی تیادابێ:**

**یەکەم:** دەبێ ئەرك لەسەربێ، واتە: موکەللەف بێ کەواتە هەڵگرتنی مناڵ‌و شێت دانامەزرێ.

**دووەم:** دەبێ ئازادبێ، کەواتە بەندە بۆی نیە مناڵ هەڵبگرێ، چونکە هەڵگرتنی مناڵ هەقدارییە، کۆیلەیش ئەهلی ئەو هەقدارییە نیە، تەنانەت ئەگەر کۆیلەیێ مناڵێکی هەڵگرت لێی دەسەنرێتەوە، مەگەر ئاغاکەی ڕێگەی ئەوەی پێبدا، یا دادوەر بیهێڵێتەوە لە دەستیدا.

**سێیەم:** مەرجی ئیسلامە، بێبڕوا نابێ منداڵی موسوڵمانی فڕێدراو هەڵبگرێ، چونکە وەك گوتمان هەڵگرتنی مناڵ هەقداری‌و

خاوەنایەتییە، دەی بێبڕوا شیاوی ئەوە نیەو کافر نابێ بە هەقدارو بە خاوەنی موسوڵمان. بەڵی بێبڕوا بۆی هەیە بێبڕوای منداڵ هەڵبگرێ، بەهەرحاڵ موسوڵمان بۆی هەیە ئەو منداڵە هەڵبگرێ، کە حوکم بە کوفری دەکرێ، چونکە ئەم هەقی سەروەریو سەرداریو هەقداری هەیە بەسەر بێبڕواوە.

**چوارەم:** دادپەروەرییە، بەدکار (فاسق) بۆی نیە منداڵ هەڵبگرێ.

**پێنجەم:** خاوەن فام بێ، مرۆی دەستبلاوی حیجر لەسەر بۆی نیە منداڵی فڕێدراو هەڵبگرێ، گریمان هەڵیشی بگرێ ناهێڵرێتەوە لە دەستیدا.

## ئەوماڵەی کە لەگەڵ ئەم منداڵە بێ، بۆ کێیەو چی لێدەکرێ؟:

هەر ماڵی لەگەڵ منداڵی دۆزراوەدابێ بەهی خۆی دادەنرێ، ژیواری لێی دابین دەکرێ، چونکە منداڵ ئەگەر لەژێر چاودێری باوکیشادا بەخێوبکرێ، ئەگەر ماڵی هەبێ، ژێواری لەسەر خۆیەتی، دەی لەکاتی وادا زیاتر ژێواری لەسەر خۆیەتی. ماڵی خۆشی وەك جلو بەرگو کەلو پەلو نوێنەکەیو پارەپوولو شمەکێ کە لە باخەڵی دابێ، یا پێوەی شەتەك درابێ، یا وەك ولاخێ جڵەوەکەی بە دەستیەوە بێ، وەك ئەو چاتۆڵەی کە منداڵەکەی تیادا بدۆزێتەوە، یا وەك ئەو چاتۆڵەی کە منداڵەکەی تیادا بدۆزێتەوە، یا وەك ئەو خانووەی کەهەر خۆی تیادابێ، باخیش هەروا، ئەوەی کە مەسرەفی بۆ دەکا لەو ماڵە فەرمانڕەوایە، چونکە ئەو هەقداری ئەو کەسانەیە کە هەقدرای تریان نیە، منداڵ

هەلگریش لەسەر فەرمانی قازی بۆی هەیە لەو ماڵە مەسرەفی بۆ بکا، جا ئەگەر فەرمانڕەوا نەبوو دەبێ شایەت بگرێ لەسەر ئەوەی کە بۆی خەرج دەکا، دەنا ئەگەر شایەت نەگرێ هەرچی لەو ماڵە سەرف بکا بۆی دەبێ بە دەستەبەری. گوتراویشە: بەبێ فەرمانی قازیش لە ماڵی منداڵەکە خۆی ژێواری بۆ دابین بکا نابێ بە دەستەبەر.

بەڵام ئەگەر منداڵەکە خۆی ماڵی نەبوو، ژیواری لەسەر بەیتولماڵە، چونکە ئیمامی عومەر {رەزای خوای لێبێ} لە بارەی بەخێوکردنی فڕێدراوەوە، پرس و رای بە هاوڕێیان کرد، بەیەك دەنگو بەیەك را فەرموویان: ژیواری لەسەر بەیتولماڵە، لەبەر ئەوەیش گەورەی رەسیدەی نەدارایش ژێواری لەسەر بەیتولماڵە، دەی منداڵ هەقی ئەوەی زیاتر هەیە کە ژیواری لەسەر بەیتولماڵ بێ. ئەگەر دەوڵەمەندو هەژارێ بە یەکەوە فڕێدراوێکیان هەلگرتەوە، دەوڵەمەندەکە پێش دەخرێ، چونکە لە بارەیدا هەیە کە لەکاتی پێویستدا یاریدەی سامانی بدات[1].

---

[1] ئەمە عیبارەتی ئەصڵەکەیە کە زەین بە هەڵەدا دەبا: (فان وجد مع اللقيط مال كالثياب والفرش وما يكون في جيبه أو شد عليه أو دابة عنانها بيده أو وجد في خيمته، أو في دار ليس فيها غيره أو في بستان كذلك.. ألخ) دەتوانین بڵێین هەتا ولاخەکە ئەم دەقە باشە، گەرچی بێ پێزی پێوە دیارە، بەڵام (أو وجد في خيمته) وەك مەتەڵ وایە هەڵهێنانەکەی ئەمەیە کە لە کیفایەکەدا دەفەرموێ: (ولو كان اللقيط في خيمته فهي له). ئەمەیش لە موغنی موحتاجدا باقی مەدەنی ئەم مەتەڵەمان بۆحەل دەکا کە دەفەرموێ؛ (وان وجد اللقيط في دار فهي له، لليد ولا مزاحم.. ولا يحكم له ببستان وجد فيه.. لان سكناها تصرف والحصول في البستان ليس تصرفا ولا سكنى) له

## ٢٤٢) باسی سپارده (وەدیعە):

سپارە ناوە بۆ زات (عەین)ێ خاوەنەکەی یا جێگری خاوەنەکەی لەلای کەسێ بە ئەمانەت دایبنێ، هەتا ئاگاداری بکا، سەربەڵگە لەم بابەتەدا نامەی خواو رێگەی رەهبەرە. خوای گەورە دەفەرموێ: {فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ – سورة البقرة – ٢٨٣/٤٢} وە دەفەرموێ: {أَن تُؤَدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا – سوره النساو – ٥٨/٤} ئەوەتا یەزدانی پاك لەم دوو ئایەتەدا فەرمان دەکا بە دانەری سپاردە بە خاوەنی، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: سپاردە بەسەر راستی بدەرەوە دەست ئەو کەسە کە دەستپاكو متمانە پێکراوی داناوی، گزیو ناپاکیش لە کەس مەکە، تەنانەت لەو کەسەیش کە گزیو ناپاکیت لێ دەکا (ئەبو داوود) لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نیشانەی مرۆی ناپاك ئەم سێ رەوشە ناشیرینەیە: هەرکاتێ قسەی کرد درۆی زۆری تیابکا، هەرکاتێ پەیمانی بەست،

---

راستیدا گەلێ جار تەصەروفێکی زۆر خراپ لە ئەصلی ئەصڵەکەدا کراوە، اختصار جیایە لە اختزال، گەلێ شوێنی وا شەڵەقاوو شەڵەژاوە نە لەمەتن دەکاو نە لە شەرح، ئومێد دەکەم لە رەحمەتی خوا لەم تەرجەمەدا سەرکەوتوومان بفەرموێ، هەتا ببێ بەهۆی راستکردنەوەی هەڵەکانی ناو ئەم کتێبە پیرۆزە بەڵکوو ببێ بەشەرحێکی کوردی بۆی.

چونکە لە راستیدا ئەم کتێبە ئەگەر تەحقیق بکرێو موراجەعە بکرێتەوە، بۆ لاوی موسوڵمان مانەندی کەمە. چونکە موسوڵمانی بەتەمەن دەبێ بەرەبەرە سەرچاوەی زانستی فرەوانتر بکا، چونکە قۆناغی سەرەتایی گەلێ جیایە لە قۆناغی کۆتایی.

– وەرگێڕ –

پەیمانەکەی نەباتە سەرو هەمیشە پەیمان شکێن بێ، هەرکاتێ شتی پێ سپێررا دەسپیس‌و ناپاك دەرچێ، لە گێڕانەوەیەکی موسلیما ئەم زیادەیەیشی هەیە: با لەبەرچاوی خەڵك ڕۆژوویش بگرێ‌و نوێژیش بکاو خۆیشی بە موسوڵمان لەقەڵەم بدا). بەڵگەی پێداویستیی ئەو خەڵکەیش بە سپاردە پێ سپیاردن، لەوێ بوەستێ.

## بڕیارەکەی:

ئەو کەسەی بتوانێ سپاردە بپارێزێ‌و لە هەمان کاتا باوەڕیشتی بە دەستپاکی‌و ئەمینداریی خۆی هەبێ ئەوە سوننەتە بۆی کە سپاردە وەربگرێ، چونکە خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا لە پشتی ئەوبەندە باشەی خۆیەتی کە لەسەر حەق پشتی برای ئایینی خۆی دەگرێ. گریمان هەر ئەو هەبوو کە بتوانێ ئەو سپاردەیە وەربگرێ ئەوە دەبڕێ بە سەریا کە وەری بگرێ، ئەو کەسەیش کە سپاردەی پێ نەپارێزرێ حەرامە وەری بگرێ، ئەگەر دەیتوانی بەڵام باوەڕی بە ئەمینیی خۆی نەبوو کە ڕاهەتی هەیە کە وەری بگرێ.

## دەستەبەر نابێ مەگەر لەبەر کەمتەرخەمی:

سپاردە ئەمانەتە وا لە دەستی ئەمیندارا، وەك گشت سپاردەیەکی تر نابێ بە دەستەبەر، بەڵام کەمتەرخەمی تیابکا، یا لە پاراستنیا کۆتایی بکا، دەبێ بە دەستەبەر، وەك ئەوە بەبێ فەرمانی خاوەنی لەلای کەسێکی تر بە ئەمانەت دایبنێ، یا خۆی بچێ بۆ سەفەرو بەجێی نەهێڵێ بۆ خاوەنەکەی، یا بۆ جێگری خاوەنەکەی، یا لە شوێنی داییبنێ

کە جێگەی پاراستنی ئاسایی وێنەی خۆی بەبێ بەهانەی ڕەوا لەگەڵ خۆی بیبا بۆ سەفەر، یا لەکاتی نەخۆشینی مەترسێدارا وەسێت نەکا کە ئەو سپاردەیەی لەلایە، یا لەوکاتەدا کە دەسەڵاتداری سەروڵات زیندانی دەکا بۆ کوشتن ڕانەسپێرێ لە بارەیەوە، یا درێغی بکا لە باسکردنی، یا بەبێ فەرمانی خاوەنی سوودی لێ وەربگرێ، کە ئەوە دادەنرێ بە کەمتەرخەمیو درێغیکردن، یا دەربچێ لەو مەرجەی خاوەنەکەی دایناوە، جا لەهەر کام لەم شێوانەدا سپاردەکە فەوتا دەیبژێرێ، ئەگەر زۆرداری داوای سپاردەکەی لێکرد لە سەریەتی کە نەیداتێو حاشای لێبکاو بیشارێتەوە، بەو پەڕی تواناوە دەبێ بەرگری بکا، ئەگەر دەیتوانی بەرگری بکاو بە ئارەزوو نەیکرد ئەوە دەستەبەرە.

## قسەی ئەمیندار دەخوات:

ئەگەر ئەمیندار بە خاوەن سپاردەی گوت: سپاردەکەتم پێداویتەوە، قسە قسەی ئەوە، بەمەرجێ سوێند بخوات، چونکە زاتی پاك دەفەرموێ: {فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ} ئەوەتا خودا فەرمان بە ئەمیندار دەکا کە بەبێ شایەت گرتن سپاردەکەی پێبداتەوە، ئەمەیش بەلگەی ئەوەیە کە قسەی دەخوات، چونکە ئەگەر وانەبوایە پێی دەفەرموو کە شایەتی لێ بگرێ ئەوسا سپاردەکەی بداتەوە دەستی، وەك لەم ئایەتەی تردا ئامۆژگاری هەقداری هەتیو دەکا، کە کاتێ لە هەتیوی دەرچوون ماڵەکانیان پێ بدەنەوەو شایەتیان لێ بگرن لەسەر ئەوە، وەك دەفەرموێ: {فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ - سورة النساء - ٤/٦}.

پێویسته لەسەری کە لە جێگەی پاراستنی ئەو جۆرە شتەدا دایبنێ، بۆ نموونە دراوو خشڵو گەوهەرە بەهادارەکان لە قاسەو سندووقی قایما دادەنرێن، ناومالّ لەناو مالاّ دادەنرێ، بزنو مەڕ لە حەوشەی مالّو کۆزو گەوڕی خۆیاندا دادەنرێن. هەرکاتێ خاوەنەکەی داوای کردەوە، دەبێ بەبێ دواخستن بیداتەوە پێی، بەپێی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا – سورة النساء – ٥٨/٤} واتە: ئەی موسوڵمانینە! خودا فەرمانتان پێ دەکا کە هەموو جۆرە سپاردەو ئەمانەتێ، بدەنەوە دەستی خاوەنی. جا هەر کاتێ بەبێ بیانوو دوایخستو فەوتا دەستەبەرە، ئەگەر بیانووی رەوای هەبوو نابێ بە دەستەبەری.

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوا بە یارمەتی خوای گەورەو مەزن ئەمڕۆ کە شەممەیە، ڕێکەوتی (١٩٩٥/١١/١١) لە وەرگێڕانی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە موبارەکەیە بوومەوە، لە خودا داوادەکەم کە ئەم هەنگاوە بکا بە نۆبەرەیێ بۆم و بیکا بە بەرایی کۆششێکی پیرۆز، لە بواری تەرجەمەی فیقهدا، بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، چ بۆ من و چ بۆ گشت کەسێ کە پەرۆشی خزمەتی دین و خزمەتی میللەتی کوردبێ.

## لێرەدا دووپاتی دەکەمەوە:

١) لە کتێبە گەورەکاندا زاناکان بە باشی بەسەرو گوێلاکی یەکتردا دێن، لەکاتی گلەیی و ڕاستکردنەوەی هەڵەی یەکتریدا. گەلێ توندتر لەم گلەییانەی کە من لە مامۆستای پایەبەرزی ئەحمەد عیسا عاشوورم کردووە. لەبەر ئەوە نابێ ئەمەی من لەم بارەیەوە نووسیومە بە تانەو توانج لە قەڵەم بدرێ. عەللامەی عەینی، لە بەرگی یەکەمی عومدەتولقاریدا، لەکاتی شەرحی فەرموودەی: (ربَّ مبلَّغٍ اوعى من سامعٍ)دا ڕخنە لە بۆچوونی کرمانی و شێخ قوطبەدین دەگرێ و پێیان دەفەرموێ: قلت: كل منهما قد ابعد وتعسف! ئەمە مشتێکە لە خەرواری.

٢) بەپێی تەوانا بەندە پابەندی دەقی ئەصڵەکە بووم و لەزۆر شوێنیش کە قسەکان بۆنی بازێ شتی لێ هاتبێ کە لەگەڵ مەشرەبی

خۆمدا ری نەکەوتبێ، ناچار بووم دەقەکە بە جوانی تەرجەمە بکەم. بەڵام ئەوە مەعنای وانییە کە من ئەورایە پەشەند دەکەم.

۳) لەخوا بەزیادبێ ئەم وەرگەڕانە باشترین شەرحو شیکردنەوەیە بۆ تێگەیشتن لە (كفاية الاخيار) و (الفقه الميسر).

بەڵێ بۆ فێربوونی ئەم دووکتێبە فەقێ دەتوانێ ئەم وەرگەڕاوە کوردییە بکا بە مامۆستای خۆی. بەڵام ئەمە مەعنای وانیە کە مەلاو فەقێ بەم تەرجەمانە بێ نیاز بن لە دیراسەی عولومی شەیعەت بە عەرەبی، نەء، ئەو بۆچوونە هەڵیە، پێویستە لەسەر مەلاو فەقێ زانستە شەرعییەکان، وەك جاران بە عەرەبی بخوێنن.

٤) تکا لە هەموو مامۆستاو خوێنەواران و ئەدیبان دەکەم، کە بەبێ لە بارابوونی تەواو پەلاماری تەرجەمەو دانانی کتێبی گەورەی ئاینی نەدەن، چونکە وەرگەڕانی شرم پرم، کتێبی بێ سەرو بەر، هەم ئەصڵەکە، هەم بابەتەکە، هە زمانەکە، لە بەرچاو دەخا.

غفر الله لی ولوالدی ولسائر المسلمين، وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

فِي كنفٍ ظلعَّلهُ القرآن     أظل نجلی (كاوة) يا رحمان

وصلى الله تعالى على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم.

وەرگێڕ

نوری فارس حمی خان هەمەن

سلێمانی ( خانووی زابتەکان )

گەڕەکی مامۆستایان.

# فهرس المواضيع

